# معالم السنة النبوية

## مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن


کۆکردنەوەی

صالح أحمد الشامي

وەرگێڕانی

عبدالکریم فتاح


بەرگی چوارەم

# مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## "پوختەی (١٤) کتێبە، کە بنچینەی کتێبەکانی فەرموودەن"


کۆکردنەوەی

صالح احمد الشامي

وەرگێرانی

عبدالكريم فتاح


بەرگی چوارەم

مەبەستی هەشتەم: دڵنەرمکەرەکان و ئەخلاق و ئاداب

مەبەستی نۆیەم: مێژوو و ژیاننامە و سەروەرییەکان / مەبەستی دەیەم: فیتنەکان







٢٥

نووری حەقیقەت

٥٠

ڕێکخراوی خاڵ


■ بابەت: مەشخەڵی سوننەتی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

■ کۆکردنەوە: صالح احمد الشامي

■ وەرگێڕان: عبدالكريم فتاح

■ دیزاینەری ناوەوە: هەردی زیاد صالح

■ دیزاینەری بەرگ: جمعە هموندی

■ ساڵی چاپ: 2022

■ چاپخانە: ڕێدار بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

■ تیراژ: 2000 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (٣٤٨) ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە


تێبینی: لەسەر وەرگرتنی مۆڵەت لە شێخ صالح ئەحمەد شامی و بنەماڵەکەی
هەستاین بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە

## ١- دەروازەی: نزیکبوونەوە بە نافیلەکان و دەستپێشخەری لە کارە چاکەکان

**٣٢٧٥-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ قَالَ: مَنْ عادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ: كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنَا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ نَفْسِ المُؤْمِنِ، يَكْرَهُ المَوْتَ وَأَنَا أَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ**). [خ٦٥٠٢]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا فەرمووی: هەر کەس دەستدرێژی بکاتە سەر دۆستێکم جەنگم دژ بە ئەو راگایاندووە، بەندەکەم بە شتێك لێم نزیك نابێتەوە لام خۆشتر لەوەی فەرزم کردووە لەسەری، بەردەوام بەندەکەم بە نافیلەکان لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشمدەوێت، گەر خۆشمویست ئەو گوێیەی ئەوم پێی دەبیستێ، ئەو چاوەی ئەوم پێی دەبینێ، ئەو دەستەی ئەوم دەیوەشێنێت، ئەو لاقەی ئەوم پێی دەڕوات، گەر داوام لێ بکات پێیدەدەم، گەر پەنام پێبگرێت پەنای دەدەم، من بۆ هیچ شت تەرەدودم نەبووە ئەنجامی بدەم وەك تەرەدودم لە نەفسی باوەڕدار[١]، مردنی پێخۆش نییە، منیش ناخۆشی ئەوم لا ناخۆشە**).

**٣٢٧٦-** (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ فِتَناً كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِناً وَيُمْسِي كَافِراً، أَوْ يُمْسِي مُؤْمِناً وَيُصْبِحُ كَافِراً، يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا**). [م١١٨]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بە کۆمەڵێك کار دەستپێشخەری بکەن لە فیتنەیەك وەك پارچەی شەوی تاریك، پیاو بە باوەڕەوە رۆژی**

[١] واتە: لە مراندنی کەسە باوەڕدارەکە و گیانکێشانی-و.

**لێ دەبێتەوە و بەبێباوەڕی ئێوارەی بەسەردا دێت، یان بە باوەڕەوە ئێوارەی بەسەردا دێت و بە بێباوەڕی ڕۆژی لێ دەبێتەوە، دینەکەی بە شتێکی کەم لە دنیا دەفرۆشێت).**

**٣٢٧٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِرَجُلٍ وَهُوَ يَعِظُهُ: (**اغْتَنِمْ خَمْساً قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَراغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ**). [ك٧٨٤٦]

* قال الذهبي: على شرطهما.

لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پیاوێکی فەرموو-ئەو ئامۆژگاری دەکرد-: (**پێنج شت بەر لە پێنج شتی تر بەدەستبهێنە: گەنجێتیت بەر لە پیریت، و ساغڵەمیت بەر لە نەخۆشیت، و دەوڵەمەندیت بەر لە هەژاریت، و دەستبەتاڵیت بەر لە سەرقاڵیت، و ژیانت بەر لە مردنت).**

## ٢- دەروازەی: کاروباری باوەڕدار هەمووی خێرە

**٣٢٧٨**- (م) عَنْ صُهَيْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَجَباً لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ**، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ: إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْراً لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيْراً لَهُ). [م٢٩٩٩]

(م) لە صوهەیبەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**سەرسوڕمان لە کاروباری باوەڕدار، هەموو کاروباری خێرە، ئەوەش بۆ هیچ کەس نییە جگە لە باوەڕدار: گەر خۆشی تووشهات شوکر دەکات و خێری بۆ هەیە، گەر زیانی تووشهات ئارام دەگرێت و خێری بۆ هەیە).**

## ٣- دەروازەی: نزیکی قیامەت و نموونەی دنیا

**٣٢٧٩**- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ بِإِصْبَعَيْهِ هكَذَا، بِالْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ: (**بُعِثْتُ وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ**). [خ٤٩٣٦/ م٢٩٥٠]

(ق) لە سەهلی كوڕی سەعدەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی بە دوو پەنجەی -ناوەند و ئەوەی دوای پەنجەگەورە دێت- بەم جۆرەی دەفەرموو: **(من رەوانەكرام و لەگەڵ قیامەت وەك ئەم دوانە)**.

**٣٢٨٠**- (م) عَنْ مُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ . أَخي بَنِي فِهْرٍ . قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَاللهِ مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ؛ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ هَـذِهِ . وَأَشَارَ يَحْيَى بِالسَّبَّابَةِ . فِي الْيَمِّ؛ فَلْيَنْظُرْ بِمَ تَرْجِعُ؟). [م٢٨٥٨]

(م) لە موستەوەریدی كوڕی شەددادەوە -برای بەنی فیهر- وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بە خودا، دنیا بەراورد بە دواڕۆژ وەك نموونەی یەكێك لە ئێوە وایە ئەم پەنجەی -یەحیا ئاماژەی كرد بۆ پەنجەی شایەتمان- بخاتە دەریایەك، با وردبێتەوە چی پێوە دەلكێت)**.

## ٤- دەروازەی: هەر كەس لیقای خودای پێخۆش بێت خوداش لیقای ئەوی پێخۆشە

**٣٢٨١**- (ق) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ كَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ). [خ٦٥٠٧/ م٢٦٨٣]

(ق) لە عوبادەی كوڕی صامیتەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس لیقای خودای پێخۆش بێت خودا لیقای ئەوی پێخۆشە، هەر كەس لیقای خودای پێناخۆش بێت خوداش لیقای ئەوی پێناخۆشە)**.

- زاد البخاري في روايته: قالَتْ عائِشَةُ، أَو بَعْضُ أَزْوَاجِهِ: إِنَّا لَنَكْرَهُ الموْتَ، قالَ: (**لَيْسَ ذَلِك**، وَلكِنَّ الْمُؤمِنَ إِذَا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوَانِ اللهِ وَكَرَامَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَأَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ، وَأَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ. وإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا حُضِرَ، بُشِّرَ بِعَذَابِ اللهِ وَعُقُوبَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَهَ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَكَرِهَ لِقَاءَ اللهِ وَكَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ).

بوخاری لە ریوایەتەکەیدا ئەمەی زیاد کردووە: عائیشە –یان یەکێك لە ژنەکانی– وتی: ئێمە مردنمان لا ناخۆشە، پێغەمبەر فەرمووی: **(بەو جۆرە نییە، بەڵام باوەڕدار کە مردنی بۆ ئامادە دەبێت بە ڕیزوانی خودا و ڕێز و بەخشندەیی ئەو مژدەی پێ دەدرێت، شتێك نییە لای خۆشەویستتر بێت لەوەی لەبەردەمیدایە، بۆیە لیقای خودای خۆشدەوێت و خوداش لیقای ئەوی خۆشدەوێت، کاتێ بێباوەڕ دەکەوێتە سەرەمەرگ بە سزا و ئازاردانی خودایی مژدەی پێ دەدرێت، شتێك نییە لای ناخۆشتر بێت لەوەی لەبەردەمیدایە، بۆیە لیقای خودای لای ناخۆشە و خوداش لیقای ئەوی لا ناخۆشە).**

٣٢٨٢– (خ) عَنْ مِرْدَاسٍ الأَسْلَمِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ، الأَوَّلُ فالأَوَّلُ، وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ، أَوِ التَّمْرِ، لاَ يبَالِيهِمُ اللهُ بَالَةً).
[خ٦٤٣٤ (٤١٥٦)]

(خ) لە میرداسی ئەسلەمییەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(یەك لەدوای یەك صاڵحان دەڕۆن، سەرکۆتەڵێك وەك سەرکۆتەڵی جۆ[1]، یان خورمای خراپ دەمێنێتەوە، خودا باکێکی پێیان نییە).**

## ٥- دەروازەی: ئیسلامی بە غەریبی دەستی پێکرد

٣٢٨٣– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (بَدَأَ الإِسْلاَمُ غَرِيباً، وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيباً، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ). [م١٤٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد، لە داهاتوو وەك چۆن دەستی پێکرد غەریب دەبێتەوە، خۆشبەختی بۆ غەریبان).**

---

[1] کاتێ گەنم یان جۆ دەدرێت لە کەو–کەو لە بێژەنگ گەورەترە– گەنمەکە یان جۆکە دادەدات و هەندێ لە کەوەکەدا دەمێنێتەوە دایناداتە، ئەوە پێی دەوترێت کۆتەڵ یان سەرکۆتەڵ–و.

## ٦- دەروازەی: ترسان لە خودا (سبحانه وتعالى)

**٣٢٨٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**كَانَ رَجُلٌ يُسْرِفُ عَلَى نَفْسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَهُ المَوْتُ قَالَ لِبَنِيهِ: إِذَا أَنَا مِتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اطْحَنُونِي، ثُمَّ ذُرُّونِي فِي الرِّيحِ. فَوَاللهِ! لَئِنْ قَدَرَ عَلَيَّ رَبِّي لَيُعَذِّبَنِّي عَذَاباً ما عَذَّبَهُ أَحَداً. فَلَمَّا مَاتَ فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ، فَأَمَرَ اللهُ الأَرْضَ فَقَالَ: اجْمَعِي ما فِيكِ مِنْهُ، فَفَعَلَتْ، فَإِذَا هُوَ قَائِمٌ، فَقَالَ: ما حَمَلَكَ عَلَى ما صَنَعْتَ؟ قَالَ: يَا رَبِّ خَشْيَتُكَ! فَغَفَرَ لَهُ**). وَقَالَ غَيْرُهُ: (**مَخَافَتُكَ يَا رَبِّ**).          [خ٣٤٨١/ م٢٧٥٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێك ستەمی لە نەفسی خۆی هەبوو، كاتێ مردن لەسەری ئامادە بوو بە كوڕەكانی خۆی وت: گەر من مردم بمسووتێنن، پاشان ورد و خاشم بكەن و بمهاڕن، پاشان بمدەنە بەر با، سوێند بە خودا، گەر خودا دەستی بەسەرمدا بڕوات سزایەكم دەدات هیچ كەسی بەو جۆرە سزا نەدابێت، كاتێ مرد ئەوەیان بەسەردا هێنا، خودا فەرمانی بە زەوی كرد و فەرمووی: ئەوەی لە تۆدایە لە جەستەی ئەو كۆبیكەرەوە، زەوی بەو جۆرەی كرد، و كەسەكە ڕاستبوویەوە، پێی فەرموو: چ شتێك تۆی هەڵنا بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە؟ وتی: ئەی پەروەردگار، ترسان لە تۆ، بۆیە خودا لێیخۆش بوو).**

## ٧- دەروازەی: هاندان لەسەر كورتی هیوا و ئاوات

**٣٢٨٥-** (خ) عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمَنْكِبِي فَقَالَ: (**كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ**).

وكان ابن عمر يقول: إذا أَمْسَيتَ فَلا تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ، وإِذَا أَصْبَحْتَ فَلا تَنْتَظِرِ المساءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَتِكَ لِمَرَضِكَ، ومِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ.          [خ٦٤١٦]

(خ) لە موجاهیدەوە، لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) شانی گرتم و فەرمووی: **(لە دنیا وەك غەریبێك بە، یان وەك گوزەركەری ڕێگەیەك).**

ئیبن عومەر دەیوت: گەر ئێوارەت بەسەردا هات چاوەڕوانی بەیانی مەكە، گەر ڕۆژت لێبوویەوە چاوەڕوانی ئێوارە مەكە، لە تەندروستیت وەربگرە بۆ نەخۆشیت، لە ژیانت وەربگرە بۆ مردنت.

٣٢٨٦- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! عَلِّمْنِي وَأَوْجِزْ، قَالَ: (إِذَا قُمْتَ فِي صَلاَتِكَ فَصَلِّ صَلاَةَ مُوَدِّعٍ، وَلاَ تَكَلَّمْ بِكَلاَمٍ تَعْتَذِرُ مِنْهُ، وَأَجْمِعِ الْيَأْسَ عَمَّا فِي أَيْدِي النَّاسِ). [جه٤١٧١]

* حسن.

لە ئەبی ئەیوبەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، فێرم بكە و كورتی بكەرەوە، فەرمووی: **(گەر هەستای بۆ نوێژەكەت نوێژی ماڵئاواییكەر ئەنجام بدە، قسەیەك مەكە عوزری بۆ بهێنییەوە، بێهیوایی كۆبكەرەوە[1] لەوەی لە دەستی خەڵكدایە).**

## ٨- دەروازەی: هەوڵ و پێداگری بۆ ماڵ و سامان و درێژی تەمەن

٣٢٨٧- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: خَطَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم خَطّاً مُرَبَّعاً، وَخَطَّ خَطّاً فِي الْوَسَطِ خارِجاً مِنْهُ، وَخَط خُطَطاً صِغَاراً إِلَى هَذَا الَّذِي فِي الْوَسَطِ مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي فِي الْوَسَطِ، وَقَالَ: (هَذَا الإِنْسَانُ، وَهذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ . أَوْ: قَدْ أَحَاطَ بِهِ . وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ، وَهذِهِ الْخُطَطُ الصِّغَارُ: الأَعْرَاضُ، فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا، وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا). [خ٦٤١٧]

(خ) لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هێڵێكی چوارگۆشەی كێشا، هێڵێكیشی لە ناوەند-لە دەرەوەی هێڵی چوارگۆشەكە- كێشا، چەند هێڵێكی بچووكیشی كێشا لەسەر ئەو هێڵەی لە ناوەند بوو لە دەرەوەی

---

[1] واتە: لە دڵدا عەز و سووربوون و لێبڕانت هەبێت لە بێهیوابوون لەوەی لە دەستی خەڵكدایە-و.

**هێڵەكە، فەرمووی: (ئەمە مرۆڤە، ئەمە ئەجەلەكەیەتی ئابڵۆقەی داوە-یان: دەورەی داوە- ئەمەش كە لە دەرەوەیە هیواكەیەتی، ئەم هێڵە وردانەش: پێشهاتەكانن، گەر ئەمە نەیپێكێت ئەمەیان دەیگرێتەوە، گەر ئەمەش نەیپێكێت ئەمەیان دەیگرێتەوە).**

دەتوانین ئەوەی لە فەرموودەكەدا هاتووە بەم شێوەیە نواندنی بۆ بكەین:




٣٢٨٨- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لاَ يَزَالُ قَلْبُ الْكَبِيرِ شَابّاً فِي اثْنَتَيْنِ: فِي حُبِّ الدُّنْيَا، وَطُولِ الأَمَلِ). [خ٦٤٢٠/ م١٠٤٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بەردەوام دڵی كەسی پیر لە دوو شتدا گەنجە: لە خۆشەویستی دنیا و هیوا و ئاواتی دوور و درێژ).**

٣٢٨٩- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَوْ أَنَّ لاِبْنِ آدَمَ وَادِياً مِنْ ذَهَبٍ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَادِيَانِ، وَلَنْ يَمْلأَ فَاهُ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللهُ عَلَى مَنْ تَابَ). [خ٦٤٣٩/ م١٠٤٨]

(ق) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئادەمیزاد دۆڵێك لە زێڕی هەبێت پێیخۆشە دوو دۆڵی هەبێت، تەنها خۆڵ دەمی پڕ دەكات، خودا تەوبە لە كەسێك قبووڵ دەكات تەوبە بكات).**

٣٢٩٠- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (إِذَا فُتِحَتْ عَلَيْكُمْ فَارِسُ وَالرُّومُ، أَيُّ قَوْمٍ أَنْتُمْ)؟ قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: نَقُولُ كَمَا

أَمَرَنَا اللهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَوَ غَيْرُ ذَلِكَ؟ تَتَنَافَسُونَ، ثُمَّ تَتَحَاسَدُونَ، ثُمَّ تَتَدَابَرُونَ، ثُمَّ تَتَبَاغَضُونَ، أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ. ثُمَّ تَنْطَلِقُونَ فِي مَسَاكِينِ الْمُهَاجِرِينَ، فَتَجْعَلُونَ بَعْضَهُمْ عَلَى رِقَابِ بَعْضٍ). [م٢٩٦٢]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(گەر فارس و ڕۆمتان بۆ فەتح کرا، ئێوە دەبن بە چ گەلێك؟)**، عبدالرحمانی کوڕی عەوف وتی: ئەوە دەڵێین کە خودا فەرمانی پێکردووین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئایا جگە لەوە شتێکی تر دەڵێن؟ دەکەونە ململانێ، پاشان حەسوودی بردن بەیەکتر، پاشان پشتهەڵکردن لە یەکتر، پاشان کینە و ڕقبوون لەیەکتر یان هاوشێوەی ئەوە، پاشان هەژارانی کۆچکەران دەرگای دنیایان بە ڕوودا دەکرێتەوە، و هەندێکیان دەخەنە سەر گەردنی هەندێکی تر[1])**.

## ٩- دەروازەی: کەسێك بگاتە شەست ساڵان بیانووی بۆ نییە

**٣٢٩١**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَعْذَرَ اللهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً). [خ٦٤١٩]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا بیانووی مرۆڤێکی بڕیوە وادەی مردنەکەی دوابخات تا بیگەیەنێتە شەست)**.

## ١٠- دەروازەی: هۆشداریدان لە گوناهی کەمبایەخ

**٣٢٩٢**- (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: إِنَّكُمْ لَتَعْمَلُونَ أَعْمَالاً، هِيَ أَدَقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنَ الشَّعْرِ، إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الموبِقَاتِ. [خ٦٤٩٢]

(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئێوە کارگەلێك ئەنجام دەدەن لەبەرچاوتان لە موو باریکترن، ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لە تیابەرەکانمان دادەنان.

---

[1] واتە: دەبن بە فەرمانڕەوا بەسەریانەوە–و.

**٣٢٩٣**- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِيَّاكُمْ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ، كَقَوْمٍ نَزَلُوا فِي بَطْنِ وَادٍ، فَجَاءَ ذَا بِعُودٍ، وَجَاءَ ذَا بِعُودٍ، حَتَّى أَنْضَجُوا خُبْزَتَهُمْ، وَإِنَّ مُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ مَتَى يُؤْخَذْ بِهَا صَاحِبُهَا، تُهْلِكْهُ**). [حم٢٢٨٠٨]

* حديث صحيح على شرط الشيخين.

**لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئاگادارتان دەکەمەوە لە گوناهە کەمبایەخەکان، وەك خەڵکێك لە دۆڵێکدا دەبەزن[1]، ئەمەیان چیلکەیەك دەهێنێ و ئەوەیان چیلکەیەك دەهێنێ تا نانەکەی خۆیانی پێ دەبرژێنن، هەرکات خاوەنی گوناهە کەمبایەخەکان بەو گوناهانە بگیرێت تیایدەبەن).**

## ١١- دەروازەی: کار دەمێنێتەوە

**٣٢٩٤**- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ، وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ: يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمالُهُ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ**).

[خ٦٥١٤/ م٢٩٦٠]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سێ شت شوێنی مردوو دەکەون، دوانیان دەگەڕێنەوە و یەکێکیان لەگەڵی دەمێنێ: خانەوادەکەی و ماڵ و سامانەکەی و کارەکەی شوێنی دەکەون، خانەوادە و ماڵ و سامانەکەی دەگەڕێنەوە و کارەکەی دەمێنێتەوە).**

**٣٢٩٥**- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيُّكُمْ مالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مالِهِ**)؟ قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، ما مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ مالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ، قَالَ: (**فإِنَّ مَالَهُ ما قَدَّمَ، وَمالُ وَارِثِهِ ما أَخَّرَ**). [خ٦٤٤٢]

---

[1] دەبەزن: لە بەزینەوەیە، کاتێ کۆچکوران و ڕەوەند لە جێگەیەك کۆڵ و بارەکانیان دەخەن، ئەو کارە پێی دەوترێت بەزین یان بارخستن-و.

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(کێ ماڵی میراتگرانی لە ماڵەکەی خۆی لا خۆشەویستترە؟)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) یەك بە یەکی ئێمە ماڵەکەی خۆی لا خۆشەویستترە، فەرمووی: **(ماڵەکەی ئەوەیە پێش خۆی خستووە، ماڵی میراتگرانی ئەوەیە دوایکەوتووە)**.

**٣٢٩٦**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَقُولُ الْعَبْدُ: مَالِي، مَالِي. إِنَّمَا لَهُ مِنْ مَالِهِ ثَلاَثٌ: مَا أَكَلَ فَأَفْنَى، أَوْ لَبِسَ فَأَبْلَى، أَوْ أَعْطَى فَاقْتَنَى وَمَا سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ ذَاهِبٌ، وَتَارِكُهُ لِلنَّاسِ). [م٢٩٥٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەندە دەڵێت: ماڵەکەم، ماڵەکەم، ئەو لە ماڵەکەی سێ شتی بۆ هەیە: ئەوەی دەیخوات و تیادەچێت، یان ئەوەی دەیپۆشێ و دەڕزێ، یان دەیبەخشێ و دەمێنێتەوە، جگە لەوانە ئەو دەڕوات و بۆ خەڵکی بەجێدەهێڵێت)**.

## ١٢- دەروازەی: پلە و پایەی دنیا لای خودا

**٣٢٩٧**– (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَرَّ بِالسُّوقِ، دَاخِلاً مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ، وَالنَّاسُ كَنَفَتَهُ، فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ، فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ، ثُمَّ قَالَ: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ)؟ فَقَالُوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ، وَمَا نَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: (أَتُحِبُّونَ أَنَّهُ لَكُمْ)؟ قَالُوا: واللهِ لَوْ كَانَ حَيّاً كَانَ عَيْباً فِيهِ، لأَنَّهُ أَسَكُّ، فَكَيْفَ وَهُوَ مَيِّتٌ؟ فَقَالَ: (فَوَاللهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ، مِنْ هَذَا عَلَيْكُمْ). [م٢٩٥٧]

(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە بازاڕدا تێپەڕی لە هەندێ لە بەرزاییەکانەوە چووبووە ژوورەوە و خەڵك لە تەنیشتی بوون بە پاڵ کارێکی کەڕیلەی[1] مرداروەبوودا گوزەری کرد، دەستی بۆ برد، گوێی کاریلەکەی گرت و پاشان فەرمووی: **(کێ لە ئێوە پێیخۆشە ئەمە بۆ ئەو بێت بە درهەمێك؟)**،

[1] واتە: کەڕیلە ئەو گیاندارەیە دوو گوێی نییە–و.

وتیان: پێمانخۆش نییە بە هیچ شت[1] بۆ ئێمە بێت، چی لەوە بکەین؟ فەرمووی: **(پێتانخۆشە ئەمە بۆ ئێوە بێت؟)**، وتیان: سوێند بە خودا، گەر ئەوە زیندوو بوایە عەیبی تێدا بوو، چونکە کەڕیلەیە، ئەی دەبێ چۆن بێت مردارەوەبووبێت؟! فەرمووی: **(سوێند بە خودا، دنیا لای خودا سووکترە لەمە لە لای ئێوە)**.

**٣٢٩٨-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ). [م٢٩٥٦]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دنیا بەندیخانەی باوەڕدار و بەهەشتی بێباوەڕە)**.

**٣٢٩٩-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِراً مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ). [ت٢٣٢٠]

* صحيح.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر دنیا لای خودا کێشی باڵە مێشوولەیەکی ببوایە ڕێگەی نەدەدا بێباوەڕ قومە ئاوێکی لێ بخواتەوە)**.

## ١٣- دەروازەی: کەم پێدەکەنین

**٣٣٠٠-** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً). [خ٦٦٣٧ (٦٤٨٥)]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئەبو قاسم(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی محەمەدی بەدەستە، گەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن، زۆر دەگریان و کەم پێدەکەنین)**.

**٣٣٠١-** وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تُكْثِرُوا الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ). [جه٤١٩٣]

* صحيح.

---

[1] واتە: بە بەلاش-و.

**هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (زۆر پێمەکەنن، چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ).**

## ١٤- دەروازەی: هیچ کەس بە کاری خۆی ناچێتە بەهەشتەوە

**٣٣٠٢-** (ق) عَنْ عائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (سَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يُدْخِلُ أَحَداً الجَنَّةَ عَمَلُهُ). قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ بِمَغْفِرَةٍ وَرَحْمَةٍ). [خ٦٤٦٧ (٦٤٦٤)/ م٢٨١٨]

(ق) **لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (ڕاست بەمەبەست بگرن و لێی نزیك ببنەوە، و مژدەتان لێ بێت، هیچ کەس لە ئێوە کارەکەی نایباتە بەهەشتەوە)، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (منیش، مەگەر خودا بە لێخۆشبوون و بەزەیی داممپۆشێت).**

- زاد في رواية لهما: (وأنَّ أحبَّ الأَعمالِ أدومها إلى الله وإن قلَّ). [خ٦٤٦٤]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان ئەمە زیابووە: (خۆشەویستترین کار لای خودا بەردەوامترینیانە با کەمیش بێت).**

**٣٣٠٣-** (خ) عَنْ عائِشَةَ أَنَّهَا قالَتْ: كانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ. [خ٦٤٦٢ (١١٣٢)]

(خ) **لە عائیشەوە، ئەو وتی: خۆشەویستترین کار لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوە بوو خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بوو.**

## ١٥- دەروازەی: بەشکردن و قەناعەت و دەوڵەمەندی دەروون

**٣٣٠٤-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ). [خ٦٤٤٦/ م١٠٥١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەوڵەمەندی لە زۆری شتومەك نییە، بەڵكو دەوڵەمەندی دەروونە).**

٣٣٠٥- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ، وَرُزِقَ كَفَافاً، وَقَنَّعَهُ اللهُ بِمَا آتَاهُ). [م١٠٥٤]

(م) لە عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی موسڵمان بوو و بە بەشی پێویست ڕۆزی درا و خودا بەوەی پێیداوە قەناعەتی پێ پەیدا كرد، سەرفراز بووە).**

## ١٦- دەروازەی: فەزڵی ئارامگرتن لەسەر هەژاری

٣٣٠٦- (م) عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: أَلَسْنَا مِنْ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ: أَلَكَ امْرَأَةٌ تَأْوِي إِلَيْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَلَكَ مَسْكَنٌ تَسْكُنُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الأَغْنِيَاءِ. قَالَ: فَإِنَّ لِي خَادِماً. قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الْمُلُوكِ.

**(م) لە ئەبی عبدالرحمانی حوبولییەوە، وتی: لە عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصم بیست، پیاوێك پرسیاری لێكرد و وتی: ئایا ئێمە لە هەژارە كۆچكەرەكان نین؟ عەبدوڵا وتی: ئایا ژنێكت هەیە بچی بۆ لای؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئایا شوێنێكت هەیە تیایدا نیشتەجێ بیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: كەوابوو تۆ لە دەوڵەمەندانی، پیاوەكە وتی: خزمەتكارێكیشم هەیە، وتی: كەوابوو تۆ لە مەلیكانی.**

- وفي رواية قال أبو عبد الرحمن: وَجَاءَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، وَأَنَا عِنْدَهُ، فَقَالُوا: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، إِنَّا وَاللهِ مَا نَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ، لاَ نَفَقَةٍ، وَلاَ دَابَّةٍ، وَلاَ مَتَاعٍ. فَقَالَ لَهُمْ: مَا شِئْتُمْ؟ إِنْ شِئْتُمْ رَجَعْتُمْ إِلَيْنَا فَأَعْطَيْنَاكُمْ مَا يَسَّرَ اللهُ لَكُمْ. وَإِنْ شِئْتُمْ ذَكَرْنَا أَمْرَكُمْ لِلسُّلْطَانِ. وَإِنْ شِئْتُمْ صَبَرْتُمْ. فَإِنِّي سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الأَغْنِيَاءَ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَى الْجَنَّةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفاً).**
قَالُوا: فَإِنَّا نَصْبِرُ، لاَ نَسْأَلُ شَيْئاً. [م٢٩٧٩]

لە ریوایەتێکدا ئەبو عبدالرحمن وتی: سێ کەس هاتن بۆ لای عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص، من لە لای بووم، وتیان: ئەی باوکی محەمەد، سوێند بە خودا، ئێمە دەستمان بەسەر هیچ شتێکدا ناڕوات، نە خەرجی، و وڵاخی سواری، و نە شتومەك، پێی وتن: ئەوە دەخوازن؟ گەر دەتانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لامان و ئەوەی خودا بۆی ئاسان کردوون پێتان دەدەین، گەر دەتانەوێ کارەکەتان بۆ سوڵتان باس دەکەین، گەر دەشخوازن ئارام بگرن، چونکە من لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: **(هەژارانی کۆچکەران لە ڕۆژی قیامەت بۆ چوونە بەهەشت بە چل پایز پێش دەوڵەمەندان دەکەون)**.

وتیان: ئێمە ئارام دەگرین و داوای هیچ شت ناکەین.

**٣٣٠٧**– عن أبي سعيدٍ الخدريِّ قال: أحبُّوا المساكينَ فإني سمعتُ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلمَ يقولُ في دعائِه: (اللهمَّ أحْيِني مسكينًا وأمتني مسكينًا واحشُرني في زمرةِ المساكينِ).

* ضعيف. [جه٤١٢٦]

لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: گەدایانتان خۆشبوێت، من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو لە دوعاکەیدا دەیفەرموو: **(اللهم أحْيِنِي مِسْكِنا، وأمِتْنِي مِسْكِنا، واحْشُرْنِي مع المَساكِين–خودایە بە گەدایی[1] بمژێنە، و بە گەدایی بمرێنە، و لەگەڵ گەدایان حەشرم بکە)**.

## ١٧- دەروازەی: با تەماشای خوار خۆی بکات

**٣٣٠٨**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي المَالِ وَالخَلْقِ، فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ). [خ٦٤٩٠/ م٢٩٦٣]

---

[1] واتە: وشەی هەژارم بۆ "فقير" بەکارهێناوە و وشەی گەدام بۆ "مسكين" بەکارهێناوە–و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە تەماشای کەسێکی کرد لە ماڵ و سامان و لە خەلق بەسەر ئەودا فەزڵی درابوو با تەماشای ئەو کەسە بکات لە خوار خۆیەوەیە).**

- زاد في مسلم: (مِمَّنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ).

لە موسلیمدا ئەمە زیاد بووە: **(مِمَّنْ فُضِّلَ عليه-لەوانەی فەزڵی بەسەر ئەودا دراوە).**

- وفي رواية له: (انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللهِ).

هەروەها لە ریوایەتێکی تری موسلیمدا: **(تەماشای ئەو کەسە بکەن لە خوار ئێوەوەیە، تەماشای ئەو کەسە مەکەن لەسەرو ئێوەوەیە، ئەوە شایستەترە بەوەی نیعمەتی خودا کەمبایەخ تەماشا نەکەن).**

## ١٨- دەروازەی: خەم و پەژارە بە دنیاوە

**٣٣٠٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ كَانَتِ الْآخِرَةُ هَمَّهُ، جَعَلَ اللهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ، وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ. وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ، جَعَلَ اللهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ). [ت٢٤٦٥]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس خەم و پەژارەی دواڕۆژ بێت خودا دەوڵەمەندییەکەی دەخاتە دڵییەوە و شەملی بۆ کۆدەکاتەوە[1] و دنیا بە ملکەچی رووی لێ دەکات، هەر کەس دنیا خەم و پەژارەی بێت خودا هەژارییەکەی دەخاتە نێوان دوو چاوی و شەملی لەسەر بڵاوە پێ دەکات و تەنها ئەوەندە دنیای بۆ دێت بۆی براوەتەوە).**

---

[1] واتە: کاری پەرش و بڵاوی بۆ کۆدەکاتەوە-و.

## ١٩- دەروازەی: درێژی تەمەن و باشی و چاکی کار و کردەوە

**٣٣١٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عُمْرُ أُمَّتِي مِنْ سِتِّينَ سَنَةً إِلَى سَبْعِينَ سَنَةً**). [ت٢٣٣١، ٣٥٥٠/ جه٤٢٣٦]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تەمەنی ئومەتەکەم لە شەست ساڵەوەیە بۆ حەفتا ساڵ).**

**٣٣١١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ: أَنَّ أَعْرَابِيّاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ خَيْرُ النَّاسِ؟ قَالَ: (**مَنْ طَالَ عُمُرُهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ**). [ت٢٣٢٩]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی بوسرەوە: ئەعرابییەك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کێ باشترینی خەڵکە؟ فەرمووی: (کەسێك تەمەنی درێژ بێت و کار و کردەوەی باش و چاك بێت).**

**٣٢١٢-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم آخَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَقُتِلَ أَحَدُهُمَا، وَمَاتَ الْآخَرُ بَعْدَهُ، فَصَلَّيْنَا عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا قُلْتُمْ**)؟ قَالُوا: دَعَوْنَا لَهُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ! اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ! اللَّهُمَّ أَلْحِقْهُ بِصَاحِبِهِ! فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَأَيْنَ صَلَاتُهُ بَعْدَ صَلَاتِهِ، وَأَيْنَ عَمَلُهُ بَعْدَ عَمَلِهِ؟ فَلَمَا بَيْنَهُمَا، كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ**).

* صحيح. [د٢٥٢٤/ ن١٩٨٤]

**لە عوبەیدی کوڕی خالیدی سولەمییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان دوو پیاو، یەکێکیان کوژرا و ئەویتریان لەدوای ئەو مرد، نوێژمان لەسەر کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چیتان وت؟)، وتیان: دوعامان بۆ کرد: "أللهم اغفر لە، أللهم ارحمە، أللهم ألحِقْە بصاحبە-خودایە لێیخۆش بە، خودایە رەحمی پێبکە، خودایە**

**بیگەیەنە بە هاوەڵەکەی"، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نوێژی لە کوێیە لەپاش نوێژی ئەو، کاری لە کوێیە لە پاش کاری ئەو؟ لە نێوانیان وەك نێوانی ئاسمان و زەوییە[1]).**

## ٢٠- دەروازەی: یادی مردن و خۆ ئامادە کردن بۆی

**٣٣١٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ**). يَعْنِي: الْمَوْتَ. [ت٢٣٠٧/ ن١٨٢٣/ جه٤٢٥٨]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (یادی چێژبڕەکە بکەن)، واتە: مردن.**

**٣٣١٤**- عَنْ هَانِئٍ - مَوْلَى عُثْمَانَ - قَالَ: كَانَ عُثْمَانُ إِذَا وَقَفَ عَلَى قَبْرٍ بَكَى، حَتَّى يَبُلَّ لِحْيَتَهُ، فَقِيلَ لَهُ: تُذْكَرُ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَلاَ تَبْكِي، وَتَبْكِي مِنْ هَذَا؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنْزِلٍ مِنْ مَنَازِلِ الآخِرَةِ، فَإِنْ نَجَا مِنْهُ، فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ. وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ، فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ**).

قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا رَأَيْتُ مَنْظَراً قَطُّ؛ إِلاَّ الْقَبْرُ أَفْظَعُ مِنْهُ**).

* حسن. [ت٢٣٠٨/ جه٤٢٦٧]

**لە هانیئەوە -مەولای عوسمان- وتی: گەر عوسمان لەسەر گۆڕێك بوەستابا دەگریا تا ریشی تەڕ دەکرد، پێی وترا، بەهەشت و ئاگر باس دەکرێ ناگریت، کەچی لەمەوە دەگریت؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گۆڕ یەکەمین مەنزڵە لە مەنزڵەکانی دواڕۆژ، گەر رزگاری بێت لێی لەدوای ئەوە ئاسانترە لە گۆڕ، گەر رزگاری نەبێت لێی ئەوەی دواترە توندترە لەوە).**

[1] واتە: نوێژ و کاری کەسی دووەم -کە دواتر مرد- لە کوێ و نوێژ و کاری کەسی یەکەم- کە پێشتر مردووە- لە کوێ؟ کەسی دووەم زۆرتر لە ژیاندا ماوەتەوە و زۆرتر نوێژی کردووە و زۆرتر کاری چاکەی ئەنجامداوە-و.

وتی: هەروەها پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ دیمەنێکم نەدیوە ترسناکتر لە گۆڕ).**

**٣٢١٥**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ خَافَ أَدْلَجَ، وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ غَالِيَةٌ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ الْجَنَّةُ).　　[ت٢٤٥٠]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس شەوڕەو دەکات، هەر کەس شەوڕەوی کرد دەگاتە مەنزڵ، دەزانن شمەکی خودا گرانبەهایە، دەزانن شمەکی خودا بریتییە لە بەهەشت).**

## ٢١- دەروازەی: پەیوەستبوون بە تەقوا و محاسەبەی نەفس

**٣٣١٦**– عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اتَّقِ اللهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ).　　[ت١٩٨٧/ مي٢٨٣٣]

* حسن.

لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(لە هەر کوێ بووی لە خودا بترسە، چاکە بەدوای خراپەدا رەوانە بکە دەیسڕێتەوە، بە رەوشتی جوان تێکەڵ بە خەڵکی ببە).**

**٣٣١٧**– عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا، وَتَمَنَّى عَلَى اللهِ).

* ضعيف، قال الترمذي: حسن.　　[ت٢٤٥٩/ جه٤٢٦٠]

---

(١) ئەوانەی لە کاروانیدا کاریان دەکرد شەوڕەویان دەکرد و کاروانییەکەیان بەگەڕ دەخست تا چەند قۆناغێك ببڕن و خۆیان بگەیەننە جێگەی ئەمان، بە ئەزموون دەرکەوتووە رۆیشتنی شەو خێراترە و شەکەتی و ماندووبوونی کەمترە–و.

لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ژیر و دانا کەسێکە سەرەکۆنەی نەفسی خۆی دەکات و کار بۆ دوای مردن دەکات، دەستەوسان کەسێکە نەفسی شوێن ئارەزوو دەخات و ئاوات لەسەر خودا هەڵدەکێشێت).**

## ٢٢- دەروازەی: ئەوانەی کە دەبینرێن یادی خودا دەکرێت (خودا بیردەخەنەوە)

**٣٣١٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قِيْلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ جُلَسَائِنا خَيْرٌ؟ قَالَ: (مَنْ ذَكَّرَكُمْ بِاللهِ رُؤْيَتُهُ، وَزَادَكُمْ فِي عِلْمِكُمْ مَنْطِقُهُ، وَذَكَّرَكُمْ بالآخِرَةِ عِلْمُهُ). [مخ١١/٢٠٩، ٢١٠]

* إسناده حسن.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، کام لە هاومەجلیسەکانمان باشە؟ فەرمووی: **(ئەو کەسەی بینینی خوداتان بیردەخاتەوە، قسەی ئەو زانستان زیاد دەکات، و زانستی ئەو دوارۆژتان بیر دەخاتەوە).**

**٣٣١٩-** وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ﴿...إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ۝﴾ [يونس:٦٢] قال: (يُذْكَرُ اللهُ بِرُؤْيَتِهِمْ).

هەر لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ):﴿...إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ۝﴾ [يونس:٦٢]، فەرمووی: **(خودا بە بینیان بیردەهێنرێتەوە).**

وفي رواية: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ أَوْلِيَاءُ اللهِ؟ قَالَ: (الذينَ إذا رُؤُوا ذُكِرَ اللهُ).

* إسناده حسن. [مخ١٠/١٠٤-١٠٦]

لە ریوایەتێکدا: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، "أولياءُ الله" کێن؟ فەرمووی: **(ئەوانەی گەر ببینرێن خودا بیردەهێنرێتەوە).**

## ٢٣- دەروازەی: تەنگانەی رۆژگار و گەورەیی بەڵا

**٣٣٢٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (**عِظَمُ الجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ الْبَلاَءِ، وَإِنَّ اللهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْماً ابْتَلاَهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ**).

* حسن. [ت٢٣٩٦/ جه٤٠٣١]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(گەورەیی پاداشت لە گەورەیی بەڵاوەیە، گەر خودا گەلێکی خۆشویست بەڵایان تووش دەکات، هەر کەس رازی بوو رازیبوونی بۆ هەیە[1]، هەر کەس ناڕازی بوو خەشمی بۆ هەیە).**

**٣٣٢١-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: (**الأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الأَمْثَلُ فَالأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلْباً اشْتَدَّ بَلاَؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى قَدْرِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلاَءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ وما عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ**). [ت٢٣٩٨/ جه٤٠٢٣/ مي٢٨٢٥]

* حسن صحيح.

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، چ جۆرە خەڵکێك توندترین بەڵایان بۆ هەیە؟ فەرمووی: **(پێغەمبەران، پاشان هاوشێوەی ئەوان و هاوشێوەی ئەوان، پیاو بەپێی دینەکەی تووشی بەڵا دێت، گەر دینەکەی دامەزراو بوو بەڵاکەی توند دەبێتەوە، گەر لە دینەکەیدا نەرمی هەبوو بەپێی بڕی دینەکەی تووش دێت، بەردەوام بەڵا بە بەندەوە دەبێت تا لێیدەگەڕێ بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ گوناهێکی لەسەر نەبێت).**

---

[1] واتە: رازیبوونی خودای بۆ هەیە-و.

## ٢٤- دەروازەی: کەسێك بە خەشم و تووڕەیی خەڵك خودا رازی بکات

**٣٣٢٢-** عَن مُعَاوِيَةَ: أنه كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ: أَنِ اكْتُبِي إِلَيَّ كِتَاباً تُوصِينِي فِيهِ، وَلاَ تُكْثِرِي عَلَيَّ، فَكَتَبَتْ عَائِشَةُ ﷺ إِلَى مُعَاوِيَةَ: سَلاَمٌ عَلَيْكَ أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**مَنِ الْتَمَسَ رِضَا اللهِ بِسَخَطِ النَّاسِ، كَفَاهُ اللهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ. وَمَنِ الْتَمَسَ رِضَا النَّاسِ بِسَخَطِ اللهِ، وَكَلَهُ اللهُ إِلَى النَّاسِ**)، وَالسَّلاَمُ عَلَيْكَ. [ت٢٤١٤]

* صحيح.

لە موعاویەوە: ئەو نووسی بۆ دایکی باوەڕداران، عائیشە(خوا لێی رازی بێت): نوسراوێکم بۆ بنووسە تیایدا ئامۆژگاریم بکە، زۆری مەکە لەسەرم، عائیشە(خوا لێی رازی بێت) بۆی نووسی: سلام علیك، پاشان: من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەر کەس رەزامەندی خودا بە تووڕەیی خەڵك بەدەست بهێنێت خودا شەڕی خەڵکی لێ دەگرێتەوە، هەر کەسیش رەزامەندی خەڵك بە تووڕەبوونی خودا بەدەست بهێنێت خودا دەیداتە دەست خەڵك)**، والسلام علیك.

## ٢٥- دەروازەی: گومانی باش بە خودا

**٣٣٢٣-** عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، فَلْيَظُنَّ بِي مَا شَاءَ**). [حم١٦٠١٦/ مي٢٧٧٣]

* صحيح.

لە "واثلة بن الأسقع"ەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(تبارك وتعالی) فەرمووی: بەپێی گومانی بەندەکەم بە من، با چۆن دەخوازێت بەو جۆرە گومانم پێ ببات[1])**.

---

[1] گەر وا گومان دەبات خودایەکی لێخۆشبوو و بەبەزەییە و لە گوناهانی خۆشدەبێت و کارە چاکەکانی لێ قبووڵ دەکات، خودا بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵ دەکات گەر مافی خەڵکی لەسەر نەبێت-و.

## ٢٦- دەروازەی: دەربارەی لەشساغی و دەستبەتاڵی

**٣٣٢٤-** (خ) عَنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رضـي الله عنهمـا قَـالَ: قَـالَ النَّبِـيُّ صلّـى الله عليـه وسلّم: (**نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ**). [خ٦٤١٢]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(دوو نیعمەت هەن زۆرینەی خەڵك تیایاندا زیانۆمەندن: لەشساغی و دەستبەتاڵی)**.



## بەشی یەکەم

## کۆمەڵێك فەرموودەی کۆکەرەوە

### ١- دەروازەی: ڕەوشتی شیرین و جوان

**٣٣٢٥**- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ). [د٤٧٩٩/ ت٢٠٠٢، ٢٠٠٣]

* صحيح.

**لە ئەبی دەرداوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (هیچ شت لە میزاندا لە جوانی ڕەوشت قورستتر نییە).**

**٣٣٢٦**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ). [د٤٧٩٨]

* صحيح.

**لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (باوەڕدار بە ڕەوشتی جوانی دەگاتە پلەی ڕۆژووانی شەونوێژکەر).**

**٣٣٢٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الْأَخْلَاقِ). [حم٨٩٥٢/ ط١٦٧٧ بلاغاً]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من بۆیە ڕەوانە کراوم ئەخلاق تێر و تەواو بکەم).**

**٣٣٢٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاَقاً إِذَا فَقِهُوا**). [حم١٠٠٢٢]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە ئەبو قاسم(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (باشترینی ئێوە ئەوانەتانن لە هەموان زیاتر رەوشتیان جوانترن گەر تێگەیشتن لە دین بەدەست بهێنن).**

**٣٣٢٩**- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ! أَحْسَنْتَ خَلْقِي، فَأَحْسِنْ خُلُقِي**). [حم٢٤٣٩٢، ٢٥٢٢١]

* حديث صحيح، رجاله رجال الشيخين.

**لە عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (أللهم أحْسَنْتَ خَلْقي فَأحْسِنْ خُلُقي-خودایە خەلقت جوان کردووم ئەخلاقیشم جوان بکە).**

## ٢- دەروازەی: کۆمەڵێك فەرموودەی کۆکەرەوە دەربارەی خێر

**٣٣٣٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ تَعَالَى فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظَلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: إِمامٌ عَدْلٌ، وَشابٌ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللهِ، اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخافُ اللهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمالُهُ ما تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ**). [خ١٤٢٣ (٦٦٠)/ م١٠٣١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (حەوت کەس خودا(تعالى) دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی رۆژێك هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری ئەو: ئیمامێکی دادپەروەر، گەنجێك لە عیبادەتی خودادا پەروەردە بووبێت، پیاوێك دڵی پەیوەست بێت بە عیبادەتەوە، دوو پیاو لەبەر خودا یەکتریان خۆشدەوێت لەسەر ئەوە کۆدەبنەوە و لەسەر ئەوە لەیەکتر جیادەبنەوە، پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن پلە و پایە و جوانی بانگی بکات، ئەویش بڵێ: من لە خودا دەترسم، پیاوێك صەدەقەیەك**

**ئەنجام بدات و بیشارێتەوە تا دەستی چەپی نەزانێت دەستی راستی چی خەرج دەکات، پیاوێك بەتەنها یادی خودا دەکات و چاوەکانی فرمێسك دەبارێنن).**

**٣٣٣١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلاَ يُؤْذِ جارَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ). [خ٦٠١٨ (٥١٨٥)/ م٤٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس ئیمانی بە خودا و رۆژی دوایی هەیە با جیرانەكەی خۆی ئازار نەدات، هەر كەس ئیمانی بە خودا و رۆژی دوایی هەیە با رێز لە میوانەكەی بگرێت، هەر كەس ئیمانی بە خودا و رۆژی دوایی هەیە با خێر بڵێت یان بیدەنگ بێت).**

**٣٣٣٢-** (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (إِيمَانٌ بِاللهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ). قُلْتُ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (أَغْلاَهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا). قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: (تُعِينُ صَانِعاً، أَو تَصْنَعُ لأَخْرَقَ). قَالَ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: (تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُ بِهَا عَلَى نَفْسِكَ). [خ٢٥١٨/ م٨٤]

(ق) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد: چ كارێك باشترینە؟ فەرمووی: **(ئیمان بە خودا و جیهاد لە رێگەی خودا)**، وتم: ئەی چ كۆیلە ئازاد كردنێك باشترینە؟ فەرمووی: **(ئەوەیان نرخەكەی گرانترینە و لای خاوەنەكەی بەنرخترینە)**، وتم: گەر ئەوە نەكەم؟ فەرمووی: **(یارمەتی پیشەكارێك بدە، یان بۆ نەزانێك دروست بكە[1])**، وتی: گەر ئەوە نەكەم؟ فەرمووی: **(خەڵكی لە شەڕ وازلێبهێنە[2]، ئەوە صەدەقەیەكە بەسەر نەفسی خۆتەوە دەیكەی بە صەدەقە).**

---

(١) كەسێك نازانێت شتێك دروست بكات، تۆ بۆی دروست بكە، یان فێری بكە دروستی بكات-و.

(٢) خەڵك لە شەڕی خۆت بپارێزە و خۆت لە شەڕی خەڵك بپارێزە-و.

**٣٣٣٣-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ اللهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاَثاً، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاَثاً؛ فَيَرْضَى لَكُمْ: أَنْ تَعْبُدُوهُ، وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً. وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً، وَلاَ تَفَرَّقُوا. وَيَكْرَهُ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ**). [م١٧١٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خودا لە سێ شتتان رازی دەبێت و سێ شتیش لێتان بە ناپەسەند دەگرێ، لێتان رازی دەبێت: بیپەرستن و شتێك نەكەن بە هاوبەشی، و هەمووتان دەست بگرن بە حەبلی خوداوە، و ناكۆك و جیاواز نەبن، لێتان بە ناپەسەند دەگرێ: وتی وتی، و زۆری پرسیار، و ماڵ و سامان بەفیڕۆدان**).

**٣٣٣٤-** (م) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً، سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ. وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْماً، سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقاً إِلَى الْجَنَّةِ. وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ. وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ**). [م٢٦٩٩]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەر كەس لە باوەڕدارێك تەنگانە و ناخۆشییەك لە تەنگانە و ناخۆشییەكانی دنیا بڕەوێنێتەوە خودا ناخۆشی و تەنگانەیەك لە ناخۆشی و تەنگانەكانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر دەڕەوێنێتەوە، هەر كەس لەسەر دەستتەنگێك[1] ئاسانكاری بكات خودا لە دنیا و دوارۆژ ئاسانكاری لەسەر دەكات، هەر كەس موسڵمانێك داپۆشێت خودا لە دنیا و دوارۆژ دایدەپۆشێت، خودا لە كۆمەكی بەندەدایە تا بەندە لە كۆمەكی براكەیدا بێت، هەر كەس ڕێگەیەك بگرێتەبەر زانستێكی لێوە بەدەست بهێنێت خودا بەوە ڕێگەیەكی[2] بۆ بەهەشت لەسەر ئاسان دەكات، هەر كۆمەڵێك لە ماڵێك لە ماڵەكانی خودا كۆببنەوە، كتێبەكەی خودا**

(١) واتە: هەژارێك-و.

(٢) واتە: دەكەوێتە سەر كار و ڕێگەیەكی خێر تا بەهەشتی لێوە بەدەست دەهێنێت-و.

**بخوێننەوە و لە نێوان خۆیان مودارەسەی بکەن سەکینەت بەسەریاندا دادەبەزێت و رەحمەت دایاندەپۆشێ و فریشتە دەورەیان دەدات و خودا لای ئەوانەی کە لای خۆین باسیان دەکات، هەر کەس کارەکەی دوای بخات رەچەچەڵەکەکەی پێشی ناخات).**

**٣٣٣٥**– (م) وَعَنْهُ أَيْضاً قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: يَا ابْنَ آدَمَ، مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي. قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعالَمِينَ؟! قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلاَناً مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ، لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ؟ يَا ابْنَ آدَمَ، اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي. قَالَ: يَا رَبِّ وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟! قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلاَنٌ، فَلَمْ تُطْعِمْهُ؟ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ، لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي. قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعالَمِينَ؟! قَالَ: اسْتَسْقَاكَ عَبْدِي فُلاَنٌ، فَلَمْ تَسْقِهِ، أَمَا إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ، وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي). [م٢٥٦٩]

**(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە رۆژی قیامەت خودا(عز وجل) دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد، نەخۆشکەوتم و سەردانت نەکردم، دەڵێت: ئەی پەروەردگار، چۆن لە نەخۆشی سەردانت بکەم، تۆ پەروەردگاری جیهانانی؟! فەرمووی: نەتزانی فلان بەندەم نەخۆش بوو سەردانت نەکرد، نەتزانی گەر سەردانت بکردبایە منت لای ئەو دەبینییەوە؟**

**ئەی ئادەمیزاد، داوای خواردنم لێکردنی خواردنت پێ نەدام، دەڵێت: ئەی پەروەردگار، چۆن خواردنت پێ بدەم تۆ پەروەردگاری جیهانانی؟! فەرمووی: نەتزانی فلان بەندەم داوای خواردنی لێ کردی خواردنت پێ نەدا؟ نەتزانی گەر خواردنت پێ بدابا ئەوەت لای من دەبینییەوە؟**

**ئەی ئادەمیزاد، داوای خواردنەوەم لێکردی خواردنەوەت پێ نەدام، دەڵێت: ئەی پەروەردگار، چۆن خواردنەوەت پێ بدەم و تۆ پەروەردگاری جیهانانی؟! فەرمووی: فلان بەندەم داوای خواردنەوەی لێکردی خواردنەوەت پێ نەدا[1]، گەر خواردنەوەت پێ بدابا ئەوەت لای من دەبینییەوە).**

---

[1] واتە: ترازوو پڕ دەکات–و.

**٣٣٣٦**– (م) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلآنِ . أَوْ تَمْلأُ . مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا**). [م٢٢٣]

(م) لە ئەبی مالیكی ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە، "الحمد لله"ش ترازوو پڕ دەكات، "سبحان الله والحمد لله" هەردووكیان پڕ دەكات–یان نێوان ئاسمانەكان و زەوی پڕ دەكات، نوێژ نوورە، صەدەقە بورهانە، ئارامگرتنیش روناكییە، و قورئان بەڵگەیە بۆت یان بەڵگەیە لەسەرت، هەموو خەڵك رۆژیان لێ دەبێتەوە و نەفسی خۆیان دەفرۆشن، رزگاری دەكەن یان تیایدەبەن**[1]).

**٣٣٣٧**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللهُ عَبْداً بِعَفْوٍ إِلا عِزّاً، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ للهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ**). [م٢٥٨٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (**صەدەقە لە ماڵ و سامانێك كەم ناكات، خودا بە لێبوردنی بەندەیەك عیززەتی زیاد دەكات، هەر كەس بۆ خودا تەوازوع بنوێنێ خودا بەرزی دەكاتەوە**).

**٣٣٣٨**– عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُكَ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلاَلِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَبَصَرُكَ لِلرَّجُلِ الرَّدِيءِ الْبَصَرِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الْحَجَرَ وَالشَّوْكَةَ وَالْعَظْمَ عَنِ الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ**). [ت١٩٥٦]

* صحيح.

لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**خەندە و بزەت بە رووی براكەتەوە بۆ تۆ صەدەقەیە، فەرمان بە چاكە و نەهی لە خراپەت بۆ تۆ صەدەقەیە،**

---

[1] گەر نەفسی خۆیان بە خودا بفرۆشن رزگاری دەكەن، گەر بە دنیای بفرۆشن تیایدەبەن–و.

**ڕێنموونیت بۆ پیاوێك لە زەوی بزربوون[1] بۆ تۆ صەدەقەیە، ڕێگە ڕۆشنکردنەوەت بۆ پیاوێکی نابینا بۆ تۆ صەدەقەیە، لادانی بەرد و دڕك و ئێسك لەسەر ڕێگە بۆ تۆ صەدەقەیە، خاڵیکردنەوەی ئاوی دۆڵچەکەت بۆ دۆڵچەی براکەوت بۆ تۆ صەدەقەیە[2]).**

**٣٣٣٩**– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا أَبَا هُرَيْرَةَ! كُنْ وَرِعاً تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَكُنْ قَنِعاً تَكُنْ أَشْكَرَ النَّاسِ، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُؤْمِناً، وَأَحْسِنْ جِوَارَ مَنْ جَاوَرَكَ تَكُنْ مُسْلِماً، وَأَقِلَّ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ).

* صحيح. [جه٤٢١٧]

[وانظر في الإمساك عن الشر: **١٧٦٠، ٣٣٣٢**].

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئەبو هورەیرە، واریع بە دەبی بە عابیدترینی خەڵك، قانع بە دەبی بە شاکیرترینی خەڵك، ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە بۆ خەڵك پێتخۆش بێت دەبیت بە ئیماندار، بە باشی جیرانی ئەو کەسە بکە جیرانیت دەکات دەبیت بە موسڵمان، پێکەنین کەم بکەرەوە، چونکە پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێت).**

## ٣- دەروازەی: دەربارەی گوناهە گەورەکان و تیابەرەکان

**٣٣٤٠**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَاتِ)، قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَما هُنَّ؟ قَالَ: (الشِّرْكُ بِاللهِ، والسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبا، وَأَكْلُ مالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاَتِ). [خ٢٧٦٦/ م٨٩]

---

(١) کەسێك ڕێگەی لێ تێکچووبێت و وێڵ بووبێت–و.

(٢) واتە: تۆ بە دۆڵچە ئاوت لە بیرەکە هەڵگۆزیوە و دەیدەی بە براکەت و جارێکی بۆ خۆت ئاو هەڵدەگۆزییەوە–و.

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لە حەوت تیابەر دوورەپەرێز بن)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە کامانەن؟ فەرمووی: **(شەریك دانان بۆ خودا، وسیحر، وکوشتنی نەفسێك خودا حەرامی کردووە مەگەر بە حەق، وخواردنی سوو، و خواردنی ماڵی منداڵی بێباب، و پشتهەڵکردن لە رۆژی رووبەڕووبوونەوە، و تۆمەتبار کردنی پاکداوێنانی باوەڕداری بێئاگا)**.

**٣٣٤١**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ؟ قَالَ: **(أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ)**. قُلْتُ: إِنَّ ذلِكَ لَعَظِيمٌ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: **(وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ)**. قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: **(أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جارِكَ)**.
[خ٤٤٧٧/ م٨٦]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد چ گوناهێك لای خودا گەورەترینە؟ فەرمووی: **(دژ بۆ خودا دابنێی و ئەو دروستی کردوویت)**، وتم: ئەوە زۆر مەزنە، وتم: پاشان چیتر؟ فەرمووی: **(منداڵەکەت بکوژی بترسی لەوەی لەگەڵت بخوات)**، وتم: پاشان چیتر؟ فەرمووی: **(زینا بکەی لەگەڵ حەلاڵی جیرانەکەت)**.

- زاد في رواية لهما: فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل تَصْدِيقَهَا: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ﴾ الآية [الفرقان:٦٨].
[خ٤٧٦١]

لە ریوایەتێکی هەردووکیان ئەمە زیاد بووە: خودا(عزوجل) تەصدیقی ئەوەی دابەزاند: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ﴾ [الفرقان:٦٨].

**٣٣٤٢**- (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ)**. ثَلاَثاً، قالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: **(الإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ . وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئاً، فَقَالَ: . أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ)**. قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ. [خ٢٦٥٤/ م٨٧]

(ق) لـە "أبـي بكـرة"ەوە(خـوا لێـی ڕازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: **(دەتانەوێ هەواڵتان پێ بدەم بە گەورەترین گوناهی گەورە)؟**، سێ جار، وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(هاوەڵدانان بۆ خودا، و خراپی لەگەڵ دایك و باوك**-ئەو شـانیدادابوو و بەرزیوویـەوە و دانیشـت و فـەرمووی:- **هـەروەها ئاگـادار بـن لـە "قـول الزور[1]")**، وتی: بەردەوام دووبارەی دەكردەوە، تا وتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو[2].

**٣٣٤٣**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَقْتُلُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ)**.

قَالَ عِكْرِمَةُ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: كَيْفَ يُنْزَعُ الإِيمَانُ مِنْهُ؟ قَالَ: هكَذَا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ أَخْرَجَهَا، فَإِنْ تَابَ عَادَ إِلَيْهِ هكَذا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. [خ٦٨٠٩ (٦٧٨٢)]

(خ) لـە ئـیبن عەباسـەوە(خوایان لـێ ڕازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەندە زینا ناكات كاتێ زینا دەكات و ئەو باوەڕدار بێت، دزی ناكات كاتێ دزی دەكات و ئەو باوەڕدار بێت، عارەق ناخواتەوە كاتێ دەخواتەوە و ئەو باوەڕدار بێت، ناكوژێت و ئەوباوەڕدار بێت)**.

عیكریمە وتی: وتم بە ئیبن عەباس: چۆن ئیمانی لێ دادەڕنرێت؟ وتی: بەم جۆرە، پەنجـەكانی لێكهـەڵپێكا و پاشـان جیایكردنـەوە، گـەر تەوبـەی كـرد بـەم جـۆرە دەگەڕێتەوە بۆ لای، پەنجەكانی هەڵپێكایەوە.

---

(1) شایەتی و قسەی درۆ-و.

(2) ئەو قسە مانای وەڕسبوون ناگەیەنێت، چونكە وەڕسبوون لە قسەی خوا و پێغەمبـەر(ﷺ) ئیمـان دەخاتـە بـەر مەترسـی، بـەڵكو ئـەوە لـەو ڕووەوەیـە لـە فەرموودەكـەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ترس و تۆقینیان لەو تاوانە گەورەیە بۆ دروسـتبووە، وتویانـە خۆزگـە پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ دەبوو و هەندێك ترس و تۆقینمان دەڕەوییەوە-و.

**٣٣٤٤-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ. قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ. وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ**). [م١٠٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سیان لە ڕۆژی قیامەت خودا قسەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە-ئەبو موعاویە وتی: خودا تەماشایان ناکات- و سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە: پیرێکی زیناکەر، و مەلیکێکی درۆزن، و هەژارێکی لوتبەرز).**

**٣٣٤٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنَّانٌ، وَلاَ عَاقٌّ، وَلاَ مُدْمِنُ خَمْرٍ**). [ن٥٦٨٨/ مي٢١٣٨]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(زۆر مننەتکەر[1]، خراپەکار لەگەڵ دایك و باوك، و ئالوودەبووی عارەق، ناچنە بەهەشتەوە).**



[1] کە شتێك دەبەخشێت بچووك یان گەورە مننەت بەسەر خەڵك و خودادا دەکات-و.

# بەشی دووەم

## فەزیلەتەکان و ئەخلاق و ئاداب

### ١- دەروازەی: فەزڵی خۆشەویستی لەپێناو خودا (تعالی)

٣٣٤٦- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي). [م٢٥٦٦]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا لە ڕۆژی قیامەت دەفەرموێت: ئەوانە لە کوێن بە شکۆمەندی من یەکتریان خۆشدەویست؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەرم، ڕۆژێك هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری من).**

٣٣٤٧- (م) وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى. فَأَرْصَدَ اللهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكاً، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَخاً لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ، قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا؟ قَالَ: لاَ، غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللهِ عزّ وجل. قَالَ: فَإِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكَ، بِأَنَّ اللهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ). [م٢٥٦٧]

**(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): (پیاوێك لە ئاوادانییەکی تر[١] سەردانی برایەکی خۆی کرد، خودا لەسەر ڕێگەکەی فریشتەیەکی بۆ خستە شکارەوە، کاتێ گەیشتە فریشتەکە پێی وت[٢]: بۆ کوێ دەچی؟ وتی: دەچم بۆ لای برایەکم لەو ئاوەدانییە، پێی وت: ئایا نیعمەتێکت لەسەریەتی بتەوێ چاك و تەواوی بکەی، وتی: نەخێر، جگە لەوەی من لەبەر خودا(عز وجل) خۆشمدەوێت، فریشەکە پێی وت: من نێراوی خودام بۆ لای تۆ، خودا تۆی خۆشدەوێت وەك چۆن تۆ لەبەر خودا ئەوت خۆشدەوێت).**

---

[١] واتە: گوندێکی تر-و.

[٢] واتە: فریشتەکە لێی پرسی و پێی وت-و.

**٣٣٤٨**- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ لَأُنَاساً مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلاَ شُهَدَاءَ، يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللهِ تَعَالَى)**، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ؟ قَالَ: **(هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللهِ، عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ، وَلاَ أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا. فَوَاللهِ! إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ، وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ، لاَ يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ، وَلاَ يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ)** وَقَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [يونس: ٦٢]. [د٣٥٢٧]

* صحيح.

له عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(له بەندەکانی خودا کەسانێك هەن پێغەمبەر و شەهید نین، پێغەمبەران و شەهیدان له ڕۆژی قیامەت بە شوێن و جێیان لای خودا(تعالى) ئاوات دەخوازن)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵمان پێ بدە، ئەوانە کێن؟ فەرمووی: **(ئەوانە کۆمەڵێکن بە ڕۆحی خودا یەکتریان خۆشویست، بەبێ ئەوەی خزمایەتی لە نێوانیان بێت و ماڵ و سامان ئاڵوگۆڕ بکەن، سوێند بە خودا، روخساری ئەوانە لە نوورە، ئەوانە لەسەر نوورن، کاتێ خەڵك دەترسن ئەوان ناترسن، کاتێ خەڵك دڵتەنگ دەبن ئەوان دڵتەنگ نابن)**، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[يونس: ٦٢].

**٣٣٤٩**- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ؛ فَقَدْ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ)**. [د٤٦٨١]

* صحيح.

له ئەبی ئومامەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لەبەر خودا خۆشیبوێ و لەبەر خودا ڕقی لێ بێ، و لەبەر خودا ببەخشێ، و لەبەر خودا بگرێتەوە، هەوڵی کامڵ کردنی ئیمانی خۆی داوە)**.

## ٢- دەروازەی: گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست لای بەندەکانی خۆشەویستی دەکات

٣٣٥٠- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**إِذَا أَحَبَّ اللهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاَناً؛ فَأَحْبِبْهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاَناً؛ فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الأَرْضِ**). [خ٣٢٠٩/ م٢٦٣٧]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر خودا بەندەیەکی خۆشویست بانگ لە جیبریل دەکات: خودا فڵانی خۆشدەوێت تۆش خۆشتبوێ، بۆیە جیبریلیش خۆشیدەوێ، جیبریل بانگ بە ئەهلی ئاسماندا دەدێرێ: خودا فڵانی خۆشدەوێ ئێوەش خۆشتانبوێ، ئەهلی ئاسمانیش خۆشیاندەوێ، پاشان قبووڵی لە زەوی بۆ دادەنرێ).**

- زاد مسلم في روايته: (**وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْداً دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ: إِنِّي أُبْغِضُ فُلاَناً؛ فَأَبْغِضْهُ. قَالَ: فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ. ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللهَ يُبْغِضُ فُلاَناً؛ فَأَبْغِضُوهُ. قَالَ: فَيُبْغِضُونَهُ. ثُمَّ توضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الأَرْضِ**).

موسلیم لە ریوایەتەکەیدا ئەمەی زیاد کردووە: **(گەر خودا رقی لە بەندەیەك بێت جیبریل بانگ دەکات و دەفەرموێت: من رقم لە فڵانە، تۆش رقت لێی بێت، بۆیە جیبریلیش رقی لێ دەبێت، پاشان بانگ بە ئەهلی ئاسماندا دەدێرێ: خودا رقی لە فڵانە، ئێوەش رقتان لێی بێت، فەرمووی: ئەوانیش رقیان لێ دەبێت، پاشان رقلێبوونەوەی لە زەوی بۆ دادەنرێ).**

## ٣- دەروازەی: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە خۆشیدەوێت

٣٣٥١- (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ السَّاعَةِ، فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: (**وَمَاذَا أَعْدَدْتَ لَهَا**)؟ قالَ: لاَ شَيْءَ، إِلاَّ أَنِي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: (**أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ**).

قالَ أَنَسٌ: فَمَا فَرِحْنَا بِشَيْءٍ فَرَحَنَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)**. قالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أُحِبُّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ بِحُبِّي إِيَّاهُمْ، وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِمِثْلِ أَعْمَالِهِمْ. [خ٣٦٨٨/ م٢٦٣٩]

**(ق) له ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت): پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد دەربارەی قیامەت و وتی: كەی قیامەتە؟ فەرمووی: (چیت بۆ ئامادە كردووە؟)، وتی: هیچ شت، جگە لەوەی من خودا و پێغەمبەری خودام(ﷺ) خۆشدەوێت، فەرمووی: (تۆ لەگەڵ ئەو كەسەی خۆشتویستووە).**

**ئەنەس وتی: بە شتێك دڵخۆش نەبووین وەك دڵخۆشبوونمان بەو قسەی پێغەمبەر(ﷺ): (تۆ لەگەڵ ئەو كەسەی خۆشتویستووە)، ئەنەس دەڵێت: من پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەكر و عومەرم خۆشدەوێت، رجام وایە لەگەڵ ئەوان بم بەو خۆشەویستییەم بۆ ئەوان، با بە نموونەی كاری ئەوان كاریشم ئەنجام نەدابێت.**

- وفي رواية لهما: قالَ: بَيْنَمَا أَنَا والنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم خَارِجَانِ مِنَ المسْجِدِ، فَلَقِيَنَا رَجُلٌ عِنْدَ سُدَّةِ المسْجِدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَا أَعْدَدْتَ لَهَا)**؟ فَكَأَنَّ الرَّجُلَ اسْتَكَانَ، ثُمَّ قالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ما أَعْدَدْتُ لَهَا كَبِيرَ صِيَامٍ وَلاَ صَلاَةٍ وَلاَ صَدَقَةٍ، وَلكِنِّي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ: **(أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)**. [خ٧١٥٣]

**لە ریوایەتێكی هەردووكیان: ئەنەس وتی: كاتێ من و پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوت چووبووینە دەرەوە لای دەرگای مزگەوتەكە بە پیاوێك گەیشتین، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، قیامەت كەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چیت بۆ ئامادە كردووە؟)، پیاوەكە تەوازوعی نیشان دا و پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، رۆژوو و نوێژ و صەدەقەی گەورەم بۆ ئامادە نەكردووە، بەڵام خودا و پێغەمبەرم خۆشدەوێت، فەرمووی: (تۆ لەگەڵ ئەو كەسەی خۆشتویستووە).**

## ٤- دەروازەی: تەفسیری "البِرّ والإِثْم"

**٣٣٥٢-** (م) عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟ فَقَالَ: (**الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ. وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ**). [م٢٥٥٣]

(م) لە نەواسی کوڕی سەمعانی ئەنصارییەوە، وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد دەربارەی "البِرّ و الإثم"؟ فەرمووی: (**"البِرّ" بریتییە لە جوانی و باشی رەوشت، "الإِثْم"یش ئەوەیە سینەت دەتۆسێنێتەوە و لات ناپەسەندە خەڵکی پێی بزانن**).

## ٥- دەروازەی: دانیشتن لەگەڵ صالحان

**٣٣٥٣-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**مَثَلُ الجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ، كَحَامِلِ المِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ: إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحاً طَيِّبَةً. وَنَافِخُ الْكِيرِ: إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحاً خَبِيثَةً**). [خ٥٥٣٤ (٢١٠١)/ م٢٦٢٨]

(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نموونەی هاوەجلیسی چاك و خراپ وەك هەڵگری میسك و کوورەدەمێن وایە، هەڵگری میسك یان میسکت پێدەدات یان لێی دەکڕی، یاخود بۆنی خۆشی لێوە دەکەی، کورەدەمێن: یان پۆشاکەکەت دەسوتێنێ، یان بۆنی ناخۆشی لێوە دەکەی)**.

## ٦- دەروازەی: باشی و پەسەندی رووخۆشی

**٣٣٥٤-** (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ**). [م٢٦٢٦]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: **(هیچ شتێك لە چاکە کەمبایەخ تەماشا مەکە، با گەیشتنیش بێت بە براکەت بە رووی خۆشەوە)**.

## ٧- دەروازەی: هەڵکردن لەگەڵ خەڵك و نەرم و نیانی لەگەڵ بچووك

**٣٣٥٥-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ فَقَالَ: **(ائْذَنُوا لَهُ، فَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ، أَوْ بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ)**. فَلَمَّا دَخَلَ أَلَانَ لَهُ الْكَلَامَ، فَقُلْتُ لَه: يَا رَسُولَ اللهِ، قُلْتَ ما قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ فِي الْقَوْلِ؟! فَقَالَ: **(أَيْ عائِشَةُ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللهِ مَنْ تَرَكَهُ ـ أَوْ وَدَعَهُ ـ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ)**. [خ٦١٣١ (٦٠٣٢)/ م٢٥٩١]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پیاوێك داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، فەرمووی: **(مۆڵەتی بدەن، خراپترین ڕۆڵەی عەشرەت، یان خراپترین برای عەشرەت[1])**، کاتێ هاتە ژوورەوە قسەی نەرم و نیانی لەگەڵ کرد، پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەی وتت وتت، پاشان قسەی نەرم و نیانت لەگەڵ کرد؟! فەرمووی: **(ئەی عائیشە، خراپترینی خەڵك لە ڕووی مەنزیلەتەوە لای خودا کەسێکە لە ترسی زمانشڕی و خراپییەکەی خەڵك وازیلێدەهێنن یان لەگەڵی نەرمونیان دەبن)**.

**٣٣٥٦-** (ق) وَعَنْهَا ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَكَانَ لِي صَوَاحِبُ يَلْعَبْنَ مَعِي، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا دَخَلَ يَتَقَمَّعْنَ مِنْهُ، فَيُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ فَيَلْعَبْنَ مَعِي. [خ٦١٣٠/ م٢٤٤٠]

**(ق) هەر لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: لای پێغەمبەر(ﷺ) یاریم بە کچۆڵە دەکرد، هاوڕێم هەبوو یاریان لەگەڵ دەکردم، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتە ژوورەوە خۆیان لێی دەشاردەوە، دەینارد لە دوویان و یاریان لەگەڵ دەکردم.**

- وفي رواية لمسلم: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ فِي بَيْتِهِ، وَهُنَّ اللُّعَبُ.

**لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا: لە ماڵەکەی یاریم بە کچۆڵە دەکرد، ئەوانەش بووکەڵە بوون.**

---

[1] واتە: خراپترین کەسی ئەو عەشرەتە-و.

**٣٣٥٧**- (ق) عَنْ أَنَسٍ قالَ: كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقاً، وَكانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ ـ قالَ: أَحْسِبُهُ ـ فَطِيمٌ، وَكَانَ إِذَا جَاءَ قالَ: (**يَا أَبَا عُمَيْرٍ، ما فَعَلَ النُّغَيْرُ**)؟. نُغَرٌ كانَ يَلْعَبُ بِهِ، فَرُبَّمَا حَضَرَ الصَّلاةَ وَهُوَ في بَيْتِنَا، فَيَأْمُرُ بِالْبِسَاطِ الَّذِي تَحْتَهُ فَيُكْنَسُ وَيُنْضَحُ، ثُمَّ يَقُومُ وَنَقُومُ خَلْفَهُ، فَيُصَلِّي بِنَا. [خ٦٢٠٣ (٦١٢٩)/ م٢١٥٠]

**(ق) لە ئەنەسەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو خەڵك رەوشتی جوانتر بوو، برایەکم هەبوو پێیدەوترا: ئەبو عومەیر–وابزانم لە شیر بڕابوویەوە– ئەو گەر بهاتبایە دەیفەرموو: ("يا أبا عُمَير ما فعل النُّغَير–ئەبو عومەیر نوغەیر چی کرد"؟)، نوغەیر باڵندەیەکی خورماخۆرە بوو عومەیر یاری پێ دەکرد، لەوانەیە نوێژ بهاتبایەتە بەرەوە و ئەو هێشتا لە ماڵمان بوو، فەرمانی دەکرد بەو راخەرەی لە ژێریدا بوو پاکدەکرایەوە و ئاوی لێ دەپرژا، پاشان هەڵدەستا و ئێمەش لەدوایەوە دەوەستاین و نوێژی پێ دەکردین.**

## ٨- دەروازەی: رێزگرتن لە گەورە و پێشخستنی

**٣٣٥٨**- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَذَبَنِي رَجُلاَنِ، أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الأَكْبَرِ**). [م٢٢٧١ و٣٠٠٣/ خ معلّقاً ٢٤٦]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە خەوندا پێم نیشاندرا بە سیواکێك سیواکم دەکرد، دوو پیاو هاتن بۆ لام، یەکێکیان گەورەتر بوو لەویتریان، سیواکەکەم دا بە پیاوە کەم تەمەنەکەیان، پێم وترا: گەورە پێشبخە، بۆیە سیواکەکەم دا بە گەورەکە).**

**٣٣٥٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا، فَلَيْسَ مِنَّا**). [د٤٩٤٣/ ت١٩٢٠]

* صحيح.

لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس بەزەیی نەكات بە بچووكەكانمان و مافی گەورەكانمان نەزانێت لە ئێمە نییە).**

## ٩- دەروازەی: فەزڵی ئاسانكاری و داپۆشین

**٣٣٦٠**- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قالَ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَسَكِّنُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا). [خ٦١٢٥ (٦٩)/ م١٧٣٤]

(ق) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئاسانكاری بكەن و سەختگیری مەكەن، مژدەدەر بن و خەڵكڕەوێن مەبن).**

**٣٣٦١**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَسْتُرُ اللهُ عَلَى عَبْدٍ فِي الدُّنْيَا؛ إِلاَّ سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [م٢٥٩٠]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا لە دنیا بەندەیەك داپۆشێ لە ڕۆژی قیامەت دایدەپۆشێ).**

**٣٣٦٢**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، كَشَفَ اللهُ عَوْرَتَهُ، حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ). [جه٢٥٤٦]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس عەورەتی برا موسڵمانەكەی داپۆشێت خودا لە ڕۆژی قیامەت عەورەتی دادەپۆشێت، هەر كەس عەورەتی برا موسڵمانەكەی دەربخات خودا عەورەتی دەردەخات تا لە ماڵەكەی بەوە رسوای دەكات).**

## ١٠- دەروازەی: نەهی لە بێهیوابوون لە بەزەیی خودا (سبحانه وتعالی)

**٣٣٦٣-** (م) عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الجَبَلِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدَّثَ: (أَنَّ رَجُلاً قَالَ: وَاللهِ لاَ يَغْفِرُ اللهُ لِفُلاَنٍ. وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنْ لاَ أَغْفِرَ لِفُلاَنٍ، فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ، وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ)، أَوْ كَمَا قَالَ. [م٢٦٢١]

(م) لە جوندەبی كوڕی عەبدوڵای جەبەلییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی ئەوەی كرد: **(پیاوێك وتی: سوێند بە خودا، خودا لە فڵان خۆشنابێت، خوداش(تعالی) فەرمووی: كێیە ئەو كەسەی سوێند دەخوات لەسەر من لە فڵان خۆشنابم، ئەوا من لە فڵان خۆشبووم و كارەكانی تۆم پووچ كردەوە)**، یان بەو جۆرەی فەرمووی.

## ١١- دەروازەی: نەهی كردن لە چپەكردنی دوان بەبێ سێیەمیان

**٣٣٦٤-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً، فَلاَ يَتَنَاجى رَجُلاَنِ دُونَ الآخَرِ، حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، أَجْلَ أَنَّ ذلك يُحْزِنُهُ).

[خ٦٢٩٠/ م٢١٨٤]

(ق) لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر سیان بوون با دوو پیاوتان بەبێ ئەویتر چپە نەكەن، تا تێكەڵ بە خەڵكی دەبن، چونكە ئەوە دڵتەنگی دەكات[1])**.

## ١٢- دەروازەی: پیاو لە شوێنی دانیشتنی خۆی بەرزنابێتەوە

**٣٣٦٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ). [خ٦٢٦٩ (٩١١)/ م٢١٧٧]

---

[1] واتە: كاتێ دوانەكە چپە دەكەن كەسی سێیەم دڵتەنگ دەكات-و.

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خن)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێك پیاوێكی تر لە شوێنی دانیشتنەكەی هەڵناسێنێت و پاشان تیایدا دابنیشێت).**

**٣٣٦٦**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ قَامَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ). [م٢١٧٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر كەس لە مەجلیسەكەی هەستا و پاشان گەڕایەوە بۆ جێگەكەی خۆی ئەو لەپێشترە پێی).**

## ١٣- دەروازەی: ئەدەب لە پژمین و باوێشك

**٣٢٦٧**– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الحَمْدُ للهِ، وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، فَإِذَا قالَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، فَلْيَقُلْ: يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ). [خ٦٢٢٤]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەكێك لە ئێوە پژمی با بڵێت: "الحمد لله" با براكەی یان هاوەڵەكەی پێی بڵێ: "يَرْحَمُكَ الله"، گەر ئەو پێیوت "يرحمك الله" با ئەویش بڵێت: "يَهْدِيكُمُ اللهُ ويُصْلِحُ بالَكُم").**

**٣٣٦٨**– (م) عَنْ أَبِي موسى قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَحَمِدَ اللهَ فَشَمِّتُوهُ. فَإِنْ لَمْ يَحْمَدِ اللهَ، فَلاَ تُشَمِّتُوهُ). [م٢٩٩٢]

(م) لە ئەبی موساوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر یەكێك لە ئێوە پژمی و حەمدی خودای كرد، ئێوەش ڕەحمەتی بۆ بنێرن، گەر حەمدی نەكرد بۆی مەنێرن).**

**٣٣٦٩**– (م) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، وَعطَسَ رَجُلٌ عِنْدَهُ فَقَالَ لَهُ: (يَرْحَمُكَ اللهُ)، ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الرَّجُلُ مَزْكُومٌ). [م٢٩٩٣]

(م) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پیاوێك لە لای پژمی، پێی فەرموو: (**يَرْحَمُكَ الله**)، پاشان جارێکی تر پژمی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووی: (**ئەم پیاوە هەڵامەتی هەیە**).

▪ ولفظ ابن ماجه: (**يُشَمَّتُ الْعَاطِسُ ثَلاَثاً، فَمَا زَادَ فَهُوَ مَزْكُومٌ**). [جه٣٧١٤]

لەفزەکەی ئیبن ماجە: (**سێ جار ڕەحمەت بۆ کەسی پژمیو ڕەوانە دەکرێت، گەر لەوە زیاتر بوو ئەو هەڵامەتدارە**).

**٣٣٧٠**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**التَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ ما اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قالَ: هَا، ضَحِكَ الشَّيْطَانُ**).
[خ٣٢٨٩/ م٢٩٩٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**باوێشك لە شەیتانەوەیە، گەر یەکێك لە ئێوە باوێشکی هەبوو چەند دەتوانی با بەرپەرچی بداتەوە[1]، گەر یەکێك لە ئێوە وتی "هها" شەیتان پێدەکەنێت**).

**٣٣٧١**- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَى فِيهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ**). [م٢٩٩٥]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**گەر یەکێك لە ئێوە باوێشکیدا با بە دەست دەمی بگرێت، چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوە**).

## ١٤- دەروازەی: ئەدەبی ڕێگە لە دانیشتن و شتی تر

**٣٣٧٢**- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِيَّاكُمْ وَالجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقاتِ**)، فَقَالُوا: ما لَنَا بُدٌّ، إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا، قَالَ: (**فَإِذَا أَبَيْتُمْ**

---

[1] واتە: با باوێشکەکەی بخواتەوە-و.

الاَّ الْمَجَالِسَ، فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا). قالُوا: وَما حَقُّ الطَّرِيقِ؟ قَالَ: (غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الأَذَى، وَرَدُّ السَّلَامِ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ). [خ٢٤٦٥/ م٢١٢١]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگادارتان دەكەمەوە لە دانیشتن لەسەر رێگاوبانەكان)**، وتیان: چارەیەكمان نییە، ئەوانە شوێنی دانیشتنی ئێمەن و تیایاندا قسە و گفتوگۆ دەكەین، فەرمووی: **(گەر هەر دەتانەوێ بیانكەنە شوێنی دانیشتن مافی رێگە بدەن)**، وتیان: مافی رێگە چییە؟ فەرمووی: **(چاو داخستن، و ئازارگرتنەوە لە خەڵك، و وەڵامدانەوەی سەلام، و فەرمان بە چاكە و نەهی لە خراپە)**.

**٣٣٧٣**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ). [خ٦٥٢/ م١٩١٤م]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (پیاوێك بە رێگەیەكدا دەڕۆیشت چڵە دارێكی دڕكاوی بینی لایدا، خودا شوكری كرد و لێیخۆش بوو)**.

**٣٣٧٤**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَسْجِدِنَا، أَوْ فِي سُوقِنَا، وَمَعَهُ نَبْلٌ؛ فَلْيُمْسِكْ عَلَى نِصَالِهَا . أَوْ قَالَ: فَلْيَقْبِضْ بِكَفِّهِ . أَنْ يُصِيبَ أَحَداً مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِنْهَا بِشَيْءٍ). [خ٧٠٧٥ (٤٥٢)/ م٢٦١٥]

**(ق) لە ئەبی موساوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەكێك لە ئێوە بەم مزگەوتماندا یان بە بازاڕماندا تێپەڕی و رمێكی پێ بوو با نووكەكەی بگرێت-یان فەرمووی: با بە بەری دەستی بیگرێت- نەبادا لەوەوە یەكێك لە موسڵمانان بە شتێك تووش بكات[١])**.

**٣٣٧٥**- (م) عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، عَلِّمْنِي شَيْئاً أَنْتَفِعُ بِهِ؟ قَالَ: (اعْزِلِ الأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ). [م٢٦١٨]

---

(١) واتە: دەست بخاتە سەر نووكە تیژەكەی یان شۆڕی بكاتەوە بۆ زەوی نەبادا لەناو مزگەوت و لە بازاڕدا ببێتە هۆی بریندار كردنی خەڵك-و.

(م) لە ئەبی بەرزەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، شتێكم فێر بكە سوودی لێ ببینم؟ فەرمووی: **(ئازاربەخش لە ڕێگەی موسڵمانان لابدە).**

## ١٥- دەروازەی: نەهیكردن لە كێشان بە روخساردا و راكێشانی چەك

**٣٣٧٦**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا قاتَلَ أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ). [خ٢٥٥٩/ م٢٦١٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەكێك لە ئێوە جەنگا با لە روخسار دووربكەوێتەوە).**

**٣٣٧٧**– (ق) وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ، فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ).

[خ٧٠٧٢/ م٢٦١٧]

(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(یەكێك لە ئێوە لە براكەی چەك رانەكێشێت، ئەو نازانێت لەوانەیە شەیتان لە دەستی بترازێنێ و بكەوێتە ناو چاڵێك لە ئاگرەوە).**

**٣٣٧٨**– عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى أَنْ يُتَعَاطَى السَّيْفُ مَسْلُولاً.
* صحيح. [د٢٥٨٨/ ت٢١٦٣]

لە جابرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی كرد شمشێر بە راكێشراوی دەستاودەست بكرێت.

## ١٦- دەروازەی: هەڕەشەی توند لەو كەسەی سزا و ئازاری خەڵك دەدات

**٣٣٧٩**– (م) عَنْ هِشَامِ بْنِ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: مَرَّ بِالشَّامِ عَلَى أُنَاسٍ، وَقَدْ أُقِيمُوا فِي الشَّمْسِ، وَصُبَّ عَلَى رُؤُوسِهِمُ الزَّيْتُ. فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قِيلَ: يُعَذَّبُونَ فِي الْخَرَاجِ. فَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ فِي الدُّنْيَا). [م٢٦١٣]

**(م) لە هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزامەوە، وتی: لە شام بەسەر خەڵکانێکدا تێپەڕی لەبەر خۆر ڕاگیرابوون و زەیت بەسەر سەریاندا ڕژێنرا بوو، وتی: ئەمە چییە؟ وترا: لەسەر خەراج سزا دەدرێن، هیشام وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (خودا سزای ئەوانە دەدات لە دنیا سزا دەدەن[1]).**

- وفي رواية: قَالَ: وَأَمِيرُهُمْ يَوْمَئِذٍ عُمَيْرُ بْنُ سَعْدٍ عَلَى فِلَسْطِينَ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ فَحَدَّثَهُ، فَأَمَرَ بِهِمْ؛ فَخُلُّوا.

**لە ڕیوایەتێکدا: وتی: لەو ڕۆژگارەدا ئەمیرەکەیان عومەیری کوڕی سەعد بوو لەسەر فەلەستین، ڕۆیشتە ژوورەوە و قسەی لەگەڵ کرد و فەرمانی کرد ڕێگەیان بدەن بڕۆن.**

**٣٣٨٠-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(يُوشِكُ إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ، أَنْ تَرَى قَوْماً فِي أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ، يَغْدُونَ فِي غَضَبِ اللهِ، وَيَرُوحُونَ فِي سَخَطِ اللهِ)**. [م٢٨٥٧]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر هەیە تەمەنت درێژ ببێتەوە و خەڵکانێك ببینی قەمچییان لەدەستدایە وەك کلکی گا، لە توڕەیی خودادا ڕۆژ دەکەنەوە و لە خەشمی خودادا ئێوارەیان بەسەردا دێت).**

## ١٧- دەروازەی: حەیا لە ئیمانەوەیە

**٣٣٨١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ)**. [خ٢٤/ م٣٦]

---

[1] واتە: لە دنیا بە ناڕەوا سزای خەڵك دەدەن-و.

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەپاڵ پیاوێک لە ئەنصار تێپەڕی، ئەو ئامۆژگاری براکەی دەکرد لە حەیادا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لێیگەڕێ، حەیا لە ئیمانەوەیە).**

**٣٣٨٢-** (خ) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلاَمِ النُّبُوَّةِ الأُولى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِي فَاصْنَعْ ما شِئْتَ).** [خ٦١٢٠ (٣٤٨٣)]

(خ) لە ئەبی مەسعوودەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی خەڵکی پیایگەیشتوون لە کەلامی پێغەمبەرایەتی یەکەم[1]: گەر حەیا ناکەی هەرچی دەخوازی ئەنجامی بدە).**

**٣٣٨٣-** عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ شَانَهُ، وَلاَ كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ زَانَهُ).** [ت١٩٧٤/ جه٤١٨٥]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرگیز "الفُحْش"[2] لە شتێکدا نەبووە ناشیرینی نەکات، هەرگیز حەیا لە شتێکدا نەبووە جوانی نەکات).**

**٣٣٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اسْتَحْيُوا مِنَ اللهِ حَقَّ الْحَيَاءِ)** قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَسْتَحْيِي وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، قَالَ: **(لَيْسَ ذَاكَ، وَلَكِنَّ الاِسْتِحْيَاءَ مِنَ اللهِ حَقَّ الْحَيَاءِ: أَنْ تَحْفَظَ الرَّأْسَ وَمَا وَعَى، وَتَحْفَظَ الْبَطْنَ وَمَا حَوَى، وَلْتَذْكُرْ الْمَوْتَ وَالْبِلَى. وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ: تَرَكَ زِينَةَ الدُّنْيَا، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ؛ فَقَدْ اسْتَحْيَا مِنَ اللهِ حَقَّ الْحَيَاءِ).**

* حسن. [ت٢٤٥٨]

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە حەقی حەیا حەیا لە خودا بکەن)**، وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە حەیا

[1] واتە: قسەی پێغەمبەرانی پێشوو-و.

[2] "الفحش" بریتییە لە بەدڕەفتاری و زمانشڕی-و.

دەکەین، الحمد لله، فەرمووی: **(بەو جۆرە نییە، بەڵکو حەیاکردن لە خودا بە حەقی حەیا ئەوەیە: سەر و ئەوەی کۆیدەکاتەوە بپارێزی[1]، سك و ئەوەی پێیەوە پەیوەستە بپارێزی[2]، بیر لە مردن و رزان بکەیەوە، هەر کەس دواڕۆژی دەوێت: وازدەهێنێ لە زرق و برقی دنیا، هەر کەس ئەوەی ئەنجامدا بە حەقی حەیای لە خودا کردووە).**

## ١٨- دەروازەی: نەهی لە تورەبوون و کۆچ لێکردن

٣٣٨٥- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (لَيْسَ الشَّدِيدُ بالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ). [خ٦١١٤/ م٢٦٠٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەهێز ئەو کەسە نییە لە زۆرانبازیدا نابەزێت، بەڵکو بەهێز ئەو کەسەیە لە کاتی تورەیی نەفسی خۆ دەگرێت).**

٣٣٨٦- (خ) وَعَنْهُ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً قالَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَوْصِنِي، قالَ: (لاَ تَغْضَبْ). فَرَدَّدَ مِرَاراً، قَالَ: (لاَ تَغْضَبْ). [خ٦١١٦]

(خ) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پیاوێك بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: **(تورە مەبە)**، چەندین جار دووبارەی کردەوە، هەر فەرمووی: **(تورە مەبە).**

٣٣٨٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لَنَا: (إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قَائِمٌ؛ فَلْيَجْلِسْ فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ، وَإِلاَّ فَلْيَضْطَجِعْ). [د٤٧٨٢، ٤٧٨٣]

* صحيح.

---

[1] ئەوەی کۆی دەکاتەوە بریتییە لە چاو و گوێ و زمان-و.

[2] سك و ئەوەی پێیەوەی پەیوەستە بریتییە لە خواردن و خواردنەوە و پاشان پارێزگاری لە داوێن، چونکە پڕبوونی سك سەردەکێشێ بۆ هەوەسی داوێن-و.

لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) **پێی فەرموویین: (گەر یەكێك لە ئێوە توڕە بوو و بەپێوە بوو با دابنیشێ، گەر توڕەییەكەی لێ ڕۆیشت باشە، ئەگەر نە، با پاڵ بداتەوە).**

**٣٣٨٨-** (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: **(لاَ يَحِلُّ لِمسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ، يَلْتَقِيَانِ: فَيَصُدُّ هَذَا وَيَصُدُّ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ).**
[خ٦٢٣٧ (٦٠٧٧)/ م٢٥٦٠]

(ق) لە ئەبی ئەیوبەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(حەڵاڵ نییە بۆ موسڵمانێك لەسەرو سێ ڕۆژەوە كۆچ لە برا موسڵمانەكەی بكات، بەیەكتر دەگەن: ئەمەیان ڕوو وەردەچەرخێنێ و ئەوەیان ڕوو وەردەچەرخێنێ، باشترینیان ئەوەیانە سەلام دەست پێ دەكات).**

**٣٣٨٩-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الاثْنَيْنِ، وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً؛ إِلاَّ رَجُلاً كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا).** [م٢٥٦٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ڕۆژی دووشەم و ڕۆژی پێنجشەم دەروازەكانی بەهەشت دەكرێنەوە لە هەر بەندەیەك خۆشدەبێت شتێكی نەكردبێت بە هاوەڵ بۆ خودا، جگە لە پیاوێك لە نێوان ئەو و براكەی ڕق و كینە هەبێت، دەوترێت: چاوەڕوانی ئەم دوانە بن تا صوڵح دەكەن، چاوەڕوانی ئەم دوانە بن تا صوڵح دەكەن، چاوەڕوانی ئەم دوانە بن تا صوڵح دەكەن).**

## ١٩- دەروازەی: بەزەیی و نەرمونیانی

**٣٣٩٠-** (ق) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَرْحَمُ اللهُ مَنْ لاَ يَرْحَمُ النَّاسَ).** [خ٧٣٧٦ (٦٠١٣)/ م٢٣١٩]

(ق) لە جەریری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا رەحم بە کەسێك ناکات رەحم بە خەڵکی ناکات).**

٣٣٩١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، ارْحَمُوا أَهْلَ الْأَرْضِ، يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ). [د٤٩٤١/ ت١٩٢٤]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(رەحمان بەزەیی بەوانە دەکات خاوەن بەزەیین، بەزەیی بکەن بە ئەهلی زەوی ئەوەی لە ئاسمانە بەزەییتان پیّ دەکات).**

٣٣٩٢- (م) عَنْ جَرِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ، يُحْرَمِ الْخَيْرَ). [م٢٥٩٢]

(م) لە جەریرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس لە نەرمونیانی بێبەش بێت لە خێر بێبەش دەبێت).**

٣٣٩٣- (م) عَنْ عائشةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (يَا عَائِشَةُ! إِنَّ اللهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ). [م٢٥٩٣]

(م) لە عائیشەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی عائیشە، خودا رەفیقە و "الرِّفْق"[1]ی خۆشدەوێت، لەسەر "الرِّفْق" شتانێك دەبەخشێت لەسەر توندوتیژی نایانبەخشێت، هەروەها شتانێك لەسەر "الرِّفْق" دەبەخشێت کە لەسەر هیچ شتێکی تر نایانبەخشێت).**

---

[1] الرفق: بریتییە لە نەرمونیانی و لەسەرخۆیی—و.

## ٢٠- دەروازەی: نەرمونیانی و بەزەیی بە ئاژەڵان

٣٣٩٤- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى ماتَتْ، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا، وَلاَ سَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا، وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ). [خ٣٤٨٢ (٢٣٦٥)/ م٢٢٤٢]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئافرەتێك لەسەر پشیلەیەك سزا درا بەندی کرد تا مرد، لەوەوە چووە ناو ئاگرەوە، نە خواردنی پێدا، نە ئاوی پێدا کاتێ بەندی کرد بوو، رێگەشی نەدا لە مێرووی زەویش بخوات).**

٣٣٩٥- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْراً فَنَزَلَ فِيهَا، فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبُ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كانَ بَلَغَ بِي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ). قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْراً؟ فَقَالَ: (فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ). [خ٦٠٠٩ (١٧٣)/ م٢٢٤٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێك بە رێگەیەکدا دەڕۆیشت، تینوێتی زۆری بۆ هێنا، بیرێکی بینییەوە و دابەزی بۆ ناوی، خواردییەوە و پاشان هاتە دەرەوە، بینی سەگێك دەمەلاسکێیەتی، لە تینوێتیدا خۆڵی دەخوارد، پیاوەکە وتی: ئەم سەگە تینوێتی بەگیریهێناوە وەك چۆن تینوێتی منی بەگیرهێنا، دابەزییە بیرەکە و خوفەکەی پڕ کرد و بە دەمی خوفەکەی گرت و سەگەکەی ئاودا، خودا شوکری کرد و لێیخۆش بوو)**، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا لە ئاژەڵانمان پاداشتمان بۆ هەیە؟ فەرمووی: **(لە هەر خاوەن جگەرێکی تەڕدا پاداشتێك هەیە).**

٣٣٩٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِجَهَازِهِ فَأُخْرِجَ مِنْ تَحْتِهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِبَيْتِهَا فَأُحْرِقَ بِالنَّارِ، فَأَوْحَى اللهُ إِلَيْهِ: فَهَلاَّ نَمْلَةً وَاحِدَةً). [خ٣٣١٩ (٣٠١٩)/ م٢٢٤١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران لەژێر درەختێك دابەزی، مێروولەیەك گەستی، فەرمانی کرد شتومەکەکانی لەژێر درەختەکە هێنرانە دەرەوە، پاشان فەرمانی کرد شارەمێروولەکە بسوتێنرێت، خودا وەحی بۆ رەوانە کرد: بۆچی تەنها یەك مێروولە نە[1]؟)**.

## ٢١- دەروازەی: پلە و پایەی تەوازوع و حەرام کردنی خۆبەزلزانی

**٣٣٩٧-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ)** قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَناً وَنَعْلُهُ حَسَنَةً. قَالَ: (إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ. الْكِبْرُ: بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ). [م٩١]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە ئەندازەی گەردێك خۆبەلزانی لە دڵدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە)**، پیاوێك وتی: پیاو حەز دەکات پۆشاکەکەی جوان بێت و نەعلەکەی باش بێت، فەرمووی: **(خودا "جمیل"ە و جوانی خۆشدەوێت، خۆبەلزانی ملنەدانە بۆ حەق وسووك تەماشاکردنی خەڵکییە)**.

**٣٣٩٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَقُولُ اللهُ سُبْحَانَهُ: الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِداً مِنْهُمَا، أَلْقَيْتُهُ فِي النَّارِ). [جه٤١٧٥]

* صحيح.

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(سبحانه) دەفەرموێت: "الكِبْرِياء-خۆ بە شکۆمەندبینین" کراسمە، و "العَظَمَة-خۆ بە مەزنزانین" ژێر کراسمە، هەر کەس بە یەکێك لەمانە کێبەرکێم لەگەڵ بکات هەڵیدەدەمە ناو ئاگرەوە)**.

---

[1] واتە: بۆچی تەنها ئەو مێروولەت نەکوشت گازی لێگرتی، بۆچی شارەمێروولەیەکت تیابرد؟-و.

**٣٣٩٩**- (م) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ خَطَبَهُمْ فَقَالَ: (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل أَوْحَى إِلَيَّ: أَنْ تَوَاضَعُوا، حَتَّى لاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ**).

[م(٢٨٦٥) (٦٤)/ د٤٨٩٥/ جه٤١٧٩]

**(م) لە عیازی کوڕی حیمارەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو وتاری بۆ دان و فەرمووی: (خودا(عز وجل) وەحی بۆ کردم: تەوازوع بنوێنن، تا هیچ کەس بەسەر کەسێکی تردا شانازی نەکات).**

## ٢٢- دەروازەی: ریا

**٣٤٠٠**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ**).

[م٢٩٨٥]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا(تبارك و تعالى) فەرمووی: من بێنیازترین کەسم لە هاوبەش، هەر کەس کارێکی کرد و لەگەڵ من کەسێکی تری بەشدار کرد، وازدەهێنم لە خۆی و هاوبەشییەکەی).**

**٣٤٠١**- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ذُكِرَ لِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ، وَلَمْ أَسْمَعْهُ مِنْهُ: (**إِنَّ فِيكُمْ قَوْماً يَعْبُدُونَ وَيَدْأَبُونَ حَتَّى يُعْجَبَ بِهِمُ النَّاسُ وَتُعْجِبَهُمْ نُفُوسُهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ**).　　　[حم١٢٨٨٦، ١٢٩٧٢]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[وانظر: ٥، ٧].

**لە ئەنەسەوە، وتی: بۆم باسکراوە -من خۆم لە ئەوەوە نەمبیستووە- پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ناو ئێوەدا دەستەیەك هەن عیبادەت دەکەن و بەردەوام و پێداگر دەبن تا خەڵکی پێیان سەرسام دەبێت و خۆیان بە خۆیانەوە سەرسام دەبن، لە دین دەردەچن وەك دەرچوونی تیر لە نێچیرەوە).**

## ٢٣- دەروازەی: ئەمانەت

٣٤٠٢- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ. حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: (أَيْنَ ـ أُرَاهُ ـ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ)؟ قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (فَإِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ). قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: (إِذَا وُسِّدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ). [خ٥٩]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە مەجلیسێك قسەی بۆ كۆمەڵێك دەكرد، ئەعرابییەك هات بۆ لای و وتی: قیامەت كەیە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەردەوام بوو و قسەی دەفەرموو، یەكێك لە خەڵكەكە وتی: گوێی لەوە بوو وتی، ئەوەی وتی لای ناپەسەند بوو، یەكێكی تریان وتی: بەڵكو گوێی لێ نەبوو، تا قسەكەی تەواو بوو فەرمووی: (لە كوێیە—وادەزانم—پرسیاركەرەكە لە قیامەتە[1])، ئەوە منم، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (گەر ئەمانەت تیابرا، چاوەڕوانی قیامەت بە)، وتی: تیابردنی ئەمانەت چۆنە؟ فەرمووی: (گەر كار درایە دەست كەسی نائەهل چاوەڕوانی قیامەت بە).**

٣٤٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ). [د٣٥٣٥/ ت١٢٦٤/ مي٢٦٣٩]

* حسن صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمانەت بگێڕەوە بۆ ئەو كەسەی لای داناوی، ناپاكی مەكە لەو كەسەی ناپاكیت لێ دەكات).**

٣٤٠٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: مَا خَطَبَنَا نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلاَّ قَالَ: (لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ، وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ). [حم١٢٣٨٣]

* حديث حسن.

[وانظر: ٧٦، ٧٧]

---

[1] واتە: ئەو كەسە لە كوێیە پرسیاری كرد دەربارەی قیامەت؟—و.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) وتاری بۆ بدابایەن دەیفەرموو: **(هەر کەس ئەمانەتی نەبێت ئیمانی نییە، هەر کەس پەیمانی نەبێت دینی نییە)**.

## ٢٤- دەروازەی: داوای هیچ شت لە خەڵك مەکەن

**٣٤٠٥-** (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تِسْعَةً . أَوْ ثَمَانِيَةً أَوْ سَبْعَةً . فَقَالَ: **(أَلاَ تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللهِ)**؟ وَكُنَّا حَدِيثَ عَهْدٍ بِبَيْعَةٍ، فَقُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ! ثُمَّ قَالَ: **(أَلاَ تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللهِ)**؟ فَقُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ! ثُمَّ قَالَ: **(أَلاَ تُبَايِعُون رَسُولَ اللهِ)**؟ قَالَ: فَبَسَطْنَا أَيْدِيَنَا وَقُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَعَلاَمَ نُبَايِعُكَ؟ قَالَ: **(عَلَى أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَالصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، وَتُطِيعُوا . وَأَسَرَّ كَلِمَةً خَفِيَّةً . وَلاَ تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئاً)**. فَلَقَدْ رَأَيْتُ بَعْضَ أُولَئِكَ النَّفَرِ يَسْقُطُ سَوْطُ أَحَدِهِمْ، فَمَا يَسْأَلُ أَحَداً يُنَاوِلُهُ إِيَّاهُ. [م١٠٤٣]

(م) لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعییەوە، وتی: نۆ یان هەشت یان حەوت کەس لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، فەرمووی: **(ناتانەوێ بەیعەت بدەن بە پێغەمبەری خودا؟)**، ئێمە تازە عەهد بووین بە بەیعەت، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، بەیعەتمان پێ کردی! پاشان فەرمووی: **(ناتانەوێ بەیعەت بدەن بە پێغەمبەری خودا؟)**، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، بەیعەتمان پێکردی! پاشان فەرمووی: **(ناتانەوێ بەیعەت بدەن بە پێغەمبەری خودا؟)**، وتی: دەستی خۆمان کردەوە و وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، بەیعەتمان پێکردی، لەسەر چی بەیعەتت پێ بکەین؟ فەرمووی: **(لەسەر ئەوەی خودا بپەرستن و شتێك نەکەن بە هاوبەشی، و پێنج نوێژەکە، و گوێڕایەڵی بکەن-** وشەیەکی هێواشی شاردەوە- **و شتێك لە خەڵك داوا نەکەن)**.

## ٢٥- دەروازەی: فەرمان کردن بە هێز و وازهێنان لە دەستەوسانی

**٣٤٠٦-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ. احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللهِ،**

وَلاَ تَعْجَزْ. وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللهِ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ). [م٢٦٦٤]

(م) له ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(باوەڕداری بەهێز لای خودا باشتر و خۆشەویستترە له باوەڕداری لاواز، لە هەمووانـدا خێـر هەیە، پێداگریە لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێ و کۆمەکی لە خودا داوا بکە و دەستەوسان مەبە، گەر شتێکت تووشهات مەڵێ: گەر ئەوەم بکردبایە ئاوا و ئاوا دەبوو، بەڵکو بڵێ: خودا قەدەری کرد بوو، و ئەوەی بخوازێت ئەنجامی دەدا، چونکە "لو" کاری شەیتان دەکاتەوە).**

## ٢٦- دەروازەی: باوەڕدار لە کونێکەوە دوو جار ناگەزرێت

٣٤٠٧- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ).** [خ٦١٣٣/ م٢٩٩٨]

(ق) لـه ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت)، لـه پێغەمبـەرەوە(ﷺ)، ئـەو فەرمووی: **(باوەڕدار له کونێکەوە دوو جار ناگەزرێت).**

## ٢٧- دەروازەی: پاڵنانی گومانی خراپ

٣٤٠٨- (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ مَعَ إِحْدَى نِسَائِهِ، فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ فَدَعَاهُ، فَجَاءَ، فَقَالَ: **(يَا فُلاَنُ! هَذِهِ زَوْجَتِي فُلاَنَةُ)**، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ كُنْتُ أَظُنُّ بِهِ، فَلَمْ أَكُنْ أَظُنُّ بِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ).** [م٢١٧٤]

(م) له ئەنەسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ یـەکێك لـه ژنـەکانی بـوو، پیاوێك بـه پاڵیـدا گوزەری کرد، و پێغەمبەر بانگی کرد و فـەرمووی: **(ئەی فلان، ئەمە فـلان ژنمـە)**، وتـی:

ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من کێم گومانی پێ ببەم[1]، گومانم پێ نەبردی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(شەیتان لە مرۆڤدا وەك جاری بوونی خوێن جاری دەبێت).**

## ٢٨- دەروازەی: تەوەکول لەسەر خودا

٣٤٠٩- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيْرُ، تَغْدُو خِمَاصاً وَتَرُوحُ بِطَاناً).

* صحيح. [ت٢٣٤٤/ جه٤١٦٤]

لە عومەری کوڕی خەتابەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ئێوە بە حەقی تەوەکول بە خودا ببەستن، ڕۆزیتان دەدات وەك چۆن باڵندە ڕۆزی دەدرێت، بەیانی لێدەبێتەوە سکی بە پشتییەوە لکاوە و ئێوارەی بەسەردا دێت سکی پڕ بوە).**

## ٢٩- دەروازەی: چاککردنی نێوانی خەڵك

٣٤١٠- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ)؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَفَسَادُ ذَاتِ الْبَيْنِ الْحَالِقَةُ). [د٤٩١٩/ ت٢٥٠٩]

* صحيح.

لە ئەبی دەرداوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەتانەوێ هەواڵتان پێ بدەم بە چاکتر لە پلەی ڕۆژوو و نوێژ و صەدەقە؟)**، وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: **(چاککردنی نێوانی خەڵك، تێکدانی نێوانی خەڵك "الحالقة"[2]"یە).**

---

(1) واتە: من کێم گومان بە پێغەمبەری خودا ببەم؟!–و.

(2) واتە: دینی کەسەکە دەرنێتو دەبڕێت–و.

## ٣٠- دەروازەی: لە هەڵەی خاوەن پیاوەتی و جوامێری ببوورن

**٣٤١١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَقِيلُوا ذَوِي الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ؛ إِلاَّ الْحُدُودَ**). [د٤٣٧٥]

* صحيح.

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لە هەڵەی خاوەن پیاوەتی و جوامێری ببوورن، جگە لە حەددەکان**[1]).

## ٣١- دەروازەی: ئەو کەسەی رێنیشاندەرە بۆ خێر وەك ئەنجامدەری خێرەکەیە

**٣٤١٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ يَسْتَحْمِلُهُ، فَلَمْ يَجِدْ عِنْدَهُ مَا يَحْمِلُهُ، فَدَلَّهُ عَلَى آخَرَ فَحَمَلَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: (**إِنَّ الدَّالَّ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ**). [ت٢٦٧٠]

* حسن صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای دەستباری لێکرد[2]، شتێکی لە لا نەبوو دەستباری ئەوی پێ بکات، کەسێکی تری پێ نیشان دا ئەو دەستباری کرد، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پێدا، فەرمووی: (**رێنموونیکار بۆ سەر خێر وەك ئەنجامدەرەکەیەتی**).

---

[1] وەك حەددی زینا و خواردنەوەی عارەق لەم بارەدا کەس ناتوانێی لێی ببورێت-و.

[2] واتە: داوای یارمەتی و کۆمەکی-و.

## ٣٢- دەروازەی: حیلم و نەرمونیانی و ویقاری باش و چاك

**٣٤١٣**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: قَالَ أَشَجُّ بْنُ عَصَرٍ قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ فِيكَ خُلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ عزّ وجل**)، قُلْتُ: مَا هُمَا؟ قَالَ: (**الْحِلْمُ وَالْحَيَاءُ**)، قُلْتُ: أَقَدِيماً كَانَ فِيَّ أَمْ حَدِيثاً، قَالَ: (**بَلْ قَدِيمًا**)، قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خُلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا.

* إسناده صحيح. [حم١٧٨٢٨]

**لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی بەکرەوە، وتی: "أشَجُّ بن عَصَر" وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: (دوو خەسڵەتت تێدایە خودا(عز وجل) خۆشیدەوێن)، وتم: ئەو دوانە کامانەن؟ فەرمووی: (حیلم و حەیا)، وتم: هەر لە کۆنەوە ئەو دوانەم تێدا بووە یان تازە سەریانهەڵداوە؟ فەرمووی: (هەر لە کۆنەوە)، وتم: حەمد بۆ ئەو خودایەی لەسەر دوو خەسڵەت باریهێناوم خۆشیدەوێن.**

**٣٤١٤**- عَنْ سَعْدِ بن أَبِي وقاصٍ . قَالَ الْأَعْمَشُ: وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم . قَالَ: (**التُّؤَدَةُ فِي كُلِّ شَيْءٍ؛ إِلاَّ فِي عَمَلِ الْآخِرَةِ**). [د٤٨١٠]

* صحيح.

**لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە-ئەعمەش دەڵێت: دەزانم تەنها لە ڕێگەی پێغەمبەرەوەیە- فەرمووی: (لە هەموو شتێکدا هێواشی خێرە جگە لە کاری دواڕۆژ).**

**٣٤١٥**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ الْهَدْيَ الصَّالِحَ، وَالسَّمْتَ الصَّالِحَ، وَالاِقْتِصَادَ جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ**). [د٤٧٧٦]

* حسن.

**لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (حاڵ و باری باش و ویقاری باش و میانەگیری بەشێکە لە بیست و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی).**

## ٣٣- دەروازەی: خەڵکی لە جێگەی خۆیان دابنێن

٣٤١٦- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللهِ، إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ، وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ). [د٤٨٤٣]

* حسن.

لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە شکۆمەند کردنی خودا رێزنانە لە ریشسپی موسڵمان و هەڵگری قورئان زیادەڕەوی تێدا نەکردبێت و پشتی لێ هەڵنەکردبێت، هەروەها رێزنان لە خاوەن سوڵتانی دادپەروەر).**

## ٣٤- دەروازەی: میانەگیری لە خۆشویستن و رقلێبوون

٣٤١٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ . أُرَاهُ رَفَعَهُ . قَالَ: (أَحْبِبْ حَبِيبَكَ هَوْناً مَا، عَسَى أَنْ يَكُونَ بَغِيضَكَ يَوْماً مَا، وَأَبْغِضْ بَغِيضَكَ هَوْناً مَا، عَسَى أَنْ يَكُونَ حَبِيبَكَ يَوْماً مَا).

* صحيح. [ت١٩٩٧]

لە محەمەدی کوڕی سیرینەوە، لە ئەبی هورەیرەوە -پێموایە بەرزی کردەوە- فەرمووی: **(خۆشەویستەکەت بە میانەگیری خۆشبوێت، لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان ناحەزت بێت، بە میانەگیری رقت لە ناحەزەکەت بێت لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان خۆشەویستت بێت).**

٣٤١٨- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ؛ فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ). [د٥١٢٤/ ت٢٣٩٢/ والملحق ٢٥٠٢]

* صحيح.

لە میقدامی کوڕی مەعدییەکریبەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر پیاو براکەی خۆی خۆشویست با هەواڵی پێبدات ئەو خۆشیدەوێت).**

## ٣٥- دەروازەی: موسڵمان شتێك پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت وازی لیّ دەهێنێت

**٣٤١٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مِنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ**). [ت٢٣١٧/ جه٣٩٧٦]

* صحيح.

**له ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە باشی موسڵمانێتی مرۆڤ وازهێنانییەتی لەوەی پەیوەندی بە ئەوەوە نییە).**

## ٣٦- دەروازەی: چاولێکەر و لاساییکەر مەبن

**٣٤٢٠-** عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تَكُونُوا إِمَّعَةً تَقُولُونَ: إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا، وَإِنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنَا، وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا، وَإِنْ أَسَاؤُوا فَلاَ تَظْلِمُوا**). [ت٢٠٠٧]

* ضعيف، وقال الترمذي: حسن غريب.

**له حوزەیفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (چاولێکەر و لاساییکەر مەبن و بڵێن: گەر خەڵك چاکیان کرد چاك دەبین، گەر ستەمیان کرد ستەم دەکەین، بەڵکو نەفسی خۆتان دابمەزرێنن، گەر خەڵکی چاکیان کرد ئێوەش چاکە بکەن، گەر خەڵکی خراپیان کرد ئێوە ستەم مەکەن).**

## ٣٧- دەروازەی: تێکەڵی کردنی خەڵك

**٣٤٢١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمُسْلِمُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، خَيْرٌ مِنَ الْمُسْلِمِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ**).

* صحيح. [ت٢٥٠٧/ جه٤٠٣٢]

لە ئیبن عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویی: **(ئەو موسڵمانەی تێکەڵ بە خەڵك دەبێت و لەسەر ئازاریان ئارام دەگرێت باشتر و چاکترە لەو موسڵمانەی تێکەڵ بە خەڵك نابێت و لەسەر ئازاریان ئارام ناگرێت).**

## ٣٨- دەروازەی: مەزنی حورمەتی باوەڕدار

**٣٤٢٢**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمِنْبَرَ فَنَادَى بِصَوْتٍ رَفِيعٍ، فَقَالَ: (**يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ، وَلَمْ يُفْضِ الْإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ، لاَ تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ، وَلاَ تُعَيِّرُوهُمْ، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ، وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ**).

قَالَ: وَنَظَرَ ابْنُ عُمَرَ يَوْماً إِلَى الْبَيْتِ، أَوْ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ، وَالْمُؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَ اللهِ مِنْكِ. [ت٢٠٣٢]

* حسن صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەوتە سەر مینبەر و بە دەنگی بەرز بانگی کرد و فەرموویی: **(ئەی کۆمەڵی ئەوانەی بە زمان موسڵمان بوون و ئیمان نەگەیشتووەتە دڵیان، ئازاری موسڵمانان مەدەن و تانە و تەشەریان لێ مەدەن و شوێنی عەوراتیان مەکەون، چونکە هەر کەس شوێنی عەورەتی برا موسڵمانەکەی بکەوێت خودا شوێنی عەورەتی دەکەوێت، هەر کەسیش خودا شوێنی عەورەتی بکەوێت رسوای دەکات با لە سووچی ماڵەکەی خۆیدا بێت).**

وتی: ئیبن عومەر رۆژێك تەماشای بەیت یان تەماشای کەعبەی کرد، و وتی: چەند مەزنی و چەند حورمەتت مەزنە، باوەڕدار لای خودا حورمەتی لە تۆ مەزنترە.

## ٣٩- دەروازەی: باشترینی خەڵك و خراپترینی خەڵك

**٣٤٢٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَفَ عَلَى أُنَاسٍ جُلُوسٍ، فَقَالَ: (**أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِكُمْ مِنْ شَرِّكُمْ**)؟ قَالَ: فَسَكَتُوا، فَقَالَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ رَجُلٌ:

بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ أَخْبِرْنَا بِخَيْرِنَا مِنْ شَرِّنَا، قَالَ: (خَيْرُكُمْ مَنْ يُرْجَى خَيْرُهُ وَيُؤْمَنُ شَرُّهُ، وَشَرُّكُمْ مَنْ لاَ يُرْجَى خَيْرُهُ، وَلاَ يُؤْمَنُ شَرُّهُ). [ت٢٢٦٣]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەسەر خەڵکانێکەوە بەپێوە وەستابوو ئەوان دانیشتبوون، فەرمووی: **(دەتانەوێ چاکترینتان لە خراپترینتان هەواڵ پێ بدەم؟)**، وتی: خەڵکەکە بێدەنگ بوون، پێغەمبەر ئەوەی سێ جار فەرموو، پیاوێك وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵمان پێبدە بە چاکترینمان لە خراپترینمان، فەرمووی: **(چاکترینتان ئەو کەسەیە رجای خێری دەکرێت و ئاسایش هەیە لە شەڕی، خراپترینتان ئەو کەسەیە رجای خێری ناکرێت و لە ئاسایشدا نین لە شەڕی).**

**٣٤٢٤**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ، وَإِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ). [جه٢٣٧]

* حسن.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە خەڵکیدا کەسانێ هەن کلیلن بۆ خێر و داخەرن بۆ شەڕ، کەسانێکیش هەن لەسەر دوو دەستی کلیلن بۆ شەڕ و داخەرن بۆ خێر، وەیل بۆ کەسێکە خودا کلیلەکانی شەڕ دەخاتە سەر دوو دەستی).**

## ٤٠- دەروازەی: خواردنەوەی رق

**٣٤٢٥**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (مَا مِنْ جُرْعَةٍ أَعْظَمُ أَجْراً عِنْدَ اللهِ مِنْ جُرْعَةِ غَيْظٍ، كَظَمَهَا عَبْدٌ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ). [جه٤١٨٩]

* صحيح.

لە ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هیچ قومێك لای خودا مەزنتر نییە لە خواردنەوەی قومی رق، بەندەیەك بۆ رووی پاکی خودا بیخواتەوە).**

## ٤١- دەروازەی: شوکر کردنی چاکە و پاداشتدانەوەی

**٣٤٢٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَشْكُرُ اللهَ مَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ**). [د٤٨١١/ ت١٩٥٤]

* صحيح.

**لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (شوکری خودای نەکردووە ئەو کەسەی شوکری خەڵك ناکات).**

**٣٤٢٧**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أُعْطِيَ عَطَاءً، فَوَجَدَ فَلْيَجْزِ بِهِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُثْنِ بِهِ، فَمَنْ أَثْنَى بِهِ فَقَدْ شَكَرَهُ، وَمَنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ**).

* حسن. [د٤٨١٣، ٤٨١٤/ ت٢٠٣٤]

**لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس شتێکی پێدرا و هەیبوو با بەوە پاداشتی بداتەوە، گەر نەیبوو با بەوە سەنای بکات، هەر کەس بەوە سەنای کرد شوکری کردووە، هەر کەس شاردییەوە سپڵەیی نواندووە).**

**٣٤٢٨**- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ، فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللهُ خَيْراً، فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ**). [ت٢٠٣٥]

* صحيح.

**لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەس چاکەی لەگەڵ کرا و بە بکەرەکەی وت: خودا پاداشتی خێرت بداتەوە، لە سەنادا گەیشتووەتە ئەوپەڕ[1]).**

## ٤٢- دەروازەی: مەشوورەت و راوێژ

**٣٤٢٩**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ**).

* صحيح. [د٥١٢٨/ ت٢٣٦٩/ جه٣٧٤٥]

---

[1] واتە: لە شوکر و سەنای کەسەکە گەیشتووەتە لوتکە-و.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(راوێژپێکراو ئەمیندارە).**

## ٤٣- دەروازەی: کەفارەتی مەجلیس

**٣٤٣٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ)**. واللفظ للترمذي.

* صحيح. [د٤٨٥٨/ ت٣٤٣٣]

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس لە مەجلیسێك دانیشت و تیایدا زۆر قسە و ژاوە ژاوی کرد، بەرلەوەی لەو مەجلیسە هەڵبستێت وتی: "سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك[1]" لەوەی خۆشدەبێت لەو مەجلیسەی تووشی هاتووە)** لەفزەکە بۆ تیرمزی دەگەڕێتەوە.

## ٤٤- دەروازەی: دانیشتنەکان ئەمانەتن

**٣٤٣١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ، ثُمَّ الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ)**. [د٤٨٦٨/ ت١٩٥٩]

* حسن.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر پیاو قسەیەکی کرد و لایکردەوە، ئەوە ئەمانەتە).**

---

[1] واتە: "سبحان الله والحمد لله"، خودایە شایەتی دەدەم تۆ تاك و تەنهایی، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە-و.

## ٤٥- دەروازەی: نەهی لە جاسووسی کردن

**٣٤٣٢-** عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّكَ إِنِ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ، أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ).

فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةٌ سَمِعَهَا مُعَاوِيَةُ مِنْ رَسُولِ اللهِ نَفَعَهُ اللهُ تَعَالَى بِهَا. [د٤٨٨٨]

* صحيح.

**لە لە موعاویەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تۆ گەر شوێنی عەورەتی خەڵك بكەویت تێكیاندەدەی، یان خەریكە تێكیانبدەی).**

**ئەبو دەردا دەڵێ: كەلیمەیە بوو موعاویە لە پێغەمبەری خودای بیست خودا بەوە سوودی پێگەیاند[(١)].**

**٣٤٣٣-** عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: أُتِيَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَقِيلَ: هَذَا فُلاَنٌ تَقْطُرُ لِحْيَتُهُ خَمْراً، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنَّا قَدْ نُهِينَا عَنِ التَّجَسُّسِ، وَلَكِنْ إِنْ يَظْهَرْ لَنَا شَيْءٌ نَأْخُذْ بِهِ. [د٤٨٩٠]

* صحيح الإسناد.

**لە زەیدی كوڕی وەهبەوە: كەسێك هێنرا بۆ لای ئیبن مەسعوود و وترا: ئەمە فلانە ریشی عارەقی لێ دەچۆڕێت، عەبدولا وتی: ئێمە نەهیمان لێكراوە لە جاسووسی، بەڵام گەر شتێكمان بۆ دەربكەوێت بەوە دەیگرین.**

## ٤٦- دەروازەی: پیاو بەرگری دەكات لە حەیا و نامووسی براكەی

**٣٤٣٤-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ رَدَّ اللهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [ت١٩٣١]

* صحيح.

---

(١) چونكە موعاویە(خوا لێی رازی بێت) لە كاتی فەرمانڕەوایی خۆی شوێنی عەورەت و ئەنگی موسڵمانان نەدەكەوت-و.

لە ئەبی دەرداوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویی: **(هەر کەس بۆ پارێزگاری لە حەیا و نامووسی براکەی بەرەنگار ببێتەوە، خودا لە رۆژی قیامەت ئاگر لە رووی بەرپەرچ دەداتەوە)**.

## ٤٧- ئەوەی دەربارەی شۆخی هاتووە

**٣٤٣٥**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا، قَالَ: **(إِنِّي لاَ أَقُولُ إِلاَّ حَقّاً)**. [ت١٩٩٠]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ شۆخیمان لەگەڵ دەکەی، فەرموویی: **(من تەنها حەق دەڵێم[1])**.

**٣٤٣٦**- عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، احْمِلْنِي، قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّا حَامِلُوكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ)**، قَالَ: وَمَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَهَلْ تَلِدُ الْإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ)**. [د٤٩٩٨/ ت١٩٩١]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە، پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سوارم بکە(احملني)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویی: **(من سواری بەچکە حوشترێکت دەکەم)**، پیاوەکە وتی: جا من چی بکەم لە بەچکەی حوشتر؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویی: **(بۆ مەگەر حوشتر جگە لە بەچکە چیتری دەبێت؟!)**.

**٣٤٣٧**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُمْ كَانُوا يَسِيرُونَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَنَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَانْطَلَقَ بَعْضُهُمْ إِلَى حَبْلٍ مَعَهُ فَأَخَذَهُ، فَفَزِعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً)**.

* صحيح. [د٥٠٠٤]

---

[1] واتە: لە وتنی شۆخی تەنها حەق دەڵێم-و.

لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، وتی: هاوەڵانی محەمەد(ﷺ) بۆیان باس کردین: ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشتن پیاوێك لەوان خەوی لێکەوت، یەکێکیان ڕۆیشت و پەتێك کە بە پیاوەکە بوو بردی[1]، پیاوەکە ترسا و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(حەڵاڵ نییە بۆ موسڵمانێك موسڵمانێکی تر بترسێنێت).**

## ٤٨- دەروازەی: دانیشتن لە نێوان سێبەر و خۆر

**٣٤٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الشَّمْسِ .وَقَالَ مَخْلَدٌ: فِي الْفَيْءِ .فَقَلَصَ عَنْهُ الظِّلُّ، وَصَارَ بَعْضُهُ فِي الشَّمْسِ، وَبَعْضُهُ فِي الظِّلِّ؛ فَلْيَقُمْ).** [د٤٨٢١]

* صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: ئەبو قاسم(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەکێك لە ئێوە لەبەر خۆر بوو–مەخلەد دەڵێ: لەبەر سێبەر بوو– سێبەرەکەی لێ بەرتەست بوویەوە و هەندێ لە جەستەی کەوتە بەر خۆر و هەندێکی تری لەبەر سێبەر، با هەستێت).**

**٣٤٣٩–** عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى أَنْ يُقْعَدَ بَيْنَ الظِّلِّ وَالشَّمْسِ.

* صحيح. [جه٣٧٢٢]

لە بورەیدەوە: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە دانیشتن لە نێوان سێبەر و خۆر.

## ٤٩- دەروازەی: ئادابی دانیشتن لەگەڵ کۆمەڵ

**٣٤٤٠–** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهِي. [د٤٨٢٥/ ت٢٧٢٥]

* صحيح.

---

[1] یان پەتەکەی بەست بە لاقییەوە–و.

لە جابری کوڕی سەموورەوە، وتی: کاتیێ دەهاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك لە ئێمە لەو جێگە دادەنیشت کۆتایی دەهات.

٣٤٤١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ؛ إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا). [د٤٨٤٤، ٤٨٤٥/ ت٢٧٥٢]

**لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (حەلاڵ نییە بۆ پیاوێك دوو کەس لەیەکتر جیابکاتەوە[1]، مەگەر بە مۆڵەتیان).**

- وفي رواية لأبي داود: (لاَ يُجْلَسْ بَيْنَ رَجُلَيْنِ؛ إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا).

* حسن صحيح.

**لە ریوایەتێکی ئەبی داودا: (لە نێوان دوو پیاو دانانیشێت مەگەر بە مۆڵەتیان).**

## ٥٠- دەروازەی: رۆیشتنی ئافرەت بە رێگەدا

٣٤٤٢- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ وَهُوَ خَارِجٌ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَاخْتَلَطَ الرِّجَالُ مَعَ النِّسَاءِ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِلنِّسَاءِ: (اسْتَأْخِرْنَ، فَإِنَّهُ لَيْسَ لَكُنَّ أَنْ تَحْقُقْنَ الطَّرِيقَ، عَلَيْكُنَّ بِحَافَّاتِ الطَّرِيقِ). فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تَلْتَصِقُ بِالْجِدَارِ، حَتَّى إِنَّ ثَوْبَهَا لَيَتَعَلَّقُ بِالْجِدَارِ مِنْ لُصُوقِهَا بِهِ. [د٥٢٧٢]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

لە ئەبی ئوسەیدی ئەنصارییەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو فەرموویەتی-ئەو لە دەرەوەی مزگەوت بوو و لە رێگە پیاوان بە ئافرەتان تێکەڵ بوون- پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە ئافرەتانی فەرموو: **(خۆتان دوابخەن، بۆتان نییە بە ناوەڕاستی رێگەدا بڕۆن، لەسەرتانە بە کەناری رێگەدا بڕۆن)**، ئافرەت بە دیوارەوە دەلکا، تا پۆشاکەکەی بە دیوارەوە گیردەبوو لەبەر لکانی بە دیوارەکەوە.

---

[1] واتە: لە دانیشتن دوو پیاو لەیەکتر بترازێنێ و لە نێوانیان دابنیشێت، مەگەر مۆڵەتیان لێ وەربگرێت-و.

## ٥١- دەروازەی: خەوتن لەسەر پاکی

**٣٤٤٣**- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَبِيتُ عَلَى ذِكْرٍ طَاهِراً، فَيَتَعَارُّ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَسْأَلُ اللهَ خَيْراً مِنَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ؛ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ).

* صحيح. [د٥٠٤٢/ جه٣٨٨١]

لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر موسڵمانێك لەسەر زیکر بە پاکی شەوبکاتەوە و پاشان لەشەو بەئاگابێت و داوای خێری دنیا و دوارۆژ لە خودا بکات، خودا پێیدەبەخشێت).**

## ٥٢- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی راکشان لەسەر سك هاتووە

**٣٤٤٤**- عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا مُضْطَجِعٌ عَلَى بَطْنِي، فَرَكَضَنِي بِرِجْلِهِ، وَقَالَ: (يَا جُنَيْدِبُ، إِنَّمَا هَذِهِ ضِجْعَةُ أَهْلِ النَّارِ). [جه٣٧٢٤]

* صحيح. وقال شعيب: ضعيف.

لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵمدا تێپەڕی من لەسەر سکم راکشابووم، بە قاچی جوڵاندمی و فەرمووی: **(ئەی جونەیدیب، ئەمە راکشانی ئەهلی ئاگرە).**



## بەشی سێیەم

## چاکە و سیلەی رەحم

### ١- دەروازەی: رۆحەکان سەربازی کۆکراوەن

٣٤٤٥- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ). [م٢٦٣٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(رۆحەکان کۆمەڵێك سەربازی کۆکراوەن، ئەوانەیان یەکتریان ناسی بێت هۆگر دەبن بەیەکتر، ئەوانەیان یەکتریان نەناسی بێت جیاواز دەبن لە یەکتر).**

- وفي رواية: (النَّاسُ مَعَادِنُ كَمَعَادِنِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا. وَالأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ).

لە ریوایەتێکدا: **(خەڵك کانزان، وەك کانزای زیو و زێڕ، باشترینیان لە نەفامیدا باشترینیانە لە ئیسلامدا گەر تێبگەن و حاڵی ببن، رۆحەکانیش کۆمەڵێك سەربازی کۆکراوەن، ئەوانەیان یەکتریان ناسی بێت هۆگر دەبن بەیەکتر، ئەوانەیان یەکتریان نەناسی بێت جیاواز دەبن لە یەکتر).**

### ٢- دەروازەی: خەڵك وەك گەلە حوشترن راحیلەیان تێدا نییە

٣٤٤٦- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّمَا النَّاسُ كَالإِبِلِ الْمِائَةِ، لاَ تَكَادُ تَجِدُ فِيهَا رَاحِلَةً). [خ٦٤٩٨/ م٢٥٤٧]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خەڵك وەك سەد حوشتر وان، خەریکە راحیلەیەکیان[1] تێدا نەبینییەوە).**

## ٣- دەروازەی: مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان

**٣٤٤٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كانَ فِي حاجَةِ أَخِيهِ كانَ اللهُ فِي حاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُباتِ يَوْمِ الْقِيامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ). [خ٢٤٤٢/ م٢٥٨٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(موسڵمان برای موسڵمانە، نە ستەمی لێ دەکات و نە رادەستی دەکات، هەر کەس لە پێویستی براکەیدا بێت خودا لە پێویستی ئەودا دەبێت، هەر کەس دەرووی تەنگانەیەك لە موسڵمانێك بکاتەوە، خودا دەرووی تەنگانەیەك لە تەنگانەکانی رۆژی قیامەتی لێ دەکاتەوە، هەر کەس موسڵمانێك داپۆشێت خودا لە رۆژی قیامەت دایدەپۆشێت).**

**٣٤٤٨-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (حَقُّ المُسْلِمِ عَلَى المُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلاَمِ، وَعِيَادَةِ المَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ). [خ١٢٤٠/ م٢١٦٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان پێنجە: وەڵامدانەوەی سەلام، و سەردانیی نەخۆش، و شوێنکەوتنی جەنازە، و وەڵامدانەوەی بانگهێش، و رەحمەت ناردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێت).**

---

[1] راحیلە حوشترێکە بۆ سەفەری دوور کۆڵ و باری لێ دەنرێت-و.

■ وفي رواية لمسلم: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ**). قِيلَ: مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ؛ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ**).

له ریوایەتێكی موسلیمدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان شەشە)**، وتیان: ئەوانە كامانەن، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(گەر پێی گەیشتی سەلامی لێ بكەی، گەر بانگهێشتی كردی وەڵامی بدەیەوە، گەر ئامۆژگاری كردی گوێی بۆ بگری، گەر پژمی و حەمدی خودای كرد رەحمەتی بۆ بنێری، گەر نەخۆشكەوت سەردانی بكەی، و گەر مرد شوێنی جەنازەكەی بكەویت)**.

■ وفي رواية لمسلم: (**الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَاهُنَا**) وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ (**بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ. كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ**). [م٢٥٦٤]

هەروەها لە ریوایەتێكی تری موسلیمدا: **(موسڵمان برای موسڵمانە و ستەمی لێ ناكات و شەرمەزاری ناكات و سووك و كەم تەماشای ناكات، تەقوا لێرەدایە)**، سێ جار ئاماژەی بۆ سینەی خۆی كرد، **(بەسەر شەڕ بۆ مرۆڤێك سووك و كەم تەماشای برا موسڵمانەكەی بكات، خوێن و ماڵ و نامووسی هەر موسڵمانێك لە موسڵمانێكی تر حەرامە)**.

## ٤- دەروازەی: بەزەیی كردنی باوەڕداران بە یەكتر و هاوكارییان

**٣٤٤٩-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً**). وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. [خ٢٤٤٦ (٤٨١)/ م٢٥٨٥]

ولم يذكر مسلم تشبيك الأصابع.

(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەك بینایەكە هەندێكی هەندێكی تری توندوتۆڵ دەكات)**، وتی: پەنجەكانی لەیەكتر هەڵپێكا.

٣٤٥٠- (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (تَرَى الْمُؤْمِنِينَ: فِي تَرَاحُمِهِمْ، وَتَوَادِّهِمْ، وَتَعَاطُفِهِمْ، كَمَثَلِ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى عُضْواً، تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى). [خ٦٠١١/ م٢٥٨٦]

(ق) لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(باوەڕداران دەبینی: لە بەزەییان بەیەكتر و خۆشەویستییان بۆ یەكتر و سۆزیان بۆ یەكتر، وەك یەك جەستە وان، گەر ئەندامێكی ئازاری هەبێت هەموو جەستەكە بە شەونخوونی و تا و ئازارەوە وەڵامی دەدەنەوە[1])**.

## ٥- دەروازەی: چاكە لەگەڵ دایك و باوك و سیلەی ڕەحم

٣٤٥١- عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ أُبَيِّ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدَهُمَا، ثُمَّ دَخَلَ النَّارَ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ، فَأَبْعَدَهُ اللهُ وَأَسْحَقَهُ).

* إسناده صحيح. [حم١٩٠٢٧ - ١٩٠٢٩، ٢٠٣٢٨]

[انظر: **٢٦١٦، ٢٦١٩، ٢٦٢٩، ٢٦٣٠**].

لە زورارەی كوڕی ئەوفاوە، لە ئوبەی كوڕی مالیكەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(هەر كەس بە دایك و باوكی، یان بە یەكێكیان گەیشت و لەدوای ئەوە چووە ئاگرەوە خودا دووری خستووەتەوە و نەفرەتی لێ كردووە[2])**.

---

[1] واتە: هەموو جەستە هەندێكی هەندێكی تری بانگ دەكات بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ئازارە یەكێك لە ئەندامەكان تووشیهاتووە—و.

[2] واتە: دەبوا بە هۆی چاكە لەگەڵ دایك و باوك بچووبایەتە بەهەشتەوە كە نەیتوانی، ئەوەش ڕووبەڕووی نەفرەتی كردووەتەوە—و.

## ٦- دەروازەی: وەسێت بە جیران

٣٤٥٢- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (ما زَالَ يُوصِينِي جِبْرِيلُ بِالجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ). [خ٦٠١٤/ م٢٦٢٤]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بەردەوام جیبریل وەسێتی بۆ کردم بە جیران تا وا گومانم برد خودا جیران دەکاتە میراتگری جیران).**

٣٤٥٣- (خ) عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الخُزَاعِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (وَاللهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللهِ لاَ يُؤْمِنُ)، قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: (الَّذِي لاَ يَأْمَنُ جارُهُ بَوَائِقَهُ). [خ٦٠١٦]

(خ) لە ئەبی شورەیحی خوزاعیەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بە خودا ئیمانی نەهێناوە، سوێند بە خودا ئیمانی نەهێناوە، سوێند بە خودا ئیمانی نەهێناوە)**، وترا: کێ، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(ئەو کەسەی جیرانەکەی لە شەڕ و خراپەی ئەو ئارام و دڵنیا نییە).**

٣٤٥٤- (خ) عَنْ عائِشَةَ ﵂: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي جارَيْنِ، فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: (إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ باباً). [خ٢٢٥٩]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، دوو جیرانم هەیە، بۆ کامیان هەدیە ببەم؟ فەرمووی: **(بۆ ئەوەیان دەرگاکەی نزیکترە).**

٣٤٥٥- (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا طَبَخْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَهَا، وَتَعَاهَدْ جِيرَانَكَ). [م٢٦٢٥ (١٤٢)]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئەبا زەڕ گەر مەرگەیەکت[1] لێنا ئاوەکەی زۆر بکە و جیرانەکەت بەسەربکەوە).**

---

[1] واتە: شلەیەک-و.

## ٧- دەروازەی: چاکە لەگەڵ منداڵی بێ باوك و بێوەژن و گەدا

**٣٤٥٦**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ، كالْمُجاهِدِ في سَبِيلِ اللهِ)**، وَأَحْسِبُهُ قَالَ ـ يَشُكُّ الْقَعْنَبِيُّ ـ: **(كالْقَائِمِ لاَ يَفْتُرُ، وَكالصَّائِمِ لاَ يُفْطِرُ)**. [خ٦٠٠٧ (٥٣٥٣)/ م٢٩٨٢]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کۆشەر لەپێناو بێوەژن و گەدا وەك موجاهید وایە لە رێگەی خودا)**، پێموایە وتی–قەعنەبی شکی بۆ دروستووە– **(وەك شەونوێژگەر کە شەکەت نابێت و وەك رۆژووگر کە نایشکێنێت[1])**.

**٣٤٥٧**- (خ) عَنْ سَهْلٍ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَنَا وَكافِلُ الْيَتِيمِ في الجَنَّةِ هكَذَا)**. وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئاً. [خ٥٣٠٤]

(خ) لە سەهلەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من و سەرۆکاری منداڵی بێباب لە بەهەشت بەم جۆرەین)**، ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەند کرد و شتێك بۆشایی خستە نێوانیان.

## ٨- دەروازەی: میوانداری

**٣٤٥٨**- (ق) عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْعَدَوِيِّ قَالَ: سَمِعَتْ أُذُنَايَ، وَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ، حِينَ تَكَلَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيُكْرِمْ جارَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جائِزَتَهُ)**. قَالَ: وَما جائِزَتُهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا كانَ وَرَاءَ ذلِكَ فَهْوَ صَدَقَةٌ عَلَيْهِ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيَقُلْ خَيْراً، أَوْ لِيَصْمُتْ)**. [خ٦٠١٩/ م: اللقطة ٤٨ (١٤)]

[وانظر: ـ في إكرام الضيف: **٣٣٣١**.
وفي الضيف إذا تبعه غيره: **٢٦٥٠**.

---

[1] واتە: هەموو رۆژ بەرۆژوو دەبێت–و.

وفي إذا طلب الضيف دعوةَ غيره: **٢٦٥١**.

وفي طلب الدعاء من الضيف الصالح: **٢٦٥٣**].

(ق) لە ئەبی شورەیحی عەدەوییەوە، وتی: ئەم دوو گوێیەم بیستی و ئەم دوو چاوەم بینی کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) قسەی دەکرد و فەرمووی: **(هەر کەس ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە جیرانەکەی بگرێت، هەر کەس ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با لە ڕێگەپێدراودا ڕێز لە میوانەکەی بگرێت)** وتی: ڕێگەپێدراوی چییە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: **(ڕۆژ و شەوێك، میوانداری سێ ڕۆژە، ئەوەی لەدوای ئەوەیە[1] صەدەقەیە لەسەری، هەر کەس ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەیە با خێر بڵێت یان با بێدەنگ بێت)**.

## ٩- دەروازەی: پەسەندی دڵنەوایی کردن بەماڵی زیادە

**٣٤٥٩**- (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى رَاحِلَةٍ لَهُ. قَالَ: فَجَعَلَ يَصْرِفُ بَصَرَهُ يَمِيناً وَشِمَالاً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ؛ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ ظَهْرَ لَهُ. وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ؛ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ زَادَ لَهُ**).

قَالَ: فَذَكَرَ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ مَا ذَكَرَ، حَتَّى رَأَيْنَا أَنَّهُ لاَ حَقَّ لأَحَدٍ مِنَّا فِي فَضْلٍ. [م١٧٢٨]

(م) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: ئێمە لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، پیاوێك لەسەر وڵاخێکی سواری خۆی هات، وتی: چاوی بە لای ڕاست و چەپدا دەگێڕا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس وڵاخی سواری زیادەی لایە با بیدات بەو کەسەی وڵاخی سواری نییە، هەر کەس خۆراکێ زیادەی لایە با بیدات بەو کەسەی خۆراکی نییە)**، وتی: جۆرەکانی ماڵ و سامانی باس کرد، تا پێمانوابوو لە زیادەی شتێك کەسێك لە ئێمە مافێکی نییە.

---

[1] واتە: میوانداری سێ شەو و سێ ڕۆژە، شەو و ڕۆژێك مافی خۆیەتی لە خواردن و خواردنەوە و مانەوە، دوو ڕۆژەکەی تری مانەوە لەسەری صەدەقەیە-و.

## ١٠- دەروازەی: نەهی کردن لە دەستنوقاوویی(ژەنگ و ژاری دەروون)

**٢٤٦٠**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (إِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ! فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالشُّحِّ: أَمَرَهُمْ بِالْبُخْلِ فَبَخِلُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْقَطِيعَةِ فَقَطَعُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْفُجُورِ فَفَجَرُوا). [د١٦٩٨]

* صحيح.

لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاریدا و فەرمووی: **(ئاگادارتان دەکەمەوە لە "الشُحّ-ژەنگ و ژاری دەروون"، ئەوانەی پێش ئێوە بە "الشُحّ" تیاچوون: فەرمانی پێکردن بە دەستنوقاوی دەستنوقاوییان نواند، فەرمانی پێکردن بە بڕینی پەیوەندی پەیوەندییان پچڕاند، فەرمانی پێکردن بە بەدڕەفتاری بەدڕەفتارییان ئەنجامدا).**

## ١١- دەروازەی: دەربارەی هاوەڵێتی

**٣٤٦١**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِناً، وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ). [د٤٨٣٢/ ت٢٣٩٥/ مي٢١٠١]

* حسن.

لە ئەبی سەعیدەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(تەنها هاوەڵیی باوەڕدار بکە و تەنها کەسی تەقوادار خواردنت بخوات).**

**٣٤٦٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ). [د٤٨٣٣/ ت٢٣٧٨]

* حسن.

[وانظر: **٣٤٤٥**].

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(پیاو لەسەر ئاینی خۆشەویستەکەیەتی، با یەکێك لە ئێوە وردبێتەوە کێ دەکاتە خۆشەویستی خۆی).**

# بەشی چوارەم

## ئادابی زمان و ئافەتەکانی

### ١- دەروازەی: پارێزگاری لە زمان

**٣٤٦٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ، مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا، يَزِلُّ بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ المَشْرِقِ). [خ٦٤٧٧/ م٢٩٨٨]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە: گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(بەندە کەلیمەیەك بە دەمیدا دێت تێینافکرێ هەڵیدەخلیسکێنێ بۆ ناو ئاگر دوورتر لەوەی لە نێوان خۆرهەلاتە).**

- وفي رواية لمسلم: (أَبْعَدَ مَا بَيْنَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ).

لە ریوایەتێکی موسلیمدا: **(دوورتر لەوەی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوایە).**

**٣٤٦٤-** (خ) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (مَنْ يَضْمَنْ لِي ما بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ). [خ٦٤٧٤]

(خ) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس نێوان دوو لای ریش و نێوان دوو لاقیم[1] بۆ دەستەبەر بکات بەهەشتی بۆ دەستەبەر دەکەم).**

**٣٤٦٥-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ: (أَمْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ). [ت٢٤٠٦]

* صحيح.

---

[1] واتە: "نێوان دوو لای ریشی" بریتییە لە چاو و گوێ و زمان، "نێوان دوو لاقی" بریتییە لە داوێن—و.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، رزگاری لە چیدایە؟ فەرمووی: **(زمانی خۆت بگرە و ماڵەکەت لە ئامێزت بگرێ و بگری بەسەر هەڵە و گوناهەکانت).**

## ٢- دەروازەی: نەهی کردن لە وتنی هەموو ئەوەی بیستوویەتی

**٣٤٦٦-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِباً أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ).** [م المقدمة ٥]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەسە درۆ بۆ کەسێك هەموو ئەوەی بیستوویەتی بیڵێت).**

## ٣- دەروازەی: پابەندبوون بە صدق و وازهێنان لە درۆ

**٣٤٦٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يَكُونَ صِدِّيقاً. وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً).** [خ٦٠٩٤/ م٢٦٠٧]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(صدق رێنموونی دەکات بۆ خێر و چاکە، خێر و چاکەش رێنموونی دەکات بۆ بەهەشت، پیاو راست دەکات تا دەبێتە صدیق، درۆ سەردەکێشێت بۆ بەدرەفتاری، بەدرەفتاریش سەردەکێشێت بۆ ئاگر، پیاو درۆ دەکات تا لای خودا بە درۆزن دەنوسرێت).**

**٣٤٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ قَالَ: **(مَنْ قَالَ لِصَبِيٍّ: تَعَالَ هَاكَ، ثُمَّ لَمْ يُعْطِهِ فَهِيَ كَذْبَةٌ).** [حم٩٨٣٦]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، ئەو فەرمووی: **(هەر کەس بە منداڵێکی وت: وەرە شتێکت پێ بدەم، پاشان پێینەدا ئەوە درۆیەکە).**

## ٤- دەروازەی: ئەوەی موباحە لە درۆ

**٣٤٦٩-** (ق) عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَنْمِي خَيْرًا، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا). [خ٢٦٩٢/ م٢٦٠٥]

(ق) لە ئوم کولسوومی کچی عوقبەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(ئەو کەسەی لە نێوان خەڵك ئیصلاح دەکات، خێر پەرە پێ دەدات، یان خێر دەڵێت، درۆزن نییە[1]).**

- وزاد في رواية لمسلم: وقالت: وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ كَذِبٌ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ: الْحَرْبُ، وَالإِصْلاَحُ بَيْنَ النَّاسِ، وَحَدِيثُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ، وَحَدِيثُ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا.

**لە ریوایەتێکی موسلیمدا ئەمە زیادبووە: (هەروەها ئوم کولسووم وتی: نەمبیستووە پێغەمبەر مۆڵەت لە شتێکدا بدات لەوەی خەڵك دەیڵێن درۆیە جگە لە سیان: جەنگ، چاککردنی نێوانی خەڵك، و قسەی پیاو بۆ ژنەکەی و قسەی ژن بۆ پیاوەکەی).**

## ٥- دەروازەی: نەیاری سەرسەخت

**٣٤٧٠-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ). [خ٢٤٥٧/ م٢٦٦٨]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خراپترین پیاو لە لای خودا نەیاریکەری سەرسەختە).**

---

[1] واتە: گەر بۆ چاککردنی نێوان دوو کەس شتێك بڵێت واقیع بەو جۆرە نەبێت ئەوە نابێتە درۆ-و.

**٣٤٧١**- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي كُلُّ مُنَافِقٍ عَلِيمِ اللِّسَانِ**). [حم١٤٣، ٣١٠]

* إسناده قوي.

له عومەری کوڕی خەتابەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەوەی زۆر لێی دەترسم لەسەر ئومەتەکەم هەموو دووڕوویەکی زمانزانە)**.

## ٦- دەروازەی: حەرامکردنی غەیبەت و دووزمانی و قسەی زوور

**٣٤٧٢**- (ق) عَنْ هَمَّامٍ قالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَجُلاً يَرْفَعُ الحَدِيثَ إِلَى عُثْمَانَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَّاتٌ**).

[خ٦٠٥٦/ م١٠٥]

(ق) لە هەممامەوە، وتی: لەگەڵ حوزەیفە بووین، پێیوترا: پیاوێك قسە بۆ عوسمان بەرزدەکاتەوە، حوزەیفە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(کەسی دووزمان ناچێتە بەهەشتەوە)**.

**٣٤٧٣**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ للهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ**). [خ١٩٠٣]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس قسەی زوور[1] و کارکردن پێی وازلێنەهێنێت خودا پێویستی بەوە نییە خواردن و خواردنەوەی وازلێبهێنێت)**.

**٣٤٧٤**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ**)؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (**ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ**) قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: (**إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ؛ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ. وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ؛ فَقَدْ بَهَتَّهُ**). [م٢٥٨٩]

---

[1] واتە: "زوور" بریتییە لە درۆ و غەیبەت و بوختان-و.

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دەزانن غەیبەت چییە؟)**، وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: **(باس کردنی براکەت بە شتێك لای ناپەسەندە)**، وترا: ئەی ئەگەر ئەوەی دەیڵێم لە براکەمدا بوو؟ فەرمووی: **(گەر ئەوەی تێدایە تۆ دەیڵێی ئەوە غەیبەتت کردووە، گەر ئەوەی تێدا نەبێت بوختانت بۆ دروست کردووە)**.

**٣٤٧٥**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ، يَخْمُشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ، فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلاَءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلاَءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ، وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ). [د٤٨٧٨، ٤٨٧٩]

* صحيح.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێ بەرزکرامەوە[1]، بەپاڵ کۆمەڵێکدا تێپەڕیم نینووکیان لە قوڕقوشم بوو، روخسار و رووی خۆیان دەڕنی، وتم: ئەی جیبریل، ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن گۆشتی خەڵك دەخۆن و دەم دەخەنە حەیا و حورمەتیان)**.

**٣٤٧٦**– عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيمَانُ قَلْبَهُ، لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنِ اتَّبَعَ عَوْرَاتِهِمْ يَتَّبِعُ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ يَتَّبِعِ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ فِي بَيْتِهِ). [د٤٨٨٠]

* حسن صحيح.

لە ئەبی بەرزەی ئەسلەمییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی ئەو کۆمەڵەی بە زمان ئیمانیان هێناوە و ئیمان نەچووەتە ناو دڵیانەوە، غەیبەتی موسڵمانان مەکەن و شوێنی عەوراتیان مەکەون، چونکە هەر کەس شوێنی عەوراتیان بکەوێت خودا شوێنی عەورەتی دەکەوێت، هەر کەسیش خودا شوێنی عەورەتی بکەوێت لە ماڵەکەی خۆیدا رسوا و شەرمەزاری دەکات)**.

---

[1] واتە: لە شەوی میعراجدا–و.

## ٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی دووڕوو هاتووە

٣٤٧٧- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (تَجِدُ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللهِ ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هؤُلاَءِ بِوَجْهٍ، وَهؤُلاءِ بِوَجْهٍ).
[خ٦٠٥٨ (٣٤٩٤)/ م: البر والصلة ٢٥٢٦ (٩٨)]

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لە ڕۆژی قیامەت دەبینی لای خودا خراپترینی خەڵك دووڕووانن، ئەو کەسەی بە ڕوویەکەوە دێت بۆ لای ئەوانەوە و بە ڕوویەکی ترەوە دێت بۆ لای ئەمانە).**

## ٨- ئاشکراکردنی یاخیبوون

٣٤٧٨- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (كُلُّ أُمَّتِي مُعَافى إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ، وَإِنْ مِنَ الْمُجَاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً، ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ اللهُ، فَيَقُولُ: يَا فُلاَنُ، عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا، وَقَدْ باتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللهِ عَنْهُ).
[خ٦٠٦٩/ م٢٩٩٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(هەموو ئومەتەکەم عافییەتدارن جگە لە ئاشکراکاران، لە ئاشکراکاری ئەوەیە پیاو بە شەو کارێك[1] بکات و پاشان ڕۆژی لێبێتەوە–لە کاتێکدا خودا ئەوی داپۆشیوە– بڵێت: ئەی فلان، دوێنێ ئەوە و ئەوەم کرد، ئەو شەوی بەسەردا دێت و خودا دایدەپۆشێ و ڕۆژی لێ دەبێتەوە و داپۆشینی خودا لەسەر خۆی لادەبات).**

## ٩- دەروازەی: نەهی کردن لە جنێو

٣٤٧٩- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ). [خ٤٨/ م٦٤]

---

[1] واتە: کارێکی خراپ–و.

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(جنێودان بە موسڵمان (فسوق–لادانە) و جەنگان لەگەڵی بێباوەڕییە)**.

**٣٤٨٠–** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ، فَعَلَى الْبَادِئِ، مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ**). [م٢٥٨٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(تاوانی دوو جنێودەرەکە لەسەر ئەوەیانە دەستی پێکردووە گەر ستەملێکراوەکە دەستدرێژی نەکات[1])**.

## ١٠– دەروازەی: نەهیکردن لە حەسوودی بەیەکتر بردن و پشتهەڵکردن لە یەکتر و گومانی خراپ

**٣٤٨١–** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَجَسَّسُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَاناً**). [خ٦٠٦٦ (٥١٤٣)/ م٢٥٦٣]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگادارتان دەکەمەوە لە گومان، گومان درۆترین قسەیە، بەدوای هەواڵدا مەگەڕێن، جاسووسی مەکەن، نرخ لەسەر یەکتر زیاد مەکەن و حەسوودی بە یەکتر مەبەن و رق و کینەتان لە یەکتر نەبێت و پشت لە یەکتر مەکەن و بەندەی خودا و برا بن)**.

**٣٤٨٢–** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَاناً، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ**). [خ٦٠٦٥/ م٢٥٥٩]

[1] واتە: تێپەڕێنێت و سنوورەکان نەبەزێنێت–و.

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(رقتان لەیەکتر نەبێت و حەسوودی بە یەکتر مەبەن و پشت مەکەن لە یەکتر، بەندەی خودا و برای یەکتر بن، حەڵاڵ نییە بۆ موسڵمانێك لە سەروو سێ رۆژەوە کۆچ لە براکەی بکات).**

**٣٤٨٣**– عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ: الْحَسَدُ وَالْبَغْضَاءُ، هِيَ الْحَالِقَةُ، لاَ أَقُولُ: تَحْلِقُ الشَّعَرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَفَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِمَا يُثَبِّتُ ذَاكُمْ لَكُمْ، أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ). [ت٢٥١٠]

* حسن.

لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(نەخۆشی گەلانی پێش خۆتان رووی لێکردن، حەسوودی و رق و کینە کە بریتین برین، نالێم پرچ دەبڕێت، بەڵکو دین دەبڕێت، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ناچنە بەهەشتەوە تا ئیمان دەهێنن، ئیمان ناهێنن تا یەکترتان خۆشدەوێت، دەتەوێ هەواڵتان پێ بدەم بە شتێك ئەوانەتان بۆ جێگیر و دامەزراو بکات، سەلام لە نێوانتان پەخش بکەنەوە).**

## ١١- دەروازەی: کەسێك بە براکەی بڵێت: ئەی کافر

**٣٤٨٤**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أَيُّمَا رَجُلٍ قالَ لأَخِيهِ: يَا كَافِرُ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا). [خ٦١٠٤/ م٦٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر پیاوێك بە براکەی خۆی وت: ئەی کافر، دەگەڕێتەوە بۆ یەکێکیان).**

**٣٤٨٥**– (خ) عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفُسُوقِ، وَلاَ يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ، إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذلِكَ).

[خ٦٠٤٥ (٣٥٠٨)]

(خ) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(با پیاوێك پیاوێکی تر بە فسوق[1] تۆمەتبار نەکات، هەروەها با بە کوفر تۆمەتباری نەکات، گەر هاوەڵەکەی بەو جۆرە نەبێت دەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆی).**

## ١٢- دەروازەی: نەهیکردن لە نەفرەت

**٣٤٨٦-** (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(إِنَّ اللَّعَّانِينَ لاَ يَكُونُونَ شُهَدَاءَ، وَلاَ شُفَعَاءَ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ).** [م٢٥٩٨]

(م) لە ئەبی دەرداوە: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(نەفرەتکاران لە ڕۆژی قیامەت بە شایەت و تکاکار ناگیرێن).**

**٣٤٨٧-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(لاَ يَنْبَغِي لِصِدِّيقٍ أَنْ يَكُونَ لَعَّاناً).** [م٢٥٩٧]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(نابێ کەسی صەدیق نەفرەتکار بێت).**

**٣٤٨٨-** (م) وَعَنْهُ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، قَالَ: **(إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّاناً، وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً).** [م٢٥٩٩]

(م) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا دوعا لە هاوەڵدانەران بکە، فەرمووی: **(من وەك نەفرەتکار ڕەوانە نەکراوم، بەڵکو وەك ڕەحمەت ڕەوانەکراوم).**

**٣٤٨٩-** (م) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، وَامْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى نَاقَةٍ، فَضَجِرَتْ، فَلَعَنَتْهَا. فَسَمِعَ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: **(خُذُوا مَا عَلَيْهَا وَدَعُوهَا، فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ).**

---

[1] واتە: لادان و خراپەکاری و بەدڕەفتاری-و.

قَالَ عِمْرَانُ: فَكَأَنِّي أَرَاهَا الآنَ تَمْشِي فِي النَّاسِ، مَا يَعْرِضُ لَهَا أَحَدٌ. [م٢٥٩٥]

(م) لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە، وتی: كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە یەكێك لە سەفەرەكانی بوو، ئافرەتێكی ئەنصار لەسەر حوشترێكی مێیە بوو، وەڕس بوو و نەفرەتی لە حوشترەكە كرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بیست و فەرمووی: **(ئەوەی لەسەریەتی لێیبكرنەوە[1] و وازیلێبهێنن، چونكە ئەوە نەفرەتلێكراوە).**

عیمران دەڵێت: وەك ئەوەی ئێستا حوشترەكەم لەبەرچاو بێت بەناو خەڵكدا دەڕۆیشت و هیچ كەس بەری نەدەگرت.

## ١٣- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی مەدح هاتووە

٣٤٩٠- (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: أَثْنَى رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: (وَيْلَكَ! قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ). مِرَاراً، ثُمَّ قَالَ: (مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحاً أَخَاهُ لاَ مَحَالَةَ، فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلاَناً، وَاللهُ حَسِيبُهُ، وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَداً، أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا، إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذلِكَ مِنْهُ). [خ٢٦٦٢/ م٣٠٠٠]

(ق) لە ئەبی بەكرەوە، وتی: پیاوێك لای پێغەمبەر(ﷺ) سەنای پیاوێكی كرد، پێغەمبەر فەرمووی: **(هاوار بە حاڵت، گەردنی هاوەڵەكەت پەڕاند)**، چەندین جار[2]، پاشان فەرمووی: **(گەر هەر دەبێت یەكێك لە ئێوە مەدحی براكەی بكات با بڵێت: وا دادەنێم فلان، خودا باشتری دەناسێ، هیچ كەس بەسەر خودادا تەزكییە ناكەم، پێموایە ئاوا و ئاوایە، گەر ئەوە لە ئەوەوە دەزانێت[3]).**

[1] واتە: كۆڵ و بارەكەی لە كۆڵ بكەنەوە-و.

[2] واتە: چەندین جار ئەوەی فەرموو-و.

[3] واتە: گەر دەزانێت ئەو سیفەتە باشەی تێدایە-و.

**٣٤٩١**– (م) عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ: أَنَّ رَجُلاً جَعَلَ يَمْدَحُ عُثْمَانَ، فَعَمِدَ الْمِقْدَادُ، فَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَكَانَ رَجُلاً ضَخْماً، فَجَعَلَ يَحْثُو فِي وَجْهِهِ الْحَصْبَاءَ. فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا رَأَيْتُمُ الْمَدَّاحِينَ، فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ**). [م٣٠٠٢]

**(م) لە هەممامی كوڕی حاریسەوە: پیاوێك مەدحی عوسمانی دەكرد، میقداد بـۆی چوو لەسەر دوو ئەژنۆی دانیشت، میقداد پیاوێكی زەبـەلاح بـوو، وردە چـەو و زیخـی دەكرد بە روخساریدا، عوسمـان پێـی وت: چـیتە، بـۆ وا دەكـەی؟ وتـی: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر مەدحكارانتان بینی خۆڵ بكەن بە روخسارياندا[1]).**

**٣٤٩٢**– (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يَعْمَلُ الْعَمَلَ مِنَ الْخَيْرِ، وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ؟ قَالَ: (**تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ**). [م٢٦٤٢]

**(م) لە ئەبی زەڕەوە وتی: بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وترا: باشە گەر پیاوێك كـاری لە خێر ئەنجام بدات و خەڵكی لەسەری مەدحی بكەن؟[2] فـەرمووی: (ئـەوە مـژدەی خێرای باوەڕدارە).**

**٣٤٩٣**– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: كَيْفَ لِي أَنْ أَعْلَمَ إِذَا أَحْسَنْتُ وَإِذَا أَسَأْتُ؟ قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا سَمِعْتَ جِيرَانَكَ يَقُولُونَ: أَنْ قَدْ أَحْسَنْتَ؛ فَقَدْ أَحْسَنْتَ، وَإِذَا سَمِعْتَهُمْ يَقُولُونَ: قَدْ أَسَأْتَ؛ فَقَدْ أَسَأْتَ**). [جه٤٢٢٣]

* صحيح.

---

(١) میقداد(خوا لێی رازی بێت) زاهیری فەرموودەكەی وەرگرت و جێبەجێی كرد، عوسمان(خوا لێی رازی بێت) یان فەرموودەكەی نەبیستبوو یان مانایەكی تر حاڵی بـوو بـوو، ئـەوەش: مانای (خۆڵ بكەن بە روخسارياندا) واتە هیچیان پێ مەدەن و بێهیوایان بكەن–و.

(٢) واتە: ئایا ئەو مەدحە بەر ئەو نەهییە دەكەوێت دەربارەی مەدحكاران هـاتووە، تەماشـای فەرموودەی ٣٤٩١ بكە،–و.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوودەوە، وتی: پیاوێك بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) وت: چۆن بزانم چاکم کردووە یان خراپم ئەنجامداوە؟ فەرمووی: **(گەر لە جیرانەکەت بیست بڵێن: چاکت کردووە، ئەوە چاکت کردووە، گەر بیستان بڵێن: خراپت ئەنجامداوە، ئەوە خراپت ئەنجامداوە).**

**٣٤٩٤**– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْ مَلَأَ اللهُ أُذُنَيْهِ** مِنْ ثَنَاءِ النَّاسِ خَيْراً، وَهُوَ يَسْمَعُ، وَأَهْلُ النَّارِ مَنْ مَلَأَ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَنَاءِ النَّاسِ شَرّاً وَهُوَ يَسْمَعُ).

* حسن صحيح.	[جه٤٢٢٤]

لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەهلی بەهەشت ئەو کەسەیە خودا دوو گوێی پڕ کردووە لە سەنای خەڵك و ئەو دەیبیستێت، ئەهلی ئاگریش ئەو کەسەیە خودا دوو گوێی پڕ کردووە لە سەنای شەڕی خەڵك و ئەو دەیبیستێ).**

## ١٤- دەروازەی: شاردنەوەی نهێنی

**٣٤٩٥**– (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثاً، لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَداً مِنَ النَّاسِ.	[م٣٤٢ و٢٤٢٩]

(م) لە عەبدوڵای کوڕی جەعفەرەوە، وتی: ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لە پاشکۆی خۆی سواری کردم، قسەیەکی نهێنی بۆ کردم، بۆ هیچ کەس لە خەڵکی باس ناکەم.

## ١٥- دەروازەی: تکاکار بن پاداشت دەدرێنەوە

**٣٤٩٦**– (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا جَاءَهُ السَّائِلُ، أَوْ طُلِبَتْ إِلَيْهِ حَاجَةٌ، قَالَ: (**اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا، وَيَقْضِي اللهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلّم ما شَاءَ**).	[خ١٤٣٢/ م٢٦٢٧]

(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گەر پرسیارکەرێك بهاتبایە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) یان پێویستییەکی لێ داوابکرابایە دەیفەرموو: **(تکاکاری بکەن پاداشت دەدرێنەوە و خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی هەرچی بخوازێت بڕیاری لێ دەدات).**

## ١٦- دەروازەی: فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە

**٣٤٩٧**- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ أَنَّهُ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّكُمْ تَقْرَؤُونَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ [المائدة:١٠٥]، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ، فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ**). [د٤٣٣٨/ ت٢١٦٨/ جه٤٠٠٥]

* صحيح.

لە ئەبی بەكری صدیقەوە، ئەو وتی: ئەی خەڵكینە، ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ [المائدة:١٠٥]- ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەوەی لەسەرتانە نەفسی خۆتانە، ئەو كەسەی گومڕا دەبێت زیان بە ئێوە ناگەیەنێت گەر ئێوە هیدایەتخواز بن-، من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر خەڵكی ستەمكاریان بینی و دوو دەستیان نەگرت خەریكە خودا بە سزایەك لە خۆیەوە هەموویان دابگرێتەوە)**.

**٣٤٩٨**- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَاباً مِنْهُ، ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يَسْتَجِيبُ لَكُمْ**). [ت٢١٦٩]

* حسن.

لە حوزەیفەی كوڕی یەمانەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو كەسەی نەفسی منی بە دەستە، فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێگری لە خراپە دەكەن یا نزیكە خودا سزایەك لە خۆیەوە ڕەوانەی سەر ئێوە بكات، پاشان داوای لێ دەكەن و وەڵامتان نەداتەوە)**.

**٣٤٩٩**– عَنِ الْعُرْسِ ابْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا عُمِلَتِ الْخَطِيئَةُ فِي الْأَرْضِ، كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا . وَقَالَ مَرَّةً: أَنْكَرَهَا . كَانَ كَمَنْ غَابَ عَنْهَا، وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا**). [د٤٣٤٥، ٤٣٤٦]

* حسن.

له عورسی کوڕی عەمیرەی کیندییەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر هەڵە و خراپە لە زەوی ئەنجامدرا، ئەو کەسەی لەسەری ئامادە بوو و لای ناپەسەند بوو– جارێك فەرمووی: بەرەنگاری بوویەوە– وەك ئەو کەسە وایە لە خراپەکە بزر بووە[1]، ئەو کەسەی لێی بزرە و رازییە بە خراپەکە وەك ئەو کەسە وایە ئامادەیە لەسەری)**.

**٣٥٠٠**– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَامَ خَطِيباً فَكَانَ فِيمَا قَالَ: (**أَلاَ لاَ يَمْنَعَنَّ رَجُلاً هَيْبَةُ النَّاسِ، أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ إِذَا عَلِمَهُ**).

قَالَ: فَبَكَى أَبُو سَعِيدٍ وَقَالَ: قَدْ وَاللهِ رَأَيْنَا أَشْيَاءَ، فَهِبْنَا. [جه٤٠٠٧]

* صحيح.

له ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ وتاردان بە پێوە وەستا، لەوەی فەرمووی: **(هەیبەت و ترسی خەڵك رێگری لە پیاوێك نەکات حەقێك بڵێت گەر زانی[2])**.

**وتی: ئەبو سەعید گریا و وتی: سوێند بە خودا، کۆمەڵێك شتمان بینی و ترساین.**

## ١٧- دەروازەی: ناوهێنان بە رێگەی گاڵتە پێکردن

**٣٥٠١**– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: حَسْبُكَ مِنْ صَفِيَّةَ كَذَا وَكَذَا . تَعْنِي: قَصِيرَةً . فَقَالَ: (**لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ**).

---

[1] واتە: وەك ئەو کەسەی لەسەر خراپەکە ئامادە نییە و پێی ئاگادار نییە–و.

[2] واتە:گەر زانستی هەبوو بەوەی ئەو قسەیە حەقە با بیکات–و.

قَالَتْ: وَحَكَيْتُ لَهُ إِنْسَاناً، فَقَالَ: (مَا أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ إِنْسَاناً، وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا).

* صحيح. [د٤٨٧٥/ ت٢٥٠٢]

لە عائیشەوە، وتی: وتم: بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە بەسە بۆ تۆ "صَفِيَّة" ئاوا و ئاوا بێت–مەبەستی ئەوە بوو کورتەباڵایە– پێغەمبەر فەرمووی: **(قسەیەکت کرد گەر تێکەڵ بە ئاوی دەریا بکرێت بۆگەنی دەکات)**.

عائیشە وتی: باسی کەسێکم بۆ کرد، فەرمووی: **(پێمخۆش نییە قسە لە کەسێك بکەم لە کاتێکدا خۆم ئەوە و ئەوەم هەیە)**.



# بەشی پێنجەم

## ئادابی سەلام

### ١- دەروازەی: (لە نێوان خۆتان سەلام بڵاوە پێ بکەن)

٣٥٠٢- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَ لاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ). [م٥٤]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ناچنە بەهەشتەوە تا ئیمان دەهێنن، ئیمان ناهێنن تا یەکترتان خۆشدەوێت، دەتانەوێ شتێکتان پێ نیشان بدەم گەر ئەنجامتان دا یەکترتان خۆشدەوێت؟ سەلام لە نێوانتان بڵاوە پێ بکەن).**

### ٢- دەروازەی: ژمارە کەم سەلام لە زۆر دەکات

٣٥٠٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ). [خ٦٢٣٢ (٦٢٣١)/ م٢١٦٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوار سەلام لە پیادەڕەو دەکات، گوزەرکەر سەلام لە دانیشتوو دەکات، کەم سەلام لە زۆر دەکات).**

- وفي رواية للبخاري: (يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ). [خ٦٢٣١]

لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا: **(بچووک سەلام لە گەورە دەکات، گوزەرکەر لە دانیشتوو و کەم لە زۆر).**

## ٣- دەروازەی: سەلام لەوەی دەیناسی و کەسانی تر

٣٥٠٤- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قَالَ: (تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ).

[خ١٢/ م٣٩]

**(ق) له عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە: پیاوێك له پێغەمبەری خودای(ﷺ) پرسی: كام ئیسلام باشترینە؟ فەرمووی: (خواردن ببەخشی، و سەلام بخوێنی بەسەر ئەوەی دەیناسی و ئەوەی نایناسی).**

## ٤- دەروازەی: سەلام له منداڵان

٣٥٠٥- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّهُ مَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَفْعَلُهُ. [خ٦٢٤٧/ م٢١٦٨]

**(ق) له ئەنەسی كوڕی مالیكەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ئەو بە پاڵ منداڵاندا گوزەری كرد و سەلامی لێكردن و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی ئەنجام دەدا.**

## ٥- دەروازەی: فەزڵی سەلام كردن و ئەو كەسەی دەستپێشخەرە و دووبارە كردنەوەی

٣٥٠٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلاَمِ). [د٥١٩٧/ ت٢٦٩٤]

* صحيح.

**له ئەبی ئومامەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لەپێشترن كەس بە خودا ئەو كەسەیە دەستپێشخەری دەكات بە سەلام لێیان).**

٣٥٠٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ، ثُمَّ جَلَسَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَشْرٌ**).

ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَجَلَسَ، فَقَالَ: (**عِشْرُونَ**).

ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَجَلَسَ، فَقَالَ: (**ثَلَاثُونَ**).

* صحيح. [د٥١٩٥/ ت٢٦٨٩/ مي٢٦٨٢]

**لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: "السلام علیکم"، پێغەمبەر وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دە).**

**پاشان پیاوێکی تر هات و وتی: "السلام علیکم ورحمة الله"، پێغەمبەر وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر فەرمووی: (بیست).**

**پاشان پیاوێکی تر هات و وتی: "السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته"، پێغەمبەر وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پیاوەکە دانیشت و پێغەمبەر فەرمووی: (سی).**

٣٥٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَجْلِسِ؛ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ، فَلَيْسَتِ الْأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الْآخِرَةِ**).

* حسن صحيح. [د٥٢٠٨/ ت٢٧٠٦]

**لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر یەکێك لە ئێوە گەیشتە مەجلیسێك، با سەلام بکات، گەر ویستی هەستێت با سەلام بکات، یەکەمیان لەپێشتر نییە بە دواتریان).**

٣٥٠٩- عَنْ عُمَرَ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ! السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَيَدْخُلُ عُمَرُ؟ [د٥٢٠١]

* صحيح.

لە عومەرەوە: ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە هەرزاڵێکی[1] خۆیدا بوو، وتی: السلام عليك، ئەی پێغەمبەری خودا، السلام عليكم، ئایا عومەر بێتە ژوورەوە؟.

## ٦- دەروازەی: سەلام لە ئافرەتان

**٣٥١٠**- عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ يَزِيدَ قالتْ: مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي نِسْوَةٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا.

* صحيح. [د٥٢٠٤/ جه٣٧٠١/ مي٢٦٧٩]

لە ئەسمای کچی یەزیدەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵماندا گوزەری کرد، کۆمەڵێك ئافرەت بووین، سەلامی لێکردین.

## ٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی "هەستانەسەرپێ" هاتووە

**٣٥١١**- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ: وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا، لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهِيَتِهِ لِذَلِكَ. [ت٢٧٥٤]

* صحيح.

لە ئەنەسەوە، وتی: کەسێك نەبوو لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆشەویستتر بێت لە لایان، وتی: ئەوان[2] گەر بیانبینیبایە هەڵنەدەستان لەبەری، لەبەر زانینیان بە بێزاریی پێغەمبەر بەو کارە.

## ٨- دەروازەی: تەوقە و دەستکردنە گەردن

**٣٥١٢**- (خ) عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَكَانَتِ المصَافَحَةُ فِي أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: نَعَمْ. [خ٦٢٦٣]

---

(١) هەرزاڵ: جێنووستن و شوێنێکی بچووکە بۆ مانەوە-و.

(٢) واتە: هاوەڵان-و.

(خ) لە قەتادەوە، وتی: بە ئەنەسم وت: ئایا تەوقە هەبوو لەناو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)؟ وتی: بەڵێ.

**٣٥١٣**– عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ، فَيَتَصَافَحَانِ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا**). [د٥٢١٢/ ت٢٧٢٧/ جه٣٧٠٣]

* صحيح.

**لە بەرائەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر دوو موسڵمانێك بەیەكتر بگەن و تەوقە بكەن لێیانخۆش دەبێت بەرلەوەی جیاببنەوە).**

**٣٥١٤**– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقَى أَخَاهُ، أَوْ صَدِيقَهُ، أَيَنْحَنِي لَهُ؟ قَالَ: (**لاَ**)، قَالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قَالَ: (**لاَ**)، قَالَ: فَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**). [ت٢٧٢٨/ جه٣٧٠٢]

* حسن.

**لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە، وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پیاو لە ئێمە بە براكەی یان بە دۆستەكەی دەگات، ئایا بۆی بچەمێتەوە؟ فەرمووی: (نەخێر)، وتی: ئایا پێیەوە بنووسێ و ماچی بكات؟ فەرمووی: (نەخێر)، وتی: ئایا دەستی بگرێت و تەوقەی لەگەڵ بكات؟ فەرمووی: (بەڵێ).**

## ٩- دەروازەی: چۆنێتی سەلام لە ئەهلی كیتاب

**٣٥١٥**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمُ الْيَهُودُ، فَإِنَّمَا يَقُولُ أَحَدُهُمْ: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقُلْ: وَعَلَيْكَ**). [خ٦٢٥٧/ م٢١٦٤]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: **(گەر یەهوود سەلامیان لێکردن، یەکێك لەوان دەڵێت: "السام عليك"[1]، تۆش بڵێ: "وعليك"[2]")**.

## ١٠- دەروازەی: دەست ماچ کردن

**٣٥١٦-** عن عبد الله بن عمر – وذَكَرَ قِصّةً- قال: فَدَنَوْنَا، -يعني: مِنَ النَّبِي صلى الله عليه وسلم- فَقَبَّلْنَا يَدَهُ. [د٥٢٢٣/ جه٣٧٠٤]

* ضعيف.

[انظر: **٦٩٣**].

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە –چیرۆکێکی باس کرد– وتـی: لێـی نزیکبووینـەوە– واتە: لە پێغەمبەر(ﷺ)– دەستمان ماچ کرد.



[1] "السام عليك" ئەم دەربڕینە گەر کەسەکە بەخێرایی بەسـەر زمانیـدا جـاری ببێـت گـوێگر وادەزانێ وتوویەتی "السلام عليك"، ماناکەی "مەرگت لەسـەر بێـت"، یـەهوود نـەفرەتی خودایـان لـێ بێت بـۆ پێغەمبـەر و هـاوەڵان بـەکاریان دەهێنـا و دووڕوویـی و بێبـاوەڕی خۆیان لەپشت ئەو دەربڕینەوە دەشاردەوە–و.

[2] کە ئەو دەڵێ "مەرگت لەسەر بێت" تۆش بڵێ: "لەسەر تۆش"–و.

## بەشی شەشەم

# ئەوەی دەربارەی هۆنراوە و کەلیمات و لەهو هاتووە

## ١- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی هۆنراوە هاتووە

**٣٥١٧-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللهَ بَاطِلُ. وَكادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ**).
[خ٦١٤٧ (٣٨٤١)/ م٢٢٥٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(ڕاستگۆترین کەلیمەیەك شاعیر وتبێتی کەلیمەکەی لەبیدە: دەزانن هەر شتێك خاڵی بێت لە خودا باتڵە". ئومەیەی کوڕی ئەبی صەلت[1] خەریك بووە موسڵمان بێت).**

**٣٥١٨-** (خ) عَنِ ابنِ عمرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قال: (**لأَن يَمتلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً، خيرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمتلِئَ شِعراً**). [خ٦١٥٤]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(گەر ناخی یەکێك لە ئێوە پڕ بێت لە کیماو[2] باشترە بۆی لەوەی پڕ بێت لە هۆنراوە).**

**٣٥١٩-** (خ) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً**). [خ٦١٤٥]

(خ) لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(لە هۆنراوەدا حیکمەتێك هەیە).**

---

(١) واتە: یەکێك بووە لە شاعیرانی سەردەمی نەفامی-و.

(٢) کیماو: ئەو خوێن و پیسییە لە برینی پیسەوە سەرهەڵدەدات-و.

**٣٥٢٠**– (م) عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَدِفْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْماً، فَقَالَ: (**هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ شَيْئاً**)؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: (**هِيهِ**) فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتاً. فَقَالَ: (**هِيهِ**)، ثُمَّ أَنْشَدْتُهُ بَيْتاً. فَقَالَ: (**هِيهِ**) حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ. [م٢٢٥٥]

(م) لە عەمری کوڕی شەریدەوە، لە باوکییەوە، وتی: ڕۆژێك لە پاشکۆی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووم فەرمووی: **(ئایا هۆنراوەی "ئومەیەی کوڕی ئەبی صەلت" ت لە لایە)**، وتم: بەڵێ، فەرمووی: **(ئێ)**، دێڕێکم بۆ وت، فەرمووی: **(ئێ)**، پاشان دێڕێکی ترم بۆ وت، فەرمووی: **(ئێ)**، تا سەد دێڕم بۆ خوێندەوە[1].

**٣٥٢١**– عَنْ عَائِشَةَ قِيلَ لَهَا: هَلْ كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَمَثَّلُ بِشَيْءٍ مِنَ الشِّعْرِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ ابْنِ رَوَاحَةَ، وَيَتَمَثَّلُ وَيَقُولُ: (**وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ**).

* صحيح. [ت٢٨٤٨]

لە عائیشەوە: پێی وترا: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) بە شتێك لە هۆنراوە نموونەی دەهێنایەوە؟ وتی: نموونەی بە هۆنراوەی ئیبن ڕەواحە دەهێنایەوە، نموونەی دەهێنایەوە و دەیفەرموو: (**"ويأتيك بأخبار مَنْ لم تُزوِّد"**[2]).

**٣٥٢٢**– عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: إِنَّ اللهَ عزّ وجل قَدْ أَنْزَلَ فِي الشِّعْرِ مَا أَنْزَلَ، فَقَالَ: (**إِنَّ الْمُؤْمِنَ يُجَاهِدُ بِسَيْفِهِ وَلِسَانِهِ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَكَأَنَّ مَا تَرْمُونَهُمْ بِهِ نَضْحُ النَّبْلِ**). [حم٢٧١٧٤، ١٥٧٨٥، ١٥٧٨٦، ١٥٧٩٦]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە، ئەو بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: خودا(عز وجل) ئەوەی دابەزاندووە دەربارەی هۆنراوە کە دایبەزاندووە، پێغەمبەر فەرمووی: **(باوەڕدار بە**

---

[1] ئەوەش زیرەکی و بیر تیژی و زەکاوەتی ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر دەگەیەنێت لە لەبەرکردنی سەد دێڕ هۆنراوەی شاعیرێکی وەك ئومەیە بەو گشتە وردەکارییەوە–و.

[2] ئەمە نیو دێڕ هۆنراوەی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەیە، یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر–و.

**شمشێر و بە زمانی تێدەکۆشێت، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە وەك ئەوەی رمبارانیان بکەن).**

## ٢- دەروازەی: لە بەیاندا ئەفسوونێك هەیە

**٣٥٢٣-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ قَدِمَ رَجُلاَنِ مِنَ المشْرِقِ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْراً، أَوْ: إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ**). [خ٥٧٦٧ (٥١٤٦)]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): دوو پیاو لە خۆرهەڵاتەوە هاتن و وتاریان دا، خەڵك سەرسامبوون بە بەیانیان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە بەیاندا ئەفسوونێك هەیە، یان: هەندێ بەیان ئەفسوونە).**

## ٣- دەروازەی: نەرم و نیانی بە "القوارير[1]"

**٣٥٢٤-** (ق) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ وَمَعَهُنَّ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَقَالَ: (**وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ سَوْقاً بِالْقَوَارِيرِ**).قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَتَكَلَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِكَلِمَةٍ، لَوْ تَكَلَّمَ بِهَا بَعْضُكُمْ لَعِبْتُمُوهَا عَلَيْهِ؛ قَوْلُهُ: (**سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ**). [خ٦١٤٩/ م٢٣٢٣]

**(ق) لە ئەبی قیلابەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای هەندێ لە خێزانەکانی و ئوم سولەیمانیان لەگەڵ بوو، فەرمووی: (هاوار بە حاڵت، ئەی ئەنجەشە[2]، لەسەرخۆبە "القوارير" بدەبەر).**

**ئەبو قیلابە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کەلیمەیەکی فەرموو گەر یەکێك لە ئێوە بیوتبایە نەنگیتان لێ دەگرت، ئەوەی فەرمووی: (دانەبەری "القوارير").**

---

[1] "القوارير" بریتییە لە ئافرەتانی نازدار و لاواز—و.

[2] ئەنجەشە: غوڵامێکی دەنگخۆشی پێغەمبەر بووە، ئەو کەسێکی نەشیدوێژ بووە—و.

▪ وفي رواية لهما: كانَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حادٍ يُقَالُ لَهُ: أَنْجَشَةُ، وَكانَ حَسَنَ الصَّوْتِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**رُوَيْدَكَ يَا أَنْجَشَةُ! لاَ تَكْسِرِ الْقَوَارِيرَ**).
قالَ قَتَادَةُ: يَعْنِي: ضَعَفَةَ النِّسَاءِ. [خ٦٢١١]

**لە ریوایەتێکی هەردووکیان: پێغەمبەر(ﷺ) نەشیدبێژ(حاد)ێکی هەبوو پێیدەوترا: "أَنْجَشَـة"، ئـەو دەنگـی خۆشـبوو، پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فـەرموو: (ئـەی ئەنجەشـە لەسەرخۆبە، نازداران مەشکێنە).**

**قەتادە وتی: واتە: ئافرەتە لاوازەکان.**

▪ ولهما: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَفَرٍ، وَكَانَ مَعَهُ غُلاَمٌ.. [خ٦١٦١]

**لـە ریوایـەتێکی تـری هـەردووکیان: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لـە سـەفەرێك بـوو، و غولامێکی لەگەڵ بوو.**

## ٤- دەروازەی: نەهی لە جنێودان بە رۆژگار

**٣٥٢٥**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قالَ اللهُ عزّ وجل : يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ، يَسُبُّ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الأَمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ**).
[خ٤٨٢٦/ م٢٢٤٦]

**(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا(عز وجل) فەرمووی: ئـادەمیزاد ئـازارم دەدات جنێـو بـە رۆژگـار دەدات، من رۆژگارم، کار بە دەستی منە، شەو و رۆژ وەردەچەرخێنم).**

## ٥- دەروازەی: حەرام کردنی یاری بە نەرد

**٣٥٢٦**- (م) عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ، فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ**). [م٢٢٦٠]

(م) لە بورەیدەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە نەردەشیر[1] یاری بکات وەك ئەوەی دەستی لە گۆشت و خوێنی بەرازدا خوێناوی کردبێت).**

**٣٥٢٧**– عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ، فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ). [د٤٩٣٨/ جه٣٧٦٢]

* حسن.

لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(هەر کەس بە نەرد یاری بکات لە خودا و پێغەمبەرەکەی یاخی بووە).**

## ٦- دەروازەی: گۆرانی و ژەنین و لەهو

**٣٥٢٨**– (خ) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ، يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ وَالحَرِيرَ، وَالخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ، وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ، يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ ـ يَعْنِي: الْفَقِيرَ ـ لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ: ارْجِعْ إِلَيْنَا غَداً، فَيُبَيِّتُهُمُ اللهُ، وَيَضَعُ الْعَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). [خ٥٥٩٠معلق]

(خ) لە ئەبی مالیکی ئەشعەرییەوە: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(خەڵکانێك لە ئومەتەکەم زینا و ئاورشم، و عارەق و ژەنین حەلاڵ دەکەن، خەڵکانێك لە تەنیشت چیایەك دادەبەزن، شوان مەڕەکانیان دەبات بۆ لەوەڕگا، دێت بۆ لایان –واتە: هەژار– لەبەر پێویستییەك، ئەوانیش دەڵێن: سبەینێ وەرەوە بۆ لامان، خودا شەو بەسەریاندا دەدات و چیاکە دێنێت بەسەریاندا و ئەوانی تر دەکات بە مەیموون و بەراز تا رۆژی قیامەت).**

**٣٥٢٩**– عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ أَتَعْرِفِينَ هَذِهِ)؟ قَالَتْ: لاَ يَا نَبِيَّ اللهِ، فَقَالَ: (هَذِهِ قَيْنَةُ بَنِي فُلاَنٍ، تُحِبِّينَ أَنْ تُغَنِّيَكِ)؟

---

[1] نەردەشیر: جۆرێکە لە قومار–و.

قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَعْطَاهَا طَبَقاً فَغَنَّتْهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (قَدْ نَفَخَ الشَّيْطَانُ فِي مَنْخِرَيْهَا). [حم١٥٧٢٠]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی عائیشە، ئەمە دەناسی؟)، وتی: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (ئەمە گۆرانیبێژەکەی بەنی فولانە، پێتخۆشە گۆرانیت بۆ بڵێ؟)، وتی: بەڵێ، وتی: عائیشە دەفرێکی پێدا گۆرانی بۆ وت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (شەیتان فووی کرد بە دوو کونەلووتیدا).**

## ٧- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی وتنەکان هاتووە

**٣٥٣٠-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي**). [خ٦١٧٩/ م٢٢٥٠]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لە ئێوە نەڵێت: نەفسم پیس بوو، بەڵکو بڵێت: نەفسم گران بوو).**

**٣٥٣١-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِذَا قَالَ الرَّجُلُ: هَلَكَ النَّاسُ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ**). [م٢٦٢٣]

قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: لاَ أَدْرِي، أَهْلَكَهُمْ بِالنَّصْبِ، أَوْ أَهْلَكُهُمْ بِالرَّفْعِ.

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر پیاو بڵێت: خەڵك تیاچوو ئەو تیاچووترینیانە(أَهْلَكُهُم)).**

**ئەبو ئیسحاق دەڵێت: نازانم، "أَهْلَكَهُم"[1] بە فەتحەی سەر (کاف)ەکە، یان "أَهْلَكُهُم" بە (ضمة)ی سەر (کاف)ەکە.**

---

[1] گەر "أَهْلَكَهُم" بێت، واتە: ئەو خەڵکەکەی تیابردووە، گەر "أَهْلَكُهُم" بێت، واتە: ئەو تیاچووترینی خەڵکەکەیە-و.

**٣٥٣٢**- (م) عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ تَقُولُوا: الْكَرْمُ. وَلَكِنْ قُولُوا: الْعِنَبُ وَالْحَبَلَةُ**). [م٢٢٤٨]

**(م) له عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە، له باوکییەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مەڵێن "الكَرْم"[1]، بەڵکو بڵێن: "العِنَب و الحَبَلَة-ترێ و مێو").**

**٣٥٣٣**- عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ لِأَبِي عَبْدِ اللهِ .أَوْ قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ لِأَبِي مَسْعُودٍ.: مَا سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ فِي«زَعَمُوا»، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ: زَعَمُوا**).

قال أبو داود: أبو عبد الله هذا: حذيفة. [د٤٩٧٢]

* صحيح.

**له ئەبی قیلابەوە، وتی: ئەبو مەسعوود بە ئەبی عەبدولڵای وت-یان ئەبو عەبدوڵا بە ئەبی مەسعوودی وت- چیت بیستووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەربارەی ((زَعَمُوا))، وتی: له پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (خراپترین وڵاخی سواری پیاو بریتییە لە "زعموا-پێیانوابوو"[2]).**

**ئەبو داود وتی: ئەم ئەبو عەبدوڵایە بریتییە لە حوزەیفە.**

## ٨- دەروازەی: زماندرێژی

**٣٥٣٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَبْغَضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِي يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ، كَمَا تَتَخَلَّلُ الْبَقَرَةُ**). زاد أبو داود: (**بِلِسَانِهَا**).

* صحيح. [د٥٠٠٥/ ت٢٨٥٣]

---

(١) ترێ عارەقی لێ دروست دەکرا، خواردنەوەی عارەق کەسەکەی بەخشندە دەکرد، بۆیە بە ترێکەیان دەوت بەخشندەیی(الكرم)، بۆیە شەرع نەهی لەو ناوە کرد-و.

(٢) لە گەیاندنی هەواڵ و قسەکردن لە دین (پێیانوابوو و پێموایە) بوونی نییە، دەبێ کەسەکە دڵنیابێت لە قسەی خۆی ئەوجا دەریببڕێت-و.

له عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا رقی لە زمانڕەوانە[1] لە پیاوان، ئەو کەسەی زمانی هاتوچۆ پێ دەکات وەك چۆن مانگا هاتوچۆی پێ دەکات).**

ئەبو داود: (بە زمانی) زیاد کردووە.

## ٩- دەروازەی: فەخر کردن بەسەر یەکتردا بە رەچەڵەك و بنەماڵە

**٣٥٣٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَفَخْرَهَا بِالْآبَاءِ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ، أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ، لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ، إِنَّمَا هُمْ فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللهِ مِنَ الْجِعْلَانِ الَّتِي تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتِنَ). [د٥١١٦/ ت٣٩٥٥، ٣٩٥٦]

* حسن الإسناد.

له ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خودا(عز وجل) خۆبەزلزانی نەفامی و فەخر کردن بە باب و باپیرانی لە ئێوە لابردووە، باوەڕدارێکی تەقوادار، بەدڕەفتارێکی بەدبەخت، ئێوە رۆڵەی ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە، خەڵکی وازدەهێنن لە فەخر کردن بە خەڵکانێکەوە خەڵوزێکن لە خەڵوزەکانی دۆزەخ یان لای خودا سووکترن لە قالۆنچە بە لووت پیسی پاڵ دەنێت).**

**٣٥٣٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ تَفْتَخِرُوا بِآبَائِكُمُ الذِينَ مَاتُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَمَا يُدَهْدِهُ الْجُعَلُ بِمَنْخَرَيْهِ خَيْرٌ مِنْ آبَائِكُمُ الذِينَ مَاتُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ). [حم٢٧٣٩]

* إسناده صحيح.

---

(١) واتە: زماندرێژی فرەوێژ–و.

لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(فەخر مەکەن بە باب و باپیرانتانەوە کە لە نەفامیدا مردوون، سوێند بەو خودایەی نەفسی منی بەدەستە ئەو قالۆنچەی بە دوو کونە لووتی تل دەدات[1] باشتر و چاکترە لە باب و باپیرانتان کە لە نەفامیدا مردوون)**.

## ١٠- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی سەردار هاتووە

**٣٥٣٧-** عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَقُولُوا لِلْمُنَافِقِ: سَيِّدٌ، فَإِنَّهُ إِنْ يَكُ سَيِّداً، فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عزّ وجل)**. [د٤٩٧٧]

* صحيح.

لە بورەیدەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بە دووڕوو مەڵێن: سەردارە(سيد)، چونکە گەر ئەو سەردار بێت پەروەردگاری خۆتان(عز وجل) تووڕە کردووە)**.

## ١١- دەروازەی: نەڵێت: شەیتان تیاچێت[2]

**٣٥٣٨-** عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ رَجُلٍ قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَعَثَرَتْ دَابَّتُهُ، فَقُلْتُ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: **(لاَ تَقُلْ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ، تَعَاظَمَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الْبَيْتِ، وَيَقُولُ: بِقُوَّتِي، وَلَكِنْ قُلْ: بِاسْمِ اللهِ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ تَصَاغَرَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الذُّبَابِ)**. [د٤٩٨٢]

* صحيح.

---

(١) واتە: پیسی تل دەدات-و.

(٢) لە ناو کوردا دەڵێن: (چاوی شەیتان کوێر بێت)-و.

لە ئەبی مەلیحەوە، لە پیاوێکەوە، وتی: لە پاشکۆی پێغەمبەر(ﷺ) بووم، وڵاخەکەی هەڵکەوت، وتم: شەیتان تیاچێت، فەرمووی: **(مەڵێ: شەیتان تیاچێت، چونکە تۆ گەر ئەوە بڵێی، خۆی لا گەورە دەبێت تا وەك ماڵێکی لێ دێت و دەڵێت: بە هێزی خۆم[1]، بەڵکو بڵێ: بسم الله، چونکە گەر تۆ ئەوەت وت بچووك دەبێتەوە تا وەك مێشێکی لێ دێت).**

## ١٢- دەروازەی: یاری بە بووکەڵە

**٣٥٣٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ . أَوْ خَيْبَرَ . وَفِي سَهْوَتِهَا سِتْرٌ، فَهَبَّتْ رِيحٌ، فَكَشَفَتْ نَاحِيَةَ السِّتْرِ عَنْ بَنَاتٍ لِعَائِشَةَ لُعَبٍ، فَقَالَ: **(مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ)**؟ قَالَتْ: بَنَاتِي، وَرَأَى بَيْنَهُنَّ فَرَساً لَهَا جَنَاحَانِ مِنْ رِقَاعٍ، فَقَالَ: **(مَا هَذَا الَّذِي أَرَى وَسْطَهُنَّ)**؟ قَالَتْ: فَرَسٌ، قَالَ: **(وَمَا هَذَا الَّذِي عَلَيْهِ)**؟ قَالَتْ: جَنَاحَانِ، قَالَ: **(فَرَسٌ لَهُ جَنَاحَانِ)**؟ قَالَتْ: أَمَا سَمِعْتَ أَنَّ لِسُلَيْمَانَ خَيْلاً لَهَا أَجْنِحَةٌ؟ قَالَتْ: فَضَحِكَ حَتَّى رَأَيْتُ نَوَاجِذَهُ.

* صحيح. [د٤٩٣٢]

[وانظر: اللعب بالأرجوحة **٣٦١٠**].

لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزوەی تەبووك-یان خەیبەر- گەڕایەوە لە تاقەکەیدا پۆشەرێك هەبوو، با هەڵیکرد لایەکی پۆشەرەکەی هەڵدایەوە لە بووکەڵە یارییەکانی عائیشە، فەرمووی: **(ئەی عائیشە، ئەمانە چین؟)**، وتی: کچەکانم، پێغەمبەر لە نێوانیان ئەسپێکی بینی دوو باڵی هەبوو لە پێست، فەرمووی: **(ئەوە چییە لە نێوانیان دەیبینم؟)**، وتی: ئەسپە، فەرمووی: **(ئەی ئەوە چییە لەسەریەتی؟)**، وتی: دوو باڵە، فەرمووی: **(ئەسپ و دوو باڵی**

---

[1] واتە: دەڵێت: بەهێزی خۆم ئەو کارەم ئەنجامدا-و.

**هەبێت؟!**)، عائیشە وتی: ئەی نەتبیستووە سولەیمان ئەسپێکی هەبووە باڵی هەبووە، عائیشە وتی: پێغەمبەر پێکەنی تا ددانەکانیم بینی.

## ١٣- دەروازەی: یاریکردن بە کۆتر

**٣٥٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى رَجُلاً يَتْبَعُ حَمَامَةً، فَقَالَ: (**شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانَةً**). [د٤٩٤٠/ جه٣٧٦٥]

* حسن صحيح.

لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی شوێنی کۆترێک کەوتبوو، فەرمووی: (**شەیتانێك شوێنی شەیتانێك کەوتووە**).



## ١- دەروازەی: باسی ئادەم(علیه السلام)

**٣٥٤١-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: **(خَلَقَ اللهُ آدَمَ وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعاً، ثُمَّ قالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولئِكَ مِنَ المَلاَئِكَةِ، فَاسْتَمِعْ ما يُحَيُّونَكَ، تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ، فَزَادُوهُ: وَرَحْمَةُ اللهِ. فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلِ الجَنَّةَ عَلَى صَورَةِ آدَمَ، فَلَمْ يَزَلِ الخَلْقُ يَنْقُصُ حَتَّى الآنَ).** [خ٣٣٢٦/ م٢٨٤١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا ئادەمی دروست کرد و درێژییەکەی شەست باڵ بوو، پاشان فەرمووی: برۆ سەلام لەو فریشتانە بکە، گوێبگرە بزانە چۆن وەڵامی سەلامەکەت دەدەنەوە، ئەوە سڵاوی تۆ و سڵاوی نەوەکانی تۆیە، وتی: "السلام علیکم"، وتیان: "السلام علیك ورحمة الله" ئەوان "رحمة الله"یان بۆ زیاد کرد، هەموان لە شێوەی ئادەمدا دەچنە بەهەشتەوە، بەردەوام تا ئێستا مرۆڤ کەم دەکات).**

## ٢- دەروازەی: باسی سەموود، هۆزەکەی صالح(علیه السلام)

**٣٥٤٢-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا مَرَّ بِالْحِجْرِ قالَ: **(لاَ تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا؛ إِلاَّ أَن تَكُونُوا بَاكِينَ، أَنْ يُصِيبَكُمْ ما أَصَابَهُمْ).** ثُمَّ تَقَنَّعَ بِرِدَائِهِ وَهُوَ عَلَى الرَّحْلِ. [خ٣٣٨٠ (٤٣٣)/ م٢٩٨٠]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) بە پاڵ حیجردا تێپەڕی، فەرمووی: **(مەچنە ناو شوێنی نیشتەجێبوونی ئەوانەی ستەمیان کرد مەگەر بە گریانەوە، نەبادا ئەوەی تووشی ئەوان هات تووشی ئێوەش ببێت)**، پاشان بە کراسەکەی رووی خۆی داپۆشی و ئەو لەسەر وڵاخی سوارییەکەی بوو.

## ٣- دەروازەی: باسی ئیبراهیم(علیه السلام)

**٣٥٤٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أن رسول الله صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ: ثِنْتَيْنِ مِنْهُنَّ فِي ذَاتِ اللهِ عزّ وجل: قَوْلُهُ: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ [الصافات:٨٩]، وَقَوْلُهُ: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾[الأنبياء:٦٣]. وَقَالَ: بَيْنَا هُوَ ذَاتَ يَوْمٍ وَسَارَةُ، إِذْ أَتَى عَلَى جَبَّارٍ مِنَ الجَبَابِرَةِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ هَاهنَا رَجُلاً مَعَهُ امْرَأَةٌ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَسَأَلَهُ عَنْهَا، فَقَالَ: مَنْ هذِهِ؟ قَالَ: أُخْتِي. فَأَتَى سَارَةَ فَقَالَ: يَا سَارَةُ لَيْسَ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ مُؤْمِنٌ غَيْرِي وَغَيْرُكِ، وَإِنَّ هَذَا سَأَلَنِي، فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّكِ أُخْتِي، فَلاَ تُكَذِّبِينِي. فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ، ذَهَبَ يَتَنَاوَلُهَا بِيَدِهِ، فَأُخِذَ، فَقَالَ: ادْعِي اللهَ وَلاَ أَضُرُّكِ، فَدَعَتِ اللهَ فَأُطْلِقَ. ثُمَّ تَنَاوَلَهَا الثَّانِيَةَ فَأُخِذَ مِثْلَهَا أَوْ أَشَدَّ، فَقَالَ: ادْعِي اللهَ لِي وَلاَ أَضُرُّكِ، فَدَعَتْ فَأُطْلِقَ. فَدَعَا بَعْضَ حَجَبَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ لَمْ تَأْتُونِي بِإِنْسَانٍ، إِنَّمَا أَتَيْتُمُونِي بِشَيْطَانٍ، فَأَخْدَمَهَا هَاجَرَ. فَأَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي، فَأَوْمأَ بِيَدِهِ: مَهْيَا، قالَتْ: رَدَّ اللهُ كَيْدَ الْكَافِرِ ـ أَوِ الْفَاجِرِ ـ فِي نَحْرِهِ، وَأَخْدَمَ هَاجَرَ).

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: تِلْكَ أُمُّكُمْ، يَا بَنِي ماءِ السَّمَاءِ. [خ٣٣٥٨ (٢٢١٧)/ م٢٣٧١]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئیبراهیم(علیه السلام) درۆی نەکردووە لە سێ جێدا نەبێت، دوان لەوانە لەبەر زاتی خودا(عز وجل)، فەرموودەی خودا: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ [الصافات:٨٩]، و فەرموودەی خودا: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾[الأنبياء:٦٣][1]، هەروەها فەرمووی: رۆژێك لەگەڵ سارە هات بۆ لای ملهوڕێك لە ملهوڕان، پێیوترا: لێرە پیاوێك ژنێکی لەگەڵە لە جوانترینی خەڵکییە، ملهوڕەکە ناردی لەدووی ئیبراهیم و پرسیاری ژنەکەی لێکرد،**

---

[1] کاتێ ئیبراهیم(علیه السلام) ویستی بتەکان بشکێنێت خۆی لە هۆزەکەی دواخست و بەوە بیانووی هێنایەوە ئەو نەخۆشە، کاتێ هەموو بتەکانی شکاند، جگە لە گەورەکەیان، هۆزەکەی گەڕانەوە و لێیان پرسی کێ ئەو کارەی کردووە؟ فەرمووی: گەورەکەیان ئەو کارەی ئەنجامداوە -و.

وتی: ئەمە کێیە؟ ئیبراهیم وتی: خوشکمە، هات بۆ لای سارە و وتی: ئەی سارە لەسەر رووی زەوی تەنها من و تۆ باوەڕدارین[1]، ئەمە پرسیاری لێکردووم هەواڵم پێداوە خوشکمە، بۆیە بەدرۆم مەخەرەوە، ملهوڕەکە ناردی بەدوای سارەدا، کاتێ چووە ژوورەوە بۆ لای دەستی بۆ دەستی بۆ درێژ دەکرد، ملهوڕەکە گیرا[2]، وتی: داوا لە خودا بکە[3] زیانت پێ ناگەیەنم، ئەویش داوای لە خودا کرد و بەردرا، پاشان بۆ جاری دووەم دەستی بۆ درێژ کرد، هەروەك جاری یەکەم یان توندتر گیرا، وتی: داوام بۆ بکە لە خودا زیانت پێ ناگەیەنم، دوعای بۆ کرد و بەردرا، یەکێ لە پاسەوانانی بانگ کرد و وتی: ئێوە مرۆڤتان بۆ من نەهێناوە، بەڵکو شەیتانێکتان بۆ هێناوم، هاجەری بۆ کرد بە کارەکەر، سارە هات بۆ لای ئیبراهیم و ئەو نوێژی دەکرد، بە دەستی ئاماژەی کرد: چی بوو؟ سارە وتی: خودا فێڵی کافرەکەی -یان بەدڕەفتارەکەی- بەسەر خۆیدا شکاندەوە و هاجەری کردە کارەکەر).

ئەبو هورەیرە وتی: ئەوە دایکی ئێوەیە، ئەی رۆڵەکانی ئاوی ئاسمان[4].

٣٥٤٤- (ق) وَعَنْهُ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (نَحْنُ أَحَقُّ بالشَّكِّ مِنْ إبْرَاهِيمَ إِذْ قالَ: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾[البقرة:٢٦٠]. وَيَرْحَمُ اللهُ لُوطاً، لَقَدْ كانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ. وَلَوْ لَبِثْتُ في السِّجْنِ طُولَ ما لَبِثَ يُوسُفُ، لأَجَبْتُ الدَّاعِيَ).　　[خ٣٣٧٢/ م١٥١]

---

(١) واتە: من و تۆ برا و خوشکی ئیمانیین-و.

(٢) "گیرا" یان خنکا، واتە: هەناسەی توندبوو وەك ئەوەی دەست لە بینی بنرێت، تەنانەت دەستی بە لەقەفرکێ کرد وەك ئەوەی فێی لێ هاتبێت-و.

(٣) واتە: داوا لە خودا بکە گیرانەکەم نەمێنێت-و.

(٤) "ئەی رۆڵەکانی ئاوی ئاسمان" عەرەب بۆ لەوەڕی مەڕ و ماڵاتیان شانیان لەسەر باران دادابوو-و.

(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئێمە لە پێشترین بە شك لە ئیبراهیم کاتێ فەرمووی: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾[البقرة:٢٦٠](١)، خودا رەحم بە "لوط" بکات، ئەو خۆی دەدایە پاڵ پایەیەکی توند و بەهێز(٢)، گەر بە درێژی ئەو ماوەیەی یوسف لە بەندیخانە بوومایە وەڵامی بانگکەرەکەم دەدایەوە(٣)).

٣٥٤٥- (خ) وَعَنْهُ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (يَلْقَى إِبْرَاهِيمُ أَبَاهُ آزَرَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَعَلَى وَجهِ آزَرَ قَتَرَةٌ وَغَبَرَةٌ، فَيَقُولُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ: أَلَمْ أَقُلْ لَكَ لاَ تَعْصِنِي؟! فَيَقُولُ أَبُوهُ: فَالْيَوْمَ لاَ أَعْصِيكَ، فَيَقُولُ إِبْرَاهِيمُ: يَا رَبِّ إِنَّكَ وَعَدْتَنِي أَنْ لاَ تُخْزِيَنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ، فَأَيُّ خِزْيٍ أَخْزَى مِنْ أَبِي الأَبْعَدِ؟ فَيَقُولُ اللهُ تَعَالَى: إِنِّي حَرَّمْتُ الجَنَّةَ عَلَى الْكَافِرِينَ. ثُمَّ يُقَالُ: يَا إِبْرَاهِيمُ ما تَحْتَ رِجْلَيْكَ؟ فَيَنْظُرُ، فَإِذَا هوَ بِذِيخٍ مُلْتَطِخٍ، فَيُؤْخَذُ بِقَوَائِمِهِ، فَيُلْقَى فِي النَّار). [خ٣٣٥٠]

(خ) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە فەرمووی: (لە رۆژی قیامەت ئیبراهیم بە باوکی دەگات و لەسەر روخساری "ئازەر" تەپ و تۆز و غوبار هەیە، ئیبراهیم پێی دەڵێت: پێم نەوتی: لێم یاخی مەبە؟! باوکی پێی دەڵێ: ئەمڕۆ لێت یاخی نابم، ئیبراهیم دەڵێت: ئەی پەروەردگار، تۆ بەڵێنت پێدام، رۆژی زیندووکردنەوەیان من شەرمەزار نەکەی(٤)، چ شەرمەزارییەك لە شەرمەزاری باوکێکی

---

(١) واتە: پەروەردگار پێم نیشان بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیەوە، خودا فەرمووی: مەگەر ئیمانت پێی نییە؟ فەرمووی: با، بەڵام بۆئەوەی دڵم دڵنیا ببێتەوە-و.

(٢) مەبەست ئەم ئایەتەیە: ﴿أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ [هود:٨٠] -و.

(٣) مەبەست لەو کاتەیە مەلیك ناردی بەدوای یوسفدا تا لە بەندیخانە دەریبهێنێت، بەڵام یوسف فەرمووی: بە مەلیك بڵێ بپرسێ ئەو ئافرەتانە بۆ منیان گەیاندە ئەم جێگەیە؟ وەك لە سورەتی یوسفدا هاتووە: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾[یوسف:٥٠]-و.

(٤) مەبەست ئەم ئایەتەیە: ﴿وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾[الشعراء:٨٧]-و.

**دوورخراوە گەورەترە؟ خودا(تعالى) دەفەرموێت: من بەهەشتم لەسەر بێباوەڕان حەرام کردووە، پاشان دەوترێت: ئەی ئیبراهیم، چی لەژێر پێتە؟ تەماشا دەکات نێرەیەکی کەمتیاری خوێناوییە، بە لاقەکانی دەگیرێ و هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە).**

**٣٥٤٦-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: لَمَّا كانَ بَيْنَ إِبْرَاهِيمَ وَبَيْنَ أَهْلِهِ ما كَانَ، خَرَجَ بِإِسْمَاعِيلَ وَأُمِّ إِسْمَاعِيلَ، وَمَعَهُمْ شَنَّةٌ فِيهَا مَاءٌ، فَجَعَلَتْ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ تَشْرَبُ مِنَ الشَّنَّةِ، فَيَدِرُّ لَبَنُهَا عَلَى صَبِيِّهَا، حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ فَوَضَعَهَا تَحْتَ دَوْحَةٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِبْرَاهِيمُ إِلَى أَهْلِهِ، فَاتَّبَعَتْهُ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ، حَتَّى لَمَّا بَلَغُوا كَدَاءً نَادَتْهُ مِنْ وَرَائِهِ: يَا إِبْرَاهِيمُ إِلَى مَنْ تَتْرُكُنَا؟ قَالَ: إِلَى اللهِ، قَالَتْ: رَضِيتُ بِاللهِ. [خ٣٣٦٥]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: کاتێ ئەوە ڕوویدا لە نێوان ئیبراهیم و خانەوادەکەی، ئیسماعیل و دایکی ئیسماعیلی هێنا و جەوەندەیە ئاویان پێ بوو، دایکی ئیسماعیل لە جەوەندەکەی دەخواردەوە و شیرەکەی بۆ منداڵەکەی دەچۆڕا، تا هاتە مەککە و لە سەرو زەمزەمەوە داینا، پاشان ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ لای خانەوادەکەی، دایکی ئیسماعیل شوێنیکەوت تا گەیشتنە "كداء" لەدواوە بانگی لێکرد: ئەی ئیبراهیم، لای کێ بەجێمان دەهێڵی، وتی: لای خودا، وتی: ڕازیم بە خودا.**

**٣٥٤٧-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا خَيْرَ الْبَرِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**ذَاكَ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام**). [م٢٣٦٩]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی: "يا خير البريّة-ئەی باشترین خەلقی خودا" پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە ئیبراهیمە)[1].**

---

[1] پێغەمبەر(ﷺ) تەوازوعی نواند و فەرمووی: باشترین خەلقی خودا ئیبراهیمە-و.

## ٤- دەروازەی: باسی یوسف(علیه السلام)

**٣٥٤٨-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**الْكَرِيمُ ابْنُ الكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ، يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ عليهم السلام**). [خ٣٣٨٢]

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریم[1] بریتییە لە یوسفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم(علیهم السلام))**.

## ٥- دەروازەی: باسی موسا(علیه السلام)

**٣٥٤٩-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَما رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جالِسٌ جاءَ يَهُودِيٌّ، فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، ضَرَبَ وَجْهِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِكَ، فَقَالَ: (**مَنْ**)؟ قالَ: رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، قالَ: (**ادْعُوهُ**). فَقَالَ: (**أَضَرَبْتَهُ**)؟ قالَ: سَمِعْتُهُ بِالسُّوقِ يَحْلِفُ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسى عَلَى البَشَرِ، قُلْتُ: أَيْ خَبِيثُ! عَلَى مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَأَخَذَتْنِي غَضْبَةٌ ضَرَبْتُ وَجْهَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ تُخَيِّرُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ القِيَامَةِ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ الْعَرْشِ، فَلاَ أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ، أَمْ حُوسِبَ بِصَعْقَةِ الأُولَى؟**). [خ٢٤١٢/ م٢٣٧٤]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوو، یەهوودییەك هات و وتی: ئەی باوکی قاسم، پیاوێ لە هاوەڵانت کێشای بە دەموچاومدا، فەرمووی: **(کێ؟)**، وتی: پیاوێك لە ئەنصار، فەرمووی: **(بانگی بکەن)**، فەرمووی: **(ئایا لێتداوە؟)**، وتی: گوێم لێبوو لە بازاڕ سوێندی دەخوارد و دەیوت: سوێند بەو کەسەی موسای بەسەر مرۆڤدا هەڵبژارد، پێم وت: ئەی پیس، بەسەر محەمەدیشدا؟ توڕەییەك گرتمی کێشام بە دەموچاویدا، پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] کەریم: واتە بەڕێز و بەخشندە —و.

**فەرمووی: (هەڵبژاردن مەکەن[1] لە نێوان پێغەمبەران، لە ڕۆژی قیامەت خەڵك دەمرن، من یەکەمین کەسێکم زەویم بۆ شەق دەبێت، دەبینم موسا دەستی گرتووە بە پایەیەك لە پایەکانی عەرشەوە، نازانم لەوانە بوو مردنیان بەسەردا هات، یان بە مردنی یەکەم موحاسەبە کراوە[2]).**

**٣٥٥٠-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: واللهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا؛ إلاَّ أَنَّهُ آدَرُ. فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ، فَخَرَجَ مُوسَى فِي إِثْرِهِ، يَقُولُ: ثَوْبِي يَا حَجَرُ، حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسَى، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ. وَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْباً). فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللهِ إِنَّهُ لَنَدَبٌ بِالْحَجَرِ، سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ، ضَرْباً بِالْحَجَرِ. [خ٢٧٨/ م٣٣٩]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بەنو ئیسرائیل بە رووتی: خۆیان دەشۆری و هەندێکیان تەماشای هەندێکی تریان دەکرد، موسا بەتەنها خۆی دەشۆری، وتیان: سوێند بە خودا، ئەوەی ڕێگری دەکات موسا لەگەڵ ئێوە خۆی بشۆرێت گەورەیی دوو گونیەتی[3]، جارێك ڕۆیشت خۆی بشوات، پۆشاکەکەی لەسەر بەردێك دانا، بەردەکە پۆشاکەکەی فڕاند، موسا بەدوایدا هاتە دەرەوە و دەیفەرموو: ئەی بەرد، پۆشاکەکەم، تا بەنو ئیسرائیل تەماشای موسایان کرد و وتیان: سوێند بە خودا، هیچ خراپییەك بە موساوە نییە، پۆشاکەکەی گرت و دەستی**

---

(١) چونکە قورئان نەهی کردووە لە نانەوەی ناکۆکی و جیاوازی خستنە نێوان پێغەمبەران و لەسەر زمانی باوەڕداران دەفەرمووێت: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾[البقرة:٢٨٥]-و، مەگەر ئەوەی خودا بۆ خۆی فەزڵی هەندێکیانی دابێت بەسەر هەندێکی تریاندا-و.

(٢) لەم جێگەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەزڵی موسا(عليه السلام) دەردەخات، بەوەی یان بەر لە پێغەمبەر زیندوو کراوەتەوە، یان نەفخەی یەکەم نەبووەتە هۆی مردنی ئەو و تەنها مردنی ژیانی دنیای چەشتووە-و.

(٣) وەك ئەوەی کەسەکە تووشی نەخۆشی فتق هاتبێت-و.

بە لێدانی بەردەکە کرد)، ئەبو هورەیرە وتی: سوێند بە خودا ئاساری لێدانەکە بە بەردەکەوە بوو، شەش یان حەوت لێدانی بەردەکە.

**٣٥٥١**- (ق) وَعَنْهُ ﷺ قَالَ: أُرْسِلَ مَلَكُ الموْتِ إِلَى مُوسى عليهما السلام، فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ، فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لاَ يُرِيدُ الموْتَ، فَرَدَّ اللهُ عَلَيْهِ عَيْنَهُ، وَقَالَ: ارْجِعْ، فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ ما غَطَّتْ بِهِ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ الموْتُ. قَالَ: فَالآنَ. فَسَأَلَ اللهَ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الأَرْضِ المقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ، إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ، عِنْدَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ**). [خ١٣٣٩/ م٢٣٧٢]

**(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: مەلەکولمەوت رەوانە کرا بۆ لای موسا(علیە السلام) کاتیّ هات بۆ لای زلەیەکی لێدا، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری و وتی: منت رەوانەکردووە بۆ لای بەندەیەك مردنی ناوێت، خودا چاوەکەی بۆ گێڕایەوە[(١)] و وتی: بگەڕێوە، و پێی بڵیّ: دەستی خۆی بخاتە سەر پشتی گایەك بە بڕی ئەوەی دەستی دایپۆشیوە و بە هەر تاڵەموویەك ساڵێك تەمەنی بۆ هەیە، موسا فەرمووی: ئەی پەروەردگار، پاشان چی؟ فەرمووی: پاشان مردن، فەرمووی: کەوابوو با ئێستا بێت، داوای لە خودا کرد لە زەوی پیرۆز بە بڕی هەڵدانی بەردێك بیگاتیّ نزیکی بکاتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر لەویّ بوومایە گۆڕەکەیم نیشان دەدان، لە تەنیشتی ڕێگەکە نزیك کۆمایە خۆڵی سوور).**

## ٦- دەروازەی: باسی موسا و "خضر"(علیهما السلام)

**٣٥٥٢**- (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفاً الْبِكَالِيَّ يَزْعُمُ: أَنَّ مُوسى صَاحِبَ الخَضِرِ لَيْسَ هُوَ مُوسى بَنِي إِسْرَائِيلَ، إِنَّمَا هُوَ مُوسى آخَرُ، فَقَالَ: كَذَبَ عَدُوُّ

(١) واتە بە لێدانی زلەکە چاوێکی مەلەکولمەوت کوێر بوو و دواتر خودا چاوەکەی بۆ گێڕایەوە-و.

اللهِ، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: (أَن مُوسى قَامَ خَطِيباً في بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا، فَعَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ، إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ: بَلَى، لِي عَبْدٌ بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ، قالَ: أَيْ رَبِّ وَمَنْ لِي بِهِ؟ . ورُبَّمَا قالَ سُفْيَانُ: أَيْ رَبِّ وَكَيْفَ لِي بِهِ؟ . قالَ: تَأْخُذُ حُوتاً، فَتَجْعَلُهُ في مِكْتَلٍ، حَيْثُمَا فَقَدْتَ الحُوتَ فَهْوَ ثَمَّ.

وذَكَرَ القِصَّةَ كَما وَرَدَتْ في سُورةِ الكَهْف. وجَاءَ في آخرِه:

قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (يَرْحَمُ اللهُ مُوسى، لَوْ كانَ صَبَرَ لَقُصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَمْرِهِمَا).

[خ۳٤٠١/ م۲۳۸۰]

(ق) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: بە ئیبن عەباسم وت: نەوف بیکالی بانگەشەی ئەوە دەکات: موسای هاوەڵی "خضر" ئەو موسای بەنی ئیسرائیلە نییە، وتی: ئەو دوژمنەی خودا درۆ دەکات، ئوبەی کوڕی کەعب بۆی باس کردین، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(موسا لەناو بەنی ئیسرائیل هەستا و وتاری دا، پرسیاری لێکرا: چ کەس زاناترە؟ وتی: من، خودا لەسەر ئەوە سەرزەنشتی کرد، چونکە زانستەکەی نەگێڕایەوە بۆ لای خودا[1]، خودا پێی فەرموو: با[2]، لە مەجمەع بەحرەین بەندەیەکم هەیە لە تۆ زاناترە، موسا وتی: ئەی پەروەردگار، کێ منی پێ بگەیەنێت؟** لەوانەیە سوفیان وتبێتی: **ئەی پەروەردگار، چۆن بیگەمێ؟ فەرمووی: ماسییەك دەگری و دەیخەیە توێشەبەرەیەك، لە هەر کوێ ماسییەکەت بزر کرد ئەو لەو شوێنەیە).**

**چیرۆکەکەی باس کرد وەك چۆن لە سورەتی "الكهف"دا هاتووە، لە کۆتاییەکەیدا هاتووە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (رەحمەتی خودا لە موسا بێت، گەر ئارامی بگرتبایە لە کاروباری هەردووکیان زۆرترمان بۆ باس دەکرا).**

**۳۵۵۳**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (إِنَّمَا سُمِّي الخَضِرَ لِأَنَّهُ جَلَسَ عَلَى فَرْوَةٍ بَيْضَاءَ، فَإِذَا هِيَ تَهْتَزُّ مِنْ خَلْفِهِ خَضْرَاءَ).　　[خ۳٤٠۲]

---

(۱) واتە نەیفەرموو: خودا زاناترە(الله أعلم)-و.

(۲) واتە: بەڵێ، لە تۆ زاناتر هەیە-و.

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(بۆیە بە "الخَضِر" ناونراوە، چونکە لەسەر زەوییەکی سپی دانیشتبوو بینی لە دوایەوە بە سەوزی دەشەکێتەوە).**

## ٧- دەروازەی: باسی داود و سولەیمان(علیهما السلام)

٣٥٥٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كَانَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا، جَاءَ الذِّئْبُ فَذَهَبَ بِابْنِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ لِصَاحِبَتِهَا: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ، وقَالَتِ الأُخْرَى: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ، فَتَحَاكَمَتَا إِلَى دَاوُدَ عليه السلام فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى، فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بنِ دَاوُدَ عليهما السلام فَأَخْبَرَتَاهُ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِينِ أَشُقُّهُ بَيْنَهُمَا، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: لاَ تَفْعَلْ يَرْحَمُكَ اللهُ هُوَ ابْنُهَا، فَقَضى بِهِ لِلصُّغْرَى). [خ٦٧٦٩ (٣٤٢٧)/ م١٧٢٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوو ئافرەت دوو کوڕی خۆیان پێ بوو، گورگ هات و کوڕی یەکێك لەوانی برد، بە هاوڕێکەی خۆی وت: کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەویتریان وتی: بەڵکو کوڕەکەی تۆی بردووە، حوکمەکەیان بردە لای داود(علیه السلام) هەواڵەکەیان پێدا، ئەویش قەزاوەتی کرد بۆ گەورەکەیان، ئەوان چوونە دەرەوە بۆ لای سولەیمانی کوڕی داود(علیهما السلام) هەواڵیان پێ دا، ئەویش وتی: چەقۆیەکم بۆ بهێنن لە نێوانیان لەتی بکەم، بچووکەکەیان وتی: ئەو کارە مەکە، ڕەحمەتی خودات لێ بێت، ئەوە کوڕی ئەوە، سولەیمان بڕیاریدا منداڵەکە بۆ بچووکەکە بێت).**

٣٥٥٥- (ق) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ عليهما السلام: لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ بِمِائَةِ امْرَأَةٍ، تَلِدُ كُلُّ امْرَأَةٍ غُلاَماً يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ لَهُ المَلَكُ: قُلْ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَلَمْ يَقُلْ وَنَسِيَ، فَأَطَافَ بِهِنَّ، وَلَمْ تَلِدْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ نِصْفَ إِنْسَانٍ. قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَانَ أَرْجَى لِحَاجَتِهِ). [خ٥٢٤٢ (٢٨١٩)/ م١٦٥٤]

(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: سولەیمانی کوڕی داود وتی: ئەم شەو بەسەر سەد ئافرەتدا دەگەڕێم، هەر منداڵێك غولامێکی ببێت لە ڕێگەی خودا بجەنگێ،

فریشەیەك پێی وت: بڵێ: "انشاءالله"، نەیوت و لەبیریچوو، بەسەریاندا گەڕا، تەنها یەك ئافرەتیان منداڵی بوو ئەویش نیو مرۆڤ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر بیوتبا "انشاءالله" سوێندەکەی نەدەکەوت و بۆ پێویستییەکەی رجادارتر بوو[1])**.

**٣٥٥٦**- (خ) وَعَنْهُ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (خُفِّفَ عَلَى دَاوُدَ عليه السلام الْقُرْآنُ، فَكَانَ يَأْمُرُ بِدَوَابِّهِ فَتُسْرَج، فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ قَبْلَ أَنْ تُسْرَجَ دَوَابُّهُ، وَلاَ يَأْكُلُ إِلاَّ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ). [خ٣٤١٧ (٢٠٧٣)]

(خ) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(قورئان خوێندن[2] لەسەر داود(علیه السلام) ئاسان کرابوو، ئەو فەرمانی دەکرد وڵاخی سوارییەکەی بۆ زین بکەن، قورئانی دەخوێند بەرلەوەی وڵاخەکەی زین بکرێت، ئەو تەنها لەبەری رەنجی دەستی خۆی دەخوارد)**.

## ٨- دەروازەی: باسی ئەیوب(علیه السلام)

**٣٥٥٧**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (بَيْنَمَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَاناً، خَرَّ عَلَيْهِ رِجْلُ جَرَادٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ يَحْثِي فِي ثَوْبِهِ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ: يَا أَيُّوبُ أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قالَ: بَلَى يَا رَبِّ، وَلكِنْ لاَ غِنَى لِي عَنْ بَرَكَتِكَ). [خ٣٣٩١ (٢٧٩)]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(ئەیوب بە رووتی: خۆی دەشۆری، پۆلە کوللەیەك لە زێڕ بەسەریدا داباری، لە پۆشاکەکەیدا دەستی کرد بە کۆکردنەوەیان، پەروەردگاری بانگی لێکرد: ئەی ئەیوب**

---

(١) واتە: رجا وابوو لەو شەوەدا سەد منداڵ لە رەحمی ژنەکانیدا دروستبیوونایە و شۆڕەسواریان لێ دەربچووبایە–و.

(٢) قورئانی هەر پێغەمبەرێك ئەو کتێبە بوو بۆی دابەزی بوو و دەیخوێندەوە، قورئانی دابەزێنراو بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام هەموو کتێبە ئاسمانییەکان لە ئامێز دەگرێت، خوێندنی زەبوور وەك خوێندنی بەشێك لە قورئان بوو–و.

**ئایا من تۆم بێنیاز نەکرد لەوەی دەیبینی؟ وتی: بەڵێ، ئەی پەروەردگار، بەڵام لە بەرەکەتی تۆ بێنیازییم نییە)**

## ٩- دەروازەی: باسی یونس(علیه السلام)

**٣٥٥٨**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لاَ يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ: أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى). وَنَسَبَهُ إِلَى أَبِيهِ. [خ٣٣٩٥/ م٢٣٧٧]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(نابێت بەندەیەك بڵێت: من باشترم لە یونسی کوڕی مەتتا)**، دایە پاڵ باوکی.

## ١٠- دەروازەی: باسی زەکەریا(علیه السلام)

**٣٥٥٩**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُول اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كَانَ زَكَرِيَّاءُ نَجَّاراً). [م٢٣٧٩]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زەکەریا دارتاش بوو)**.

## ١١- دەروازەی: باسی عیسا(علیه السلام)

**٣٥٦٠**- (ق) عَنْ عُبَادَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسى عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، والنَّارُ حَقٌّ، أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ عَلَى ما كَانَ مِنَ الْعَمَلِ). [خ٣٤٣٥/ م٢٨]

(ق) لە عوبادەوە(خوا لێی رازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(هەرکەس شایەتی بدات "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأنَّ محمدا عبده ورسوله"، هەروەها شایەتی بدات عیسا بەندە و پێغەمبەری خودایە، و کەلیمەی خۆی بوو هەڵیدا بۆ مەریەم و رۆحێك بوو لە ئەوەوە، و بەهەشت حەقە و ئاگر حەقە، خودا دەیباتە بەهەشتەوە لەسەر ئەوەی هەیەتی لە کار و کردەوە)**.

**٣٥٦١**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلاً يَسْرِقُ، فَقَالَ لَهُ: أَسَرَقْتَ؟ قالَ: كَلا، وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلهَ إِلاَّ هُوَ! فَقَالَ عِيسى: آمَنْتُ بِاللهِ، وَكَذَّبْتُ عَيْنِي). [خ٣٤٤٤/ م٢٣٦٨]

(ق) لە ئەبى هورەيرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووى: **(عيساى كوڕى مەريەم پياوێكى بينى دزى دەكرد، پێى فەرموو: دزيت كرد؟ وتى: نەخێر، سوێند بەو خوداى هيچ خودايەك بوونى نييە جگە لە ئەو، عيسا فەرمووى: ئيمانم بە خودا هێنا و چاوى خۆم بەدرۆخستەوە).**

**٣٥٦٢**- (ق) وَعَنْهُ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (ما مِنْ بَنِي آدَمَ مَوْلُودٌ إِلاَّ يَمَسُّهُ الشَّيْطَانُ حِينَ يُولَدُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخاً مِنْ مَسِّ الشَّيْطَانِ، غَيْرَ مَرْيَمَ وَابْنِهَا). ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: ﴿وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ [آل عمران:٣٦]. [خ٣٤٣١ (٣٢٨٦)/ م٢٣٦٦]

(ق) هەر لە ئەبى هورەيرەوە، وتى: گوێم لە پێغەمبەرى خودا(ﷺ) بوو دەيفەرموو: **(هەر ئادەميزادێك لەدايك دەبێت شەيتان مەسسى دەكات كاتێ لەدايك دەبێت، بۆيە لەو مەسسەى شەيتانەوە دەست بە هاوار دەكات[1]، جگە لە مەريەم و كوڕەكەى).** پاشان ئەبو هورەيرە دەيوت[2]: ﴿وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ [آل عمران:٣٦].

---

(١) واتە: منداڵەكە دەست بە گريان دەكات-و.

(٢) واتە: پاشان ئەبو هورەيرە ئەم ئايەتى دەخوێندەوە، ئايەتەكە بەڵگەيە لەسەر ئەوەى مەريەم و عيسا كاتى لە دايكبوونيان شەيتان مەسسى نەكردوون، چونكە ئەوە دوعاى دايكى مەريەم(ژنەكەى عيمران) بوو، مەريەم و نەوەى مەريەم بە خودا پەنا دەدات-و.

## ١٢- دەروازەی: ئەوانەی لە لانکەدا قسەیان کرد

**٣٥٦٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي المَهْدِ إِلاَّ ثَلاَثَةٌ: عِيسى.

وَكَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: جُرَيْجٌ، كانَ يُصَلِّي، فَجَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ، فَقَالَ: أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّي؟ فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجوهَ المُومِسَاتِ، وَكَانَ جُرَيْجٌ فِي صَوْمَعَتِهِ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ امْرَأَةٌ وَكَلَّمَتْهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِياً فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا، فَوَلَدَتْ غُلاَماً، فَقَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ، فَأَتَوْهُ، فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ، وَأَنْزَلُوهُ، وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى، ثُمَّ أَتَى الْغُلاَمَ، فَقَالَ: مَنْ أَبُوكَ يَا غُلاَمُ؟ قالَ: الرَّاعِي، قالُوا: نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ؟ قالَ: لاَ، إِلاَّ مِنْ طِينٍ.

وَكَانَتِ امْرَأَةٌ تُرْضِعُ ابْناً لَهَا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ رَاكِبٌ ذُو شَارَةٍ، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، وَأَقْبَلَ عَلَى الرَّاكِبِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهَا يَمَصُّهُ. قالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَمَصُّ إِصْبَعَهُ. ثُمَّ مُرَّ بِأَمَةٍ، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هذِهِ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَقَالَتْ: لِمَ ذَاكَ؟ فَقَالَ: الرَّاكِبُ جَبَّارٌ مِنَ الجَبَابِرَةِ، وَهذِهِ الأَمَةُ يَقُولُونَ: سَرَقْتِ، زَنَيْتِ، وَلَمْ تَفْعَلْ).

[خ٣٤٣٦ (١٢٠٦)/ م٢٥٥٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: تەنها سیان لە لانکەدا قسەیان کردووە: عیسا و پیاوێك لە بەنی ئیسرائیل پێی دەوترا جورەیج، ئەو نوێژی دەکرد، دایکی هات بۆ لای و بانگی کرد، جورەیج وتی:[1] وەڵامی بدەمەوە یان نوێژەکە بکەم؟ دایکی وتی: خودایە، مەیمرێنە تا رووی لەشفرۆشەکانی نیشان دەدەی[2]، **جورەیج لە خەڵوەتگاکەیدا بوو، ئافرەتێك خۆی بۆ خستەڕوو و قسەی لەگەڵ کرد، بەڵام جورەیج نەیویست ئەو کارە بکات، بۆیە ئافرەتەکە هات بۆ لای**

[1] واتە: لە نێوان خۆی و خودا ئەو قسەیەی کرد–و.

[2] وەك لە دوعاکەی دایکییەوە دەردەکەوێ جورەیج لەبەر نوێژەکەی وەڵامی دایکی نەداوەتەوە، دوعای دایکیش بۆ منداڵ و لە منداڵ گیرایە–و.

شوانێك و لە خۆی نا و کوڕێکی بوو، ئافرەتەکە وتی: لە جورەیجە، هاتن بۆی و خەڵوەتگاکەیان روخاند و دایانبەزاند[1] و قسە و جنێویان پێدا، ئەویش دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، پاشان هات بۆ لای منداڵەکە و پێی وت: ئەی منداڵ باوکی تۆ کێیە؟ منداڵەکە وتی: شوانەکە، وتیان: خەڵوەتگاکەت لە زێڕ دروست بکەینەوە؟ وتی: نەخێر، تەنها لە قوڕ.

ئافرەتێك لە بەنی ئیسرائیل شیری بە کوڕەکەی دەدا[2] پیاوێکی سواری خاوەن جوانی و هەیبەت بە پاڵیدا گوزەری کرد، ژنەکە وتی: خودایە کوڕەکەم وەك ئەو پیاوە لێبکەی، منداڵەکە مەمکی دایکی بەردا و رووی لە سوارەکە کرد و وتی: خودایە، وەك ئەوەم لێ نەکەی، پاشان لایکردەوە بە لای مەمکی دایکیدا و دەستی بە مژین کردەوە –ئەبو هورەیرە وتی: وەك ئەوەی تەماشای پێغەمبەر(ﷺ) بکەم پەنجەی خۆی دەمژی– پاشان کەنیزەکێك بە پاڵیدا گوزەر پێکرا ژنەکە وتی: خودایە، کوڕەکەم وەك ئەوە لێ مەکە، منداڵەکە دوو مەمکی دایکی وازلێهێنا و وتی: خودایە وەك ئەو کەنیزەکەم لێبکە، ژنەکە وتی: بۆچی ئەوە؟ منداڵەکە وتی: سوارەکە ملهوڕێکە لە ملهوڕان، ئەم کەنیزەکە کە پێی دەڵێن دزی کردووە و زینای کردووە ئەو کارانەی نەکردووە.

## ١٣- دەروازەی: فەرموودەی پەڵەدار و کەچەڵ و کوێرێك

٣٥٦٤- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ ثَلاَثَةً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ: أَبْرَصَ، وَأَقْرَعَ، وَأَعْمى، بَدَا للهِ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكاً.

[1] دایانبەزاند(أنزلوه) وەك لە وشەکەوە ئاشکرا دەبێت پێدەچێ خەڵوەتگاکەی لە چیاو بەرزییەك بووبێت–و.

[2] ئەمە بریتییە لە منداڵی سێیەم لەدوای عیسا و ئەو منداڵەی بۆ پاکێتی جورەیج هاتە قسە–و.

فَأَتَى الأَبْرَصَ فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: لَوْنٌ حَسَنٌ، وَجِلْدٌ حسَنٌ، قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ، فَأُعْطِيَ لَوْناً حَسناً، وَجِلْداً حَسَناً، فَقَالَ: أَيُّ المَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الإِبِلُ - أَوْ قَالَ: الْبَقَرُ، هُوَ شَكَّ فِي ذِلِكَ: أَنَّ الأَبْرَصَ وَالأَقْرَعَ: قالَ أَحَدُهُمَا: الإِبِلُ، وَقَالَ الآخَرُ: الْبَقَرُ - فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ، فَقَالَ: يُبَارَكُ لَكَ فِيها.

وَأَتَى الأَقْرَعَ فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: شَعَرٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ هذا عَنِّي، قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ، وَأُعْطِيَ شَعَراً حَسناً، قَالَ: فَأَيُّ المَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: الْبَقَرُ، قالَ: فَأَعْطَاهُ بَقَرَةً حَامِلاً، وَقَالَ: يُبَارَكُ لَكَ فِيها.

وَأَتَى الأَعْمَى فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: يَرُدُّ اللهُ إِلَيَّ بَصَرِي، فَأُبْصِرُ بِهِ النَّاسَ، قالَ: فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ اللهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ، قالَ: فَأَيُّ المَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: الْغَنَمُ، فَأَعْطَاهُ شَاةً وَالِداً.

فَأُنْتِجَ هذَانِ، وَوَلَّدَ هَذَا، فَكَانَ لِهذَا وَادٍ مِنْ إِبِلٍ، وَلِهذَا وَادٍ مِنْ بَقَرٍ، وَلِهذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ.

ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الأَبْرَصَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ، تَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلاَ بَلاَغَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الحَسَنَ وَالْجِلْدَ الحَسَنَ وَالمَالَ، بَعِيراً أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي. فَقَالَ لَهُ: إِنَّ الْحُقُوقَ كَثِيرَةٌ، فَقَالَ لَهُ: كَأَنِّي أَعْرِفُكَ، أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ، فَقِيراً فَأَعْطَاكَ اللهُ؟ فَقَالَ: لَقَدْ وَرِثْتُ لِكَابِرٍ عَنْ كابِرٍ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كاذِباً؛ فَصَيَّرَكَ اللهُ إِلَى ما كُنْتَ.

وَأَتَى الأَقْرَعَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ما قالَ لِهَذَا، فَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ ما رَدَّ عَلَيهِ هَذَا، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كاذِباً؛ فَصَيَّرَكَ اللهُ إِلَى ما كُنْتَ.

وَأَتَى الأَعْمَى فِي صُورَتِهِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ، وَتَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلاَ بَلاَغَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي، فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أَعْمى فَرَدَّ اللهُ بَصَرِي، وَفَقِيراً فَقَدْ أَغْنَانِي، فَخُذْ ما شِئْتَ، فَوَاللهِ لا أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ بِشَيْءٍ أَخَذْتَهُ للهِ، فَقَالَ: أَمْسِكْ مالَكَ، فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ، فَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْكَ، وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ).

[خ٣٤٦٤/ م٢٩٦٤]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ئەو گوێی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(سیان لە بەنی ئیسرائیل: پەڵەدارێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خودا ویستی تاقییان بکاتەوە، بۆیە فریشتەیەکی ڕەوانە کرد بۆ لایان، هات بۆ لای پەڵەدارەکە و پێی وت: چ شتێك خۆشترینە لە لات؟ وتی: ڕەنگی باش و پێستی**

جوان، خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە، فەرمووی: دەستێکی پیادا هێنا و پەڵەدارییەکەی پێوە نەما و ڕەنگێکی باش و پێستێکی جوانی پێدرا، پێی وت: چ ماڵ و سامانێك خۆشەویسترینە لە لات؟ وتی: حوشتر-یان وتی: مانگا، ئەو لەوەدا شکی هەبوو: پەڵەدار و کەچەڵەکە، یەکێکیان وتی: حوشتر و ئەویتریان وتی: مانگا- حوشترێکی سکپڕی پێدرا و فریشتەکە وتی: تیایدا بەرەکەتت بۆ بەرهەم دێت.

فریشتەکە هات بۆ لای کەچەڵەکە و وتی: چ شتێك خۆشترینە لە لات؟ وتی: پرچ و قژی جوان و باش و ئەمەم نەمێنێ، خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە، فەرمووی: دەستێکی پێدا هێنا و نەیما[1] و قژێکی جوان و باشی پێدرا، فریشتەکە وتی: چ ماڵ و سامانێك خۆشەویسترینە لە لات؟ وتی: مانگا، مانگایەکی سکپڕی پێدا و وتی: تیایدا بەرەکەتت بۆ بەرهەم دێت.

فریشتەکە هات بۆ لای کوێرەکە و وتی: چ شتێك خۆشترینە لە لات؟ وتی: خودا چاوەکانم بۆ بگێڕێتەوە، فەرمووی: دەستێکی پێدا هێنا و خودا چاوەکانی بۆ گێڕایەوە، فریشتەکە وتی: چ ماڵ و سامانێك خۆشەویسترینە لە لات؟ وتی: مەڕ، مەڕێکی سکوزاکەری پێدا.

ئەو دوانە بەرهەم هاتن و ئەمەش سك و زای کرد، ئەمەیان شیوێك لە حوشتر و ئەوەیان شیوێك لە مانگا و ئەمەش شیوێك لە مەڕی هەبوو.

پاشان لە شێوە و هەڵکەوتەی خۆیدا فریشتەکە هاتەوە بۆ لای پەڵەدارەکە و وتی: پیاوێکی هەژارم، لەم سەفەرەم هەرچی هۆیە لە دەستم پچڕاون، ئەمڕۆ گەیشتنم بە خودا و پاشان بە تۆوەیە، داوات لێ دەکەم بەو کەسەی ڕەنگی باش و پێستی جوان و ماڵ و سامانی پێدای، حوشترێکم پێ بدە لەم سەفەرەم پێی بگەمە بەرەوە، پیاوەکە پێی وت: مافەکان زۆر و گەورەن، فریشتەکە پێی وت: وەك ئەوەی بتناسم، تۆ پەڵەدارەکە نەبووی خەڵك بێزی لێ دەکردییەوە و هەژارێك بووی خودا پێی بەخشیت؟ پیاوەکە وتی: لە باب و باپیرانمەوە بۆم بەجێماوە، فریشتەکە وتی: گەر درۆ دەکەی خودا بتگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی پێشتر لەسەری بووی.

---

[1] واتە: کەچەڵییەکەی نەما-و.

لە شێوە و هەڵکەوتەی خۆیدا هات بۆ لای کەچەڵەکە و ئەوەی بە پەڵەدارەکەی وت بەمیشی وت، ئەمیش هەروەك ئەوەی پێشوو رەدی کردەوە، فریشتەکە وتی: گەر درۆ دەکەی خودا بتگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی پێشتر لەسەری بووی.

لە شێوەی خۆیدا هات بۆ لای نابیناکە و وتی: پیاوێکی هەژارم و رێبواری رێگەم، لەم سەفەرەم هەرچی هۆیە لە دەستم پچڕاون، ئەمڕۆ گەیشتنم بە خودا و پاشان بە تۆوەیە، داوات لێ دەکەم بەو کەسەی چاوەکانی بۆت گێڕایەوە، مەڕێکم پێ بدە لەم سەفەرەم پێی بگەمە بەرەوە، پیاوەکە وتی: من کەسێکی کوێر بووم و خودا چاوەکانی بۆ گێڕامەوە و هەژارێك بووم دەوڵەمەندی کردم، هەرچیت دەوێ ببە، سوێند بە خودا، ئەمڕۆ شتێك لە تۆ وەرناگرمەوە بۆ خودا بردووتە، فریشتەکە وتی: ماڵ و سامانەکەت بۆ خۆت، ئێوە تاقیکرانەوە، خودا لە تۆ رازی بوو و لە دوو هاوەڵەکەت خەشمی گرت).

■ ولفظ مسلم: (فَأَرَادَ اللهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ) وهو رواية عند البخاري. [خ٣٤٦٤]

لەفزەکەی موسلیم: (خودا ویستی تاقییان بکاتەوە)، ئەوەش لای بوخاری ریوایەتێکە.

## ١٤- دەروازەی: فەرموودەی غارەکە

٣٥٦٥- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (بَيْنَمَا ثَلاَثَةُ نَفَرٍ يَتَمَاشَوْنَ أَخَذَهُمُ المَطَرُ، فَمَالُوا إِلَى غارٍ في الجَبَلِ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الجَبَلِ فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا للهِ صَالِحَةً، فَادْعُوا اللهَ بِهَا لَعَلَّهُ يَفْرُجُهَا.

فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ، كُنْتُ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رُحْتُ عَلَيْهِمْ، فَحَلَبْتُ بَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ أَسْقِيهِمَا قَبْلَ وَلَدِي، وَإِنَّهُ نَأَى بِيَ الشَّجَرُ يَوْماً، فَمَا أَتَيْتُ حَتَّى أَمْسَيْتُ فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كما كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلاَبِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُؤُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَبْدَأَ بِالصِّبْيَةِ قَبْلَهُمَا، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذلِكَ دَأْبِي وَدَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ؛ فَافْرُجْ لَنَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ. فَفَرَجَ اللهُ لَهُمْ فُرْجَةً حَتَّى يَرَوْنَ مِنْهَا السَّمَاءَ.

وَقَالَ الثَّانِي: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كانَتْ لِي ابْنَةُ عَمٍّ أُحِبُّهَا كَأَشَدِّ ما يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، فَطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَسَعَيْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ فَلَقِيتُهَا بِهَا، فَلَمَّا قَعَدْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللهِ، اتَّقِ اللهَ، وَلاَ تَفْتَحِ الخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ، فَقُمْتُ عَنْهَا. اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي قَدْ فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ؛ فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا. فَفَرَجَ لَهُمْ فُرْجَةً.

وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيراً بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضى عَمَلَهُ قالَ: أَعْطِنِي حَقِّي، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَقَّهُ، فَتَرَكَهُ وَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَراً وَرَاعِيَهَا، فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللهَ وَلاَ تَظْلِمْنِي وَأَعْطِنِي حَقِّي، فَقُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرَاعِيهَا، فَقَالَ: اتَّقِ اللهَ وَلاَ تَهْزَأْ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي لاَ أَهْزَأُ بِكَ، فَخُذْ تِلْكَ الْبَقَرَ وَرَاعِيَهَا، فَأَخَذَهُ فَانْطَلَقَ بِهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ ما بَقِيَ. فَفَرَجَ اللهُ عَنْهُمْ). [خ٥٩٧٤ (٢٢١٥)/ م٢٧٤٣]

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ رازی بێت)، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: **(سێ کەس بە رێیەکدا دەڕۆیشتن باران دایگرتنەوە، پەنایان برد بۆ غارێك لە چیایەك، گابەردێك بەربوویەوە بۆ دەمی غارەکە و غارەکەی لەسەر قەپات کردن، یەکێکیان بەوانی تری وت: وردببنەوە کارگەلێکی چاك بۆ خودا ئەنجامتان دابێت، بەوانە داوا لە خودا بکەن بەڵکو دەروویەکمان لێ بکاتەوە.**

**یەکێکیان وتی: خودایە، من دایك و باوکێکی پیر و ئەفتادەم هەبوو و منداڵی بچووکیشم هەبوو، بۆ ئەوان شوانیم دەکرد، کە دەگەڕامەوە بۆ لایان شیرم دەدۆشی و یەکەمجار بە دایك و باوکم دەستم پێ دەکرد بەر لە منداڵەکەم، رۆژێك لەوەڕ[1] دووری خستمەوە نەگەڕامەوە تا ئێوارەم بەسەردا هات، بینیم هەردووکیان خەوتوون، شیرم دۆشی وەك چۆن دەمدۆشی و دەفری شیرەکەم هێنا و لەسەر سەریان وەستام، لام خۆش نەبوو لە خەوەکەیان بەئاگایان بهێنم و پێشم خۆش نەبوو بەر لەوان بە منداڵەکان دەست پێ بکەم، منداڵەکانیش لەبەر پێم دەکڕوزانەوە، بەردەوام ئەوە حاڵی من و منداڵەکان بوو تا رۆژ بوویەوە، گەر دەزانی من ئەوەم لەبەر رووی پاکی تۆ ئەنجامداوە دەروویەکمان لێ بکەرەوە لێیەوە ئاسمان ببینین، خودا کونێکی لێ کردنەوە لێیەوە ئاسمان ببینن.**

---

[1] واتە: لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانم-و.

دووەمیان وتی: خودایە، من کچێکی مامم هەبوو خۆشمدەویست بە توندترین و زۆرترین خۆشەویستی پیاو بۆ ئافرەت، داوای خۆیم کرد، رازی نەبوو تا سەد دیناری دەدەمێ، کۆشام تا سەد دینارم کۆکردەوە و پێمدا، کاتێ لە نێوان دوو لاقی دانیشتم وتی: ئەی بەندەی خودا، لە خودا بترسە و تەنها بە حەقی خۆی مۆرەکە بکەرەوە، منیش هەستامە سەرپێ و لێی دوورکەوتمەوە، خودایە، گەر دەزانی من ئەو کارەم لەپێناو رووی پاکی تۆ ئەنجامداوە دەروویەکمان لێ بکەرەوە خودا کونێکی تری لێکردنەوە.

ئەویتریان وتی: خودایە، من کرێکارێکم بە دەفرێ چەڵتووك گرت کاتێ کارەکەی تەواو کرد وتی: حەقەکەم پێ بدە، منیش حەقەکەم پێدا ئەویش وازیلێهێنا و پشتی تێکرد[1]، بەردەوام چەڵتووکەکەم دەچاند تا مانگام لێیەوە کۆکردەوە لەگەڵ شوانەکەیان[2]، کرێکارەکە هاتەوە بۆ لام و وتی: لە خودا بترسە و ستەمم لێ مەکە و حەقەکەم پێ بدە، منیش وتم: برۆ بۆ لای ئەو گاگەلە و شوانەکەیان، کرێکارەکە وتی: لە خودا بترسە و گاڵتەم پێ مەکە، منیش وتم: من گاڵتەت پێ ناکەم، ئەو گاگەلە و شوانەکەیان ببە، ئەویش بردنی و رۆیشت، گەر دەزانی من ئەوەم لەپێناو رووی پاکی تۆ ئەنجامداوە ئەوەی ماوەتەوە لێمان بکەرەوە، خودا دەرووی لێکردنەوە[3]).

## ١٥- دەروازەی: چیرۆکی "أصحاب الأخدود"

٣٥٦٦- (م) عَنْ صُهَيْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ، فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ: إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ، فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلاَماً أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ.

(١) واتە: کرێکەی بە کەم بینی و وەرینەگرت-و.

(٢) واتە: تا گاگەلێکم لە گا و مانگا لە پارەی چەڵتووکەکە کڕی و شوانێکیشم بەو پارەیە بۆ گرتن-و.

(٣) واتە: بەردەکەی لە دەرگای ئەشکەوتەکە تل دا-و.

فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلاَماً يُعَلِّمُهُ، فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ . إِذَا سَلَكَ . رَاهِبٌ، فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلاَمَهُ، فَأَعْجَبَهُ. فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ، فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ. فَشَكَا ذلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ، فَقَالَ: إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ: حَبَسَنِي أَهْلِي، وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ: حَبَسَنِي السَّاحِرُ.

فَبَيْنَمَا هُوَ كَذلِكَ إِذْ أَتَى عَلى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ، فَقَالَ: الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ؟ فَأَخَذَ حَجَراً فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ، حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ، فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا، وَمَضَى النَّاسُ. فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: أَيْ بُنَيَّ، أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي، قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرى، وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى، فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلاَ تَدُلُّ عَلَيَّ. وَكَانَ الْغُلاَمُ يُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ، وَيُدَاوِي النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الأَدْوَاءِ.

فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ، فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ، فَقَالَ: مَا هَاهُنَا لَكَ أَجْمَعُ، إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي، فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَشْفِي أَحَداً، إِنَّمَا يَشْفِي اللهُ، فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللهِ دَعَوْتُ اللهَ فَشَفَاكَ، فَآمَنَ بِاللهِ، فَشَفَاهُ اللهُ. فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ؟ قَالَ: رَبِّي. قَالَ: وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِي؟ قَالَ: رَبِّي وَرَبُّكَ اللهُ. فَأَخَذَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلاَمِ. فَجِيءَ بِالْغُلاَمِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: أَيْ بُنَيَّ! قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ، وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ، فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَشْفِي أَحَداً، إِنَّمَا يَشْفِي اللهُ، فَأَخَذَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلى الرَّاهِبِ.

فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ، فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَدَعَا بِالْمِنْشَارِ، فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ. ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ، فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ.

ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلاَمِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا، فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ، فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذِرْوَتَهُ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ؛ وَإِلاَّ فَاطْرَحُوهُ. فَذَهَبُوا بِهِ، فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ! اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَرَجَفَ بِهِمُ الْجَبَلُ، فَسَقَطُوا.

وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللهُ، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ، فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ، فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ؛ وَإِلاَّ فَاقْذِفُوهُ. فَذَهَبُوا بِهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ، فَغَرِقُوا. وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللهُ، فَقَالَ لِلْمَلِكِ: إِنَّكَ لَسْتَ

بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ خُذْ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِي، ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قُلْ: بِاسْمِ اللهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ ارْمِنِي، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ، قَتَلْتَنِي.فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ أَخَذَ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قَالَ: بِاسْمِ اللهِ، رَبِّ الْغُلَامِ! ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ، فَمَاتَ. فَقَالَ النَّاسُ: آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ! آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ! آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ! فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ: أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ؟ قَدْ وَاللهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ، قَدْ آمَنَ النَّاسُ. فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ، وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ، وَقَالَ: مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ، فَأَحْمُوهُ فِيهَا، أَوْ قِيلَ لَهُ: اقْتَحِمْ، فَفَعَلُوا. حَتَّى جَاءَتِ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا، فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا، فَقَالَ لَهَا الْغُلَامُ: يَا أُمَّهِ! اصْبِرِي، فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ). [م٣٠٠٥]

**(م) لە (صوهەیبەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: مەلیکێك هەبوو پێش ئێوە، ئەو ساحیرێکی هەبوو، کاتێ چوو بە تەمەندا بە مەلیکەکەی وت: من چووم بە ساڵدا[(١)]، منداڵێك رەوانە بکە بۆ لام سیحری فێر بکەم، مەلیکەکە غولامێکی نارد بۆ لای تا فێری بکات، ئەو لە رێگەکەی-کاتێ دەیگرتەبەر- راهیبێك هەبوو، لای دانیشت و قسەکانی بیست و پێی سەرسام بوو، ئەو کە دەهات بۆ لای ساحیرەکە بە لای راهیبەکەدا تێدەپەڕی و لای دادەنیشت، کاتێ دەهات بۆ لای ساحیرەکە لێیدەدا، منداڵەکە سکاڵای خۆی لای راهیبە کرد دەربارەی ئەوە[(٢)]، راهیبەکە وتی: گەر ترسای بڵێ خانەوادەکەم دوایانخستم، گەر لە خانەوادەکەت ترسای بڵێ: ساحیرەکە دوایخستم.**

**کاتێ منداڵەکە لەو حاڵ و بارەدا بوو هات بەسەر گیاندارێکی زەبەلاحدا خەڵکی راگرتبوو[(٣)]، منداڵەکە وتی: ئەمڕۆ دەزانم ساحیرەکە باشترە یان راهیبەکە؟ بەردێکی هەڵگرت و وتی: خودایە، گەر کاروباری راهیبەکە لە کاروباری ساحیرەکە لات باشترە**

---

(١) واتە: پیر بووم-و.

(٢) واتە: دەربارەی لێدانی لە لایەن ساحیرەکەوە-و.

(٣) واتە: لەبەر درندەکە خەڵك نەیدەوێرا بەو ناوچەدا هاتووچۆ بکات، ئەوەش بوو بووە هۆی راگرتنی کاروباریان-و.

ئەم گیانداره بکوژه تا خەڵکی تێپەڕن، بەردەکەی هەڵدا و کوشتی و خەڵکەکە تێپەڕین، هات بۆ لای راهیبەکە و هەواڵەکەی پێدا، راهیبەکە پێی وت: ئەی کوڕی خۆم تۆ ئەمڕۆ لە من باشتری، کاروبارت گەیشتووە بەوەی دەیبینم، تۆ تاقیدەکرێیەوە، گەر تاقیکرایتەوە منیان پێ نیشان مەدە، غولامەکە کەڕ و لاڵ و پەڵەداری چاك دەکردەوە و خەڵکی لە هەرچی نەخۆشییە چارەسەر دەکرد، یەکێك لە پیاوانی دیوای مەلیك کوێر بووبوو ناوی منداڵەکەی بیست بوو، هەدیەی زۆری بۆ هێنا، وتی: هەموو ئەوانە بۆ تۆن گەر تۆ شفات بۆ ناردم، منداڵەکە وتی: من هیچ کەس شفا نادەم، بەڵکو خودا شفا دەدات، گەر تۆ ئیمان بە خودا بهێنی داوا دەکەم لە خودا و شفات دەدا، ئیمانی بە خودا هێنا و خودا شفای دا، هات بۆ لای مەلیکەکە و لای دانیشت وەك چۆن جاران دادەنیشت، مەلیکەکە پێی وت: کێ چاوەکانی بۆ گێڕایتەوە؟ وتی: پەروەردگارم، مەلیکەکە وتی: بۆچی جگە لە من پەروەردگارێکی ترت هەیە؟ وتی: پەروەردگاری من و پەروەردگاری تۆ بریتییە لە "الله"، مەلیکەکە گرتی و بەردەوام ئازاری دەدا تا غولامەکەی پێ نیشاندا، غولامەکە هێنرا، مەلیکەکە پێی وت: کوڕی خۆم، سیحرەکەت گەیشتووەتە ئاستێك کەڕ و لاڵ و پەڵەدار چاك دەکەیەوە و ئەوە دەکەی و ئەوە دەکەی، منداڵەکە وتی: من شفای هیچ کەس نادەم، بەڵکو خودا شفا دەدات، مەلیکەکە گرتی، بەردەوام سزای دەدا تا راهیبەکەی پێ نیشان دا.

راهیبەکە هێنرا و پێی وترا: لە دینەکەت پاشگەز ببەرەوە، راهیبەکە رازی نەبوو، مەلیکەکە مشاری داوا کرد، مشارەکەی لەسەر ناوەڕاستی سەری دانا و کردی بە دوو لەتەوە تا دوو لاکەی بەربوونەوە، پاشان هاومەجلیسەکەی مەلیکیان هێنا، پێی وترا: لە دینەکەت پەشیمان ببەرەوە، ئەو رازی نەبوو، مشارەکەی لەسەر ناوەڕاستی سەری دانا و کردی بە دوو لەتەوە تا لەتەکان بەربوونەوە.

پاشان غولامەکە هێنرا و پێی وترا: لە دینەکەت پاشگەز ببەرەوە، غولامەکە رازی نەبوو، دای بە چەند کەسێك لە پاسەوانانی و وتی: بیبەن بۆ فلان چیای فلان شوێن سەری بخەن بەسەر چیاکەدا، کاتێ گەیشتنە لوتکەی چیاکە، گەر لە دینەکەی پاشگەزبوویەوە باشە، ئەگەر نە، هەڵیبدەنە خوارەوە، ئەوانیش بردیان و بەسەر

چیاکەدا سەریانخست، منداڵەکە وتی: خودایە بەوەی دەتەوێ ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوە، چیاکە هاتە لەرزە و بەربوونەوە[1].

گەڕایەوە بۆ لای مەلیکەکە، مەلیکەکە پێی وت: هاوڕێکانت چییان کرد؟ غوڵامەکە وتی: خودا ئەوانی لە کۆڵی منی کردنەوە، مەلیکەکە غوڵامەکەی دا بە چەند کەسێك لە پاسەوانانی و وتی: بیبەن و سواری بەلەمێ بچووکی بکەن و بیبەن بۆ ناوەڕاستی دەریا، گەر لە دینەکەی پاشگەزبوویەوە باشە، ئەگەر نە، هەڵیبدەنە ناو دەریاکە، ئەوانیش بردیان، غوڵامەکە وتی: خودایە، بەوەی دەتەوێ ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوە، بەلەمەکەیان قڵپ بوویەوە و هەموو نوقم بوون.

هات و بە ڕۆیشتن چوو بۆ لای مەلیك، مەلیك پێی وت: هاوەڵەکانت چییان کرد؟ وتی: خودا لە کۆڵی منی کردنەوە، ئەو بە مەلیکەکەی وت: تۆ ناتوانی من بکوژی تا ئەوە دەکەی من فەرمانت پێ دەکەم، مەلیکەکە وتی: ئەوە چییە؟ وتی: هەموو خەڵك لە یەك شوێن کۆدەکەیەوە، لەسەرینکی دارخورمایەك لە خاچم دەدەی، پاشان تیرێك لە هەگبەی تیرەکانم دەردەهێنی، پاشان تیرەکە لە کەوانەکە بنێ، پاشان بڵێ: بە ناوی خودا، پەروەردگاری منداڵەکە، پاشان تیرەکەم تێتەقێنە، تۆ گەر ئەو کارە بکەی من دەکوژی.

مەلیکەکە هەموو خەڵکەکەی لە یەك شوێن کۆکردەوە، غوڵامەکەی لەسەر بنکی دارخورمایەك لە خاچ دا، پاشان تیرێکی لە تیردانەکەی منداڵەکە دەرهێنا، پاشان تیرەکەی لە کەوانەکە نا، پاشان وتی: بە ناوی خودا، پەروەردگاری منداڵەکە، پاشان تیرەکەی تێتەقاند و تیرەکە دای لە لایەکی سەری، منداڵەکە دەستی خۆی دانا لەسەر لای سەری لە شوێنی تیرەکە و مرد، خەڵکەکە وتیان: ئیمانمان هێنا بە پەروەردگاری غوڵامەکە، ئیمانمان هێنا بە پەروەردگاری غوڵامەکە، ئیمانمان هێنا بە پەروەردگاری غوڵامەکە، هاتن بۆ لای مەلیکەکە و پێی وترا: دەبینی ئەوەی تۆ لێی دەترسای؟ سوێند بە خودا ترسەکە بەسەر خۆتدا داباری، خەڵکەکە ئیمانیان هێنا.

---

[1] واتە: ئەوانەی لەگەڵی بوون لە پاسەوانانی مەلیك مرد–و.

مەلیکەکە فەرمانی کرد بە لێدانی چاڵێکی گەورە لە زەوی لە دەروازەی: ڕێگەکان، چاڵەکە لێدرا و ئاگر کرایەوە و وتی: هەر کەس لە دینەکەی پەشیمان نەبێتەوە تیایدا بیسوتێنن، یان پێی دەوترا: بڕۆ ناویەوە، باوەڕدارانیش ئەوەیان ئەنجام دا، تا ئافرەتێك هات منداڵێکی خۆی لەگەڵ بوو، ساردبوویەوە لەوەی خۆی هەڵبداتە ناویەوە، منداڵەکە پێی وت: ئەی دایکی خۆم، ئارام بگرە تۆ لەسەر حەقی).



## بەشی یەکەم

## سەردەمی نەفامی و پێش پێغەمبەرایەتی

### ١- دەروازەی: یەکەمین کەسێك ئاژەڵانی بەرەڵا کرد

**٣٥٦٧-** (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ قالَ: البَحِيرَةُ: الَّتِي يُمْنَعُ دَرُّهَا لِلطَّوَاغِيتِ، وَلاَ يَحْلُبُهَا أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ. وَالسَّائِبَةُ: الَّتِي كانُوا يُسَيِّبُونَهَا لآلِهَتِهِمْ، فَلاَ يُحْمَلُ عَلَيْهَا شَيْءٌ.

قَالَ: وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عامِرِ بْنِ لُحَيٍّ الخُزَاعِيَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ**). [خ٣٥٢١/ م٢٨٥٦]

**(ق) لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، وتی: "البحيرة": ئەوەیە رێگری دەکرێت لە شیرەکەی لەپێناو تاغووتەکان، و هیچ کەس لە خەڵکی نایدۆشن، "السائبة"ش ئەوە بوو بۆ خواوەندەکانیان بەرەڵایان دەکرد و هیچ شتێکی لەسەر پشت نەدەنرا.**

**وتی: ئەبو هورەیرەش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عەمری کوڕی عامیری کوڕی لوحیی خوزاعیم لەناو ئاگر بینی ریخۆڵەکانی بەدوای خۆیدا رادەکێشا، ئەو یەکەمین کەس بوو ئاژەڵانی بەرەڵا کرد[1]).**

### ٢- دەروازەی: پەرستنی بەرد

**٣٥٦٨-** (خ) عَنْ أَبِي رَجاءٍ الْعُطَارِدِيِّ قَالَ: كُنَّا نَعْبُدُ الحَجَرَ، فَإِذَا وَجَدْنَا حَجَراً هُوَ أَخْيَرُ مِنْهُ أَلْقَيْنَاهُ وَأَخَذْنَا الآخَرَ، فَإِذَا لَمْ نَجِدْ حَجَراً جَمَعْنَا جُثْوَةً مِنْ تُرَابٍ، ثُمَّ جِئْنَا بِالشَّاةِ فَحَلَبْنَاهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُفْنَا بِهِ، فَإِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَجَبٍ قُلْنَا: مُنَصِّلُ الأَسِنَّةِ، فَلاَ نَدَعُ رُمْحاً فِيهِ حَدِيدَةٌ، وَلاَ سَهْماً فِيهِ حَدِيدَةٌ؛ إِلاَّ نَزَعْنَاهُ وَأَلْقَيْنَاهُ شَهْرَ رَجَبٍ. [خ٤٣٧٦]

---

[1] واتە: یەکەمین کەس بوو سائیبەی داهێنا-و.

(خ) لە ئەبی رەجائی عوتاریدییەوە، وتی: بەردمان دەپەرست، گەر بەردێکمان ببینیبایە باشتر لەوە ئەوەی یەکەممان فڕێ دەدا و ئەویترمان هەڵدەگرتەوە، گەر بەردمان نەبینیبایەوە کۆمایە لە خۆڵمان کۆدەکردەوە، پاشان مەڕێکمان دەهێنا بەسەریدا دەماندۆشی و پاشان تەوافمان دەکرد بە دەوریدا، گەر مانگی رەجەب بهاتبایەتە بەرەوە دەمانوت: "مُنَصِّلُ الأسِنَّةِ-هەڵکەنی ددان"، بۆیە لە مانگی رەجەب رمێك ئاسنی پێوەبایە و هەر تیرێك ئاسنی پێوەبایە لێمان دەکردەوە و فڕێمان دەدا[1].

## ٣- دەروازەی: سوێندان لەسەردەمی نەفامیدا

**٣٥٦٩-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ قَسَامَةٍ كانَتْ فِي الجَاهِلِيَّةِ لَفِينَا بَنِي هَاشِمٍ: كانَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، اسْتَأْجَرَهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ مِنْ فَخِذٍ أُخْرَى، فَانْطَلَقَ مَعَهُ فِي إِبِلِهِ، فَمَرَّ رَجُلٌ بِهِ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، قَدِ انْقَطَعَتْ عُرْوَةُ جُوَالِقِهِ، فَقَالَ: أَغِثْنِي بِعِقَالٍ أَشُدُّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِي، لاَ تَنْفِرُ الإِبِلُ، فَأَعْطَاهُ عِقَالاً فَشَدَّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِهِ. فَلَمَّا نَزَلُوا عُقِلَتِ الإِبِلُ؛ إِلاَّ بَعِيراً وَاحِداً، فَقَالَ الَّذِي اسْتَأْجَرَهُ: ما شَأْنُ هَذَا البَعِيرِ لَمْ يُعْقَلْ مِنْ بَيْنِ الإِبِلِ؟ قالَ: لَيْسَ لَهُ عِقَالٌ، قالَ: فَأَيْنَ عِقَالُهُ؟ قَالَ: فَحَذَفَهُ بِعَصاً كانَ فِيهَا أَجَلُهُ. فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ، فَقَالَ: أَتَشْهَدُ المَوْسِمَ؟ قالَ: ما أَشْهَدُ، وَرُبَّمَا شَهِدْتُهُ، قالَ: هَلْ أَنْتَ مُبْلِغٌ عَنِّي رِسَالَةً مَرَّةً مِنَ الدَّهْرِ؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: فَكُنْتَ إِذَا أَنْتَ شَهِدْتَ المَوْسِمَ فَنَادِ: يَا آلَ قُرَيْشٍ! فَإِذَا أَجَابُوكَ فَنَادِ: يَا آلَ بَنِي هَاشِمٍ! فَإِنْ أَجابُوكَ، فَسَلْ عَنْ أَبِي طَالِبٍ فَأَخْبِرْهُ: أَنَّ فُلاَناً قَتَلَنِي فِي عِقَالٍ، وَمَاتَ المُسْتَأْجَرُ.

فَلَمَّا قَدِمَ الذِي اسْتَأْجَرَهُ، أَتَاهُ أَبُو طَالِبٍ، فَقَالَ: ما فَعَلَ صَاحِبُنَا؟ قالَ: مَرِضَ، فَأَحْسَنْتُ الْقِيَامَ عَلَيْهِ، فَوَلِيتُ دَفْنَهُ، قالَ: قَدْ كانَ أَهْلَ ذَاكَ مِنْكَ، فَمَكَثَ حِيناً، ثُمَّ إِنَّ الرَّجُلَ الَّذِي أَوْصَى إِلَيْهِ أَنْ يُبْلِغَ عَنْهُ وَافَى المَوْسِمَ، فَقَالَ: يَا آلَ قُرَيْشٍ! قَالُوا: هذِهِ قُرَيْشٌ، قَالَ: يَا آلَ بَنِي هَاشِمٍ! قَالُوا: هذِهِ بَنُو هَاشِمٍ، قالَ: أَيْنَ أَبُو طالِبٍ؟ قالوا: هَذَا أَبُو طَالِبٍ، قالَ: أَمَرَنِي فُلاَنٌ أَنْ أُبْلِغَكَ رِسَالَةً، أَنَّ فُلاَناً قَتَلَهُ فِي عِقَالٍ.

---

[1] واتە: نووکی ئاسنینی رم و تیرمان لێ دەکردەوە و فڕێمان دەدا-و.

فَأَتَاهُ أَبُو طَالِبٍ فَقَالَ لَهُ: اخْتَرْ مِنَّا إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تُؤَدِّيَ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ فَإِنَّكَ قَتَلْتَ صَاحِبَنَا، وَإِنْ شِئْتَ حَلَفَ خَمْسُونَ مِنْ قَوْمِكَ أَنَّكَ لَمْ تَقْتُلْهُ، فَإِنْ أَبَيْتَ قَتَلْنَاكَ بِهِ، فَأَتَى قَوْمَهُ فَقَالُوا: نَحْلِفُ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، كانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْهُمْ، قَدْ وَلَدَتْ لَهُ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا طَالِبٍ! أُحِبُّ أَنْ تُجِيزَ ابْنِي هَذَا بِرَجُلٍ مِنَ الْخَمْسِينَ، وَلاَ تَصْبُرْ يَمِينَهُ حَيْثُ تُصْبَرُ الأَيْمَانُ، فَفَعَلَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ: يَا أَبَا طَالِبٍ! أَرَدْتَ خَمْسِينَ رَجُلاً أَنْ يَحْلِفُوا مكانَ مِائَةٍ مِنَ الإِبِلِ، يُصِيبُ كُلَّ رَجُلٍ بَعِيرَانِ، هَذَانِ بَعِيرَانِ، فَاقْبَلْهُمَا عَنِّي وَلاَ تَصْبُرْ يَمِينِي حَيْثُ تُصْبَرُ الأَيْمَانُ، فَقَبِلَهُمَا، وَجَاءَ ثَمَانِيَةٌ وَأَرْبَعُونَ فَحَلَفُوا.

قالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! ما حالَ الحَوْلُ، وَمِنَ الثَّمَانِيَةِ وَالأَرْبَعِينَ عَيْنٌ تَطْرِفُ. [خ٣٨٤٥]

**(خ)** لە ئیبن عەباسەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: یەکەمین سوێندانێك لەسەردەمی نەفامیدا لەبەنی هاشمدابوو: پیاوێك لەبەنی هاشم بە کرێ گیرا لەلایەن پیاوێك لە قورەیشەوە لەتیرەیەکی تر، لەکاروانی حوشترەکانیدا لەگەڵی ڕۆیشت[1]، پیاوێك لە بەنی هاشم بەپاڵیدا گوزەری کرد پەتی جەواڵەکەی چڕابوو[2]، وتی: بەفریامکەوە بەپێدانی پەتێك دەمی جەواڵەکەمی پێ ببەستم و حوشترەکەم لەدەست هەڵنەیەت، ئەویش پەتێکی پێدا و دەمی جەواڵەکەی پێبەست، کاتێك لە شوێنێ دابەزین حوشترەکان بەسترانەوە جگە لەیەك حوشتر، ئەو کەسەی بەکرێی گرتبوو پێی وت: بۆچی ئەو حوشترە لەناو حوشترەکانی تردا نەبەستراوەتەوە؟ وتی: پەتی نیە، ئەویش وتی: ئەی کوا پەتەکەی؟[3] وتی: عەسایەکی بۆ هەڵدا و مردنی کەسەکەی تێدابوو، پیاوێك لەئەهلی یەمەن بەپاڵیدا تێپەڕی و پێی وت[4]: ئایا لە

---

(١) واتە: ئەو پیاوەی کە لە تیرەیەکی تری قورەیش بوو پیاوە بەنی هاشمییەکەی بە کرێ گرت تا کاروانی حوشترەکانی بۆ لێبخوڕێت -و.

(٢) واتە: پیاوێکی تر لە بەنی هاشم بە پاڵ پیاوە بەکرێگیراوەکەی بەنی هاشمدا گوزەری کرد-

(٣) دیارە لە وەڵامیدا وتوویەتی پەتەکەیم بەخشی بە پیاوێکی تری بەنی هاشم -و.

(٤) واتە: پیاوە بریندارەکەی بەنی هاشم پێی وت -و.

مەوسمی حەجدا ئامادە دەبیت؟ وتی: ئامادە نابم، لەوانەیە کاتێکی تر ئامادەبم، وتی: ئایا بۆتەنها جارێك لەرۆژگار نامەیەك لەمن دەگەیەنیت بەکەسێك؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەگەر ئامادەبوویت لە مەوسمی حەج بانگ بکە: ئەی ئالی قورەیش! گەر وەڵامیان دایەوە، بانگ بکە: ئەی ئالی بەنی هاشم! گەر وەڵامیان دایەوە، پرسیار بکە دەربارەی ئەبی تالب، هەواڵی پێبدە: فلان[1] لەبەر پەتێك منی کوشت، دواتر کەسەکە بەکرێگیراوەکە مرد.

کاتێك ئەو کەسەی بەکرێی گرتبوو گەڕایەوە[2]، ئەبوتالب[3] هات بۆ لای، پێی وت: هاوەڵەکەی ئێمە چی لێهات؟ ئەویش وتی: نەخۆشکەوت، زۆر بەجوانی بەسەریەوە بووم خزمەتم کرد، دواتر کفن ودفنم کرد، ئەبوتالب وتی: هەر ئەوە لەتۆ چاوەڕوان دەکرێت، تۆ شایستەی ئەو کارەیت، ماوەیەك بەسەردا تێپەڕی ئەو پیاوەی وەسێتەکەی بۆ کرابوو بیگەیەنێت[4] لەمەوسمی حەج ئامادەبوو، وتی: ئەی ئالی قورەیش، وتیان: ئەمە قورەیشە، وتی: ئەی ئالی بەنی هاشم، وتیان: ئەمە بەنو هاشمە، وتی: کوا ئەبوتالب، وتیان: ئەوە ئەبو تالبە، وتی: فلان کەس فەرمانی پێکردووم نامەیەکت پێبگەیەنم: فلان کەس لەبەر پەتێك کوشتویەتی[5].

ئەبوتالب هات بۆلای کەسەکە و پێی وت: یەکێك لەم سیانە لەئێمە وەربگرە: دەتوانیت سەد حوشتر بدەیت، چونکە تۆ کەسەکەی ئێمەت کوشتوە، دەشتوانیت پەنجا کەس لەتیرەکەت بهێنیت سوێند بخۆن تۆ نەتکوشتوە، گەر یەکێك لەم دوانە ئەنجام نەدەی لەبری ئەو پیاوە دەتکوژینەوە، ئەویش هات بۆلای تیرەکەی خۆی و وتیان: سوێندت بۆ دەخۆین، ئافرەتێك لەبەنی هاشم کە ژنی پیاوێك لەوانبوو،

---

[1] واتە: خاوەنی کاروانییەکە-و.

[2] واتە: گەڕایەوە بۆ مەککە-و.

[3] چونکە ئەبو تالب سەرۆکی بەنی هاشم بوو-و.

[4] واتە: پیاوە یەمەنییەکە-و.

[5] ئەوە نامە زارەکییەکەیە-و.

کوڕێکی لە مێردەکەی هەبوو هات بۆ لای ئەبوتالب و وتی: ئەی ئەبا تالب! پێمخۆشە کوڕەکەم سوێند نەدەیت لەو پەنجا پیاوە ناچاری نەکەیت بەسوێندخواردن لەنێوان روکن و مەقامدا[1]، ئەبوتالبیش وەلامی دایەوە و بەوجۆرەی کرد، پیاوێکیتر لەوان هات و وتی: ئەی ئەبوتالب! تۆ پەنجا پیاوت دەوێت سوێندت بۆ بخۆن بەرامبەر بە سەد حوشتر، هەر پیاوێك لەوان دوو حوشتری دەکەوێت، ئەوە دوو حوشترەکەی خۆم، لێمی وەربگرە و ناچارم مەکە بەسوێندخواردن لەنێوان روکن و مەقام، ئەبوتالب دوو حوشترەکەی لێوەرگرت، و چل و هەشت کەسەکەی تر هاتن و سوێندیان خوارد، ئیبن عەباس وتی: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە! ساڵ نەگەڕایەوە بەسەریاندا چل و هەشت کەسەکە چاویان دنیای نەبینی[2].

## ٤- دەروازەی: خۆ پاکڕاگرتنی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل

**٣٥٧٠-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَقِيَ زَيْدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ بِأَسْفَلِ بَلْدَحَ، قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الْوَحْيُ، فَقُدِّمَتْ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم سُفْرَةٌ، فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا، ثُمَّ قالَ زَيْدٌ: إِنِّي لَسْتُ آكُلُ مِمَّا تَذْبَحُونَ عَلَى أَنْصَابِكُمْ، وَلاَ آكُلُ إِلاَّ ما ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ. وأَنَّ زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو كانَ يَعِيبُ عَلَى قُرَيْشٍ ذَبَائِحَهُمْ، وَيَقُولُ: الشَّاةُ خَلَقَهَا اللهُ، وَأَنْزَلَ لَهَا مِنَ السَّمَاءِ الماءَ، وَأَنْبَتَ لَهَا مِنَ الأَرْضِ، ثُمَّ تَذْبَحُونَهَا عَلَى غَيْرِ اسْمِ اللهِ! إِنْكاراً لِذلِكَ وَإِعْظَاماً لَهُ. [خ٣٨٢٦، ٣٨٢٧]

**(خ)** لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە (خوایان لێ رازی بێت): پێغەمبەر(ﷺ) بەزەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل گەیشت لە خوارووی بەلدەح[3]، بەرلەوەی وەحی بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) دابەزێت، سفرەیەك لە خواردن پێشکەش بە پێغەمبەر کرا، پێغەمبەر نەیویست لێی بخوات، زەید وتی: من لەو خواردنانە ناخۆم لەسەر

---

[1] شوێنی سوێندخواردنەکە نێوان روکن و مەقام بوو-و.

[2] واتە: هەموویان مردن، چونکە بەناحەق سوێندیان خوارد-و.

[3] بەلدەح: شیوێکە بەرانبەر بە مەککە لە ئاراستەی خۆرئاواوە-و.

بتەکانتان سەردەبڕڕێن، تەنها ئەوانە دەخۆم ناوی خوایان لەسەر دەهێنرێت، زەیدی کوڕی عەمر نەنگی لە قورەیش دەگرت بۆ سەربڕینەکانیان و دەیوت: مەڕ و بزن خودا خەڵقی کردون و لە ئاسمانەوە بارانی بۆ باراندوون و لەزەوی گژوگیای بۆ ڕوواندون، پاشان سەریان دەبڕن بەناوێك جگە لەناوی خودا! ئەو قسەی وەك ئینکارکردنی کارەکەی ئەوان و خراپ تەماشاکردنیان بوو.

## ٥- دەروازەی: ڕەچەڵەکی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٥٧١-** (م) عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشاً مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ). [م٢٢٧٦]

**(م) لەواثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (خودا لە کوڕەکانی ئیسماعیل کینانەی هەڵبژارد، قورەیشی لە کینانە هەڵبژارد، لە قورەیش بەنی هاشمی هەڵبژارد، منی لەبەنی هاشم هەڵبژارد).**

## ٦- دەروازەی: لەتکردنی سینەی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" کاتێك ئەو منداڵ بوو

**٣٥٧٢-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَتَاهُ جِبْرِيلُ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَهُ فَصَرَعَهُ، فَشَقَّ عَنْ قَلْبِهِ، فَاسْتَخْرَجَ الْقَلْبَ، فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ عَلَقَةً، فَقَالَ: هَذَا حَظ الشَّيْطَانِ مِنْكَ. ثُمَّ غَسَلَهُ فِي طَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ لأَمَهُ، ثُمَّ أَعَادَهُ فِي مَكَانِهِ. وَجَاءَ الْغِلْمَانُ يَسْعَوْنَ إِلَى أُمِّهِ - يَعْنِي: ظِئْرَهُ - فَقَالُوا: إِنَّ مُحَمَّداً قَدْ قُتِلَ، فَاسْتَقْبَلُوهُ وَهُوَ مُنْتَقَعُ اللَّوْنِ.

قَالَ أَنَسٌ: وَقَدْ كُنْتُ أَرَى أَثَرَ ذلِكَ الْمِخْيَطِ فِي صَدْرِهِ. [م: الإيمان ١٦٢ (٢٦١)]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: جبریل(علیه السلام) هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەو لەناو منداڵان یاری دەکرد، پێغەمبەری گرت و کێشای بەزەویدا و سینەی شەقکرد و دڵی**

هێنا دەرەوە، لە دڵی زالوویەکی ڕەشی[1] هێنایە دەرەوە و وتی: ئەمە بەشی شەیتانە لەتۆدا، پاشان دڵەکەی لە تەشتێکی زێڕدا بەئاوی زەمزەم شۆری و پاشان دڵەکەی هێنایەوەیەك و گێڕایەوە شوێنەکەی خۆی، مندااڵن هاتن بۆ لای دایکی– واتە: دایکە شیرییەکەی[2]– و وتیان: محەمەد کوژرا، ئەوانیش بەرەو ڕووی هاتن و بینیان ڕەنگی گۆڕاوە، ئەنەس وتی: ئەسەری ئەو دورینەوەم لە سینەی پێغەمبەری خودادا دەبینی.

## ٧- دەروازەی: شوانی مەڕ لەلایەن پێغەمبەرەوە "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٥٧٣–** (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (ما بَعَثَ اللهُ نَبِيّاً إِلاَّ رَعى الْغَنَمَ)، فَقَالَ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ؟ فَقَالَ: (نَعَمْ، كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لأَهْلِ مَكَّةَ).
[خ٢٢٦٢]

**(خ)** لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(خودا هەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێت شوانی مەڕی کردووە)** هاوەڵانی وتیان: تۆش؟ فەرمووی: **(بەڵێ، منیش بەچەند درهەمێك بۆ ئەهلی مەککە مەڕم دەلەوەڕاند)**.

## ٨- دەروازەی: مژدەدەرەکان بە پێغەمبەرایەتی

**٣٥٧٤–** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنِّي لأَعْرِفُ حَجَراً بِمَكَّةَ، كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ). [م٢٢٧٧]

**(م)** لە جابری کوڕی سەموورەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من بەردێك لە مەککە دەزانم، بەرلەوەی ڕەوانە بکرێم بە پێغەمبەرایەتی سەلامی لێدەکردم[3]، من ئێستا ئەو بەردە دەناسم)**.

---

[1] واتە: پارچە خوێنێکی ڕەش–و.

[2] واتە: حەلیمە سەعدییە–و.

[3] واتە: بەردەکە پێی دەوت: "السلام عليك، يا رسول الله"–و.

## بەشی دووەم

# ڕەوانەکردنی پێغەمبەر و قۆناغی مەکی

## ١- دەروازەی: ڕەوانەکردنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٥٧٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: بُعِثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَرْبَعِينَ سَنَةً، فَمَكَثَ بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحى إِلَيْهِ، ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ فَهَاجَرَ عَشْرَ سِنِينَ، وَمَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [خ٣٩٠٢ (٣٨٥١)/ م٢٣٥١]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە چل ساڵیدا ڕەوانەکرا، سیازدە ساڵ لە مەککە مایەوە وەحی بۆ ڕەوانەدەکرا، پاشان فەرمانی پێکرا بە کۆچ، دەساڵیش لە کۆچدا بوو، ئەو کۆچی دوایی کرد و تەمەنی شەست و سێ ساڵان بوو.**

## ٢- دەروازەی: دەسپێکردنی وەحی

**٣٥٧٦-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا؛ إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ، فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ. وَهُوَ: التَّعَبُّدُ. اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ المَلَكُ فَقَالَ: اقْرَأْ، قَالَ: (**مَا أَنَا بِقَارِئٍ**). قَالَ: (**فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجُهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الجُهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣﴾** [العلق: ١- ٣]).

فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رضي الله عنها فَقَالَ: (**زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي**). فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ: (**لَقَدْ**

خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي). فَقَالَتْ خَدِيجَةُ: كَلاَّ، وَاللهِ! مَا يُخْزِيكَ اللهُ أَبَداً، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ المعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ.

فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى، ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ، وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخاً كَبِيراً قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَا ابْنَ عَمِّ! اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ.

فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي! مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللهُ عَلَى مُوسَى، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعاً!، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيّاً إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ). قَالَ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ؛ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْراً مُؤَزَّراً.　　[خ٣/ م١٦٠]

**(ق)** لە عائشەوە دایكی باوەڕداران ئەو وتی: یەكەمین شتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی پێكرد لە وەحی خەونی ساڵح بوو لە خەودا، ئەو هەر خەونێكی ببینیبایە وەك ڕۆشنایی بەرەبەیان دەهاتە دی، پاشان تەنهایی لا خۆشەویست كرا، ئەو لە غاری حیرا تەنها دەكەوت، تیایدا چەندین شەو تەعەبودی دەكرد بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆلای خانەوادەكەی و توێشو ببات بۆ ئەوە، پاشان دەگەڕایەوە بۆلای خەدیجە و بەهاوشێوەی ئەوە توێشوی دەبرد تا حەق هات بۆلای و ئەو لە غاری حیرا بوو، فریشتەیەك هات بۆلای پێی وت بخوێنە (وتی: من خوێندەوار نیم). وتی: **(بەتوندی گرتمی و گوشیمی بە خۆیدا تا هەستم بەناڕەحەتی كرد، پاشان بەریدام و وتی: بخوێنە، وتم من خوێندەوار نیم، بۆ جاری دووەهەم گرتمی و بەتوندی گوشیمی بەخۆیدا و پاشان بەریدام و وتی: بخوێنە وتم من خوێندەوار نیم، بۆ جاری سێهەم گوشیمی بەخۆیدا، پاشان بەریدام و وتی:** ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ① خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ② ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ③﴾ [العلق: ١ - ٣]).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕایەوە و ئەو دڵی هاتبووە هەژان، ڕۆیشتە ژوورەوە بۆلای خەدیجەی كچی خوەیلید(خوا لێی ڕازی بێت)، فەرمووی: **(داماپۆشن داماپۆشن)**. ئەوانیش دایانپۆشی تا ترسەكەی لێڕەویەوە، هەواڵەكەی بە خەدیجە گەیاند و فەرمووی: **(لەنەفسی خۆم ترسام)**، خەدیجە وتی: نا سوێند بەخودا هەرگیز خودا تۆ

شەرمەزار ناکات، تۆ سیلەی ڕەحم بەجێدەهێنی، کۆمەکی کەسی پەککەوتوو دەدەی، یارمەتی کەسی هەژار دەدەی، میوانپەزێری لە میوان دەکەیت، لەڕووداوەکانی حەق کۆمەکی دەکەیت.

خەدیجە بردی و گەیاندیە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدوالعوزا، کوڕە مامی خەدیجە ئەو پیاوێك بوو لەسەردەمی نەفامیدا بووبوو بە نەصرانی، کتێبی بە عیبرانی دەنووسی، خودا چەندی بویستبایە بە عیبرانی لە ئینجیلی دەنووسی، ئەو پیاوێکی پیری بەتەمەن بوو، نابینا بووبوو خەدیجە پێی وت کوڕی مامم گوێ بگرە لە برازاکەی خۆت، وەرەقە پێی وت: ئەی برازای خۆم چی دەبینی؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بینی بووی هەواڵی پێدا، وەرەقە پێی وت ئەوە ئەو ناموسەیە بۆ سەر موسا دابەزی، خۆزگە تیایدا گەنجێکی بەتوانا بوومایە، خۆزگە زیندوبومایە کاتێك هۆزەکەت تۆ دەردەکەن، پێغەمبەری خودا فەرمووی: **(بۆچی هۆزەکەم من دەردەکەن)** وتی: بەڵێ، هەر پیاوێك ئەوەی هێنابێت کە تۆ هێناوتە دەستدرێژی کراوەتەسەر، گەر لەو ڕۆژگارەدا زیندووبم بەسەرکەوتنێکی گەورە سەرتدەخەم.

**٣٥٧٧**- (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ أنه قَالَ ـ وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ ـ قَالَ صلّى الله عليه وسلّم: (**بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتاً مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي، فَإِذَا الْمَلَكُ الذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي**، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ① قُمْ فَأَنذِرْ ②﴾، إِلى قَوْلِهِ: ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ⑤﴾[المدثر: ١- ٥]. فَحَمِيَ الْوَحْيُ وَتَتَابَعَ). [خ٤/ م١٦١]

(ق) لەجابری کوڕی عەبدوڵای ئەنساریەوە، ئەو دەربارەی خاوبوونەوەی وەحی قسەی دەکرد و وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(کاتێك من بەڕێگەدا دەڕۆیشتم لەئاسمانەوە گوێم لە دەنگێك بوو چاوم بەرزکردەوە ئەو فریشتەم بینی لەغاری حیرا هات بۆ لام، لەسەر کورسیەك لەنێوان ئاسمان و زەوی دانیشتبوو، لێی ترسام،**

گەڕامەوە و وتم: دامپۆشن، دامپۆشن، خودا ئایەتی دابەزاند و فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾، تا: ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥﴾[المدثر: ١ – ٥].

**٣٥٧٨**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤمِنِينَ ﵂: أَنَّ الحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ ﵁ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَحْيَاناً يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحْيَاناً يَتَمَثَّلُ لِيَ المَلَكُ رَجُلاً، فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ)**.

قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ، فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقاً. [خ٢/ م٢٣٣٣]

**(ق) لە عائیشەوە دایکی باوەڕداران(خوا لێی ڕازی بێت) حاریسی کوڕی هیشام(خوا لێی ڕازی بێت) پرسیاری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن وەحیت بۆ دێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەندێك جار وەك زرەی زەنگ بۆم دێت، ئەوەیان لەسەرم توندترینە، دەنگەکە دەبڕێت و ئەوەی ئەو وتوویەتی لەبەرم کردووە و لێی حاڵی بووم، هەندێ جاریش فریشتەیەك لەشێوەی پیاوێکدا بۆم بەرجەستە دەبێت قسەم لەگەڵ دەکات و ئەوەی ئەو وتوویەتی لەبەری دەکەم و لێی حاڵی بووم)، عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەرم بینی لەڕۆژێکی زۆر سارددا وەحی بۆ سەر دابەزی، کاتێ وەحیەکەی لێبڕا ڕوخساری ئارەقەی لێدەچۆڕا.**

## ٣- دەروازەی: فەرمودەی خودا(سبحان والتعالى): ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ۝٢١٤﴾ [الشعراء: ٢١٤]

**٣٥٧٩**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ أَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ۝٢١٤﴾[الشعراء: ٢١٤] قَالَ: **(يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ. أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا . اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئاً. يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللهِ**

شَيْئاً. يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللهِ شَيْئاً. وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللهِ لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً. وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي ما شِئْتِ مِنْ مالِي، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً).
[خ٢٧٥٣/ م٢٠٦]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کاتێك خودا ئایەتی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾[الشعراء: ٢١٤]ی دابەزاند، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا و فەرمووی: **(ئەی کۆمەڵی قورەیش–یان قسەیەکی هاوشێوەی ئەوە– خۆتان بکڕنەوە، من لای خودا بۆ ئێوە هیچ شتێکم لە دەستدا نییە، ئەی بەنی عەبدولمەناف، من لای خودا بۆ ئێوە هیچ شتێکم لە دەستدا نییە، ئەی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، من لای خودا بۆ تۆ هیچ شتێکم لە دەستدا نیە، ئەی صەفییەی پووری پێغەمبەری خودا، من لای خودا بۆ تۆ هیچ شتێکم لە دەستدا نییە، ئەی فاتیمەی کچی موحەمەد، هەرچی دەخوازی لە ماڵ و سامان لێم داوابکە، لای خودا بۆ تۆ من هیچ شتێکم لە دەستدا نییە).**

٣٥٨٠– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾[الشعراء: ٢١٤] وَرَهْطَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ، خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى صَعِدَ الصَّفَا، فَهَتَفَ: (يَا صَبَاحَاهْ!). فَقَالُوا: مَنْ هَذَا؟ فَاجْتَمَعُوا إِلَيْهِ، فَقَالَ: (أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً تَخْرُجُ مِنْ سَفْحِ هَذَا الجَبَلِ، أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ)؟ قَالُوا: ما جَرَّبْنَا عَلَيْكَ كَذِباً، قالَ: (فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ). قالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبّاً لَكَ، ما جَمَعْتَنَا إِلاَّ لِهَذَا، ثُمَّ قَامَ، فَنَزَلَتْ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾[المسد: ١] وَقَدْ تَبَّ. هكَذَا قَرَأَهَا الأَعْمَشُ يَوْمَئِذٍ.
[خ٤٩٧١ (١٣٩٤)/ م٢٠٨]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: کاتێك ئایەتی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾[الشعراء: ٢١٤]، وَرَهْطَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ[1]، دابەزی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە تا بە صەفادا سەرکەوت، هاواری کرد: (یا

[1] مەبەست پێی ئەسپ سواری دوژمنە بیانەوێ بدەن بەسەریاندا–و.

صـباحاه![1]) ئـەوانیش وتیـان: ئـەوە کێیـە؟ ئـەوان لای کۆبوونـەوە، پێغەمبـەر فەرمووی: **(باشە گەر هەواڵتان پێبدەم لە لاپاڵی ئەو چیایە ئەسپ سوار[2] سەرهەڵدەدەن، ئایا بەڕاستم دەزانن؟)** وتیـان درۆمـان لـەتۆ ئـەزموون نـەکردووە، فەرمووی: **(من ترسێنەرم بۆ ئێوە بەر لە هاتنی سزایەکی زۆر توند)**، ئـەبو لەهـەب وتی: زیانۆمەند بیت، بۆ ئەمە ئێمـەت کـۆکردەوە؟ پاشـان هەسـتا و ئایـەت دابـەزی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ①﴾[المسد: ١]، ئەو زیانۆمەند بوو، ئەو ڕۆژە ئەعمەش بەو جۆرە ئایەتەکەی خوێندەوە.

## ٤- دەروازەی: موسوڵمانە پێشەنگەکان

**٣٥٨١**– (خ) عَنْ عمار قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَا مَعَهُ؛ إِلاَّ خَمْسَةُ أَعْبُدٍ وَامْرَأَتَانِ، وَأَبُو بَكْرٍ. [خ٣٦٦٠]

**(خ) لە عەمارەوە وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی تەنها پێنج بەندە و دوو ژن و ئەبوبەکری لەگەڵ بوو.**

## ٥- دەروازەی: ئـەوەی توشی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" و هاوەڵانی بوو لە مەککە

**٣٥٨٢**– (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ، وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ، إِذْ قَالَ بَعْضُهُمْ لبَعْضٍ: أَيُّكُمْ يَجِيءُ بِسَلَى جَزُورِ بَنِي فُلاَنٍ، فَيَضَعُهُ عَلَى ظَهْرِ مُحَمَّدٍ إِذَا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ فَجَاءَ بِهِ، فَنَظَرَ حَتَّى إذا سَجَدَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، وَضَعَهُ عَلَى ظَهْرِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ لاَ أغني شَيْئاً، لَوْ كَانَ لِي مَنَعَةٌ،

---

(١) "یا صباحاه" کەلیمەیەکە بۆ کۆکردنەوەی خەڵك بەکاردێت–و.

(٢) قورتـوبی لـە تەفسـیرەکەیدا دەڵێـت: (وَرَهْطَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ) ئایـەت بـووە و خوێنراوەتەوە و نەسخ کراوە–و.

قَالَ: فَجَعَلُوا يَضْحَكُونَ، وَيُحِيلُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَاجِدٌ لاَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى جَاءَتْهُ فَاطِمَةُ، فَطَرَحَتْ عَنْ ظَهْرِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ قَالَ: **(اللَّهُمَّ! عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ)**. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَشَقَّ عَلَيْهِمْ إِذْ دَعَا عَلَيْهِمْ. قَالَ: وَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّ الدَّعْوَةَ فِي ذَلِكَ الْبَلَدِ مُسْتَجَابَةٌ، ثُمَّ سَمَّى: **(اللَّهُمَّ! عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ، وَعَلَيْكَ بِعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ)**. وَعَدَّ السَّابِعَ فَلَمْ نَحْفَظْهُ، قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ عَدَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَرْعَى، فِي الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ.

[خ٢٤٠/ م١٧٩٤]

**(ق)** لە عەبدوڵای كوڕی مەسعوودەوە، پێغەمبەر لەبەیت نوێژی دەكرد، ئەبو جەهل و هاوەڵانی دانیشتبوون، یەكێكیان بەوانی تری وت: كێ دەتوانێت سەراو و سیخوڕی[1] حوشترەكانی بەنی فڵان بهێنێت و لەسەر پشتی موحەمەد-كاتێك دەچێتە سوژدە- دایبنێت، بۆیە بەدبەخترین كەسی دەستەكەیان ڕەوانەكرد و هێنای و چاوەڕوان بوو تا پێغەمبەر(ﷺ) چووە سوژدە لەسەر پشتی پێغەمبەر لەنێوان دوو شانی داینا، من تەماشام دەكرد و هیچم لە دەست نەدەهات، ئای گەر پاڵپشتێكم هەبوایە، وتی: دەستیان بە پێكەنین كرد، هەندێكیان بەسەر هەندێكیاندا لار دەبوونەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوژدەی بردبوو سەری بەرز نەدەكردەوە، تا فاتیمە هات و ئەوەی لەسەر پشتی بوو لای دا، پێغەمبەر سەری بەرزكردەوە و پاشان فەرمووی: **(خودایە، قورەیش دەدەمە دەستی تۆ)** سێ جار، ئەوانیش لایان گران بوو پێغەمبەر دوعای لێكردن، وتی: ئەوان دەیانزانی دوعای پێغەمبەر لەو شارەدا گیرایە، پاشان پێغەمبەر ناوی هێنان و فەرمووی: **(خودایە ئەبوجەهل دەمە دەستی تۆ، خودایە عوتبەی كوڕی ڕەبیعە و شەیبەی كوڕی ڕەبیعە و وەلیدی كوڕی عوتبە و ئومەیەی كوڕی خەلەف و عوقبەی كوڕی موعید دەدەمە دەستی تۆ)** تا حەوتی:

---

[1] سەراو و سیخوڕ: بەو ریخۆڵە و ناوسك و ورگ و پیسییەی ئاژەڵان دەوترێت فڕێ دەدرێت-و.

ژمارد، بۆمان لەبەر نەکرا، وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەوانەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناویهێنان بە کوژراویی لە بیری قەلیبی بەدر بینیمن.

■ ولفظ مسلم: وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَمِيلُ عَلَى بَعْضٍ.. فَلَمَّا سَمِعُوا صَوْتَهُ، ذَهَبَ عَنْهُمُ الضِّحْكُ، وَخَافُوا دَعْوَتَهُ.

**لەفزەکەی موسلیم هەندێکیان خوار دەبوونەوە بەسەر هەندێکی تریاندا، کاتێك دەنگی پێغەمبەریان بیست پێکەنینەکەیان نەما و ترسان لە دوعاکەی.**

**٣٥٨٣**- (خ) عَنْ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهْوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، قُلْنَا لَهُ: أَلاَ تَسْتَنْصِرُ لَنَا؟ أَلاَ تَدْعُو اللهَ لَنَا؟ قَالَ: **(كانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ، فَيُجْعَلُ فِيهِ، فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ، وَمَا يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ. وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الحَدِيدِ ما دُونَ لَحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ أَوْ عَصَبٍ، وَمَا يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ. وَاللهِ لَيُتِمَّنَّ هَذَا الأَمْرَ، حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ، لاَ يَخَافُ إِلاَّ اللهَ، أَوِ الذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ، وَلكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ).** [خ٣٦١٢]

**(خ)** لە خەبابی کوڕی ئەرەتەوە، وتی: سکالامان بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو لەسێبەری کەعبە بوردەیەکی خۆی لەژێر سەر دانابوو، پێمان وت: ئەرێ داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی، ئەرێ داوامان لە خودا بۆ ناکەی، فەرمووی: **(پیاو لەوانەی پێش ئێوە چاڵێکیان لەزەوی بۆ هەڵدەکەند و ئەویان تێدەنا، ئەوجا مشارێکیان دەهێنا و لەسەر سەری دایاندەنا و دەیانکرد بە دوو لەتەوە، ئەوە ڕێگری لێ نەدەکرد لە دینەکەی، بە مشاری ئاسنین شانە دەکرا و گۆشتی-یان دەماری- لە ئێسك جیا دەکرایەوە ئەوە ڕێگری لێ نەدەکرد لە دینەکەی، سوێند بە خودا، خودا ئەم کارە تەواو دەکات تا سوار لە سەنعاوە دەچێت بۆ حەزرەمەوت تەنها لە خودا دەترسێت یان گورگ لەسەر مەڕەکانیەتی، بەڵام ئێوە پەلەدەکەن).**

**٣٥٨٤**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ قَالَ: فَقِيلَ: نَعَمْ. فَقَالَ: وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذلِكَ لأَطَأَنَّ عَلَى رَقَبَتِهِ، أَوْ لأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ فِي

التُّرَابِ. قَالَ: فَأَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ يُصَلِّي ـ زَعَمَ ـ لِيَطَأَ عَلَى رَقَبَتِهِ، قَالَ: فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ؛ إِلاَّ وَهُوَ يَنْكِصُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ، قالَ: فَقِيلَ لَهُ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقاً مِنْ نَارٍ وَهَوْلاً وَأَجْنِحَةً.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْ دَنَا مِنِّي لاَخْتَطَفَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ عُضْواً عُضْواً**).

[م٢٧٩٧]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: ئەبوجەهل وتی: ئایا موحەمەد لەنێوان ئێوەدا ڕووخساری خۆی لەخاك هەڵدەسوێ[1]؟ وتی: وترا بەڵێ، ئەبوجەهل وتی: سوێند بە لات و عوزا، گەر ببینم ئەو کارە بکات پێ دەخەمە سەر گەردنی یان ڕووخساری لەخاك هەڵدەسووم، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات و ئەو نوێژی دەکرد، ئەبو جەهل ویستی پێ لەسەر گەردنی دابنێت، وتی: ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانیان بوو ئەوەبوو ئەبو جەهل پاشە و پاش گەڕایەوە و بە دوو دەستی ڕوخساری خۆی دەپاراست، وتی: پێی وترا: چیتە؟ وتی: لە نێوان من و ئەو چاڵێك هەیە لە ئاگر، ترسێکی زۆر و کۆمەڵێك باڵ لە نێوانماندایە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر لێم نزیك ببوایەوە فریشتەکان ئەندام بە ئەندامیان پڕدەدا).**

## ٦- دەروازەی: موسوڵمانبوونی ئەبو زەڕ

**٣٥٨٥**– (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لأَخِيهِ: ارْكَبْ إِلَى هَذَا الْوَادِي، فَاعْلَمْ لِي عِلْمَ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، يَأْتِيهِ الْخَبَرُ مِنَ السَّمَاءِ، وَاسْمَعْ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ ائْتِنِي. فَانْطَلَقَ الأَخُ حَتَّى قَدِمَهُ، وَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَبِي ذَرٍّ فَقَالَ لَهُ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الأَخْلاَقِ، وَكَلاَماً ما هُوَ بِالشِّعْرِ.

فَقَالَ: ما شَفَيْتَنِي مِمَّا أَرَدْتُ. فَتَزَوَّدَ وَحَمَلَ شَنَّةً لَهُ فِيهَا ماءٌ، حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، فَأَتَى المَسْجِدَ، فَالْتَمَسَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَلاَ يَعْرِفُهُ، وَكَرِهَ أَنْ يَسْأَلَ عَنْهُ حَتَّى أَدْرَكَهُ بَعْضُ اللَّيْلِ، فَرَآهُ

---

[1] واتە: سوژدە بۆ خودای خۆی دەبات و سوژدە بۆ خواوەندەکانی ئێوە نابات–و.

عَلِيٌّ فَعَرَفَ أَنَّهُ غَرِيبٌ، فَلَمَّا رَآهُ تَبِعَهُ فَلَمْ يَسْأَلْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ احْتَمَلَ قِرْبَتَهُ وَزَادَهُ إِلَى المسْجِدِ، وَظَلَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَلاَ يَرَاهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى أَمْسَى، فَعَادَ إِلَى مَضْجَعِهِ، فَمَرَّ بِهِ عَلِيٌّ فَقَالَ: أَمَا نَالَ لِلرَّجِلِ أَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَهُ؟ فَأَقَامَهُ فَذَهَبَ بِهِ مَعَهُ، لاَ يَسْأَلُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَيْءٍ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الثَّالِثِ، فَعَادَ عَلِيٌّ على مِثْلِ ذلِكَ، فَأَقَامَ مَعَهُ ثُمَّ قالَ: أَلاَ تُحَدِّثُنِي ما الَّذِي أَقْدَمَكَ؟ قالَ: إِنْ أَعْطَيْتَنِي عَهْداً وَمِيثَاقاً لَتُرْشِدَنَّنِي فَعَلْتُ، فَفَعَلَ، فَأَخْبَرَهُ، قالَ: فَإِنَّهُ حَقٌّ، وَهُوَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَاتْبَعْنِي، فَإِنِّي إِنْ رَأَيْتُ شَيْئاً أَخَافُ عَلَيْكَ قُمْتُ كَأَنِّي أُرِيقُ الماءَ، فَإِنْ مَضَيْتُ فَاتْبَعْنِي حَتَّى تَدْخُلَ مَدْخَلِي، فَفَعَلَ.

فَانْطَلَقَ يَقْفُوهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَدَخَلَ مَعَهُ، فَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، وَأَسْلَمَ مَكَانَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**ارْجِعْ إِلَى قَوْمِكَ فَأَخْبِرْهُمْ حَتَّى يَأْتِيَكَ أَمْرِي**). قالَ: وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَصْرُخَنَّ بِهَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى المسْجِدَ، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، ثُمَّ قامَ الْقَوْمُ فَضَرَبُوهُ حَتَّى أَضْجَعُوهُ.

وَأَتَى الْعَبَّاسُ فَأَكَبَّ عَلَيْهِ، قالَ: وَيْلَكُمْ! أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ مِنْ غِفَارٍ، وَأَنَّ طَرِيقَ تِجَارِكُمْ إِلَى الشَّامِ؟ فَأَنْقَذَهُ مِنْهُمْ. ثُمَّ عَادَ مِنَ الْغَدِ لِمِثْلِهَا، فَضَرَبُوهُ وَثَارُوا إِلَيْهِ، فَأَكَبَّ الْعَبَّاسُ عَلَيْهِ.

[خ٣٨٦١ (٣٥٢٢)/ م٢٤٧٤]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) وتی: کاتێك ڕەوانەکردنی پێغەمبەر بە ئەبو زەڕ گەیشت بە براکەی خۆی وت: سواربە و برۆ بۆ ئەو شیوە[1] هەواڵی ئەو پیاوەم بۆ بهێنە بانگەشە دەکات پێغەمبەرە و هەواڵی لە ئاسمانەوە بۆ دێت، قسەکانی ببیستە و بۆم بهێنە، براکەی ڕۆیشت تا هات بۆ مەککە، لە قسەی پێغەمبەری بیست، پاشان گەڕایەوە بۆ لای ئەبو زەڕ و پێی وت: بینیم فەرمان دەکات بەڕەوشتی شیرین و جوان، کەلامێکی هێناوە هۆنراوە نییە.**

**ئەبو زەڕ وتی: ئەوەی من ویستم تێرت نەکردم، بۆیە توێشووی هەڵگرت و جەوەندەیەك ئاوی لەگەڵ خۆی برد، تا هات بۆ مەککە و ڕووی لە مزگەوت کرد، بە**

---

[1] واتە: مەککە –و.

دوای پێغەمبەردا(ﷺ) گەڕا و ئەو نەیدەناسی، پێی باش نەبوو پرسیار لە هیچ کەس بکات تا شەوی بەسەردا هات، عەلی ئەوی بینی زانی ئەو پیاوێکی غەریبە، کاتێ کە بینی شوێنی کەوت، هیچکامیان پرسیاری شتێکیان لەویتر نەکرد تا ڕۆژبوویەوە، پاشان جەوەندە ئاوەکە و توێشوەکەی خۆی هەلگرت و گەڕایەوە بۆ مزگەوت[1] ئەو ڕۆژە مایەوە و هەتا ئێوارە پێغەمبەری خودای(ﷺ) نەبینی، بۆیە گەڕایەوە بۆ شوێنی خەوتنەکەی خۆی، عەلی بەلایدا تێپەڕی وتی: ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە ئەم پیاوە شوێنی خۆی بزانێت، ئەبو زەڕی هەستاند و لەگەڵ خۆی بردی هیچکامیان شتێکی لەویتر نەپرسی تا ڕۆژی سێیەم عەلی بە هەمان شێوە گەڕایەوە ئەبو زەڕ لەگەڵی هەستا پاشان عەلی وتی: ئایە بۆم باس ناکەیت چی تۆی هێناوە؟ ئەبو زەڕ وتی: گەر پەیمان و بەڵێنم پێبدەی ڕێنموونیم بکەیت پێت دەڵێم، عەلی پەیمان و بەڵێنی پێدا، ئەویش هەواڵی پێدا، عەلی وتی: ئەو حەقە، ئەو پێغەمبەری خودایە، گەر ڕۆژت لێبوویەوە شوێنم بکەوە، من گەر شتێکم بینی ترس و هەڕەشەبێت بۆ سەر تۆ دەوەستم وەك ئەوەی ئاو بڕێژم، گەر بەردەوامبووم لە ڕۆیشتن شوێنم بکەوە تا دەچیە ژوورەوە بۆ ئەو شوێنەی کە من لێیچوومەتە ژوورەوە.

ئەبو زەڕ بەوجۆرەی کرد شوێنی عەلی کەوت تا چووە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو زەڕیش چووە ژوورەوە و قسەکانی پێغەمبەری بیست و لەو شوێنەدا موسوڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (**بگەڕێوە بۆ لای هۆزەکەت هەواڵیان پێبدە تا فەرمانی منت پێدەگات**) ئەبو زەڕ وتی: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ئەم بانگەوازە لە ناویاندا ڕادەگەیەنم، بۆیە چووە دەرەوە تا هات بۆ مزگەوت بەدەنگی بەرزی خۆی هاواریکرد: أشهد أنْ لا إلـهَ إلا الله، وأنَّ محمدا رسولُ الله، خەڵکە هەستان و لێیاندا تا هەراسانیان کرد.

عەباس هات و خۆیدا بەسەریدا و وتی: هاوار بە حاڵتان، نازانن ئەو پیاوە لە هۆزی غیفارە ڕێگەی بازرگانیتان بۆ ناو شام بەناو ئەواندا تێدەپەڕێت، ئەبو زەڕی لە

---

[1] واتە: بۆ کەعبە-و.

دەستیان ڕزگار کرد، بۆ ڕۆژی دووەم بەهەمان شێوە گەڕایەوە ئەوانیش هەستان و دەستیان بە لێدانی کرد و پەلاماریاندا، عەباس دیسان خۆیدایەوە بەسەریدا.

## ٧- دەروازەی: موسوڵمانبوونی عەمری کوڕی عەبەسە

**٣٥٨٦-** (م) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ السُّلَمِيُّ: كُنْتُ وَأَنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، أَظنُّ أَنَّ النَّاسَ عَلَى ضَلاَلَةٍ، وَأَنَّهُمْ لَيْسُوا عَلَى شَيْءٍ، وَهُمْ يَعْبُدُونَ الأَوْثَانَ، فَسَمِعْتُ بِرَجُلٍ بِمَكَّةَ يُخْبِرُ أَخْبَاراً، فَقَعَدْتُ عَلَى رَاحِلَتِي، فَقَدِمْتُ عَلَيْهِ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُسْتَخْفِياً، جُرَءَاءُ عَلَيْهِ قَوْمُهُ، فَتَلَطَّفْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَيْهِ بِمَكَّةَ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا أَنْتَ؟ قَالَ: **(أَنَا نَبِيٌّ)** فَقُلْتُ: وَمَا نَبِيٌّ؟ قَالَ: **(أَرْسَلَنِيَ اللهُ)** فَقُلْتُ: وَبِأَيِّ شَيْءٍ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: **(أَرْسَلَنِي بِصِلَةِ الأَرْحَامِ، وَكَسْرِ الأَوْثَانِ، وَأَنْ يُوَحَّدَ اللهُ لاَ يُشْرَكُ بِهِ شَيْءٌ)** قُلْتُ لَهُ: فَمَنْ مَعَكَ عَلَى هَذَا؟ قَالَ: **(حُرٌّ وَعَبْدٌ)**. قَالَ: وَمَعَهُ يَوْمَئِذٍ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ مِمَّنْ آمَنَ بِهِ. فَقُلْتُ: إِنِّي مُتَّبِعُكَ. قَالَ: **(إِنَّكَ لاَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ يَوْمَكَ هَذَا، أَلاَ تَرَى حَالِي وَحَالَ النَّاسِ؟ وَلَكِنِ ارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ، فَإِذَا سَمِعْتَ بِي قَدْ ظَهَرْتُ، فَأْتِنِي)**.

قَالَ: فَذَهَبْتُ إِلَى أَهْلِي، وَقَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمَدِينَةَ، وَكُنْتُ فِي أَهْلِي، فَجَعَلْتُ أَتَخَبَّرُ الأَخْبَارَ وَأَسْأَلُ النَّاسَ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ. حَتَّى قَدِمَ عَلَيَّ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ يَثْرِبَ مِنْ أَهْلِ المدِينَةِ، فَقُلْتُ: مَا فَعَلَ هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي قَدِمَ الْمَدِينَةَ؟ فَقَالُوا: النَّاسُ إِلَيْهِ سِرَاعٌ، وَقَدْ أَرَادَ قَوْمُهُ قَتْلَهُ فَلَمْ يَسْتَطِيعُوا ذلِكَ.

فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَتَعْرِفُنِي؟ قَالَ: **(نَعَمْ، أَنْتَ الَّذِي لَقِيتَنِي بِمَكَّةَ؟)** قَالَ: فَقُلْتُ: بَلَى. [م٨٣٢]

**(م) لە ئەبی ئومامەوە، وتی: عەمری کوڕی عەبەسەی سولەمی وتی: من لەسەردەمی نەفامیدا گومانم دەبرد ئەو خەڵکە لە گومڕایدابن، ئەوان لەسەر هیچ شتێك لە حەق نەبن، چونکە ئەوان بت و وەسەنیان دەپەرست، بیستم پیاوێك لە مەککە[1] کۆمەڵێك هەواڵ دەگەیەنێت، سواری وڵاخی سواریەکەم بووم و هاتم بۆ لای،**

[1] واتە: پێغەمبەر(ﷺ)-و.

ئەو کاتانە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەنارگیری کردبوو لەبەر بوێریدانە بەرخۆ لەلایەن هۆزەکەیەوە بۆ سەری، منیش نەرموونیانیم نواند تا چووم بۆلای لەمەککە و پێم وت: تۆ کێیت؟ فەرمووی: **(من پێغەمبەرێکم)**، وتم پێغەمبەر چی یە؟ فەرمووی: **(خودا ڕەوانەی کردووم)** ، وتم: بە چ شتێکەوە ڕەوانەی کردوویت؟ فەرمووی: **(بە سیلەی ڕەحم و شکاندنی بت و وەسەن، هەروەها خودا بە تاکوتەنهایی ڕابگیرێت و شتێك لە هاوەڵی بۆ دانەنرێت)**، پێم وت: لەسەر ئەم کارە کێ لەگەڵ تۆیە؟ فەرمووی: **(ئازاد و بەندەش)**، وتی: لەو ڕۆژگارەدا ئەبوبەکر و بیلال لەوانەبوون ئیمانیان پێ هێنابوو، وتم: من شوێنت دەکەوم، پێغەمبەر فەرمووی: **(لەم ڕۆژەدا تۆ ناتوانیت ئەو کارە بکەیت، نابینیت حاڵی من و حاڵی خەڵکی چۆنە؟ بەڵام بگەڕێرەوە بۆ ناو خانەوادەکەت هەرکات بیستت پشتیوانی کراوم وەرە بۆلام)**.

وتی: گەڕامەوە بۆ لای خانەوادەکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) چوو بۆ مەدینە من لە ناو خانەوادەکەمدا بووم، دەستمکرد بە هەواڵپرسینی، پرسیارم لە خەڵکی دەکرد دەربارەی ئەو کاتێ هاتبوو بۆ مەدینە، تا چەند کەسێك لە ئەهلی یەسریبم–ئەهلی مەدینە– هاتن بۆ لام، وتم: ئەو پیاوەی هاتووە بۆ مەدینە چی دەکات؟ وتیان خەڵکی بەپەلە ڕووی لێدەکەن، هۆزەکەی ویستیان بیکوژن، بەڵام نەیانتوانی.

بۆیە منیش هاتم بۆ مەدینە و ڕۆشتمە ژوورەوە بۆ لای و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا دەمناسیەوە؟ فەرمووی: **(بەڵێ، تۆ ئەو کەسەی لە مەککە بە من گەیشتیت؟)** ، وتی: منیش وتم بەڵێ.

## ٨- دەروازەی: ئیسلامبوونی عومەری کوڕی خەتاب

**٣٥٨٧**– (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: لَمَّا أَسْلَمَ عُمَرُ، اجْتَمَعَ النَّاسُ عِنْدَ دَارِهِ، وَقَالُوا: صَبَأَ عُمَرُ . وَأَنَا غُلاَمٌ فَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِي . فَجَاءَ رَجُلٌ عَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْ دِيبَاجٍ، فقالَ: قَدْ صَبَأَ عُمَرُ، فَمَا ذَاكَ؟ فَأَنَا لَهُ جَارٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ النَّاسَ تَصَدَّعُوا عَنْهُ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: الْعَاصُ بْنُ وَائِلٍ. [خ٣٨٦٥ (٣٨٦٤)]

(خ) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە (خوایان لێ رازی بێت) کاتێك عومەر موسوڵمان بوو خەڵکەکە لە ماڵەکەی کۆبونەوە و وتیان عومەر بێباوەڕ بووە، من مێردمنداڵێك بووم لە سەربانی ماڵەکەمان بووم، پیاوێك هات پۆشاکێکی دیباجی لەبەردابوو وتی: عومەر بێباوەڕ بووە دەی دەبێت چی بێت؟ من پەنای ئەوم داوە، وتی: خەڵکەکەم بینی لە عومەر دورکەوتنەوە، پرسیم ئەو پیاوە کێ بوو؟ وتیان: عاسی کوڕی وائیل بوو.

**٣٥٨٨**- (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: ما زِلْنَا أَعِزَّةً مُنْذ أَسْلَمَ عُمَرُ. [خ٣٦٨٤]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە (خوا لێی رازی بێت) وتی: لەو کاتەوەی عومەر موسوڵمان بوو بەردەوام لە عیززەت و دەسەڵاتدابووین.**

## ٩- دەروازەی: مردنی ئەبی تالب

**٣٥٨٩**- (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ، جَاءَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ وَعَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ المغِيرَةِ، فَقَالَ: **(أَيْ عَمِّ، قُلْ: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، كَلِمَةً أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللهِ)**. فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ؟! فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدَانِهِ بِتِلْكَ المقَالَةِ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ ما كَلَّمَهُمْ: عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلهَ إِلاَّ الله، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَاللهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ)**. فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ [التوبة: ١١٣] وَأَنْزَلَ اللهُ فِي أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ [القصص: ٥٦]. [خ٤٧٧٢ (١٣٦٠)/ م٢٤]

**(ق) لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، لە باوکیەوە وتی: کاتێ مردن لەسەر ئەباتالب ئامادە بوو پێغەمبەری خودا هات و بینی ئەبوجەهل و عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئومەیەی کوڕی موغەیرە لەلای بوون، پێغەمبەر فەرمووی: (مامی خۆم، بڵێ: لا إله إلا الله، کەلیمەیەکە دەیکەم بە بەڵگە بۆت لەلای خودا) ئەبوجەهل و عەبدوڵای کوڕی**

ئەبی ئومەیە وتیان: ئایە پشت هەڵدەکەیت لە ئاینی عەبدولموتەلیب؟! پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی بۆ دەخستەڕوو و ئەوانیش بەردەوام بەو قسەیان دەیانگێڕایەوە، تا دواین قسەیەك ئەبوتالیب وتی: لەسەر ئاینی عەبدولموتەلیبم، نەیویست بڵێ: (لا إله إلا الله)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بە خودا، بەردەوام داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم گەر نەهیم لێ نەکرێت)**، خودا ئایەتی دابەزاند: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ [التوبة: ١١٣]، هەروەها دەربارەی ئەبی تالب ئایەتی دابەزاند، بە پێغەمبەری خودای(ﷺ) فەرموو: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ [القصص: ٥٦].

**٣٥٩٠**- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، وَذُكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ فَقَالَ: **(لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُجْعَلُ فِي ضَحْضَاحٍ مِنَ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ، يَغْلِي مِنْهُ دِمَاغُهُ)**. [خ٣٨٨٥/ م٢١٠]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، ئەو لە پێغەمبەری(ﷺ) بیست-لە لای باسی مامەی کرا- فەرمووی: (بەڵکو لە ڕۆژی قیامەت شفاعەتم سوودی پێ بگەیەنێت و بخرێتە ناو تەنکاوێك لە ئاگر بگاتە قولاپێی لێیەوە دەماغی بکوڵێت).**

## ١٠- دەروازەی: ڕۆیشتن بۆ تائف

**٣٥٩١**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ. زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم.: أَنَّهَا قالَتْ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ قالَ: **(لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ ما لَقِيتُ، وَكانَ أَشَدُّ ما لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلا وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ اللهُ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ، لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ، فَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، فَقالَ: ذلِكَ فِيمَا شِئْتَ، إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ**

عَلَيْهِم الأَخْشَبَيْنِ؟)، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ، لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً). [خ٣٢٣١/ م١٧٩٥]

(ق) لە عائشەوە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو وتی: بە پێغەمبەر(ﷺ) ئایا ڕۆژێکت بەسەردا هاتووە تەنگانەتر و توندتر لە ڕۆژی ئوحد؟ پێغەمبەر فەرمووی: **(ئەوەی تووشم هات لە هۆزەکەت تووشم هات، توندترین و تەنگانەترین ڕۆژێك لەوانەوە تووشم هاتبێت ڕۆژی عەقەبە بوو، خۆم خستە ڕوو[1] بۆ ئیبن عەبد یالیلی عەبد کولال وەلامی ئەوەی نەدامەوە من ویستم، بە خەم و پەژارەوە ڕۆیشتم و سەری خۆم هەڵگرت کاتێ هۆشم کردەوە گەیشتبوومە (قرن الثعالب) سەرم بەرزکردەوە پەڵە هەورێك سێبەری بۆ کرد بووم وردبوومەوە جبریلی تێدابوو، بانگی لێکردم: خودا ئەوەی بیست هۆزەکەت بەتۆیان وت و بەرپەرچیان دایتەوە، ئێستا خودا فریشتەی چیاکانی ڕەوانەکردووە بۆ لای تۆ تا فەرمانی پێبکەی بەوەی پێتخۆشە دەربارەی هۆزەکەت، فریشتەی چیاکان بانگی لێکردم و سەلامی لێکردم، پاشان وتی: ئەی موحەمەد، وتی: ئەوە بەو جۆرەیە تۆ دەخوازیت، گەر بخوازیت هەردوو چیاکە بەسەریاندا لەیەك دەدەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو ڕجام وایە خودا لەپشتی ئەمانە[2] کەسانێك دەربهێنێت بەتاکو تەنهایی خودا بپەرستن و شتێك لە هاوەڵ بۆ خودا بڕیارنەدەن).**

## ١١- دەروازەی: ئیسڕاو میعراج

**٣٥٩٢-** (ق) عَنْ أَنَس بن مالك، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ رضي الله عنهما: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدَّثَهُمْ عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ: (بَيْنَما أَنَا فِي الحَطِيمِ، - وَرُبَّمَا قَالَ: فِي الحِجْرِ - مُضْطَجِعاً، إِذْ أَتَانِي آتٍ فَقَدَّ - قالَ: وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: فَشَقَّ - ما بَيْنَ هذِهِ إِلَى هذِهِ - فَقُلْتُ لِلْجَارُودِ

[1] واتە: بانگەوازی ئیسلامم بۆ خستە ڕوو-و.

[2] واتە: نەوەکانیان-و.

وَهْوَ إِلَى جَنْبِي: ما يَعْنِي بِهِ؟ قالَ: مِنْ ثُغْرَةِ نَحْرِهِ إِلَى شِعْرَتِهِ، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: مِنْ قَصِّهِ إِلَى شِعْرَتِهِ. فَاسْتَخْرَجَ قَلْبِي، ثُمَّ أُتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ مَمْلُوءَةٍ إِيمَاناً، فَغُسِلَ قَلْبِي، ثُمَّ حُشِيَ ثُمَّ أُعِيدَ، ثُمَّ أُتِيتُ بِدَابَّةٍ دُونَ البَغْلِ وَفَوْقَ الحِمَارِ أَبْيَضَ. فَقَالَ لَهُ الجَارُودُ: هُوَ الْبُرَاقُ يَا أَبَا حَمْزَةَ؟ قالَ أَنَسٌ: نَعَمْ. يَضَعُ خَطْوَهُ عِنْدَ أَقْصى طَرْفِهِ، فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ.

فَانْطَلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَاسْتَفْتَحَ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفُتِحَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا فِيها آدَمُ، فَقَالَ: هَذَا أَبُوكَ آدَمُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ السَّلاَمَ، ثُمَّ قَالَ: مَرْحَباً بِالابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي، حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الثَّانِيَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفَتَحَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ إِذَا يَحْيى وَعِيسى، وَهُمَا ابْنَا الخَالَةِ، قالَ: هذا يَحْيى وَعِيسى فَسَلِّمْ عَلَيْهِمَا، فَسَلَّمْتُ، فَرَدَّا، ثُمَّ قَالاَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفُتِحَ. فَلَمَّا خَلَصْتُ إِذَا يُوسُفُ، قالَ: هذَا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الرَّابِعَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: أَوَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً به، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفُتِحَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ إِلَى إِدْرِيسَ، قالَ: هَذَا إِدْرِيسُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثُمَّ قالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الخَامِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ صلّى الله عليه وسلّم، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً به، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا هَارُونُ، قالَ: هَذَا هَارُونُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثمّ قالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ السَّادِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: مَرْحَباً به، فَنِعْمَ المَجِيءُ جاءَ، فَلَمَّا

خَلَصْتُ فَإِذَا مُوسى، قَالَ: هَذَا مُوسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثُمَّ قالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ، فَلَمَّا تَجَاوَزْتُ بَكى، قِيلَ لَهُ: ما يُبْكِيكَ؟ قَالَ: أَبْكِي لأَنَّ غُلاَماً بُعِثَ بَعْدِي يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ أَكْثَرُ مِمَّنْ يَدْخُلُهَا مِنْ أُمَّتِي.

ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: مَرْحباً بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا إِبْرَاهِيمُ، قالَ: هَذَا أَبُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، قالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ السَّلاَمَ، قالَ: مَرْحَباً بِالابْنِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ رُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهى، فَإِذَا نَبِقُهَا مِثْلُ قِلاَلِ هَجَرَ، وَإِذَا وَرَقُهَا مِثْلُ آذَانِ الْفِيَلَةِ، قالَ: هذِهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهى، وَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ: نَهْرَانِ بَاطِنَانِ وَنَهْرَانِ ظَاهِرَانِ، فَقُلْتُ: ما هذَانِ يَا جِبْرِيلُ؟ قالَ: أَمَّا الْبَاطِنَانِ فَنَهَرَانِ فِي الجَنَّةِ، وَأَمَّا الظَّاهِرَانِ: فَالنِّيلُ وَالْفُرَاتُ.

ثُمَّ رُفِعَ لِيَ الْبَيْتُ المَعْمُورُ، ثُمَّ أُتِيتُ بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ عَسَلٍ، فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ فَقَالَ: هِيَ الْفِطْرَةُ التِي أَنْتَ عَلَيْهَا وَأُمَّتُكَ.

ثُمَّ فُرِضَتْ عَلَيَّ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ، فَرَجَعْتُ، فَمَرَرْتُ عَلَى مُوسى، فَقَالَ: بِمَ أُمِرْتَ؟ قالَ: أُمِرْتُ بِخَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: إن أُمَّتُكَ لاَ تَسْتَطِيعُ خَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ، وَإِنِّي وَاللهِ قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ، وَعَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ المُعَالجَةِ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ لأُمَّتِكَ، فَرَجَعْتُ، فَوَضَعَ عَنِّي عَشْراً، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ، فَوَضَعَ عَنِّي عَشْراً، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْراً، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ، فَأُمِرْتُ بِعَشْرِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، فَرَجَعْتُ فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ، فَأُمِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى، فَقَالَ: بِمَا أُمِرْتَ؟ قُلْتُ: أُمِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، قالَ: إنَّ أُمَّتَكَ لاَ تَسْتَطِيعُ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، وَإِنِّي قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ، وَعالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ المُعَالَجَةِ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التخْفِيفَ لأُمَّتِكَ، قَالَ: سَأَلْتُ رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ، وَلكِنْ أَرْضى وَأُسَلِّمُ. قالَ: فَلَمَّا جاوَزْتُ نَادَى مُنَادٍ: أَمْضَيْتُ فَرِيضَتِي، وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي).

[خ٣٨٨٧ (٣٢٠٧)/ م١٦٤]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە مالیکی کوڕی سەعسەعەوە(خوایان لـێ ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو شەوەی ئیسرای پێکرا باسی بۆکردن و فەرمووی:

(**من لە حەتیم بووم**، وابزانم فەرمووی: **لە حیجر پاڵمدابوویەوە، یەکێك هات بۆلام نێوان ئێرە بۆ ئێرەی لەت کرد**، مالیکی کوڕی سەعسەعە دەڵێت: هەروەها گوێم لێ بوو فەرمووی: **شەقکرد**[1]، وتم: بە جاروود -کە ئەو لە تەنیشتم بوو- ئەوە یانی چی[2]؟ وتی: واتە لە مووی گەردنییەوە تا مووی خوارەوەی، هەروەها بیستم دەیووت: لە سەرووی سینەوە تا مووی خوارەوەی[3]، (**دڵی دەرهێنام پاشان تەشتێکی زێڕیان بۆ هێنام پڕ بوو لە ئیمان، دڵمی تێدا شۆرا، پاشان دڵەکەیان دووریەوە و گێڕایانەوە شوێنی خۆی، پاشان وڵاخێکی سوارییان بۆ هێنام بچووکتر لە ئێستر و گەورەتر لە گوێدرێژ سپی بوو**)، جاروود بە ئەنەسی وت: ئەوە بوراقە، ئەی باوکی حەمزە؟ ئەنەس وتی: بەڵێ، (**یەك هەنگاوی ئەو وڵاخی سوارییە تا چاو هانابکات، منیان خستە سەری.**

**جبریل بردمی تا هات بۆ ئاسمانی دنیا، تەقەیدا لە دەرگا، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەڵێ، وترا: مەرحەبای لێ بێت، باشترین هاتوو هات، درگاکە کرایەوە کاتێ چوومە ژوورەوە ئادەمم تێدا بینی، جبریل وتی: ئەوە باوکتە ئادەم، سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد، وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، پاشان وتی: مەرحەبا لە کوڕی صالح و پێغەمبەری صالح.**

**پاشان جبریل بەرزی کردمەوە تا هات بۆ ئاسمانی دووەم، تەقەیدا لە دەرگا، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەڵێ، وترا: مەرحەبای لێ بێت، باشترین هاتوو هات، درگاکە کرایەوە، کاتێ چومە ژوورەوە یەحیا و عیسام بینی، ئەوان کوڕی پووری یەکترن، جبریل وتی: ئەوە یەحیا و عیسان سەلامیان لێ بکە، منیش سەلامم کرد، وەڵامیان دامەوە، پاشان وتیان: مەرحەبا لە برای صالح و پێغەمبەری صالح.**

---

(١) واتە: سینەی شەق کرد-و.

(٢) واتە: مانای "ئێرە بۆ ئێرە" چییە؟-و.

(٣) واتە: مووی بەر-و.

پاشان بەرزی کردمەوە تا ئاسمانی سێیەم تەقەیدا لە دەرگا وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەلێ، وترا: مەرحەبای لێ بێت باشترین هاتوو هات، دەرگاکە کرایەوە، کاتێ چومە ژوورەوە یوسفم بینی، جبریل وتی: ئەوە یوسفە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد، وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، پاشان وتی: مەرحەبا لە برای صالح و پێغەمبەری صالح.

پاشان بەرزی کردمەوە تا ئاسمانی چوارەم، تەقەیدا لە دەرگا، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەڵێ، وترا: مەرحەبای لێ بێت، باشترین هاتوو هات، دەرگاکە کرایەوە، کاتێ چومە ژوورەوە ئیدریسم بینی، جبریل وتی: ئەوە ئیدریسە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد، وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، پاشان وتی: مەرحەبا لە برای صالح و پێغەمبەری صالح.

پاشان بەرزی کردمەوە تا هات بۆ ئاسمانی پێنجەم، تەقەیدا لە دەرگا، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەڵێ، وترا: مەرحەبای لێ بێت باشترین هاتوو هات، کاتێ چومە ژوورەوە هاروونم بینی، جبریل وتی: ئەوە هاروونە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد، وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، پاشان وتی: مەرحەبا لە برای صالح و پێغەمبەری صالح.

پاشان بەرزی کردمەوە تا ئاسمانی شەشەم تەقەیدا لە دەرگا، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەلێ، وتی: مەرحەبای لێ بێت باشترین هاتوو هات، کاتێ چومە ژوورەوە موسام بینی، وتی: ئەوە موسایە سەلامی لێ بکە، منیش سەلامم لێ کرد، وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، پاشان وتی: مەرحەبا لە برای صالح و پێغەمبەری صالح، کاتێ بەلایدا تێپەڕیم موسا گریا، پێی وترا: چی دەتگریەنێت؟ وتی: دەگریم، چونکە گەنجێك بەدوای مندا ڕەوانەکراوە لەئومەتەکەی زۆرتر و زیاتر لە ئومەتەکەی من دەچنە بەهەشتەوە.

پاشان بەرزی کردمەوە تا ئاسمانی حەوتەم، جبریل تەقەیدا لە دەرگا، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد، وترا: بەدوایدا نێردراوە؟ وتی: بەلێ، وتی: مەرحەبای لێ بێت باشترین هاتوو هات، دەرگاکە کرایەوە، کاتێ چومە ژوورەوە ئیبراهیمم بینی، جبریل وتی: ئەوە باوکتە سەلامی لێ بکە، پێغەمبەر فەرمووی: سەلامم لێ کرد، وەلامی سەلامەکەی دامەوە وتی: مەرحەبا لە کوڕی صالح و پێغەمبەری صالح.

پاشان "سِدْرَةُ المُنْتَهى"م بۆ بەرزکرایەوە، بینیم بەری درەختەکانی وەك دەفری گەورەی هەجەرە[1]، گەلای درەختەکانی وەك گوێی فیل بوون، جبریل وتی: ئەوە "سِدْرَةُ المُنْتَهى"یە، چوار ڕوباری تێدابوو، دوو روباری ناوەکی، و دوو روباری دەرەکی، وتم ئەو دوانە چین؟ جبریل وتی: ئەو دووانە ناوەکییە دوو ڕووباری بەهەشتن، ئەو دووانە دەرەکیەش نیل و فوراتن.

پاشان "الْبَيْتُ المَعْمُورُ"م بۆ بەرزکرایەوە، پاشان کوپێك عارەق و کوپێك شیر و کوپێك هەنگوینیان بۆ هێنام، کوپە شیرەکەم گرت، جبریل وتی: ئەوە ئەو فیترەتەیە کە خۆت و ئومەتەکەت لەسەرینی.

پاشان نوێژەکانم لەسەر فەرزکرا، لەهەر ڕۆژێدا پەنجا نوێژ، گەڕامەوە و بە پاڵ موسادا تێپەڕیم موسا وتی: بەچی فەرمانت پێکرا؟ پێغەمبەر فەرمووی: بە پەنجا نوێژ لە هەر ڕۆژێکدا، موسا وتی: ئومەتەکەت پەنجا نوێژ لە هەر ڕۆژێکدا ناتوانێت، سوێند بە خودا، من بەر لە تۆ خەڵکیم ئەزموون کرد، بەتوندترین چارەسەر چارەسەری بەنی ئیسرائیلم کرد، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سوککردنی لێ بکە بۆ ئومەتەکەت، منیش گەڕامەوە، دە نوێژم لەسەر لابرا، گەڕامەوە بۆلای موسا هەمان شتی وتەوە، دیسان گەڕامەوە، دە نوێژی ترم لەسەر لابرا، گەڕامەوە بۆ لای موسا هەمان شتی وتەوە، دیسان گەڕامەوە، دە نوێژی ترم لەسەر لابرا، گەڕامەوە بۆ لای موسا هەمان شتی وتەوە، دیسان گەڕامەوە، دە نوێژی ترم لەسەر لابرا، گەڕامەوە

---

[1] هەجەر: ئاوەدانییەك بووە نزیك بە مەدینە، دەفر و مەنجەڵەکانیان زۆر گەورە بوون—و.

**موسا هەمان شتی وتەوە، منیش گەڕامەوە فەرمانم پێکرا بە پێنج نوێژ لە هەر ڕۆژێکدا، گەڕامەوە بۆلای موسا وتی: بەچی فەرمانت پێکرا؟ وتم: فەرمانم پێکرا بە پێنج نوێژ لەهەر ڕۆژێکدا، وتی: ئومەتەکەت پێنج نوێژ لە هەر ڕۆژێکدا ناتوانن، من پێش تۆ خەڵکیم ئەزموون کردووە، بەتوندترین شێوە چارەسەری بەنی ئیسرائیلم کردووە، بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێ بکە بۆ ئومەتەکەت، پێغەمبەر فەرمووی: ئەوەندە داوام لێ کردووە شەرم دەکەم، بەڵام ڕازی دەبم و خۆم ڕادەست دەکەم، پێغەمبەر فەرمووی: کاتێك لە موسا تێپەڕیم بانگکەرێك بانگی کرد فەرزەکانم تێپەڕاند و لەسەر بەندەکانم سووك و ئاسان کرد[1]).**

**٣٥٩٣**– (م) عن ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (أُتِيتُ بِالْبُرَاقِ . وَهُوَ دَابَّةٌ أَبْيَضُ طَوِيلٌ فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ، يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ . قَالَ: فَرَكِبْتُهُ حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ. قَالَ: فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِي يَرْبِطُ بِهِ الأَنْبِيَاءُ. قَالَ: ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ. ثُمَّ خَرَجْتُ، فَجَاءَنِي جِبْرِيلُ عليه السلام بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ صلّى الله عليه وسلّم: اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ. وذكر مثل الحديث الذي قبله. [م١٦٢ (٢٥٩)]

(م) لەسابیت بونانییەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) **فەرمووی: (بوراقم بۆ هێنرا، ئەوە وڵاخێکی سپی درێژە، لەسەر و گوێدرێژ و خوار ئێسترەوە، سمی لە شوێنێ دادەنێ تا چاو هانا بکات[2])، پێغەمبەر فەرمووی: (سواری بووم تا هاتم بۆ "بيت المقدس"، فەرمووی: بەو ئەڵقەوە بەستمەوە پێغەمبەران پێیەوە دەیانبەستەوە، فەرمووی: پاشان چوومە ناو مزگەوت دوو ڕکات نوێژم تێدا کرد، پاشان هاتمە دەرەوە، جبريل(عليه السلام) هات بۆ لام و کوپێك**

---

[1] واتە: هەر فەرزێك بە دە فەرز بۆ موسڵمان دەنوسرێت و دەکاتەوە پەنجا نوێژەکە و لەسەر ئەوانیش ئاسان کراون–و.

[2] واتە: کە سمێکی دادەنێ سمەکەی تری لە دوورترین جێگە چاو بیگاتێ دادەنێ –و.

**عارەق و کوپێك شیری بۆ هێنام، شیرەکەم هەڵبژارد، جبریل(ﷺ) وتی: فیترەتت هەڵبژارد)، هەمان ئەو فەرموودەی پێشووی باسکرد.**

**٣٥٩٤**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي الْحِجْرِ، وَقُرَيْشٌ تَسْأَلُنِي عَنْ مَسْرَايَ، فَسَأَلَتْنِي عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ لَمْ أُثْبِتْهَا، فَكُرِبْتُ كُرْبَةً مَا كُرِبْتُ مِثْلَهُ قَطُّ. قَالَ: فَرَفَعَهُ اللهُ لِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، مَا يَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَنْبَأْتُهُمْ بِهِ. وَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي جَمَاعَةٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ، فَإِذَا مُوسَى قَائِمٌ يُصَلِّي، فَإِذَا رَجُلٌ ضَرْبٌ جَعْدٌ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ. وَإِذَا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عليه السلام قَائِمٌ يُصَلِّي، أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهاً عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ. وَإِذَا إِبْرَاهِيمُ عليه السلام قَائِمٌ يُصَلِّي، أَشْبَهُ النَّاسِ بِهِ صَاحِبُكُمْ . يَعْنِي: نَفْسَهُ . فَحَانَتِ الصَّلاَةُ فَأَمَمْتُهُمْ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنَ الصَّلاَةِ، قَالَ قَائِلٌ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا مَالِكٌ صَاحِبُ النَّارِ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ، فَبَدأَنِي بِالسَّلاَمِ). [م١٧٢]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە حیجر منت ببینیبایە قورەیش پرسیاری ئیسراکەیان لێ دەکردم، پرسیاری کۆمەڵێك شتیان لە "بیت المقدس" لێ کردم، لەبەرم نەبوو، تووشی تەنگانەیەك بووم هەرگیز تەنگانەی وام بەخۆوە نەبینی بوو، فەرمووی خودا (بیت المقدس)ی بۆ بەرزکردمەوە تەماشام دەکرد، هەر پرسیارێکیان لێ دەکردم وەڵامم دەدانەوە، منت ببینیبایە[1] لەناو کۆمەڵێك لە پێغەمبەران بووم، موسا بەپێوە نوێژی دەکرد، پیاوێکی لەڕی سەر ڕووتاوە وەك ئەوەی لە پیاوانی (شنوءة[2]) بێت، عیسای کوڕی مەریەمم(علیه السلام) بینی بە پێوە نوێژی دەکرد، نزیکترین کەس شێوەی لە عیسا بچێت عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفیە، ئیبراهیمم(علیه السلام) بینی بە پێوە نوێژی دەکرد، نزیکترین کەسێك شێوەی لە ئەو بچێت هاوەڵەکەی ئێوەیە، مەبەستی خۆی بوو[3]. کاتێ نوێژ هاتە بەرەوە ئیمامەتم بۆ کردن، کاتێ لە نوێژەکە تەواوبووم یەکێك وتی:**

---

(١) لێرەوە پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئیسراکەی خۆی دەکات لە "بیت المقدس"–و.

(٢) واتە: "شنوءة" قەبیلەیەك بوو لە یەمەن لە قەحتان–و.

(٣) واتە: نزیکترین شێوە بە ئیبراهیم(علیه السلام) شێوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو–و.

**ئەی موحەمەد، ئەوە مالیکی هاوەڵی ئاگرە[1] سەلامی لێ بکە لامکردەوە بە لایدا، ئەو دەستپێشخەری کرد و سەلامی لێ کردم).**

**٣٥٩٥**- (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: لَمَّا أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم انْتُهِيَ بِهِ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَهِيَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، إِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُعْرَجُ بِهِ مِنَ الأَرْضِ، فَيُقْبَضُ مِنْها، وَإِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُهْبَطُ بِهِ مِنْ فَوْقِهَا، فَيُقْبَضُ مِنْهَا. قَالَ: ﴿**إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ**﴾ [النجم: ١٦] قَالَ: فَرَاشٌ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: فَأُعْطِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ثَلاَثاً: أُعْطِيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَأُعْطِيَ خَوَاتِيمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَيْئاً، الْمُقْحِمَاتُ. [م١٧٣]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە وتی: کاتێ ئیسرا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرا گەیەنرایە (سدرة المنتهى)، ئەوە لە ئاسمانی شەشەمە، ئەوەی لە زەویەوە بەرز دەبێتەوە و دەگاتە ئەو شوێنە لێی وەردەگیرێت، ئەوەی لە سەریەوە دادەبەزێت دەگاتە ئەو شوێنە و لێی وەردەگیرێت، خودا دەفەرموێت: ﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ﴾ [النجم: ١٦]، عەبدوڵا وتی: فەرشێکە لە زێڕ، هەروەها وتی: سێ شت بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) درا پێنج نوێژەکەی پێدرا و کۆتایی "سُورَةِ الْبَقَرَةِ"ی پێدرا و لێخۆشبوون لە گوناهی گەورەی ئومەتەکەی پێدرا بۆ کەسێك شتێك لە هاوەڵ بۆ خودا دانەنێت.**

## ١٢- دەروازەی: ئایا پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لە میعراج پەروەردگاری بینی؟

**٣٥٩٦**- (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: يَا أُمَّتَاهُ، هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ قَفَّ شَعْرِي مِمَّا قُلْتَ! أَيْنَ أَنْتَ مِنْ ثَلاَثٍ، مَنْ حَدَّثَكَهُنَّ فَقَدْ كَذَبَ: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم رَأَى رَبَّهُ؛ فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿**لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ**﴾ [الأنعام: ١٠٣] ﴿**وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ**

---

[1] واتە: ئەو فریشتەی خەزنەداری دۆزەخە-و.

مِن وَرَآيِ حِجَابٍ﴾ [الشورى: ٥١]، وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ يَعْلَمُ ما في غَدٍ؛ فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾ [لقمان: ٣٤]، وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ كَتَمَ؛ فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ الآيَةَ [المائدة: ٦٧]، وَلكِنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ عليه السلام في صُورَتِهِ مَرَّتَيْنِ. [خ٤٨٥٥ (٣٢٣٤)/ م١٧٧]

(ق) لە مەسروقەوە، وتی: بەعائیشەم(خوا لێی ڕازی بێت) وت: ئەی دایکم، ئایا موحەمەد پەروەردگاری بینی[1]؟ عائیشە وتی: مووی سەرم ڕاسبوویەوە لەوەی وتت، تۆ لە کوێی ئەم سیانەدایت؟ هەرکەسێك بۆتان باس بکات درۆی کردووە، هەر کەسێك بۆت باس بکات موحەمەد(ﷺ) پەروەردگاری بینیوە درۆی کردووە، پاشان ئەو ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ [الأنعام: ١٠٣]، ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ﴾ [الشورى: ٥١]، هەرکەس بۆت باس بکات دەزانێت سبەینێ چی تێدایە درۆی کردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾ [لقمان: ٣٤]، هەرکەس بۆت باس بکات پێغەمبەر شتێکی شاردۆتەوە درۆی کردووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ [المائدة: ٦٧]، بەڵام جبریلی(علیه السلام) لەشێوەی خۆیدا دووجار بینیوە.

**٣٥٩٧-** (ق) عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ﴾ [النجم: ٩- ١٠].

قَالَ: حَدَّثَنا ابْنُ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ، لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ. [خ٣٢٣٢/ م١٧٤]

(ق) لە زیڕی کوڕی حوبەیشەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ﴾ [النجم: ٩- ١٠].

وتی: ئیبن مەسعود بۆی باس کردین پێغەمبەر جبریلی بینیوە شەشسەد باڵی هەبووە.

---

[1] واتە: ئایا لە شەوی میعراجدا پێغەمبەر خودای بینی؟-و.

**٣٥٩٨-** (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ: (نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ). [م١٧٨]

**(م) لەئەبی زەڕەوە وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد: ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی؟[1] فەرمووی: نوورێك، چۆن بتوانم بیبینم.**



[1] واتە: لە شەوی میعراجدا-و.

## بەشی سێیەم

## کۆچ و دوای کۆچ

### ١- دەروازەی: دەسپێکردنی کۆچ بۆ مەدینە

**٣٥٩٩-** (خ) عَنِ البَرَاءِ بْنِ عازِبٍ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، ثُمَّ قَدِمَ عَلَيْنَا عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ وَبِلاَلٌ ﷺ. [خ٣٩٢٤]

**(خ) لە بەرائی کوڕی عازیبەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: یەکەمین کەسێك هاتن بۆ لامان موصعەبی کوڕی عومەیر و ئیبن ئوم مەکتووم بوو، پاشان عەماری کوڕی یاسر و بیلال(خوایان لێ ڕازی بێت) هاتن بۆ لامان.**

- وفي رواية: قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، وَكَانَا يُقْرِئونَ النَّاسَ، فَقَدِمَ بِلاَلٌ وَسَعْدٌ وَعَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، ثُمَّ قَدِمَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ قَدِمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ المَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حَتَّى جَعَلَ الإِمَاءُ يَقُلْنَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَمَا قَدِمَ حَتَّى قَرَأْتُ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ١﴾[الأعلى: ١] فِي سُوَرٍ مِنَ المُفَصَّلِ. [خ٣٩٢٥]

**لە ڕیوایەتێکدا بەڕا وتی: یەکەمین کەسێك هاتن بۆ لامان موصعەبی کوڕی عومەیر و ئیبن ئوم مەکتووم بوو، ئەوان قورئانیان بە خەڵك دەخوێند، پاشان بیلال و سەعد وعەماری کوڕی یاسر هاتن بۆ لامان، پاشان عومەری کوڕی خەتاب و بیست کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتن بۆ لامان، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) هات، ئەهلی مەدینەم نەبینیوە بەشتێك دڵخۆشبن وەك دڵخۆشبوونیان بە هاتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، تەنانەت کەنیزەکەکان دەیانووت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات، پێغەمبەر نەهات تا من**

سـورەتی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى①﴾[الأعلى: ١]م لەگەڵ چەند سورەتێکی موفەصەلەم[1] خوێند.

## ٢- دەروازەی: کۆچکردنی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بۆ مەدینە

٣٦٠٠- (خ) عَنْ عَائِشَةَ ﵂. زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَتْ: لَمْ أَعْقِلْ أَبَوَيَّ قَطُّ إِلاَّ وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ، وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ إِلاَّ يَأْتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم طَرَفَيِ النَّهَارِ، بُكْرَةً وَعَشِيَّةً، فَلَمَّا ابْتُلِيَ المسْلِمُونَ خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ مُهَاجِراً نَحْوَ أَرْضِ الحَبَشَةِ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَرْكَ الْغِمَادِ لَقِيَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ، وَهْوَ سَيِّدُ الْقَارَةِ، فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَبَا بَكْرٍ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجَنِي قَوْمِي، فَأُرِيدُ أَنْ أَسِيحَ فِي الأَرْضِ وَأَعْبُدَ رَبِّي.

قَالَ ابْنُ الدَّغِنَةِ: فَإِنَّ مِثْلَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ لاَ يَخْرُجُ وَلاَ يُخْرَجُ، إِنَّكَ تَكْسِبُ المعْدُومَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الحَقِّ، فَأَنَا لَكَ جارٌ، ارْجِعْ وَاعْبُدْ رَبَّكَ بِبَلَدِكَ. فَرَجَعَ وَارْتَحَلَ مَعَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ.

فَطَافَ ابْنُ الدَّغِنَةِ عَشِيَّةً فِي أَشْرَافِ قُرَيْشٍ، فَقَالَ لَهُمْ: إِن أَبَا بَكْرٍ لاَ يَخْرُجُ مِثْلُهُ وَلاَ يُخْرَجُ، أَتُخْرِجُونَ رَجُلاً يَكْسِبُ المعْدُومَ، وَيَصِلُ الرَّحِمَ، وَيَحْمِلُ الكَلَّ، وَيَقْرِي الضَّيْفَ، وَيُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ؟! فَلَمْ تُكَذِّبْ قُرَيْشٌ بِجِوَارِ ابْنِ الدَّغِنَةِ، وَقَالُوا لاِبْنِ الدَّغِنَةِ: مُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيَعْبُدْ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، فَلْيُصَلِّ فِيهَا، وَلْيَقْرَأْ ما شَاءَ، وَلاَ يُؤْذِينَا بِذلِكَ، وَلاَ يَسْتَعْلِنْ بِهِ، فَإِنَّا نَخْشَى أَنْ يَفْتِنَ نِسَاءَنَا وَأَبْنَاءَنَا. فَقَالَ ذلِكَ ابْنُ الدَّغِنَةِ لأَبِي بَكْرٍ، فَلَبِثَ أَبُو بَكْرٍ بِذلِكَ يَعْبُدُ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، وَلاَ يَسْتَعْلِنُ بِصَلاَتِهِ وَلاَ يَقْرَأُ فِي غَيْرِ دَارِهِ.

ثُمَّ بَدَا لأَبِي بَكْرٍ، فابْتَنَى مَسْجِداً بِفِنَاءِ دَارِهِ، وَكَانَ يُصَلِّي فِيهِ، وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَتَقَذَّفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ المشْرِكِينَ وَأَبْنَاؤُهُمْ، وَهُمْ يَعْجَبُونَ مِنْهُ وَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَجُلاً بَكَّاءً، لاَ يَمْلِكُ عَيْنَيْهِ إِذَا قَرَأَ الْقُرْآنَ، وَأَفْزَعَ ذلِكَ أَشْرَافَ قُرَيْشٍ مِنَ المشْرِكِينَ، فَأَرْسَلُوا إِلَى ابْنِ الدَّغِنَةِ فَقَدِمَ عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا: إِنَّا كُنَّا أَجَرْنَا أَبَا بَكْرٍ بِجِوَارِكَ، عَلَى أَنْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، فَقَدْ جاوَزَ ذلِكَ،

---

[1] "مفصل" ئەو سورەتانەن دابڕ(فاصلة)یان زۆرە، لە سورەتی (الحجرات) یان (ق)ەوە دەست پێ دەکەن بۆ سورەتی (الناس)-و.

فَابْتَنَى مَسْجِداً بِفِنَاءِ دَارِهِ، فَأَعْلَنَ بِالصَّلاَةِ وَالْقِرَاءَةِ فِيهِ، وَإِنَّا قَدْ خَشِينَا أَنْ يَفْتِنَ نِسَاءَنَا وَأَبْنَاءَنَا، فَانْهَهُ، فَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْتَصِرَ عَلَى أَنْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَعَلَ، وَإِنْ أَبى؛ إِلاَّ أَنْ يُعْلِنَ بِذلِكَ، فَسَلْهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْكَ ذِمَّتَكَ، فَإِنَّا قَدْ كَرِهْنَا أَنْ نُخْفِرَكَ، وَلَسْنَا مُقِرِّينَ لأَبِي بَكْرٍ الاِسْتِعْلاَنَ.

قَالَتْ عائِشَةُ: فَأَتَى ابْنُ الدَّغِنَةِ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتَ الَّذِي عاقَدْتُ لَكَ عَلَيْهِ، فَإِمَّا أَنْ تَقْتَصِرَ عَلَى ذلِكَ، وَإِمَّا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيَّ ذِمَّتِي، فَإِنِّي لاَ أُحِبُّ أَنْ تَسْمَعَ الْعَرَبُ أَنِّي أُخْفِرْتُ فِي رَجُلٍ عَقَدْتُ لَهُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِنِّي أَرُدُّ إِلَيْكَ جِوَارَكَ، وَأَرْضى بِجِوَارِ اللهِ عزّ وجل.

وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِلْمُسْلِمِينَ: (**إِنِّي أُرِيتُ دَارَ هِجْرَتِكُمْ، ذَاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لاَبَتَيْنِ**) . وَهُمَا الحَرَّتَانِ . فَهَاجَرَ مَنْ هَاجَرَ قِبَلَ المدِينَةِ، وَرَجَعَ عامَّةُ مَنْ كانَ هَاجَرَ بِأَرْضِ الحَبَشَةِ إِلَى المدِينَةِ، وَتَجَهَّزَ أَبُو بَكْرٍ قِبَلَ المدِينَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَى رِسْلِكَ، فَإِنِّي أَرْجُو أَنْ يُؤْذَنَ لِي**). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَلْ تَرْجُو ذلِكَ بِأَبِي أَنْتَ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**). فَحَبَسَ أَبُو بَكْرٍ نَفْسَهُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِيَصْحَبَهُ، وَعَلَفَ رَاحِلَتَيْنِ كانَتَا عِنْدَهُ وَرَقَ السَّمُرِ . وَهُوَ الخَبَطُ . أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ.

قَالَتْ عائِشَةُ: فَبَيْنَما نَحْنُ يَوْماً جُلُوسٌ فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، قَالَ قَائِلٌ لأَبِي بَكْرٍ: هَذَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُتَقَنِّعاً، فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَأْتِينَا فِيهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِدَاءٌ لَهُ أَبِي وَأُمِّي، وَاللهِ ما جاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَمْرٌ.

قالَتْ: فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ فَدَخَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لأَبِي بَكْرٍ: (**أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ**). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا هُمْ أَهْلُكَ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ! قالَ: (**فَإِنِّي قَدْ أُذِنَ لِي فِي الخُرُوجِ**). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: الصَّحَابَةَ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ! قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**نَعَمْ**). قالَ أَبُو بَكْرٍ: فَخُذْ . بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ . إِحْدَى رَاحِلَتَيَّ هَاتَيْنِ، قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**بِالثَّمَنِ**).

قالَتْ عائِشَةُ: فَجَهَّزْنَاهُمَا أَحَثَّ الْجِهَازِ، وَصَنَعْنَا لَهُمَا سُفْرَةً فِي جِرَابٍ، فَقَطَعَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ قِطْعَةً مِنْ نِطَاقِهَا، فَرَبَطَتْ بِهِ عَلَى فَمِ الجِرَابِ، فَبِذلِكَ سُمِّيَتْ ذَاتَ النِّطَاقَيْنِ. قَالَتْ: ثُمَّ لَحِقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبُو بَكْرٍ بِغَارٍ فِي جَبَلِ ثَوْرٍ، فَكَمَنَا فِيهِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، يَبِيتُ عِنْدَهُمَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، وَهُوَ غُلاَمٌ شَابٌّ، ثَقِفٌ لَقِنٌ، فَيَدَّلِجُ مِنْ عِنْدِهِما بِسَحَرٍ، فَيُصْبِحُ مَعَ قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ كَبَائِتٍ، فَلاَ يَسْمَعُ أَمْراً يُكْتَادَانِ بِهِ إِلاَّ وَعاهُ، حَتَّى يَأْتِيَهُمَا بِخَبَرِ ذلِكَ حِينَ

يَخْتَلِطُ الظَّلاَمُ، وَيَرْعَى عَلَيْهِمَا عامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ . مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ . مِنْحَةً مِنْ غَنَمٍ، فَيُرِيحُهَا عَلَيْهِمَا حِينَ تَذْهَبُ سَاعَةٌ مِنَ الْعِشَاءِ، فَيَبِيتَانِ فِي رِسْلٍ، وَهْوَ لَبَنُ مِنْحَتِهِمَا وَرَضِيفِهِمَا، حَتَّى يَنْعِقَ بِهَا عامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ بِغَلَسٍ، يَفْعَلُ ذلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ تِلْكَ اللَّيَالِي الثَّلاَثِ.

وَاسْتَأْجَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبُو بَكْرٍ رَجُلاً مِنْ بَنِي الدِّيلِ، وَهْوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ بْنِ عَدِيٍّ، هَادِياً خِرِّيتاً . وَالْخِرِّيتُ: الماهِرُ بِالْهِدَايَةِ . قَدْ غَمَسَ حِلْفاً فِي آلِ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ، وَهْوَ عَلَى دِينِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، فَأَمِنَاهُ فَدَفَعَا إِلَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا، وَوَاعَدَاهُ غارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، فَأَتَاهُمَا بِرَاحِلَتَيْهِمَا صُبْحَ ثَلاَثٍ، وَانْطَلَقَ مَعَهُمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ، وَالدَّلِيلُ، فَأَخَذَ بِهِمْ طَرِيقَ السَّوَاحِلِ. [خ٣٩٠٥ (٤٧٦)]

**(خ) لە عائیشەوە(خوای لێ ڕازی بێت)، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) وتی: من بیرم بێت دایك و باوكم خاوەنی دین بوون، ڕۆژێك بەسەرماندا تێنەدەپەڕی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو جەمسەرەكەی ڕۆژ-بەیانیان و ئێواران- سەردانمان نەكات، كاتێ موسوڵمانان تووشی بەڵا و ناخۆشی هاتن ئەبوبەكر لە مەككە چووە دەرەوە بە مەبەستی كۆچكردن بەرەو زەوی حەبەشە، ئەو ڕۆیشت تا گەیشتە "بَرْكَ الْغِمَادِ[1]" لەو شوێنە ئیبن دەغینەی پێگەیشت ئەو سەرداری قارە بوو.**

**ئیبن دەغینە وتی: بۆ كوێ دەڕۆیت، ئەی ئەبوبەكر؟ ئەبوبەكر وتی: هۆزەكەم دەریان كردووم، دەمەوێت بەزەویدا گەشت بكەم و پەروەردگاری خۆم بپەرستم، ئیبن دەغینە وتی: نموونەی وەك تۆ نەدەچێتە دەرەوە و نە دەردەكرێت، تۆ یارمەتی هەژاران دەدەی و سیلەی ڕەحم بەجێدەهێنی و داماو و پەككەوتە كۆمەكی دەكەی و میوان پەزێری دەكەیت و یارمەتی ڕووداو و كاروباری حەق دەدەیت، من دەبم بە پەنادەری تۆ بگەڕێرەوە و پەروەردگاری خۆت لە شارەكەت بپەرستە، ئەبوبەكر گەڕایەوە و ئیبن دەغینەش لەگەڵیدا هات.**

**بەسەر سەرانی قورەیشدا گەڕا و پێی وتن: نموونەی ئەبوبەكر نەدەردەچێت و نەدەردەكرێت، ئایا ئێوە پیاوێك دەردەكەن یارمەتی هەژاران دەدات و سیلەی ڕەحم**

---

**[1] شوێنێكە ٥٦٠ كم لە مەككەوە دوورە-و.**

بـەجێ دەهێـڵێ و داماو و پەککەوتـە کۆمـەکی دەکات و میـوان پـەزێری دەکات و یارمەتی ڕووداو کاروباری حەق دەدات، قورەیش پەنادانەکەی ئیبن و دەغینـەیان ڕەد نەکردەوە و وتیان بە ئیبن دەغینە فـەرمان بـە ئەبوبـەکر بکـە بـا لەماڵەکـەی خۆیـدا پەروەردگاری خۆی بپەرستێت، با لەماڵەکەی خۆیدا نوێـژ بکـات و قورئـان بخوێنێـت چەند دەخوازێت، بەو کارانەی ئازاری ئێمە نـەدات و ئاشـکرای نـەکات، چـونکە ئێمـە دەترسـین ژنـەکانمان و منداڵـەکانمان لـەوەوە تووشـی فیتنـە بـبن[1]، ئـیبن دەغینـە ئەوەی بە ئەبوبەکر وت، ماوەیەك ئەبوبەکر لە ماڵەکـەی خۆیـدا پـەروەردگاری خـۆی پەرست و نوێژکردنەکەی و خوێندنی قورئانەکەی جگە لەماڵەکەی خۆی ڕانەدەگەیاند.

پاشان ئەبوبـەکر پێـی باشـبوو مزگـەوتێك لەتەنیشتی ماڵەکـەی دروسـت بکـات، ئـەو نوێژی تێدا دەکرد و قورئانی تێدا دەخوێند ژنانی هاوەڵدانەران و منداڵانیان لەسەری کۆما دەبوون و کۆدەبوونەوە، ئـەوان پێیـەوە سەرسـامبوون و تەماشـایان دەکـرد، ئەبوبـەکرك ەسێکی چاو بە فرمێسك بوو کـاتێ قورئـانی دەخوێنـد چـاوەکانی خۆیـان پێڕانـەدەگیرا، ئەوە بوو بە ترس و تۆقین بۆ سەرانی قورەیش لـە هاوەڵدانـەران، بۆیـە ناردیـان بـەدوای ئیبن دەغینەدا، ئەویش هات بۆ لایان، پێیـان وت: ئێمـە بـە هـۆی پـەنادانی تـۆوە پـەنای ئەبوبەکرمان دا لەسەر ئەوەی پەروەردگاری خۆی لەماڵەکەیدا بپەرستێت، ئێسـتا ئـەوەی تێپەڕاندووە، مزگەوتی: کی لەتەنیشت ماڵەکەی دروستکردووە و نوێژەکـەی و خوێنـدنی قورئانەکەی تێدا ڕادەگەیەنێت، ئێمە دەترسین ژنەکانمان و منداڵەکانمان لەوەوە تووشـی فینە ببن، بۆیە نەهی لێبکە، گـەر پێـی خۆشـبوو لەماڵەکـەی خـۆی پـەروەردگاری خـۆی بپەرستێت با ئەو کارە بکات، ئەگەر نەیویست و ڕایدەگەیاند داوای لێبکە پەنادانەکەت بـۆ بگێڕێتەوە، چونکە ئێمە پێمان خۆش نییە ناپاکی لە پەنادانی تۆ بکەین، ڕێگەیش نادەین ئەبوبەکر نوێژ و خوێندنی قورئانەکەی ڕابگەیەنێت.

عائیشە وتی: ئیبن دەغینە هات بۆ لای ئەبوبەکر و وتی: تۆ ئەوە دەزانیـت کـەمن پەیمانم لەسەر وەگرتووە بۆ تـۆ، جـا یـان لەسـەر ئـەوە خـۆت کـورت هەڵبهێنـە یـان

---

[1] واتە: موسڵمان ببن–و.

پەنادانەکەم بۆ بگێڕەوە، من پێم خۆشنییە عەرەب ببیستن پەنادانی من بۆ پیاوێك پەیمانم لەسەر وەرگرتووە ناپاکی لێکراوە، ئەبوبەکر وتی: من پەنادانەکەت بۆ دەگێڕمەوە و ڕازیم بە پەنای خودا(عز وجل).

پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕۆژگارە لە مەککە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە موسوڵمانانی وت: ئەو خانەی کۆچی بۆ دەکەن نیشانی من دراوە، شوێنێکە دارخورمای هەیە لەنێوان دوو زەوی ڕەش، ئەوەش دوو زەوییە کە بەردی ڕەشی تێدایە، ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ مەدینە کۆچیان کرد، زۆرینەی ئەوانەی کۆچیان بۆ حەبەشە کرد بوو گەڕانەوە بۆ مەدینە، ئەبوبەکر خۆی ئامادەکرد بەرەو مەدینە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (**پەلە مەکە من ڕجام وایە مۆڵەتم بدرێت**)، ئەبوبەکر وتی: ئایا ڕجای ئەوەت هەیە باوکم بە فیداتبێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، بۆیە ئەبوبەکر لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئارامیگرت تا هاوەڵی بکات، دوو حوشتر کە لەلای بوون دایبەستن و گەڵای درەختی پێ دەدان، ئەوەش بریتیە لەگەڵای وەریوی درەخت بۆ ماوەی چوار مانگ.

عائیشە وتی: ڕۆژێك ئێمە لەماڵی ئەبوبەکر دانیشتبووین لە قرچەی نیوەڕۆدا یەکێك هات و بە ئەبوبەکری وت: ئەوە پێغەمبەری خودایە(ﷺ) ڕوخساری خۆی داپۆشیوە، لەساتێکدا بوو کە پێغەمبەری خودا لەو کاتانە نەدەهات بۆ لامان، ئەبوبەکر وتی: دایك و باوکم فیدات بێت، سوێند بە خودا، لەم کاتەدا تەنها کاروبارێ تۆی هێناوە.

عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای مۆڵەتی کرد مۆڵەتیدراو و هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبوبەکری فەرموو: (**ئەمانە لە لای خۆت بکە دەرەوە**)، ئەبوبەکر وتی: ئەوانە خانەوادەی تۆن، باوکم بە فیدات بێت، ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر فەرمووی: (**من مۆڵەتم دراوە بە دەرچوون**)، ئەبوبەکر وتی: دایك و باوکم فیدات بێت، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوەڵێت بکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بەڵێ**)، ئەبوبەکر وتی: باوکم فیدای تۆ بێت، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) یەکێك لەو دوو حوشترە ببە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**نرخی لەسەر دابنێ**).

عائیشە وتی: بەخێراترین و باشترین شێوە ئامادەکاریمان بۆ کردن، لە توێشەبەرەدا خواردنمان بۆ ئامادەکردن، ئەسمای کچی ئەبوبەکر پارچەیەك لە

پشتوێنەکەی خۆی بڕی دەمی یەکێك لە توێشەبەرەکانی پێ بەست، بەوە ناونرا (ذات النطاقين)-خاوەنی دوو پشتێنەکە- عائیشە وتی: پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر ڕۆیشتن بۆ ئەو غارە لە چیای سەور، سێ شەو تیایدا مانەوە، عەبدوڵای کوڕی ئەبوبەکر لەگەڵیان دەمایەوە، ئەو غوڵامێکی گەنج بوو، زیرەك بوو، تێگەیشتنی خێرا بوو، بەیانیان زوو لەلای ئەوان دەردەچوو لەگەڵ قورەیش لەمەککە ڕۆژی دەکردەوە وەك یەکێك شەو لەگەڵ ئەواندا بوو بێت، هەر شتێکی ببیستبایە دەربارەی فێڵ و پیلانیان لەبەری دەکرد کاتێ تاریکی شەو دادەهات هەواڵەکەی بۆ دەبردن، عامیری کوڕی فوهەیرە-مەولای ئەبوبەکر- پەڵەیەك لە مەڕی بەسەر ئەواندا دەلەوەڕاند، کە ساتێ لەشەو تێدەپەڕی بەسەر ئەواندا مەڕەکانی دەهێنایەوە، بۆیە ئەو شەوە پێغەمبەر و ئەبوبەکر شیری نوێیان لە لابوو، ئەوەش شیرێك بوو بەردی تاوسەندویان بە هەتاو تێدەکرد تا بۆ خاویەکەی نەمێنێت، بەیانیان زوو عامیری کوڕی فوهەیرە مەڕەکانی بەسەریاندا لێدەخوڕی ئەو سێ شەوە هەموو شەوێك ئەو کارەی ئەنجام دەدا.

پێغەمبەری خودا و ئەبوبەکر پیاوێکیان لە بەنی دەیل بەکرێ گرت، ئەو پیاوێك بوو لەبەنی عەبدی کوڕی عەدی وەك ڕێنیشاندەر، (خريت) بوو، خريت واتە شارەزا و ئاگادار بەڕێنموونی کردنی ڕێگە، ئەو پیاوە پەیمانی لەگەڵ ئالی عاسی کوڕی وائلی سەهمی بەستبوو، ئەو لەسەر ئاینی بێباوەڕانی قورەیش بوو، پێغەمبەر و ئەبوبەکر بە ئەمینیان زانی و دوو حوشترەکەیان دایە دەست و مەوعیدیان لێوەرگرت، دوای سێ شەو لە غاری سەور بەیەکتر بگەن، بەیانی ڕۆژی سێهەم دوو حوشترەکەی بۆ هێنان عامری کوڕی فوهەیرە-ڕێنیشاندەرەکە- لەگەڵیان ڕۆیشت ڕێگەی کەنار دەریای پێگرتنەبەر.

٣٦٠١- (خ) عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ جُعْشُمٍ قَالَ: جاءَنَا رُسُلُ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، يَجْعَلُونَ فِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبِي بَكْرٍ، دِيَةَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا، لِمَنْ قَتَلَهُ أَوْ أَسَرَهُ، فَبَيْنَمَا أَنَا جالِسٌ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ قَوْمِي بَنِي مُدْلِجٍ، إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، حَتَّى قامَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ جُلُوسٌ، فَقَالَ: يَا سُرَاقَةُ، إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ آنِفاً أَسْوِدَةً بِالسَّاحِلِ، أُرَاهَا مُحَمَّداً وَأَصْحَابَهُ، قالَ سُرَاقَةُ: فَعَرَفْتُ أَنَّهُمْ

هُمْ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِهِمْ، وَلكِنَّكَ رَأَيْتَ فُلاَناً وَفُلاَناً، انْطَلَقُوا بِأَعْيُنِنَا، ثُمَّ لَبِثْتُ فِي الْمَجْلِسِ سَاعَةً، ثُمَّ قُمْتُ فَدَخَلْتُ، فَأَمَرْتُ جارِيَتِي أَنْ تَخْرُجَ بِفَرَسِي . وَهْيَ مِنْ وَرَاءِ أَكَمَةٍ . فَتَحْبِسَهَا عَلَيَّ، وَأَخَذْتُ رُمْحِي.

فَخَرَجْتُ بِهِ مِنْ ظَهْرِ الْبَيْتِ، فَخَطَطْتُ بِزُجِّهِ الأَرْضَ، وَخَفَضْتُ عَالِيَهُ، حَتَّى أَتَيْتُ فَرَسِي فَرَكِبْتُهَا، فَرَفَعْتُهَا تُقَرِّبُ بِي، حَتَّى دَنَوْتُ مِنْهُمْ.

فَعَثَرَتْ بِي فَرَسِي، فَخَرَرْتُ عَنْهَا، فَقُمْتُ فَأَهْوَيْتُ يَدِي إِلَى كِنَانَتِي، فَاسْتَخْرَجْتُ مِنْهَا الأَزْلاَمَ، فَاسْتَقْسَمْتُ بِهَا: أَضُرُّهُمْ أَمْ لاَ، فَخَرَجَ الَّذِي أَكْرَهُ، فَرَكِبْتُ فَرَسِي، وَعَصَيْتُ الأَزْلاَمَ، تُقَرِّبُ بِي حَتَّى إِذَا سَمِعْتُ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهْوَ لاَ يَلْتَفِتُ، وَأَبُو بَكْرٍ يُكْثِرُ الاَلْتِفَاتَ، سَاخَتْ يَدَا فَرَسِي فِي الأَرْضِ، حَتَّى بَلَغَتَا الرُّكْبَتَيْنِ، فَخَرَرْتُ عَنْهَا، ثُمَّ زَجَرْتُهَا فَنَهَضَتْ، فَلَمْ تَكَدْ تُخْرِجُ يَدَيْهَا. فَلَمَّا اسْتَوَتْ قَائِمَةً، إِذَا لأَثَرِ يَدَيْهَا عُثَانٌ سَاطِعٌ فِي السَّمَاءِ مِثْلُ الدُّخَانِ، فَاسْتَقْسَمْتُ بِالأَزْلاَمِ، فَخَرَجَ الَّذِي أَكْرَهُ.

فَنَادَيْتُهُمْ بِالأَمَانِ فَوَقَفُوا، فَرَكِبْتُ فَرَسِي حَتَّى جِئْتُهُمْ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي حِينَ لَقِيتُ ما لَقِيتُ مِنَ الحَبْسِ عَنْهُمْ، أَنْ سَيَظْهَرُ أَمْرُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّمفَقُلْتُ لَهُ: إِنْ قَوْمَكَ قَدْ جَعَلُوا فِيكَ الدِّيَةَ، وَأَخْبَرْتُهُمْ أَخْبَارَ ما يُرِيدُ النَّاسُ بِهِمْ، وَعَرَضْتُ عَلَيْهِمُ الزَّادَ وَالمَتَاعَ، فَلَمْ يَرْزَآنِي وَلَمْ يَسْأَلاَنِي، إِلاَّ أَنْ قَالَ: (**أَخْفِ عَنَّا**). فَسَأَلْتُهُ أَنْ يَكْتُبَ لِي كِتَابَ أَمْنٍ، فَأَمَرَ عامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ فَكَتَبَ فِي رُقْعَةٍ مِنْ أَدِيمٍ، ثُمَّ مَضَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم.

قال ابن شهاب: فأخبرني عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَقِيَ الزُّبَيْرَ فِي رَكْبٍ مِنَ المسْلِمِينَ، كانُوا تِجَاراً قَافِلِينَ مِنَ الشَّامِ، فَكَسَا الزُّبَيْرُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبَا بَكْرٍ ثِيَابَ بَيَاضٍ.

وَسَمِعَ المسْلِمُونَ بِالمدِينَةِ بِمَخْرَجِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ مَكَّةَ، فَكَانُوا يَغْدُونَ كُلَّ غِدَاةٍ إِلَى الحَرَّةِ، فَيَنْتَظِرُونَهُ حَتَّى يَرُدَّهُمْ حَرُّ الظَّهِيرَةِ، فَانْقَلَبُوا يَوْماً بَعْدَ ما أَطَالُوا انْتِظَارَهُمْ، فَلَمَّا أَوَوْا إِلَى بُيُوتِهِمْ، أَوْفَى رَجُلٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِهِمْ، لأَمْرٍ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَبَصُرَ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابِهِ مُبَيَّضِينَ يَزُولُ بِهِمُ السَّرَابُ، فَلَمْ يَمْلِكِ الْيَهُودِيُّ أَنْ قَالَ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا مَعَاشِرَ الْعَرَبِ، هَذَا جَدُّكُمُ الَّذِي تَنْتَظِرُونَ، فَثَارَ المسْلِمُونَ إِلَى السِّلاَحِ، فَتَلَقَّوْا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِظَهْرِ الحَرَّةِ، فَعَدَلَ بِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ، حَتَّى نَزَلَ بِهِمْ فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَذَلِكَ يَوْمَ الاثْنَيْنِ مِنْ شَهْرِ رَبِيعٍ الأَوَّلِ.

فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّاسِ، وَجَلَسَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم صَامِتاً، فَطَفِقَ مَنْ جاءَ مِنَ الأَنْصَارِ ـ مِمَّنْ لَمْ يَرَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ـ يُحَيِّي أَبَا بَكْرٍ، حَتَّى أَصَابَتِ الشَّمْسُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى ظَلَّلَ عَلَيْهِ بِرِدَائِهِ، فَعَرَفَ النَّاسُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ ذَلِكَ. فَلَبِثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، وَأُسِّسَ المسْجِدُ الَّذِي أُسِّسَ عَلى التَّقْوَى، وَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَسَارَ يَمْشِي مَعَهُ النَّاسُ حَتَّى بَرَكَتْ عِنْدَ مَسْجِدِ الرَّسُولِ صلّى الله عليه وسلّم بِالمدِينَةِ، وَهْوَ يُصَلِّي فِيهِ يَوْمَئِذ رِجَالٌ مِنَ المسْلِمِينَ، وَكَانَ مِرْبَداً لِلتَّمْرِ، لِسُهَيْلٍ وَسَهْلٍ غُلاَمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِ أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ: (هذَا إِنْ شَاءَ اللهُ المَنْزِلُ).

ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْغُلاَمَيْنِ فَسَاوَمَهُمَا بِالمرْبَدِ لِيَتَّخِذَهُ مَسْجِداً، فَقَالاَ: لاَ، بَلْ نَهَبُهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ! فَأَبَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُمَا هِبَةً حَتَّى ابْتَاعَهُ مِنْهُمَا، ثُمَّ بَنَاهُ مَسْجِداً، وطَفِقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَنْقُلُ مَعَهُمُ اللَّبِنَ فِي بُنْيَانِهِ وَيَقُولُ، وَهُوَ يَنْقُلُ اللَّبِنَ:

هذا الحِمالُ لا حِمَالُ خيبرْ      هذَا أَبَرُّ رَبَّنَا وأَطْهَرْ

ويقول:

اللَّهُمَّ! إِنَّ الأَجْرَ أَجْرُ الآخِرَهْ      فَارْحَمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

فَتَمَثَّلَ بِشِعْرِ رَجُلٍ مِنَ المسْلِمِينَ لَمْ يُسَمَّ لِي.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلَمْ يَبْلُغْنَا فِي الأَحادِيثِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَمَثَّلَ بِبَيْتِ شِعْرٍ تَامٍّ غَيْرِ هذه الأبيات. [خ٣٩٠٦]

**(خ) لە سوراقەی کوڕی جوعشوومەوە وتی: نێردراوی بێباوەڕانی قورەیش هاتن بۆ لامان خوێنیان لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر دانابوو، بۆ هەریەکەیان خوێنێك[1] بۆ کەسێك یەکێك لەوانە بکوژێت، یان بە دیلیان بگرێت، کاتێك من لەیەکێك**

[1] واتە: سەد حوشتر –و.

لە مەجلیسەکانی هۆزەکەم–هۆزی بەنی مودلیج– دانیشتبووم پیاوێك لەوان[(١)] هات لەناومان بەپێوە وەستا و ئێمە دانیشتبووین، وتی: ئەی سوراقە من هەر ئێستا تارمایی لەکەنار دەریا بینی، پێموایە موحەممەد و هاوەڵانی بن، سوراقە وتی: زانیم ئەوانن، بۆیە وتم ئەو تارماییانە ئەوان نین، تۆ فڵان و فڵانت بینی؟ هەر ئێستا بەدیار چاو ئێمەوە ڕۆیشتن، ساتێك لە مەجلیسەکەدا مامەوە[(٢)] و پاشان هەستام و ڕۆیشتم بۆ ماڵەوە و چوومە ژوورەوە، فەرمانم کرد بە جاریەکەم ئەسپەکەم دەربهێنێت و –بیبات بۆ پشتی گردەکە–، لەوێ بۆم ڕابگرێت، منیش ڕمەکەم هەڵگرت.

لە پشتی ماڵەکەمەوە دەرچووم، نووکی ڕمەکەم لە زەوی دەخشاند و بەرزییەکەیم نزم کردەوە تا هاتمە لای ئەسپەکەم و سواری بووم، ئاوزەنگیم لە لەئەسپەکە دا و تەکانم پێدا، تا لێیان نزیك بوومەوە.

ئەسپەکەم هەڵکەوت و لەسەری بەربوومەوە، هەستامەوە و دەستم برد بۆ تیردانەکە، تیرێکی بێنووکم دەرهێنا قورعەم پێکرد ئایا زیانیان پێبگەیەنم یان زیانیان پێنەگەیەنم؟ ئەوە دەرچوو کەمن پێمناخۆش بوو[(٣)]، سواری ئەسپەکەم بوومەوە، سەرپێچیم کرد لە قورعەکە، تەکانم پێدا تا خوێندنەوەی پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست[(٤)]، ئەو لای نەدەکردەوە، ئەبوبەکر زۆر لای دەکردەوە، هەردوو دەستی ئەسپەکەم لەزەویدا نوقمبوون تا گەیشتنە هەردوو ئەژنۆی، لەسەر ئەسپەکە بەربوومەوە، پاشان دەنگمدایە ئەسپەکە و ڕاستبوویەوە، دەستەکانی دەرنەدەهاتن، کاتێ لەسەر چوار لاقی وەستا تەمومژێکی ڕۆشن لە ئاسماندا هەروەك دوکەڵ لە ئەسەری دوو دەستییەوە پەیدا بوو، دیسان قورعەم کردەوە ئەوە دەرچوویەوە من پێمناخۆشبوو.

---

(١) واتە: لە هۆزەکەی سوراقە–و.

(٢) تا کەس گومانی پێ نەبات بە هۆی هەواڵەکەوە بەدوای تارماییەکاندا دەڕوات–و.

(٣) واتە: بە قورعەی تیرەکە دەرچوو زیانیان پێ نەگەیەنم، ئەوەش بۆ من ناخۆش بوو، چونکە خەڵاتەکەی قورەیشم لەدەست دەچوو–و.

(٤) واتە: تا گوێم لە دەنگی قورئانخوێندنی پێغەمبەر بوو–و.

هاواری ئەمن و ئەمانم لێکردن، بۆیە وەستان، سواری ئەسپەکەم بووم تا هاتم بۆ لایان، لەوەی تووشم هات لە بەندبوون شتێك کەوتە ناو دڵ و دەروونمەوە، ئەوەش ئەمری پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، بۆیە پێم وت: هۆزەکەت خوێنیان بۆ تۆ داناوە، هەواڵی ئەوەم پێدا خەڵکی دەربارەی ئەوان دەیانەوێت، توێش و شتومەکم بۆ خستەڕوو[1]، بەڵام هیچی لێهەڵنەگرت و هیچی داوا لێ نەکردم جگە لەوەی فەرمووی: (**هەواڵەکەمان بشارەوە**)، داوام لێکرد نوسراوێکی ئەمن و ئەمانم بۆ بنووسێت فەرمانی کرد بە عامیری کوڕی فوهەیرە لەپارچە چەرمێکدا نووسی، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت.

ئیبن شیهاب دەڵێت: عورووەی کوڕی زوبەیر هەواڵی پێدام پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەزوبەیر گەیشت لەناو قافڵەیەك لە موسوڵمانان بازرگانییان دەکرد، کاروانییەکەیان لە شام دەگەڕایەوە، بۆیە زوبەیر پۆشاکی سپی بە پێغەمبەری خودا و ئەبوبەکر پۆشی.

موسوڵمانان لە مەدینە هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەری خودایان(ﷺ) لەمەککە بیست، هەموو بەیانیەك دەچوون بۆ حەڕە[2]، لەوێ چاوەڕوانی بوون تا گەرمای نیوەڕۆ دەیگێڕانەوە بۆ ماڵەوە، ڕۆژێك لەدوای چاوەڕوانیەکی دوورو درێژ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە کە گەیشتنە بەرەوە پیاوێك لە یەهوود لەیەکێك لە قولەکانیانەوە تەماشای شتێکی خۆی دەکرد لەدوورەوە پێغەمبەری خودا و هاوەڵانی(ﷺ) بینی پۆشاکی سپییان لەبەردابوو، سەراب دەیسڕینەوە[3]، یەهودیەکە خۆی پێ نەگیرا و بەبەرزترین دەنگ هاواری کرد: ئەی کۆمەڵی عەرەب، ئەوە ئەو سەروەری و دەسەڵاتەیە چاوەڕوانتان دەکرد، موسوڵمانان ڕاپەڕین و چەکەکانیان هەڵگرت، لەپشتی حەڕەوە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتن، پێغەمبەر بەلای ڕاستدا ئەوانی لادا تا لەبەنی عەمری کوڕی عەوف دابەزین، ئەوەش ڕۆژی دووشەممە بوو لەمانگی ڕەبیعی یەکەم.

---

[1] واتە: پێم وت: خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگتان بۆ بهێنم-و.

[2] حەڕەی خۆرهەڵات و حەڕەی خۆرئاوای مەدینە سنوورەکانی مەدینە بوون-و.

[3] واتە: بەهۆی دوورییان جار جار شەپۆلەکانی سەراب تارماییەکانی دەشێواند و بزری دەکرد-و.

ئەبوبەکر لەناو خەڵکەکەدا بەپێوە وەستا و پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە بێدەنگی دانیشتبوو، خەڵکانێك لە ئەنصار هاتن، ئەوانەی کە پێغەمبەری خودایان(ﷺ) نەبینی بوو سڵاویان لە ئەبوبەکر دەکرد[1]، تا خۆر دای لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر رووی لێکرد و بەکراسەکەی سێبەری بۆ کرد، لەوبارەدا خەڵکی پێغەمبەری خودایان(ﷺ) ناسی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەشت نۆ شەوێك لەبەنی عەمری کوڕی عەوف مایەوە، ئەو مزگەوتەی دروستکرد کە لەسەر تەقوا بیناکرا بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی تێداکرد، پاشان سواری حوشترەکەی بوو، خەڵکی لەگەڵی ڕۆیشتن تا لەشوێنی مزگەوتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەمەدینە هات بە چۆکدا، لەو ڕۆژگارەدا پیاوانێك لە موسوڵمانان نوێژیان لەو شوێنەدا دەکرد، شوێنەکە خەرمانی خورمای سوهەیل و سەهل بوو کە دوو غوڵامی بێباوك بوون لە ژێر سەرپەرشتی ئەسعەدی کوڕی زورارەدا، کاتێ حوشترەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەوشوێنەدا هات بە چۆکدا فەرمووی: (**ئەمە مەنزڵەکەیە، إنشاءالله**).

پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو غوڵامەکەی بانگ کرد و داوای نرخی خەرمانەکەی لێکردن تا بیکات بە مزگەوت، ئەوانیش وتیان: بەڵکو دەیبەخشین بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕازی نەبوو بەخششەکەیان لێوەربگرێ، تا بەنرخێك دایدەنێن، پاشان مزگەوتەکەی بیناکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵیان خشتی قوڕینەیان دەبرد کاتێك کە خشتەکانی دەبرد دەیفەرموو:

هذا الحِمالُ لا حِمَالُ خيبرْ هذَا أَبَرُّ رَبَّنَا وأَطْهَرْ

هەروەها دەیفەرموو

اللَّهُمَّ! إِنَّ الأَجْرَ أَجْرُ الآخِرَهْ فَارْحَمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

نمونەی بە شیعری پیاوێ لە موسوڵمانان هێنایەوە ناوەکەی بۆمن نەهێنا.

ئیبن شیهاب دەڵێت: فەرموودەمان پێنەگەیشتوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەدرێژکی تەواو لەهۆنراوە نموونەی هێنابێتەوە جگە لەم دوو دێرە.

---

[1] واتە: پێغەمبەریان نەناسی-و.

## ٣- دەروازەی: لەماڵی ئەبو ئەیوب

**٣٦٠٢-** (م) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم نَزَلَ عَلَيْهِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي السُّفْلِ، وَأَبُو أَيُّوبَ فِي الْعُلْوِ. قَالَ: فَانْتَبَهَ أَبُو أَيُّوبَ لَيْلَةً فَقَالَ: نَمْشِي فَوْقَ رَأْسِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم! فَتَنَحَّوْا، فَبَاتُوا فِي جَانِبٍ. ثُمَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**السُّفْلُ أَرْفَقُ**)، فَقَالَ: لاَ أَعْلُو سَقِيفَةً أَنْتَ تَحْتَهَا، فَتَحَوَّلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْعُلْوِ، وَأَبُو أَيُّوبَ فِي السُّفْلِ. فَكَانَ يَصْنَعُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم طَعَامَاً، فَإِذَا جِيءَ بِهِ إِلَيْهِ، سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِهِ، فَيَتَتَبَّعُ مَوْضِعَ أَصَابِعِهِ. فَصَنَعَ لَهُ طَعَاماً فِيهِ ثُومٌ، فَلَمَّا رُدَّ إِلَيْهِ، سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقِيلَ لَهُ: لَمْ يَأْكُلْ! فَفَزِعَ، وَصَعِدَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَحَرَامٌ هُوَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُهُ**) قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ مَا تَكْرَهُ. أَوْ مَا كَرِهْتَ. قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُؤْتَى. [م٢٠٥٣]

**(م) لە ئەبی ئەیوبەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو بە میوانی ئەوان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە قاتی خوارەوە نیشتەجێ بوو، ئەبی ئەیوبیش[1] لە قاتی سەرەوە، وتی: ئەبو ئەیوب شەوێك بە ئاگا هات و وتی: ئێمە لەسەر سەری پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتووچۆ دەکەین، بۆیە چوونە سووچێکی ماڵەکەوە، ئەو شەوە لە لایەکی ماڵەکەدا رۆژیان کردەوە، پاشان لەو بارەیەوە بۆ پێغەمبەری باس کرد، پێغەمبەر فەرمووی: (خوارەوە ئاسانترە) ئەبو ئەیوب وتی: سەرناکەومە سەر سەقفێك تۆ لە ژێریدا بیت، بۆیە پێغەمبەری(ﷺ) سەرکەوتە سەرەوە و ئەبو ئەیوب هاتە خوارەوە ئەو خواردنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە دەکرد،کاتێك بۆی دەهێنا پرسیاری شوێنپەنجەی پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد، بۆیە جێ پەنجەکانی هەڵدەگرت[2]، خواردنێکی دروستکرد سیری تێدابوو کاتێ گەڕێنرایەوە بۆ لای پرسیاری جێپەنجەی پێغەمبەری(ﷺ) کرد، پێی وترا: نەیخواردووە، ئەبو ئەیوب ترسا و سەرکەوتە سەرەوە و وتی: ئایا ئەوە**

---

[1] واتە: خۆی و خانەوادەکەی-و.

[2] واتە: ئەو خواردنەی دەمایەوە و جێپەنجەی پێغەمبەری لەسەر بوو ئەبو ئەیوب بۆ فەڕ و بەرەکەت دەیخوارد-و.

حەرامە[1]؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (نەخێر، لام ناپەسەندە[2])، ئەبو ئەیوب وتی: ئەوەی تۆ لات ناپەسەندە بوو لای منیش ناپەسەندە، وتی: پێغەمبەری(ﷺ) فریشتە دەهاتن بۆ لای.

## ٤- دەروازەی: موسوڵمانبوونی عەبدوڵای کوڕی سەلام (خوا لێی رازی بێت)

**٣٦٠٣-** (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قالَ: بَلَغَ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَلاَمٍ مَقْدَمُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المدِينَةَ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ ثَلاَثٍ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إِلاَّ نَبِيٌّ: مَا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ؟ وَمَا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الجَنَّةِ؟ وَمِنْ أَيِّ شَيْءٍ يَنْزِعُ الْوَلَدُ إِلَى أَبِيهِ؟ وَمِنْ أَيِّ شَيْءٍ يَنْزِعُ إِلَى أَخْوَالِهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**خَبَّرَنِي بِهِنَّ آنِفاً جِبْرِيلُ**). قالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: ذَاكَ عَدُوُّ الْيَهُودِ مِنَ الملاَئِكَةِ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: فَنَارٌ تَحْشُرُ النَّاسَ مِنَ المَشْرِقِ إِلَى المَغْرِبِ، وَأَمَّا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الجَنَّةِ: فَزِيَادَةُ كَبِدِ حُوتٍ، وَأَمَّا الشَّبَهُ فِي الْوَلَدِ: فَإِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَشِيَ المَرْأَةَ فَسَبَقَهَا ماؤُهُ كانَ الشَّبَهُ لَهُ، وَإِذَا سَبَقَ ماؤُهَا كانَ الشَّبَهُ لَهَا**). قالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ.

ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ اليَهُودَ قَوْمٌ بُهتٌ، إِنْ عَلِمُوا بِإِسْلاَمِي قَبْلَ أَنْ تَسْأَلَهُمْ بَهَتُونِي عِنْدَكَ، فَجَاءَتِ الْيَهُودُ وَدَخَلَ عَبْدُ اللهِ الْبَيْتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيُّ رَجُلٍ فِيكُمْ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ**)؟ قَالُوا: أَعْلَمُنَا، وَابْنُ أَعْلَمِنَا، وَأَخْيَرُنَا، وَابْنُ أَخْيَرِنا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَفَرَأَيْتُمْ إِنْ أَسْلَمَ عَبْدُ اللهِ**)؟ قالُوا: أَعاذَهُ اللهُ مِنْ ذلِكَ! فَخَرَجَ عَبْدُ اللهِ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَقَالُوا: شَرُّنَا، وَابْنُ شَرِّنَا، وَوَقَعُوا فِيهِ. [خ٣٣٢٩]

---

[1] واتە: لەبەر حەرامی خواردنەکەت نەخواردووە؟-و.

[2] واتە: خواردنەکە حەرام نەبوو، لای مەکرووه بوو لەبەر بۆنەکەی، چونکە پێغەمبەر فریشتە و جیبریل دەهاتن بۆ لای-و.

(خ) لە ئەنەسەوە (خوا لێی رازی بێت) وتی: هەواڵی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە بە عەبدوڵای کوڕی سەلام گەیشت، ئەو هات بۆلای پێغەمبەر، پێی وت: من سێ پرسیارت لێدەکەن تەنها پێغەمبەرێك دەیزانێت: سەرەتای نیشانەکانی قیامەت چین؟ یەکەم خواردنێك ئەهلی بەهەشت دەیخۆن چ خواردنێکە؟ لە چ شتێکەوە منداڵ لە باوکی دەچێت و لە چ شتێکەوە لە خاڵوانی دەچێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئێستا جبریل هەواڵی ئەوانەی پێدام**)، وتی: عەبدوڵا وتی: جبریل لە فریشتەکان دوژمنی یەهوودە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**یەکەمین نیشانەی قیامەت ئاگرێکە خەڵکی لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا کۆدەکاتەوە، یەکەمین خواردن ئەهلی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری حووتە**[1]**، شێوەش لە منداڵدا کاتێك پیاو دەچێتە لای ژنەکەی گەر ئاوەکەی پێش ئاوەکەی ژنەکە کەوت منداڵەکە لە خۆی دەچێت، گەر ئاوی ئافرەتەکە پێش ئاوی پیاوەکە کەوت منداڵەکە لە ژنەکە دەچێت**)، عەبدوڵا وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خودای.

پاشان عەبدوڵا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، یەهوود قەومێکی بە بوختانن، گەر بە موسڵمانم بوونم بزانن بەرلەوەی پرسیاری منیان لێبکەیت لای تۆ بوختانم بۆ ئەکەن، یەهود هاتن و عەبدوڵا ش چووە ژوورەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: عەبدوڵای کوڕی سەلام لەناوتاندا چۆن پیاوێکە؟ وتیان: زاناترینی ئێمە و کوڕی زاناترینمانە و چاکترینی ئێمە و کوڕی چاکترینمانە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر عەبدوڵا موسوڵمانبێت ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: خودا لەو کارە پەنای بدات، عەبدوڵا هاتە دەرەوە بۆ لایان و وتی: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، یەهودیەکان وتیان: خراپترینی ئێمە و کوڕی خراپترینی ئێمەیە و کۆمەڵێك شتیان دەربارەی ئەو وت.

---

[1] زیادەی جگەری حووت: پەلێکی ناسکە لە جگەرەکە-و.

## ٥- دەروازەی: یەکەمین منداڵێك لە ئیسلامدا لە دایکبوو

٣٦٠٤- (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما: أَنَّهَا حَمَلَتْ بِعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ، قالَتْ: فَخَرَجْتُ وَأَنَا مُتِمٌّ، فَأَتَيْتُ المدِينَةَ فَنَزَلْتُ قُبَاءً، فَوَلَدْتُ بِقُبَاءٍ، ثمَّ أَتَيْتُ بِهِ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ فَمَضَغَهَا، ثمَّ تَفَلَ فِي فِيهِ، فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ دَخَلَ جَوْفَهُ رِيقُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ حَنَّكَهُ بِالتَّمْرَةِ، ثُمَّ دَعَا لَهُ وَبَرَّكَ عَلَيْهِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَوْلُودٍ وُلِدَ فِي الإِسْلاَمِ، فَفَرِحُوا بِهِ فَرَحاً شَدِيداً؛ لِأَنَّهُمْ قِيلَ لَهُمْ: إِنَّ الْيَهُودَ قَدْ سَحَرَتْكُمْ فَلاَ يُولَدُ لَكُمْ. [خ٥٤٦٩ (٣٩٠٩)/ م٢١٤٦]

**(ق) لە ئەسمای کچی ئەبی بەکرەوە(خوایان لێ رازی بێت) ئەو بە عەبدوڵا کوڕی زوبێر حەملی بۆ پەیدابوو، ئەسما وتی: لە مەککە دەرچووم و کاتی منداڵبوونم نزیك بووبوویەوە، هاتم بۆ مەدینە و لە قوبا دابەزیم لەوێ منداڵەکەم بوو پاشان هێنام بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و منداڵەکەم لە کۆشی دانا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) دەنکە خورمایەکی داواکرد و لەدەمی خۆیدا جوی، پاشان کردییە ناو دەمی منداڵەکەوە، یەکەمین شتێك ڕۆیشتە هەناوی منداڵەکە لیکی پێغەمبەری خودابوو(ﷺ)، پاشان بە خورماکە مەلاشووی هەنوو، پاشان دوعای بۆ کرد و بەرەکەتی بەسەردا باراند، یەکەمین منداڵێك لە ئیسلامدا لە دایکبوو عەبدوڵا بوو، زۆر پێی دڵخۆشبوون، چونکە پێیان وترابوو یەهوود سحریان لێکردوون و منداڵتان نابێت.**

## ٦- دەروازەی: بەروار بە کۆچ

٣٦٠٥- (خ) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: ما عَدُّوا مِنْ مَبْعَثِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَلاَ مِنْ وَفَاتِهِ، ما عَدُّوا إِلاَّ مِنْ مَقْدَمِهِ المدِينَةَ. [خ٣٩٣٤]

**(خ) لە سەهلی کوڕی سەعدەوە وتی: لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) و وەفاتی پێغەمبەرەوە نەیان ژمارد، بەڵکو لە هاتنی بۆ مەدینەوە ژماردیان[1].**

---

[1] واتە: لە کۆچ کردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە-نەك لە ڕەوانەکردنی وەك پێغەمبەر یان وەفات کردنی- تەقویمی کۆچی دامەزرا-و.

## ٧- دەروازەی: نەخۆشکەوتنی هەندێك لە هاوەڵان لە دوای کۆچکردنیان

**٣٦٠٦-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهْ          وَالموْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهْ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ الحُمَّى يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ يَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً          بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ
وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْماً مِيَاهَ مَجَنَّةٍ          وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

وَقَالَ: اللَّهُمَّ الْعَنْ شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَعُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، كما أَخْرَجُونَا مِنْ أَرْضِنَا إِلَى أَرْضِ الْوَبَاءِ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا المَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ. اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الجُحْفَةِ)**.

قَالَتْ: وَقَدِمْنَا المدِينَةَ وَهْيَ أَوْبَأُ أَرْضِ اللهِ، قَالَتْ: فَكَانَ بُطْحَانُ يَجْرِي نَجْلاً. تَعْنِي: مَاءً آجِناً. [خ١٨٨٩/ م١٣٧٦]

**(ق) لە عائشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات بۆ مەدینە ئەبوبەکر و بیلال تووشی تا هاتن، کاتێ تا ئەبوبەکری دادەگرتەوە دەیوت:**

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهْ          وَالموْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهْ

**کاتێك تا لە بیلال دەگێرایەوە دەنگی بە گریان بەرزدەکردەوە و دەیووت:**

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً          بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ
وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْماً مِيَاهَ مَجَنَّةٍ          وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

**هەروەها بیلال وتی: خودایە نەفرەت بکە لە شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و ئومەیەی کوڕی خەلەف وەك چۆن لە زەوی خۆمان دەریانکردین بۆ زەوی نەخۆشی، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودایە، مەدینەمان لا**

خۆشەویست بکە وەك خۆشویستنمان بۆ مەککە یان زیاتر، خودایە، ساع و مودمان[١] بەرەکەت تێبخە و بۆمان ڕاست و دروستبکە تا و ئازاری ئەم شارە بگوێزەرەوە بۆ جوعفە[٢]) عائیشە وتی: هاتین بۆ مەدینە پڕ نەخۆشیترین زەوی خودا بوو، هەروەها وتی: بودحان[٣] ئاوی پیسی لێجاری دەبوو، واتە ئاوی بۆگەن.

## ٨- دەروازەی: دروستکردنی مزگەوتی نەبەوی شەریف

[انظر: ١٠٦٨ وما بعده].

## ٩- دەروازەی: برایەتی نێوان کۆچکەران و سەرخەران

**٣٦٠٧-** (خ) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمْنَا المدِينَةَ آخى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبيعِ، فَقَالَ سَعْدُ بْنُ الرَّبيعِ: إِنِّي أَكْثَرُ الأَنْصَارِ مَالاً، فَأَقْسِمُ لَكَ نِصْفَ مَالِي، وَانْظُرْ أَيَّ زَوْجَتَيَّ هَوِيتَ نَزَلْتُ لَكَ عَنْهَا، فَإِذَا حَلَّتْ تَزَوَّجْتَهَا، قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمنِ: لاَ حَاجَةَ لِي فِي ذلِكَ، هَلْ مِنْ سُوقٍ فِيهِ تِجَارَةٌ؟ قَالَ: سُوقُ قَيْنُقَاعَ، قَالَ: فَغَدَا إِلَيْهِ عَبْدُ الرَّحْمنِ، فَأَتَى بِأَقِطٍ وَسَمنٍ، قَالَ: ثُمَّ تَابَعَ الْغُدُوَّ، فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ عَبْدُ الرَّحْمنِ عَلَيْهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (تَزَوَّجْتَ)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (وَمَنْ). قَالَ: امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: (كَمْ سُقْتَ)؟ قَالَ: زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ نَوَاةً مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ). [خ٢٠٤٨]

**(خ)** له عبدالرحمان کوڕی عەوفەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: کاتێك هاتین بۆ مەدینە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نێوان من و سەعدی کوڕی ڕەبیعدا برایەتی دروستکرد، سەعدی کوڕی ڕەبیع وتی: من لە ناو ئەنصاردا زۆرترین ماڵ و سامانم

---

[١] واتە: کێشانە و پێوانەمان–و.

[٢] جوعفە: دەرەوەی مەدینەیە–و.

[٣] شوێنێکە لە مەدینە–و.

هەیە، نیوەی ماڵ و سامانەکەمت بۆ جیادەکەمەوە، تەماشا بکە کام لە ژنەکانم دڵت دەیگرێت بۆت تەڵاق دەدەم کە عیددەی تەواو بوو مارەی بکە، وتی: عبدالرحمان وتی: پێویستم بەوە نییە، ئایا بازاڕێك هەیە بازرگانی تێدابێت؟ سەعد وتی: بازاڕی قەینوقاع، وتی: عبدالرحمان بەیانی بۆی چوو کەشك و ڕۆنی هێنا، وتی: پاشان بەردەوام بەیانیان دەڕۆیشت بۆ ئەو بازاڕە، زۆری نەخایاند ئەسەری زەردی لەسەر عبدالرحمان دەرکەوت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ژنت هێناوە؟**) وتی: بەڵێ، پێغەمبەر فەرمووی: (**کێیە؟**) عبدالرحمان وتی: ئافرەتێکە لە ئەنصار، پێغەمبەر فەرمووی: (**چەند مارەیت داوە؟**) وتی: کێشی ناوکە خورمایەك لەزێڕ، یان ناوکە خورمایەك لە زێڕ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (**وەلیمەی بۆ بکە با بەمەڕێکیش بێت**).

**٣٦٠٨**– (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم آخَى بَيْنَ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ وَبَيْنَ أَبِي طَلْحَةَ. [م٢٥٢٨]

**(م)** لە ئەنەسەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و ئەبو تەڵحەوە.

## ١٠- دەروازەی: هاوسەرگیری پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەگەڵ عائیشە

**٣٦٠٩**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (رَأَيْتُكِ فِي الْمَنَامِ، يَجِيءُ بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَقَالَ لِي: هذِهِ امْرَأَتُكَ، فَكَشَفْتُ عَنْ وَجْهِكِ الثَّوْبَ فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَقُلْتُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللهِ يُمْضِهِ). [خ٥١٢٥ (٣٨٩٥)/ م٢٤٣٨]

**(ق)** لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: **(لە خەوندا تۆم بینی فریشتەیەك لە پارچەیەك ئاورشمدا تۆی دەهێنا، پێی وتم: ئەوە ژنەکەتە، منیش پۆشاکەکەم لە ڕووت لادا بینیم تۆی، بۆیە وتم ئەگەر ئەمە لەلای خوداوە بێت ڕێکی دەخات).**

**٣٦١٠**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، فَقَدِمْنَا المدِينَةَ، فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَوُعِكْتُ فَتَمَرَّقَ شَعَرِي فَوَفَى جُمَيْمَةً، فَأَتَتْنِي أُمِّي أُمُّ رُومانَ، وَإِنِّي لَفِي أُرْجُوحَةٍ، وَمَعِي صَوَاحِبُ لِي، فَصَرَخَتْ بِي، فَأَتَيْتُهَا، لاَ أَدْرِي مَا تُرِيدُ بِي؟ فَأَخَذَتْ بِيَدِي حَتَّى أَوْقَفَتْنِي عَلَى بَابِ الدَّارِ، وَإِنِّي لأُنْهَجُ حَتَّى سَكَنَ بَعْضُ نَفَسِي، ثُمَّ أَخَذَتْ شَيْئاً مِنْ ماءٍ فَمَسَحَتْ بِهِ وَجْهِي وَرَأْسِي، ثُمَّ أَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْبَيْتِ، فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِنَّ، فَأَصْلَحْنَ مِنْ شَأْنِي، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ضُحى، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. [خ٣٨٩٤/ م١٤٢٢]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) منی مارەکرد و من کچێکی شەش ساڵان بووم، هاتین بۆ مەدینە لە بەنی حاریسی کوڕی خەزرەج دابەزین، تووشی تا هاتم و مووەکانی سەرم هەڵوەرین، پاشان مووەکانی سەرم هاتنەوە، دایکم-ئوم ڕومان- هات بۆ لام، من لەگەڵ چەند هاوەڵێکم لە جۆلانەیەکدا بووم، هاواری لێکردم، منیش هاتم بۆ لای، نەمدەزانی چی لەمن دەوێت، دەستی گرتم تا لەبەردەم دەرگای ماڵەکەدا ڕایگرتم، من هەناسەبڕکێم بوو، تا هەندێك لە هەناسەم هێواش بوویەوە، پاشان هەنێ ئاوی هێنا و ڕوخسار و سەری پێشۆریم، پاشان بردمیە ژوورەوە بۆ ماڵەکە، بینیم کۆمەڵێك ئافرەتی ئەنصار لەماڵەکەدان، وتیان لەسەر خێر و بەرەکەت و لەسەر باشترین چارەنووس، دایکم منی ڕادەستی ئەوان کرد، ئەوانیش کاروباریان ڕێکخستم، ئەوەی جێی سەرسوڕمانم بوو جێشتەنگاو پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی منیان ڕادەستی ئەو کرد، من لەو ڕۆژەدا کچێکی نۆ ساڵانبووم.**

## بەشی چوارەم

## غەزوەی بەدر و ئەوەی بەدوایدا هات

### ١- دەروازەی: پلەوپایەی ئەوانەی لە بەدر ئامادەبوون

**٣٦١١-** (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ عَبْداً لِحَاطِبٍ جَاءَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَشْكُو حَاطِباً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَيَدْخُلَنَّ حَاطِبٌ النَّارَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (كَذَبْتَ! لاَ يَدْخُلُهَا، فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْراً وَالْحُدَيْبِيَةَ). [م٢٤٩٥]

**(م) لە جابرەوە، بەندەیەکی حاتیب هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) سکاڵای هەبوو لەسەر حاتیب و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا حاتیب دەچێتە ناو ئاگرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (درۆدەکەی، ناچێتە ناو ئاگرەوە، ئەو بەدر و حودەیبییەی بینیوە).**

### ٢- دەروازەی: ڕاوێژ بەر لە جەنگی بەدر

**٣٦١٢-** (خ) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: شَهِدْتُ مِنَ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ مَشْهَداً؛ لأَنْ أَكُونَ صَاحِبَهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا عُدِلَ بِهِ، أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَهْوَ يَدْعُو عَلَى الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: لاَ نَقُولُ كما قالَ قَوْمُ مُوسى: اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلاَ، وَلكِنَّا نُقَاتِلُ عَنْ يَمِينِكَ وَعَنْ شِمَالِكَ وَبَيْنَ يَدَيْكَ وَخَلْفَكَ. فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَشْرَقَ وَجْهُهُ وَسَرَّهُ. يَعْنِي: قَوْلَهُ. [خ٣٩٥٢]

**(خ) لە ئیبن مەسعودەوە وتی: ڕووداوێکم لە میقدادی کوڕی ئەسوەد بینی گەر من خاوەنیبم بە هەموو دنیای ناگۆڕمەوە، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوعای دەکرد لە هاوەڵدانەران، وتی: ئێمە ئەوە ناڵێین هۆزەکەی موسا بە موسایان وت: بڕۆ خۆت و**

پەروەردگارت بجەنگن[1]، بەڵکو لە ڕاستەوە و لە چەپتەوە و لەبەردەم و لە دواوە دەجەنگین، پێغەمبەرم بینی(ﷺ) ڕوخساری گەشایەوە و پێی خۆشبوو. واتە: قسەکەی.

**٣٦١٣-** (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَاوَرَ، حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ. فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا.

قَالَ: فَنَدَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم النَّاسَ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْراً. وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ، وَفِيهِمْ غُلاَمٌ أَسْوَدُ لِبَنِي الْحَجَّاجِ، فَأَخَذُوهُ، فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِي سُفْيَانَ وَأَصْحَابِهِ؟ فَيَقُولُ: مَا لِي عِلْمٌ بِأَبِي سُفْيَانَ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ. فَإِذَا قَالَ ذلِكَ، ضَرَبُوهُ. فَقَالَ: نَعَمْ، أَنَا أُخْبِرُكُمْ، هَذَا أَبُو سُفْيَانَ. فَإِذَا تَرَكُوهُ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: مَا لِي بِأَبِي سُفْيَانَ عِلْمٌ، وَلكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فِي النَّاسِ. فَإِذَا قَالَ هَذَا أَيْضاً، ضَرَبُوهُ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَائِمٌ يُصَلِّي. فَلَمَّا رَأَى ذلِكَ انْصَرَفَ، قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَضْرِبُوهُ إِذَا صَدَقَكُمْ، وَتَتْرُكُوهُ إِذَا كَذَبَكُمْ)**.

قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَذَا مَصْرَعُ فُلاَنٍ)** قَالَ: وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ، هَاهُنَا وَهَاهُنَا. قَالَ: فَمَا مَاطَ أَحَدُهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [م١٧٧٩]

**(م) لە ئەنەسەوە، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی هاتنی ئەبی سوفیانی پێگەیشت[2] ڕاوێژی کرد، وتی: ئەبوبەکر قسەی کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پشتی تێکرد، پاشان عومەر قسەی کرد، پێغەمبەر پشتی تێکرد، پاشان سەعدی کوڕی عوبادە وتی: مەبەستت ئێمەیە[3]، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، سوێند بەو کەسەی**

---

(1) مەبەستی ئەم ئایەتە بووە: ﴿ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾﴾ [طه: ٤٢]-و.

(2) ئەو کاتەی ئەبو سوفیان بە کاروانییەکەوە لە شامەوە دەگەڕایەوە بۆ مەککە-و.

(3) پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست ڕا و بۆچوونی ئەنصارییەکان بزانێت بۆ جەنگەکە نەک کۆچکەران، سەعد ئەنصاری بوو-و.

نەفسی منی بەدەستە، گەر فەرمانمان پێ بکەیت بچینە دەریاوە دەچینە ناویەوە، گەر فەرمانمان پێ بکەیت خۆمان تاو بدەین تا دەگەینە "برك الغماد"[1] ئەنجامی دەدەین، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەنگیدایە خەڵکەکە و هەموو ڕۆیشتن تا لە بەدر دابەزین، لەوێ حوشترە ئاوکێشەکانی قورەیش هاتن بۆ لایان، غولامێکی ڕەش پێستی بەنی حەجاجیان تێدابوو گرتیان، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاریان لێ دەکرد دەربارەی ئەبوسوفیان و هاوەڵانی، ئەویش دەیوت هیچ زانیارییەکم نییە دەربارەی ئەبوسوفیان، بەڵام ئەوە ئەبوجەهل و عوتبە و شەیبە و ئومەیەی کوڕی خەلەفن، کاتێ ئەوەی دەوت لێیان دەدا، ئەویش دەیوت: باشە هەواڵتان پێدەدەم ئەوە ئەبوسوفیانە، کاتێ وازیان لێدەهێنا و پرسیاریان لێ دەکرد دەیوت: زانیاریم نییە بە ئەبوسوفیان، بەڵام ئەوە ئەبوجەهل و عوتبە و شەیبە و ئومەیەی کوڕی خەلەفن لەناو خەڵکەکە، کاتێ ئەوەی دەوتەوە دیسان لێیان دەدایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پێوە بوو نوێژی دەکرد، کاتێ ئەوەی بینی سەلامی دایەوە و فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، کاتێ لەگەڵتان ڕاست دەکات لێی دەدەن، کاتێ لەگەڵتان درۆ دەکات وازی لێدەهێنن)**، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە شوێنی کوشتنی فلانە)**، وتی: دەستی لەسەر زەویەکە دادەنا ئا لێرە و ئا لەوێ، وتی: هیچ کام لەوانە لەشوێن دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مردنەکەیان دوورنەکەوتەوە.

## ٣- دەروازەی: دوعای پێش جەنگ

**٣٦١٤**- (خ) عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ فِي قُبَّةٍ: **(اللَّهمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اللَّهمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ اليَوْمِ)** فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَدْ أَلْحَحْتَ عَلَى رَبِّكَ، وَهُوَ فِي الدِّرْعِ، فَخَرَجَ وَهُوَ يَقُولُ ﴿**سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ۝ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ**﴾ [القمر: ٤٥- ٤٦].

---

[1] لە ئێستادا شارێکی سعوودییە(البرك)، دەکەوێتە خوارووی خۆرئاوای مەملەکەی عەرەبی سعوودییەوە، ٥٦٠ کم لە مەککەوە دوورە، لە ژیاننامەی ئەبوبەکردا(خوا لێی رازی بێت) ناوی هاتووە کاتێ دەیەوێ کۆچ بۆ حەبەشە بکات-و.

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە خێمەیەکدا بوو فەرمووی: (خودایە داوای عەهد و بەڵێنت لێدەکەم خودایە گەر بتەوێت لەمڕۆ بە دواوە ناپەرستریێت)، ئەبوبەکر دەستی پێغەمبەری گرت و وتی: بەستە ئەی پێغەمبەری خودا پێداگریت کرد لەسەر پەروەردگارت، ئەو لە دورعێکدا بوو هاتە دەرەوە و ئەو دەیفەرموو: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ۝ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ۝﴾ [القمر: ٤٥- ٤٦].**

▪ وفي رواية: في قبة يوم بدر. [خ٢٩١٥، ٤٨٧٥]

**لە ریوایەتێکدا: لە رۆژی بەدر لە قوبەیەکدا بوو.**

## ٤- دەروازەی: دەسپێکردنی جەنگەکە بە موبارەزە

**٣٦١٥-** (خ) عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ يَجْثُو بَيْنَ يَدَيِ الرَّحْمَنِ لِلْخُصُومَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ قَيْسٌ: وَفِيهِمْ نَزَلَتْ: ﴿**هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ**﴾ [الحج: ١٩] قَالَ: هُمُ الَّذِينَ بَارَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ: عَلِيٌّ وَحَمْزَةُ وَعُبَيْدَةُ، وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَعُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ. [خ٤٧٤٤ (٣٩٦٥)]

**(خ) لە قەیسی کوڕی عوبادەوە، لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە(خوای لێ رازی بێت)، وتی: من یەکەمین کەسم لە رۆژی قیامەت لە بەردەمی رەحماندا چۆك دادەدەم بۆ نەیاریی، قەیس وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوان دابەزێنراوە: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾ [الحج: ١٩]، وتی: ئەوانە بریتین لەو کەسانەی لە رۆژی بەدر موبارەزەیان کرد، عەلی و حەمزە و عوبەیدە بەرامبەر بە شەیبەی کوڕی رەبیعە و عوتبەی کوڕی رەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە.**

## ٥- دەروازەی: وەسفی گشتی جەنگەکە

**٣٦١٦-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عباس قَالَ: حدثني عمر بن الخطاب قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ نَظَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ، وَأَصْحَابُهُ ثَلَاثُمِائَةٍ وَتِسْعَةَ عَشَرَ

رَجُلاً. فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْقِبْلَةَ، ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ: (**اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي. اللَّهُمَّ آتِ مَا وَعَدْتَنِي. اللَّهُمَّ إِنْ تُهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدْ فِي الأَرْضِ**) فَمَا زَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ، مَادّاً يَدَيْهِ، مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْهِ. فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ، وَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَذَاكَ مُنَاشَدَتَكَ رَبَّكَ، فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ. فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿**إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ٩**﴾ [الأنفال: ٩] فَأَمَدَّهُ اللهُ بِالْمَلاَئِكَةِ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ، إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ، وَصَوْتَ الْفَارِسِ يَقُولُ: أَقْدِمْ حَيْزُومُ، فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ أَمَامَهُ فَخَرَّ مُسْتَلْقِياً، فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ، وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ، فَاخْضَرَّ ذلِكَ أَجْمَعُ. فَجَاءَ الأَنْصَارِيُّ فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَقَالَ: (**صَدَقْتَ. ذلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ**) فَقَتَلُوا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ، وَأَسَرُوا سَبْعِينَ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَلَمَّا أَسَرُوا الأُسَارَى، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: (**مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلاَءِ الأُسَارَى**)؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا نَبِيَّ اللهِ، هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ، أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً، فَتَكُونَ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ، فَعَسَى اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ لِلإِسْلاَمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطَّابِ**؟) قُلْتُ: لاَ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَرَى الَّذِي رَأَى أَبُو بَكْرٍ، وَلَكِنِّي أَرَى أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ، فَتُمَكِّنَ عَلِيّاً مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ، وَتُمَكِّنِّي مِنْ فُلاَنٍ ـ نَسِيباً لِعُمَرَ ـ فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ، فَإِنَّ هَؤُلاَءِ أَئِمَّةُ الْكُفْرِ وَصَنَادِيدُهَا. فَهَوِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ، وَلَمْ يَهْوَ مَا قُلْتُ.

فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ يَبْكِيَانِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنِي مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَبْكِي أَنْتَ وَصَاحِبُكَ؟ فَإِنْ وَجَدْتُ بُكَاءً بَكَيْتُ، وَإِنْ لَمْ أَجِدْ بُكَاءً تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمُ الْفِدَاءَ، لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هذِهِ الشَّجَرَةِ**). شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. وَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿**مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ**

يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِۚ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًاۚ﴾ [الأنفال: ٦٧ - ٦٩] فَأَحَلَّ اللهُ الْغَنِيمَةَ لَهُمْ. [م١٧٦٣]

**(م)** لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە وتی: عومەری کوڕی خەتاب بۆی باسکردم و وتی: کاتێ ڕۆژی بەدر هاتە بەرەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەماشای هاوەڵدانەرانی کرد ئەوان هەزار کەس بوون، هاوەڵانی پێغەمبەر سێسەد و نۆزدە پیاو بوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی لە قیبلە کرد و هەردوو دەستی بەرز کردەوە، داوای لە پەروەردگاری دەکرد و دەیفەرموو: (**خودایە، ئەوەی بەڵێنت پێدابووم پێم ببەخشە، خودایە، گەر ئەم کۆمەڵە لە ئەهلی ئیسلام تیاببەیت لە زەویناپەرستریێت**)، بەردەوام داوای لە پەروەردگاری دەکرد و دوو دەستی بەرز دەکردەوە و ڕوو بە قیبلە بوو، تا عەباکەی لەسەر دوو شان کەوتە خوارەوە، ئەبوبەکر هات بۆ لای و عەباکەی هەڵگرتەوە و خستییەوە سەر دوو شانی، پاسان لە دوایەوە وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پەروەردگارت داواکەی تۆ وەڵام دەداتەوە، ئەو بەڵێنەی پێی دابوویت بۆت دەهێنێتە دی، خودا (عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ۝٩﴾ [الأنفال: ٩]، خودا بە فریشتەکان پشتوانی کرد.

ئیبن عەباس دەڵێت: لەو ڕۆژەدا کاتێ پیاوێ لە موسوڵمانان تووشی تەنگانە دەهات لە ڕووبەڕووبوونەوەی پیاوێکی هاوەڵدانەر لە بەردەمیدا گوێی لە لێدانی قەمچی بوو، لەسەریەوە گوێی لە دەنگی شۆرەسوارێك بوو دەیوت: "حەیزووم[1] پێشکەوە" تەماشای هاوەڵدانەرەکەی دەکرد لە بەردەمی لەسەر پشت تەخت بووبوو، تەماشای دەکرد و دەیبینی لووتی: نیشانە کرابوو و ڕووخساری بەهۆی لێدانی قەمچیەکەوە شەقی بردبوو، ئەو لێدانە هەموو شوێنەکەی سەوز کرد بوو[2]،

---

[1] حەیزووم: ناوی ئەسپی فریشتەکە بووە–و.

[2] واتە: شوێنەکەی بە کیماو سەوز بوو بوو–و.

ئەنصارییەك هات و بۆ پێغەمبەری خودای(ﷺ) باس کرد، پێغەمبەر فەرمووی: **(راست دەکەیت، ئەوە کۆمەکی ئاسمانی سێیەم بوو)**، لەو ڕۆژەدا حەفتایان لێ کوژرا و حەفتایان لێ بەدیلگیرا.

ئیبن عەباس وتی: کاتێك دیلەکان بە دیلگیران پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە ئەبوبەکر و عومەری فەرموو: **(دەربارەی ئەو دیلانە چی دەڵێن؟)**، ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە ئامۆزا و عەشرەتمانن، پێمباشە فیدیەیان لێوەربگریت، فیدیەکە دەبێتە هێز بۆ ئێمە دژ بە بێباوەڕان، بەڵکو خوداش هیدایەتیان بدات بۆ ئیسلام، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەی کوڕی خەتاب ئەی تۆ چی دەڵێیت؟)**، وتم: نا سوێند بەخودا، ئەی پێغەمبەری خودا، من ئەو بۆچوونەم نییە، ئەبوبەکر هەیەتی، بەڵکو پێم باشە مۆڵەتمان بدەیت لەگەردنیان بدەین، ڕێگە بە عەلی بدە لە گەردنی عەقیل بدات، ڕێگە بە من بدە لە فلان بدەم–خزمێکی عومەر بوو– منیش لە گەردنی دەدەم، ئەوانە ئیمامانی بێباوەڕانن و سەرانی بێباوەڕانن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆچوونەکەی ئەبوبەکری وەرگرت و بە لای بۆچوونەکەی مندا نەهات.

بۆ سبەینێ هاتم پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکرم بینی دانیشتبوون و دەگریان، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، هەواڵم پێ بدە تۆ و هاوەڵەکەت بۆچی دەگرین؟ گەر گریانم بینی دەگریەم گەر گریانم نەبینی بۆ گریانەکەی ئێوە خۆم دەهێنمە گریان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بۆ ئەوە دەگریم هاوەڵانت دەربارەی فیدیە بۆ منیان خستە ڕوو، نزیکتر لەو درەختە سزای ئەوانەم بۆ خرایە ڕوو)**، درەختێکی نزیك بوو لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، خودا (عز وجل) ئایەتی دابەزاند: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾، تا ئایەتی: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا﴾ [الأنفال: ٦٧ ـ ٦٩]، خودا غەنیمەتی بۆیان حەڵاڵ کرد.

**٣٦١٧**– (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بُسَيْسَةَ عَيْناً يَنْظُرُ مَا صَنَعَتْ عِيرُ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَ وَمَا فِي الْبَيْتِ أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ـ قَالَ: لاَ أَدْرِي مَا اسْتَثْنَى بَعْضَ نِسَائِهِ ـ قَالَ: فَحَدَّثَهُ الْحَدِيثَ. قَالَ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ

صلّى الله عليه وسلّم فَتَكَلَّمَ، فَقَالَ: (**إِنَّ لَنَا طَلِبَةً، فَمَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِراً فَلْيَرْكَبْ مَعَنَا**) فَجَعَلَ رِجَالٌ يَسْتَأْذِنُونَهُ فِي ظُهْرَانِهِمْ فِي عِلْوِ الْمَدِينَةِ. فَقَالَ: (**لاَ، إِلاَّ مَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِراً**).

فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابُهُ، حَتَّى سَبَقُوا الْمُشْرِكِينَ إِلَى بَدْرٍ، وَجَاءَ الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يُقَدِّمَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَى شَيْءٍ حَتَّى أَكُونَ أَنَا دُونَهُ**) فَدَنَا الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ**).

قَالَ: يَقُولُ عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ الأَنْصَارِيُّ: يَا رَسُولَ اللهِ، جَنَّةٌ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضُ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) قَالَ: بَخٍ بَخٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍ بَخٍ**) قَالَ: لاَ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِلاَّ رَجَاءَةَ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِهَا، قَالَ: (**فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا**). فَأَخْرَجَ تَمَرَاتٍ مِنْ قَرْنِهِ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُنَّ. ثُمَّ قَالَ: لَئِنْ أَنَا حَيِيتُ حَتَّى آكُلَ تَمَرَاتِي هَذِهِ، إِنَّهَا لَحَيَاةٌ طَوِيلَةٌ. قَالَ: فَرَمَى بِمَا كَانَ مَعَهُ مِنَ التَّمْرِ، ثُمَّ قَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ. [م١٩٠١]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوسەیسەی ڕەوانەکرد وەك چاودێر تا وردبیێتەوە و بزانێت چی دەکەن، ئەو هات و لە ماڵەکەدا هیچ کەسی تێدانەبوو جگە لە من و پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەنەس وتی: نازانم هەندێك لە ژنەکانی هەڵاوارد یان نە[1]، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە دەرەوە و قسەی کرد و فەرمووی: (داواکاریەکمان هەیە هەرکەس وڵاخی سواریەکەی ئامادەیە با لەگەڵمان سواربێت)، هەندێك لە پیاوان داوای مۆڵەتیان لێ دەکرد بۆ وڵاخی سواریەکانیان کە لە بەرزاییەکانی مەدینە بوون[2]، پێغەمبەر فەرمووی: (نەخێر، تەنها ئەو کەسانەی کە وڵاخی سواریەکانیان ئامادەیە).**

**پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵانی ڕۆیشتن تا پێشی هاوەڵدانەران کەوتن لە بەدر، هاوەڵدانەران هاتن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەس لە ئێوە بۆ شتێك پێشم**

---

[1] واتە: نازانم ئایا بۆ قسە نهێنییەکەی بۆ پێغەمبەر ژنەکانی جیا کردەوە یان نە—و.

[2] واتە: داوایان دەکرد پێغەمبەر مۆڵەتیان بدات بچن لە بەرزاییەکانی مەدینە وڵاخی سوارییەکانیان بهێننەوە و لەگەڵ پێغەمبەر برۆن بۆ ئەو کارە—و.

**نەکەوێت تا من پێشی دەکەوم)**، هاوەڵدانەران نزیك بوونەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**هەستن بۆ بەهەشتێك پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوییە**).

وتی: عومەیری کوڕی حومامی ئەنصاری دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا، بەهەشتێك پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوییە؟ فەرمووی: (**بەڵێ**)، وتی: بەخ، بەخ[1]، پێغەمبەری خودا(ﷺ)فەرمووی: (**چی وا لە تۆ دەکات بڵێی بەخ، بەخ؟**)، وتی: نا[2] سوێند بەخودا، ئەی پێغەمبەری خودا، تەنها ڕجایەکە دەمەوێت لە ئەهلی بەهەشت بم، پێغەمبەر فەرمووی: (**تۆ لە ئەهلی بەهەشتی**)، چەند دەنکە خورمایەکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و دەیخواردن، پاشان وتی: گەر من بژیم تا ئەم دەنکە خورمانە دەخۆم ژیانێکی دوور و درێژە، وتی: ئەوەی لە لای بوو لە خورما فڕێیدا، پاشان دژ بەوان جەنگا تا کوژرا.

## ٦- دەروازەی: ئامادەبوونی فریشتە لە جەنگی بەدر

**٣٦١٨**- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ يَوْمَ بَدْرٍ: (هذَا جِبْرِيلُ، آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ، عَلَيْهِ أَدَاةُ الحَرْبِ). [خ٣٩٩٥]

**(خ)** لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەوە جبریلە سەری ئەسپەکەی خۆی گرتووە ئامرازی جەنگی لەسەرە**).

## ٧- دەروازەی: کوشتنی ئەبی جەهل

**٣٦١٩**- (ق) عَنْ عبدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ قالَ: بَيْنَا أَنَا وَاقِفٌ فِي الصَّفِّ يَوْمَ بَدْرٍ، فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي وَشِمَالِي، فَإِذَا أَنَا بِغُلاَمَيْنِ مِنَ الأَنْصَارِ، حَدِيثَةٍ أَسْنَانُهُمَا، تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ بَيْنَ أَضْلَعَ مِنْهمَا،

---

[1] وشەیەکە بۆ جوانی و قەشەنگی شتێکت بەکاردەهێنرێت-و.

[2] نا(لا): هەرکات لە زمانی عەرەبیدا (لا) دەچێتە سەر سوێند پێ خوراو، وەك (لا والله)، (لا أقسم بهذا البلد) بۆ تەئکیدی زیاتر و پێداگرییە لە سوێندەکە-و.

فَغَمَزَنِي أَحَدُهُمَا فَقَالَ: يَا عَمِّ هَلْ تَعْرِفُ أَبَا جَهْلٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، مَا حَاجَتُكَ إِلَيْهِ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ يَسُبُّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَئِنْ رَأَيْتُهُ لاَ يُفَارِقُ سَوَادِي سَوَادَهُ حَتَّى يَمُوتَ الأَعْجَلُ مِنَّا، فَتَعَجَّبْتُ لِذلِكَ، فَغَمَزَنِي الآخَرُ، فَقَالَ لِي مِثْلَهَا.

فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ نَظَرْتُ إِلَى أَبِي جَهْلٍ يَجُولُ فِي النَّاسِ، قُلْتُ: أَلاَ، إِنَّ هَذَا صَاحِبُكُمَا الَّذِي سَأَلْتُمَانِي، فَابْتَدَرَاهُ بِسَيْفَيْهِمَا، فَضَرَبَاهُ حَتَّى قَتَلاَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرَاهُ، فَقَالَ: (**أَيُّكُمَا قَتَلَهُ**)؟ قَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: أَنَا قَتَلْتُهُ، فَقَالَ: (**هَلْ مَسَحْتُمَا سَيْفَيْكُمَا**)؟ قَالاَ: لاَ، فَنَظَرَ فِي السَّيْفَيْنِ، فَقَالَ: (**كِلاَكُمَا قَتَلَهُ، سَلَبُهُ لِمُعَاذِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الجَمُوحِ**). وَكَانَا مُعَاذَ بْنَ عَفْرَاءَ وَمُعَاذَ بْنَ عَمْرِو بْنِ الجَمُوحِ. [خ٣١٤١/ م١٧٥٢]

**(ق)** له عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە، وتی: له ڕۆژی بەدر من له ریزێك وەستابووم تەماشای لای ڕاست و لای چەپی خۆم کرد، بینیم دوو غولام له ئەنصار–هێشتا گەنج بوون، ئاواتم خواست وەك ئەوان بەهێز بوومایە– یەکێکیان چاوی لێداگرتم و وتی: ئەی مامم، ئەبوجەهل دەناسی؟ وتم: بەڵێ، برازای خۆم، چ پێویستییەکەت بە ئەوە؟ وتی: هەواڵم پێدراوە ئەو جنێوی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەدا، سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە، گەر ببینم سێبەرم له سێبەری جیانابێتەوە تا ئەو پێش لە ئێمە دەمرێت، لەوە سەرم سوڕما، ئەوی تریان چاوی لێداگرتم و هەمان شتی پێ وتم.

زۆر نەمامەوە تەماشام کرد ئەبوجەهل بەناو خەڵکەکەدا دێت و دەچێت، وتم: دەزانن هاوەڵەکەی ئێوە–کە پرسیارتان دەربارەی دەکرد– بریتییە لەو پیاوە، هەردووکیان بە شمشێرەکانیان پەلاماریاندا و لێیاندا تا کوشتیان، پاشان ڕۆیشتن بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەواڵیان پێدا، پێغەمبەر فەرمووی: **(کامتان کوشتان)؟**) هەریەکەیان دەیوت من کوشتومە، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئایە شمشێرەکەی خۆتان سڕیوە)؟**)، وتیان: نەخێر، تەماشای دوو شمشێرەکەی کردن و فەرمووی: **(هەردووکتان کوشتوتانە، شتاکانی**[1] **بۆ موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەموحە)** ئەو دوو غولامە بریتی بوون لە موعازی کوڕی عەفرا و موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەموع.

---

[1] مەبەست شمشێر و قەڵغان و هەر شتێکی ترە لە ئەبو جەهلەوە بەجێمابوو–و.

## ٨- دەروازەی: وەستانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەسەر بیری قولەیب

**٣٦٢٠**- (ق) عَنْ أَبِي طَلْحَةَ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بِأَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلاً مِنْ صَنَادِيدَ قُرَيْشٍ، فَقُذِفُوا في طَوِيٍّ مِنْ أَطْوَاءِ بَدْرٍ خَبِيثٍ مُخْبِثٍ. وَكَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، فَلَمَّا كانَ بِبَدْرٍ الْيَوْمَ الثَّالِثَ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا، ثُمَّ مَشى، وَاتَّبَعَهُ أَصْحَابُهُ وَقَالُوا: ما نُرَى يَنْطَلِقُ إِلاَّ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ، حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ، فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ، وَأَسْمَاءِ آبَائِهِمْ: **(يَا فُلاَنُ ابْنَ فُلاَنٍ! وَيَا فُلاَنُ ابْنَ فُلاَنٍ! أَيَسُرُّكُمْ أَنَّكُمْ أَطَعْتُمُ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا ما وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّاً، فَهَلْ وَجَدْتُمْ ما وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقّاً؟)**. قالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ما تُكَلِّمُ مِنْ أَجْسَادٍ لاَ أَرْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ ما أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ)**. [خ٣٩٧٦ (٣٠٦٥)/ م٢٨٧٥]

**(ق)** لە ئەبی تەڵحەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی بەدر فەرمانی کرد بیست و چوار پیاو لەسەرانی قورەیش فڕێبدرێنە بیرێك لە بیرە هەڵچنراوەکانی بەدر، پیس و پیسکەر[1]، پێغەمبەر کاتێ بەسەر کۆمەڵێکدا سەردەکەوت لەمەیدانەکە سێ شەو دەمایەوە، کە لە بەدر بوو ڕۆژی سێیەم فەرمانی کرد وڵاخی سواریەکەیان بۆ هێنا و شتومەکەکانی لێنا و پاشان ڕۆیشت، هاوەڵانی شوێنی کەوتن و وتیان دەبێت بۆ هەندێك لە پێویستییەکانی خۆی بڕوات، ڕۆیشت تا لەسەر لێواری بیرەکە وەستا و بەناوی باب و باپیرانیان بانگی لێدەکردن و دەیفەرموو: **(ئەی فلانی کوڕی فلان و ئەی فلانی کوڕی فلان، ئایا پێتان خۆشبوو گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی بکەن، ئەوەی پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابووین ئێمە بەحەق بینیمانەوە، ئایا ئەوەی پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوون بەحەق بینیتانەوە)** وتی: عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، قسە لەگەڵ کۆمەڵێك جەستەدا دەکەیت ڕۆحیان تێدا نییە! پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ئێوە باشتر لەوان ئەو قسانە نابیستن)**.

---

[1] واتە: بیرەکە بۆ خۆی پیس بوو و پیسکەریش بوو-و.

**٣٦٢١**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: إِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّهُمْ لَيَعْلَمُونَ الآنَ أَنَّ ما كنْتُ أَقُولُ حَقٌّ**). وَقَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿**إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ**﴾ [النمل: ٨٠].
[خ١٣٧١/ م٩٣٢]

**(ق) لە عائیشەوە(خوای لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوان ئێستا دەزانن ئەوەی من دەموت حەقە)، خودا سوبحان و تعالی ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾** [النمل: ٨٠].

## ٩- دەروازەی: فیدیەی دیلەکان

**٣٦٢٢**- (خ) عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ رِجَالاً مِنَ الأَنْصَارِ، اسْتَأْذَنُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالُوا: ائْذَنْ لَنا فَلْنَتْرُكْ لِابْنِ أُخْتِنَا عَبَّاسٍ فِدَاءَهُ، فَقَالَ: (**لاَ تَدَعُونَ مِنْهُ دِرْهَماً**).
[خ٢٥٣٧]

**(خ) لەئەنەسەوە(خوا لێ ڕازی بێت): پیاوانێك لە ئەنصار داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کردو وتیان مۆڵەتمان بدە فیدیەی خوشکەزاکەمان عەباس[1] وازلێبهێنین، پێغەمەبەر فەرمووی: (درهەمێکی وازلێمەهێنن).**

**٣٦٢٣**- (خ) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ فِي أُسَارَى بَدْرٍ: (**لَوْ كانَ الْمُطْعِمُ بْنُ عَدِيٍّ حَيّاً، ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هؤُلاَءِ النَّتْنَى، لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ**). [خ٣١٣٩]

**(خ) لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە(خوای لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دیلەکانی بەدر فەرمووی: (گەر موتعیمی کوڕی عەدی زیندوو بوایە و پاشان قسەی لەگەڵ بکردبام دەربارەی ئەو بۆگەنانە[2]، بۆ ئەو وازم لێ دەهێنان).**

---

(١) واتە: بۆ هاوەڵدانەرە بەدیلگیراوەکان کە هاوەڵدانان و بێباوەڕی و جەنگان دژ بە خودا و پێغەمبەر بۆگەنی کردبوون–و.

(٢) واتە: عەبدولای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول، سەرکردەی دووڕووان–و.

## ١٠- دەروازەی: ژمارەی ئەهلی بەدر

**٣٦٢٤-** (خ) عَنِ الْبَرَاءِ قالَ: اسْتُصْغِرْتُ أَنَا وَابْنُ عُمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ المهَاجِرُونَ يَوْمَ بَدْرٍ نَيِّفاً عَلَى سِتِّينَ، وَالأَنْصَارُ نَيِّفاً وَأَرْبَعِينَ وَمِائَتَيْنِ. [خ٣٩٥٦ (٣٩٥٥)]

**(خ) لە بەرائەوە وتی: من و ئیبن عومەر لەڕۆژی بەدر بە بچووك تەماشاكراین[١]، كۆچكەران لە ڕۆژی بەدر شەست و ئەوەندە كەسبوون، ئەنصاریش دووسەد و چل و ئەوەندە كەسبوون.**

## ١١- دەروازەی: دەركەوتنی دووڕوویی بە ڕووالەت موسوڵمانبوونی ئیبن ئوبەی[٢]

**٣٦٢٥-** (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ، عَلَى قَطِيفَةٍ فَدَكِيَّةٍ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَرَاءَهُ، يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الحَارِثِ بْنِ الخَزْرَجِ، قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ. قالَ: حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَإِذَا فِي الْمَجْلِسِ أَخْلاَطٌ مِنَ المسْلِمِينَ وَالمشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ، وَالْيَهُودِ وَالمسْلِمينَ، وَفِي الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ.

فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ، خَمَّرَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ، ثُمَّ قالَ: لاَ تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا، فَسَلَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْهِمْ ثُمَّ وَقَفَ، فَنَزَلَ فَدَعاهُمْ إِلَى اللهِ، وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ: أَيُّهَا المرْءُ! إِنَّهُ لاَ أَحْسَنَ مِمَّا تَقُولُ إِنْ كانَ حَقًّا، فَلاَ تُؤْذِنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا، ارْجِعْ إِلَى رَحْلِكَ، فَمَنْ جاءَكَ فَاقْصُصْ عَلَيْهِ.

فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ! فَاغْشَنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا، فَإِنَّا نُحِبُّ ذلِكَ. فَاسْتَبَّ المسْلِمُونَ وَالمشْرِكُونَ وَاليَهُودُ حَتَّى كادُوا يَتَثَاوَرُونَ، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَنُوا.

---

[١] **واتە: بە منداڵ دانراین-و.**

[٢] **واتە: بیرەکە بۆ خۆی پیس بوو و پیسکەریش بوو-و.**

ثم رَكِبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم دَابَّتَهُ، فَسَارَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا سَعْدُ أَلَمْ تَسْمَعْ ما قالَ أَبُو حُبَابٍ . يُرِيدُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ . قالَ: كَذَا وَكَذَا**). قالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اعْفُ عَنْهُ، وَاصْفَحْ عَنْهُ، فَوَالَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ، لَقَدْ جاءَ اللهُ بِالْحَقِّ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ، لَقَدِ اصْطَلَحَ أَهْلُ هذِهِ الْبُحَيْرَةِ عَلَى أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ، فَلَمَّا أَبَى اللهُ ذلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ اللهُ شَرِقَ بِذلِكَ، فَذلِكَ فَعَلَ بِهِ ما رَأَيْتَ. فَعَفَا عَنْهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم.

وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنِ المُشْرِكِينَ وَأَهْلِ الْكِتَابِ كما أَمَرَهُمُ اللهُ، وَيَصْبِرُونَ عَلَى الأَذى، قالَ اللهُ عزّ وجل: ﴿**وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا**﴾ الآيَةَ [آل عمران: ١٨٦]، وَقَالَ اللهُ: ﴿**وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم**﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ [البقرة: ١٠٩].

وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَتَأَوَّلُ الْعَفْوَ ما أَمَرَهُ اللهُ بِهِ، حَتَّى أَذِنَ اللهُ فِيهِمْ، فَلَمَّا غَزَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَدْراً، فَقَتَلَ اللهُ بِهِ صَنَادِيدَ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، قالَ ابْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ المُشْرِكِينَ وَعَبَدَةِ الأَوْثَانِ: هَذَا أَمْرٌ قَدْ تَوَجَّهَ، فَبَايَعُوا الرَّسُولَ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الإِسْلاَمِ فَأَسْلَمُوا. [خ٤٥٦٦ (٢٩٨٧)/ م١٧٩٨]

**(ق) لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(خوایان لـێ ڕازی بێـت)، پێغەمبـەر(ﷺ) سـواری گوێدرێژێك بووبوو پارچە قوماشێکی قەیفەی فەدەکی لەسـەر بـوو، ئوسـامەی کـوڕی زەیدی لە پاشکۆی سوار کرد بوو، سەردانی نەخۆشی سەعدی کوڕی عوبادەی دەکرد لەبەنی حاریسی کوڕی خەزرەج، پێش ڕووداوی بـەدر، وتـی: تـا بـەپاڵ مەجلیسـێکدا تێپەری عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی تێدابوو، ئەوەش بەرلـەوەی عەبـدوڵای کوڕی ئوبەی خۆی ڕادەست بکات[1]، مەجلیسەکە تێکـەڵاوێك بـوو لـە موسـوڵمانان و هاوەڵداران، بت پەرستان، و یەهوود و موسوڵمانان، لە مەجلیسەکەدا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی تێدابوو.**

---

[1] واتە: بە ڕواڵەت موسڵمانبوون نیشان بدات–و.

کاتێ تەپوتۆزی وڵاخی سواریەکە[1] بەسەر مەجلیسەکەدا هات، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بە عەباکەی لووتی خۆی گرت، پاشان وتی: تەپوتۆزمان بەسەردا مەکەن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەلامی لێکردن و پاشان وەستا و دابەزی و بانگی کردن بۆلای خودا و قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وتی: هۆ کابرا، هیچ شت لەمە باشتر نییە ئەگەر حەقبێت، بۆیە لە مەجلیسەکانمان بەمە[2] ئازارمان مەدە، بگەڕێرەوە بۆلای وڵاخی سواریەکەت، هەر کەس هات بۆلات بەسەریدا بخوێنەرەوە.

عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە وتی: بەڵکو ئەی پێغەمبەری خودا، بەو قورئانە وەرە بۆ مەجلیسەکانمان، ئێمە ئەوەمان پێخۆشە، موسوڵمانان و هاوەڵدانەران و یەهوود بۆیەکتر ڕاپەڕین تا خەریکبوو جەنگان ڕوویدات، بەردەوام پیغەمبەر(ﷺ) ئارامی دەکردنەوە تا بێدەنگ بوون.

پاشان سواری وڵاخی سواریەکەی بوو ڕۆیشت، تا چوو بۆ لای سەعدی کوری عوبادە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **(ئەی سەعد، نەتبیست ئەبو حوباب چی وت–** مەبەستی عەبدولا کوڕی ئوبەی بوو– **ئاواو ئاوای وت)**، سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا لێی ببوورە و چاوپۆشی لێبکە، سوێند بەو کەسەی کتێبی بۆ سەر تۆ دابەزاندووە، خودا ئەو حەقەی هێنا بۆ سەر تۆی دابەزاندووە، ئەهلی ئەم شارە لەسەر ئەوە پێکهاتبوون تاج لەسەر ئەو بنێن و بیکەن بە مەلیك، کاتێ خودا بەو حەقەی بەتۆی داوە ئەو کارەی بۆ ئەو نەویست حەسودی دەبات، ئەوەش وادەکات ئەو کارە ئەنجام بدات کە لێتبینی، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێی بوورا.

پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە هاوەڵدانەران و ئەهلی کیتاب خۆش دەبوون وەك چۆن خودا فەرمانی پێکردبوون ئارامیان دەگرت لەسەر ئازاریان خودا(عز وجل) فەرمووی: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى

---

[1] واتە: گوێدرێژەکە–و.

[2] واتە: بە خوێندنەوەی قورئان بەسەرماندا–و.

كَثِيرًاۚ﴾ [آل عمران: ١٨٦]، هەروەها فەرمووی: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ [البقرة: ١٠٩]. تا كۆتایی ئایەتەكە.

پێغەمبەر(ﷺ) تا خودا فەرمانی پێ دەكرد لێبووردنی پێش دەخست، هەتا خودا مۆڵەتی دا لەواندا، كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) غەزوەی بەدری ئەنجامدا و خودا بە ئەو سەرانی بێباوەڕی قورەیشی كوشت، ئیبن ئوبەی كوڕی سەلول و ئەوانەی لەگەڵیبوون لە هاوەڵدانەران و بتپەرستان وتیان ئەمە كارێكە سەرەتاكەی دەركەوتووە، بۆیە بەیعەتیان كرد بە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئیسلام و خۆیان ڕادەست كرد.



# بەشی پێنجەم

## غەزوەی ئوحد و ئەوەی بەدوایدا هات

### ١- دەروازەی: و ڕاوێژ و گەڕانەوەی دووڕوان

**٣٦٢٦-** (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قالَ: لَمَا خَرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى أُحُدٍ، رَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ خَرَجَ مَعَهُ، وَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِرْقَتَيْنِ: فِرْقَةٌ تَقُولُ: نُقَاتِلُهُمْ، وَفِرْقَةٌ تَقُولُ: لاَ نُقَاتِلُهُمْ، فَنَزَلَتْ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ﴾[النساء: ٨٨] وَقَالَ: (**إِنَّهَا طَيِّبَةُ، تَنْفِي الذُّنُوبَ، كما تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الْفِضَّةِ**). [خ٤٠٥٠ (١٨٨٤)/ م٢٧٧٦]

**(ق) لە زەیدی کوڕی سابیتەوە (خوای لێڕازی بێت)، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ ئوحد خەڵکانێك کە لەگەڵی دەرچووبوون گەڕانەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون بە دوو دەستە: دەستەیەك دەیانوت دژ بەوان بجەنگین، دەستەیەکتر دەیانوت دژ بەوان نەجەنگین، ئایەت دابەزی:** ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ﴾[النساء: ٨٨]**، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە مەدینەیە، گوناهان دەسڕێتەوە، وەك چۆن ئاگر پیسی زیو لادەبات).**

**٣٦٢٧-** (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَخَذَ سَيْفاً يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: (**مَنْ يَأْخُذُ مِنِّي هَذَا**)؟ فَبَسَطُوا أَيْدِيَهُمْ، كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ يَقُولُ: أَنَا، أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ يَأْخُذُهُ بِحَقِّهِ**)؟ قَالَ: فَأَحْجَمَ الْقَوْمُ، فَقَالَ سِمَاكُ بْنُ خَرَشَةَ، أَبُو دُجَانَةَ: أَنَا آخُذهُ بِحَقِّهِ. قَالَ: فَأَخَذَهُ فَفَلَقَ بِهِ هَامَ الْمُشْرِكِينَ. [م٢٤٧٠]

**(م) لەئەنەسەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی ئوحد شمشێرێکی گرت و فەرمووی: (کێ ئەم شمشێرەم لێ دەگرێت)؟ هەموو دەستیان بڵاوکردەوە هەر مرۆڤێك لەوان دەیوت من، من، پێغەمبەر فەرمووی: (کێ بە حەقی خۆی لێم**

وەردەگرێت)؟، وتی: کۆمەڵێك دەستیان کێشایەوە، سیماکی کوڕی خەرەشە- ئەبودوجانە- وتی: من بەحەقی خۆی لێت وەردەگرم، وتی: وەریگرت و سەری هاوەڵدانەرانی پێ دەکرد بە دوو لەتەوە.

## ٢- دەروازەی: وەسفی جەنگەکە

**٣٦٢٨-** (خ) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عازِبٍ رضي الله عنهما قالَ: جَعَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الرَّجَّالَةِ يَوْمَ أُحُدٍ ـ وَكَانُوا خَمْسِينَ رَجُلاً ـ عَبْدَ اللهِ بْنَ جُبَيْرٍ فَقَالَ: (**إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ، فَلاَ تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ، وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا الْقَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ، فَلاَ تَبْرَحُوا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ**). فَهَزَمُوهُمْ، قَالَ: فَأَنَا وَاللهِ رَأَيْتُ النِّسَاءَ يَشْتَدِدْنَ، قَدْ بَدَتْ خَلاَخِلُهُنَّ وَأَسْوُقُهُنَّ، رَافِعَاتٍ ثِيَابَهُنَّ.

فَقَالَ أَصْحَابُ عَبْدِ اللهِ بْنِ جُبَيْرٍ: الْغَنِيمَةَ أَيْ قَوْمِ الْغَنِيمَةَ، ظَهَرَ أَصْحَابُكُمْ فَمَا تَنْتَظِرُونَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ جُبَيْرٍ: أَنَسِيتُمْ ما قالَ لَكُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قالُوا: وَاللهِ! لَنَأْتِيَنَّ النَّاسَ فَلَنُصِيبَنَّ مِنَ الْغَنِيمَةِ. فَلَمَّا أَتَوْهُمْ صُرِفَتْ وُجُوهُهُمْ فَأَقْبَلُوا مُنْهَزِمِينَ، فَذَاكَ إِذْ يَدْعُوهُمُ الرَّسُولُ فِي أُخْرَاهُمْ، فَلَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم غَيْرُ اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً، فَأَصَابُوا مِنَّا سَبْعِينَ، وَكَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابُهُ أَصَابَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ بَدْرٍ أَرْبَعِينَ وَمِائَةً، سَبْعِينَ أَسِيراً وَسَبْعِينَ قَتِيلاً.

فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: أَفِي الْقَوْمِ مُحَمَّدٌ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُجِيبُوهُ، ثُمَّ قَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ الْخَطَّابِ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَمَّا هَؤُلاَءِ فَقَدْ قُتِلُوا.

فَمَا مَلَكَ عُمَرُ نَفْسَهُ، فَقَالَ: كَذَبْتَ وَاللهِ يَا عَدُوَّ اللهِ! إِنَّ الَّذِينَ عَدَدْتَ لأَحْيَاءٌ كُلُّهُمْ، وَقَدْ بَقِيَ لَكَ ما يَسُوؤُكَ. قالَ: يَوْمٌ بِيَوْمِ بَدْرٍ، وَالْحَرْبُ سِجَالٌ، إِنَّكُمْ سَتَجِدُونَ فِي الْقَوْمِ مُثْلَةً، لَمْ آمُرْ بِهَا وَلَمْ تَسُؤْنِي. ثُمَّ أَخَذَ يَرْتَجِزُ: أُعْلُ هُبَلْ، أُعْلُ هُبَلْ، قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلاَ تُجِيبُونَهُ**)؟ قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ ما نَقُولُ؟ قالَ: (**قُولُوا: اللهُ أَعْلَى وأَجَلُّ**). قَالَ: إِنَّ لَنَا الْعُزَّى وَلاَ عُزَّى لَكُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلاَ تُجِيبُونَهُ**)؟ قالَ: قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ ما نَقُولُ؟ قَالَ: (**قُولُوا: اللهُ مَوْلاَنَا وَلاَ مَوْلَى لَكُمْ**). [خ٣٠٣٩]

**(خ)** لەبەرائی کوڕی عازیبەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی ئوحد عەبدوڵای کوڕی جوبەیری دانا لەسەر ئەوانەی پیادەڕەو بوون، ئەوان پەنجا پیاوبوون، فەرمووی: (**گەر بینیتان باڵندە پڕی ئێمەی دا لە شوێنی خۆتان مەجوڵێن تا دەنێرم بە دواتاندا، هەر بەو جۆرە گەر بینیتان ئێمە ئەوانمان شکست پێهێنا و زاڵبووین بەسەریاندا، تا دەنێرڕێت بەدواتاندا**)، هاوەڵان ئەوانیان بەزاند، وتی: سوێند بە خودا، ئافرەتانم دەبینی خۆیان هەڵکردبوو، پاوانە و لاقیان دەرکەوتبوو و پۆشاکەکانیان هەڵکرد بوو.

هاوەڵانی عەبدوڵای کوڕی جوبەیر وتیان: غەنیمەت ئەی قەوم، غەنیمەت، چاوەڕوانی چی دەکەن؟ عەبدوڵای کوڕی جوبەیر وتی: ئایا ئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وتن لەبیرتان چوو؟ وتیان: سوێند بە خودا، دەچین بۆ لای ئەو خەڵکە و لەو غەنیمەتە بەشی خۆمان دەبەین، کاتێ هاتن بۆ لای خەڵکەکە ڕوویان وەرچەرخێنراو و ڕووبەڕووی شکست بوونەوە، ئەوەش ئەوەبوو کە پێغەمبەر لە دوواوە بانگی لێدەکردن، تەنها دوازدە پیاو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە، ئەوان حەفتایان لە ئێمە کوشت، پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە ڕۆژی بەدر سەد و چلیان لەوان کوشت و بەدیل گرت، حەفتا دیل و حەفتا کوژراو.

ئەبو سوفیان وتی: ئایا لەناوتان موحەمەد ماوە؟ سێ جار ئەمەی وت، پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێکردن وەڵام بدەنەوە، پاشان وتی: ئایا لەناوتان کوڕەکەی ئەبی قوحافە[1] ماوە؟ سێ جار ئەمەی وت، پاشان وتی: ئایا لەناوتان کوڕەکەی خەتاب ماوە؟ سێ جار ئەمەی وت، پاشان گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی خۆی و وتی: ئەو سیانە کوژراون.

عومەر خۆی پێنەگیراو و وتی: درۆت کرد سوێند بە خودا، ئەی دوژمنی خودا، ئەوانەی تۆ ژماردنت هەموویان زیندوون، ئەوەندە ماوەتەوە ڕووی تۆ ڕەش بکات، وتی: ئەبو سوفیان وتی: ڕۆژێك بە ڕۆژی بەدر، جەنگەکەش لە نێوانمان بەردەوامە،

[1] واتە: ئەبوبەکری صدیق-ە.

ئێوە لەناو کوژراوەکانتان کەسانێك دەبینن شێواون من فەرمان پێنەکردوون، کارەکەشم پێ خراپ نەبووە، پاشان هۆنراوەی دەوت: (أُعْلُ هبل، أعل هبل)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**وەڵامی نادەنەوە؟**) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چی بڵێین؟ فەرمووی: (**بڵێن: "الله أعلا وأجل–خودا باڵاتر و مەزنترە**)، ئەبو سوفیان وتی: ئێمە عوزامان هەیە ئێوە عوزاتان نییە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**وەڵامی نادەنەوە؟**) وتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چی بڵێین؟ فەرمووی: (**بڵێن: خودا مەولامانە و ئێوە مەولاتان نییە**).

- وفي رواية: جَعَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الرُّمَاةِ يَوْمَ أُحُدٍ عَبْدَ اللهِ بْنَ جُبَيْرٍ... [خ٣٩٨٦]

**لە ڕوایەتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوڵای کوڕی جوبەیری لەسەر تیرئەندازەکان دانا لە ڕۆژی ئوحد.**

**٣٦٢٩**– (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: غابَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قاتَلْتَ المشْرِكِينَ، لَئِنِ اللهُ أَشْهَدَنِي قِتَالَ المشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللهُ ما أَصْنَعُ. فَلَمَّا كانَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَانْكَشَفَ المسْلِمُونَ، قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هؤُلاءِ ـ يَعْنِي: أَصْحَابَهُ ـ، وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هؤُلاَءِ ـ يَعْنِي: المشْرِكِينَ ـ.

ثُمَّ تَقَدَّمَ فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ: يَا سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الْجَنَّةَ وَرَبِّ النَّضْرِ! إِنِّي أَجِدُ رِيحَهَا مِنْ دُونِ أُحُدٍ، قالَ سَعْدٌ: فَمَا اسْتَطَعْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ما صَنَعَ. قالَ أَنَسٌ: فَوَجَدْنَا بِهِ بِضْعاً وَثَمَانِينَ: ضَرْبَةً بِالسَّيْفِ أَوْ طَعْنَةً بِرُمْحٍ أَوْ رَمْيَةً بِسَهْمٍ، وَوَجَدْنَاهُ قَدْ قُتِلَ وَقَدْ مَثَّلَ بِهِ المشْرِكُونَ، فَمَا عَرَفَهُ أَحَدٌ إِلاَّ أُخْتُهُ بِبَنَانِهِ.

قالَ أَنَسٌ: كُنَّا نَرَى ـ أَوْ نَظُنُّ ـ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَشْبَاهِهِ: ﴿**مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ**﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ [الأحزاب: ٢٣]. [خ٢٨٠٥/ م١٩٠٣]

**(ق) لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: مامم–ئەنەسی کوڕی نەزر– لە جەنگانی بەدر ئامادە نەبوو، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، لە یەکەمین جەنگانی**

تۆ کە دژ بە هاوەڵداران جەنگای، من ئامادە نەبووم، گەر خودا لە جەنگانی هاوەڵدانەران ئامادەم بکات خودا دەبینێت چی ئەنجام دەدەم، کە ڕۆژی ئوحد هاتە بەرەوە موسوڵمانان پشتیان چۆڵکرا، ئەو وتی: خودایە من داوای لێبوردنت لێدەکەم لەوەی ئەوانە -مەبەستی هاوەڵان بوو- ئەنجامیاندا[1]، هەروەها خۆم بەری دەکەم لەوەی ئەمانە ئەنجامیاندا -مەبەستی هاوەڵدانەران بوو-.

پاشان چووە بەرەوە و سەعدی کوڕی موعاز بەرەو ڕووی ئەو دەهات، وتی: ئەی سەعدی کوڕی موعاز، بەهەشت، سوێند بە پەروەردگاری نەزر، من لە ئوحد بۆنی بەهەشت دەکەم، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، من ئەوەم نەتوانی کە ئەو ئەنجامیدا، ئەنەس وتی: هەشتا و ئەوەندە برینمان بە جەستیەوە بینی، بە لێدانی شمشێر و نوکی ڕم و تەقانی تیر، لەناو کوژراوەکاندا بینیمانەوە لە لایەن هاوەڵدانەرانەوە جەستەکەی شێوێنرابوو و هیچ کەس نەیناسیەوە جگە لە خوشکەکەی بە پەنجەیکیدا.

ئەنەس وتی: ئێمە گومانمان دەبرد ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو و هاوشێوەکانی ئەو دابەزیوە ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِ﴾ [الأحزاب: ٢٣]، تا کۆتایی ئایەتەکە.

**٣٦٣٠-** (ق) وَعَنْهُ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَمَ النَّاسُ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَأَبُو طَلْحَةَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مُجَوِّبٌ عَلَيْهِ بِحَجَفَةٍ لَهُ، وَكَانَ أَبُو طَلْحَةَ رَجُلاً رَامِياً شَدِيدَ النَّزْعِ، كَسَرَ يَوْمَئِذٍ قَوْسَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، وَكَانَ الرَّجُلُ يَمُرُّ مَعَهُ بِجَعْبَةٍ مِنَ النَّبْلِ، فَيَقُولُ: (**انْثُرْهَا لأَبِي طَلْحَةَ**). قالَ: وَيُشْرِفُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَنْظُرُ إِلَى الْقَوْمِ، فَيَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي! لاَ تُشْرِفْ، يُصِبْكَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ الْقَوْمِ، نَحْرِي دُونَ نَحْرِكَ. وَلَقَدْ رَأَيْتُ عائشة بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ وَأُمَّ سُلَيْمٍ، وَإِنَّهُمَا لَمُشَمِّرَتَانِ، أَرَى خَدَمَ سُوقِهِمَا، تَنْقُزَانِ الْقِرَبَ عَلَى مُتُونِهِمَا، تُفْرِغَانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، ثُمَّ تَرْجِعَانِ فَتَمْلآنِهَا، ثُمَّ تَجِيئَانِ فَتُفْرِغانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، وَلَقَدْ وَقَعَ السَّيْفُ مِنْ يَدِ أَبِي طَلْحَةَ، إِمَّا مَرَّتَيْنِ وَإِمَّا ثَلاَثاً. [خ٤٠٦٤ (٢٨٨٠)/ م١٨١١]

---

[1] چونکە فەرمانەکەی پێغەمبەریان شکاند و لەسەر چیاکە دابەزین -و.

(ق) هەر لە ئەنەسەوە (خوا لێی رازی بێت)، وتی: کە خەڵکی لە رۆژی ئوحد شکستیان خوارد و پێغەمبەریان(ﷺ) بە جێهێڵا، ئەبو تەڵحە بە قەڵغانێکی خۆی پێغەمبەری لە شمشێر و تیری هاوەڵدانەران دەپاراست، ئەبو تەڵحە پیاوێکی تیرئەنداز بوو، زۆر توند بەکاری دەهێنا[1] لەو رۆژەدا دوو کەوان یان سێ کەوانی شکاند، پیاوێك بە تیردانێکەوە بە پاڵیدا تێدەپەڕی[2]، پێغەمبەر دەیفەرموو: (**تیرەکانت هەڵبڕێژە بۆ ئەبو تەڵحە**)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرز دەکردەوە و تەماشای هاوەڵدانەرانی دەکرد، ئەبو تەڵحە دەیوت: دایك و باوکم فیدات بێت، سەر بەرز مەکەرەوە، تیرێك لە تیری ئەوانە بەردەکەوێت، گەردنم لەپێش گەردنی تۆوەیە، عائیشەی کچی ئەبوبەکر و ئوم سولەیمم بینی خۆیان هەڵکردبوو، خەڵخاڵی لاقەکانیانم دەبینی بەپەلە دەرۆیشتن و جەوەندە ئاویان لەسەر شانیان هەڵگرتبوو و لە دەمی خەڵکەکەدا ئاوەکەیان خاڵی دەکردەوە و پاشان دەگەڕانەوە و پڕیان دەکردەوە و پاشان دەهاتنەوە و لە دەمی خەڵکەکەدا خاڵییان دەکردەوە، لەو رۆژەدا دوو جار یان سێ جار شمشێرەکە لە دەستی ئەبی تەڵحە کەوتە خوارەوە.

## ٣- دەروازەی: ئەوەی توشی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" هات لە برینداری

٣٦٣١- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا بِنَبِيِّهِ. يُشِيرُ إِلَى رَبَاعِيَتِهِ .، اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَبِيلِ اللهِ). [خ٤٠٧٣/ م١٧٩٣]

(ق) لە ئەبی هەرەیرەوە (خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**توڕەیی خودا لەسەر قەومێك زۆر توند بوو ئەمەیان بە پێغەمبەرەکەیان**

---

[1] "توند بەکارهێنانی تیر و کەوان" ئەوەیە تیرەکە بە ژێی کەوانەکەوە زۆر رابکێشی تا توندتر و خێراتر بتەقێت، ئەوەش هەندێ جار وا دەکات بەهۆی چەمینەوە کەوانەکە بشکێت یان ژێی کەوانەکە بچڕێت-و.

[2] واتە: بەرەو چیاکە هەڵدەهات-و.

**کرد، ئاماژەی کرد بۆ دانەکانی پێشەوەی، تووڕەیی خودا لەسەر پیاوێك زۆر توندە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەڕێگەی خودا دەیکوژێت).**

**٣٦٣٢-** (ق) عَنْ سَهْلٍ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ جُرْحِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: جُرِحَ وَجْهُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، وَهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فاطِمَةُ عليها السلام تَغْسِلُ الدَّمَ، وَعَلِيٌّ يُمْسِكُ، فَلَمَّا رَأَتْ أَنَّ الدَّمَ لاَ يَزِيدُ إِلاَّ كَثْرَةً، أَخَذَتْ حَصِيراً فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَاداً، ثُمَّ أَلْزَقَتْهُ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ.

[خ٢٩١١ (٢٤٣)/ م١٧٩٠]

**(ق) لە سەهلەوە (خوا لێی رازی بێت)، ئەو پرسیاری لێکرا دەربارەی برینداری پێغەمبەری(ﷺ) لە ڕۆژی ئوحد، وتی: ڕوخساری پێغەمبەر(ﷺ) بریندماربوو، دانەکانی پێشەوەی شکان ئەو پارێزەرەی لەسەر سەری دانابوو تێکشکا، فاتیمە(خوا لێی رازی بێت) خوێنەکەی دەشۆری و عەلی دەستی لەسەر برینەکە دانابوو، کاتێ فاتیمە بینی خوێنەکە بەرەو زۆربوون دەڕوات، حەسیرێکی هێنا و سوتاندی تا بوو بە خۆڵەمێش، پاشان خستیە سەر برینەکە و خوێنەکە گیرسایەوە.**

## ٤- دەروازەی: کوژرانی حەمزە(خوا لێی رازی بێت)

**٣٦٣٣-** (خ) عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ قَالَ: قَالَ وَحْشِي: إِنَّ حَمْزَةَ قَتَلَ طُعَيْمَةَ بْنَ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ بِبَدْرٍ، فَقَالَ لِي مَوْلاَيَ جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ: إِنْ قَتَلْتَ حَمْزَةَ بِعَمِّي فَأَنْتَ حُرٌّ، قالَ: فَلَمَّا أَنْ خَرَجَ النَّاسُ عامَ عَيْنَيْنِ وَعَيْنَيْنِ جَبَلٌ بِحِيَالِ أُحُدٍ، بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ وَادٍ . خَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ إِلَى الْقِتَالِ، فَلَمَّا أَنِ اصْطَفُّوا لِلْقِتَالِ، خَرَجَ سِبَاعٌ فَقَالَ: هَلْ مِنْ مُبَارِزٍ؟ قالَ: فَخَرَجَ إِلَيْهِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ المطَّلِبِ، فَقَالَ: يَا سِبَاعُ! يَا ابْنَ أُمِّ أَنْمَارٍ مُقَطِّعَةِ الْبُظُورِ، أَتُحَادُّ اللهَ وَرَسُولَهُ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَ: ثُمَّ شَدَّ عَلَيْهِ، فَكَانَ كَأَمْسِ الذَّاهِبِ، قَالَ: وَكَمَنْتُ لِحَمْزَةَ تَحْتَ صَخْرَةٍ، فَلَمَّا دَنَا مِنِّي رَمَيْتُهُ بِحَرْبَتِي، فَأَضَعُهَا فِي ثُنَّتِهِ حَتَّى خَرَجَتْ مِنْ بَيْنِ وَرِكَيْهِ، قالَ: فَكَانَ ذَاكَ الْعَهْدَ بِهِ. فَلَمَّا رَجَعَ النَّاسُ رَجَعْتُ مَعَهُمْ، فَأَقَمْتُ بِمَكَّةَ حَتَّى فَشَا فِيهَا الإِسْلاَمُ، ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى الطَّائِفِ، فَأَرْسَلُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَسُولاً، فَقِيلَ لِي: إِنَّهُ لاَ يَهِيجُ

الرُّسُلَ، قالَ: فَخَرَجْتُ مَعَهُمْ حَتَّى قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا رَآنِي قالَ: (آنْتَ وَحْشِيٌّ)؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قالَ: (أَنْتَ قَتَلْتَ حَمْزَةَ)؟ قُلْتُ: قَدْ كانَ مِنَ الأَمْرِ ما بَلَغَكَ، قالَ: (فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُغَيِّبَ وَجْهَكَ عَنِّي)؟ قالَ: فَخَرَجْتُ.

فَلَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَخَرَجَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ، قُلْتُ: لأَخْرُجَنَّ إِلَى مُسَيْلِمَةَ، لَعَلِّي أَقْتُلُهُ فَأُكَافِئَ بِهِ حَمْزَةَ، قالَ: فَخَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِ ما كانَ، قالَ: فَإِذَا رَجُلٌ قَائِمٌ فِي ثَلْمَةِ جِدَارٍ، كَأَنَّهُ جَمَلٌ أَوْرَقُ، ثَائِرُ الرَّأْسِ، قالَ: فَرَمَيْتُهُ بِحَرْبَتِي، فَأَضَعُهَا بَيْنَ ثَدْيَيْهِ حَتَّى خَرَجَتْ مِنْ بَيْنِ كَتِفَيْهِ، قالَ: وَوَثَبَ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَضَرَبَهُ بِالسَّيْفِ عَلَى هَامَتِهِ. [خ٤٠٧٢]

**(خ) لە جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەیەی زەمرییەوە، وتی: وەحشی وتی: حەمزە لە بەدر توعەیمەی کوڕی عەدی کوڕی خیاری کوشتبوو، مەولاکەم جوبەیری کوڕی موتعەم پێی وتم: گەر حەمزە لە خوێنی مامدا بکوژی تۆ ئازادی، کە لە ساڵی عەینەین–عەینەین چیایەکە لە چیاکانی ئوحد، لە ناوەندیدا شیوێك هەیە– خەڵکی چوونە دەرەوە منیش بۆ جەنگان لەگەڵیان چوومە دەرەوە، کاتێ ریزبوون بۆ جەنگان، سیباع هاتە دەرەوە و وتی: ئایا زۆرنبازێك هەیە؟ وتی: حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بۆی چووە دەرەوە و وتی: ئەی سیباع، ئەی کوڕی ئوم ئەنمار کە هێنی ئافرەتانی دەبری[1]، ئایا پێکۆڵی[2] دەکەیە سەر خودا و پێغەمبەرەکەی؟ وتی: پاشان پەلاماری دا و کردی بە دوێنێ تێپەڕیو[3]، وەحشی وتی: لە ژێر گابەردێك کەمینم بۆ حەمزە دانا، کە لێم نزیکبوویەوە بە رمەکەم لێمدا، رمەکەم تەقاندە خوار ناوکی تا لە نێوان دوو سمتییەوە دەرچوو، وتی: ئەوە بوو بە هۆی مردنی، کاتێ خەڵکی گەڕانەوە لەگەڵیان گەڕامەوە، لە مەککە مامەوە تا ئیسلام تیایدا بڵاوەی کرد، پاشان رۆیشم بۆ تائیف، خەڵکی تائیف نێردەیەکیان رەوانە کرد بۆ لای پێغەمبەری خودا، پێم وترا: پێغەمبەر نێردەکان وەڕس و بێزار ناکات، لەگەڵیان دەرچووم تا هاتم بۆ لای پێغەمبەری**

---

[1] دیارە دایکی سیباع ئافرەتی خەتەنە کردووە–و.

[2] پێکۆڵی وەرگێڕانی وشەی (تحدي)ە–و.

[3] واتە: بە کەمترین کات کوشتی–و.

خودا(ﷺ)، کاتێ منی بینی فەرمووی: (**تۆ وەحشیت؟**)، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (**ئایا دەتوانی روخساری خۆتم لێ بزر بکەی؟**[1])، وتی: منیش چوومە دەرەوە[2].

کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، موسەیلەمەی درۆزن سەریهەڵدا، وتم: دەچم بۆ موسەیلەمە، بەڵکو بیکوژم و بەوە لە کوشتنەکەی حەمزە هاوتا ببم، وتی: لەگەڵ خەڵکەکە دەرچووم، کارەکەی بەو جۆرە بوو روویدا، پیاوێك لە کەلەبەری دیوارێکەوە بەپێوە وەستابوو دەتوت حوشتری رەنگ خۆڵەمێشییە، قژی هەڵچووبوو، وتی: رمەکەم تێتەقاند و لە نێوان دوو مەمکی گیر بوو و لە نێوان دوو شانییەوە دەرچوو، وتی: پیاوێك لە ئەنصار بۆی راپەڕی و بە شمشێر دای لە گەردنی.

## ٥- دەروازەی: دابەزانی فریشتەکان لەڕۆژی ئوحد

**٣٦٣٤-** (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ أُحُدٍ، وَمَعَهُ رَجُلاَنِ يُقَاتِلاَنِ عَنْهُ، عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ، كَأَشَدِّ الْقِتَالِ، ما رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. [خ٤٠٥٤/ م٢٣٠٦]

**(ق) لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ڕۆژی ئوحد پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی دوو پیاوی لەگەڵ بوو بۆ ئەو دەجەنگان، پۆشاکی سپییان لەبەربوو، تونترین جەنگانیان دەکرد، پێش ئەوە و دوای ئەوە دوو کەسی لەو جۆرەم نەبینیوە.**

## ٦- دەروازەی: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ ئەوانەی وەڵامی خودا و پێغەمبەریان دایەوە

**٣٦٣٥-** (ق) عَنْ عائشة ﷺ: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْاْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ [آل عمران: ١٧٢] قالَتْ لِعُرْوَةَ: يَا

---

[1] ئەوەش تا لە دڵی موبارەکی بەرانبەر بە وەحشی هیچ دروست نەبێت-و.

[2] واتە: مەدینەی بەجێهێڵاوە-و.

ابْنَ أُخْتِي، كانَ أَبَوَاكَ مِنْهُمْ: الزُّبَيْرُ وَأَبُو بَكْرٍ، لَمَّا أَصَابَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ما أَصَابَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَانْصَرَفَ عَنْهُ المشْرِكُونَ، خافَ أَنْ يَرْجِعُوا، قالَ: (مَنْ يَذْهَبُ فِي إِثْرِهِمْ)؟ فَانْتَدَبَ مِنْهُمْ سَبْعُونَ رَجُلاً، قَالَ: كانَ فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَالزُّبَيْرُ. [خ٤٠٧٧/ م٢٤١٨]

**(ق) لەعائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ [آل عمران: ١٧٢]، عائیشە بە عوروەی وت: کوڕی خوشکی خۆم، باوکت لەو کەسانە بوو[1]، زوبێر و ئەبوبەکر، کە لە ڕۆژی ئوحد ئەوە تووشی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات هاوەڵدانەران پشتیان هەڵکرد و ڕۆیشتن، پێغەمبەر ترسا ئەوان بگەڕێنەوە بۆیە فەرمووی: (کێ بەدوایاندا دەڕوات؟) حەفتا پیاو لەوان ئامادەبوون، وتی: لەناو ئەو حەفتایەدا ئەبوبەکر و زوبێر هەبوون.**

## ٧- دەروازەی: ڕۆژی بیری ڕەجیع

**٣٦٣٦**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَشْرَةَ رَهْطٍ سَرِيَّةً عَيْناً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ . جَدَّ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ .، فَانْطَلَقُوا حَتَّى إِذَا كانُوا بِالْهَدْأَةِ، وَهُوَ بَيْنَ عُسْفَانَ وَمَكَّةَ، ذُكِرُوا لِحَيٍّ مِنْ هُذَيْلٍ، يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو لِحْيَانَ، فَنَفَرُوا لَهُمْ قَرِيباً مِنْ مِائَتَيْ رَجُلٍ كُلُّهُمْ رَامٍ، فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ حَتَّى وَجَدُوا مَأْكَلَهُمْ تَمْراً تَزَوَّدُوهُ مِنَ المدِينَةِ، فَقَالُوا: هَذَا تَمْرُ يَثْرِبَ، فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ، فَلَمَّا رَآهُمْ عاصِمٌ وَأَصْحَابُهُ لَجَؤُوا إِلَى فَدْفَدٍ، وَأَحاطَ بِهِمُ الْقَوْمُ، فَقَالُوا لَهُمْ: انْزِلُوا وَأَعْطُونَا بِأَيْدِيكُمْ، وَلَكُمُ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ، وَلاَ نَقْتُلُ مِنْكُمْ أَحَداً.

فَقَالَ عاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ أَمِيرُ السَّرِيَّةِ: أَمَّا أَنَا فَوَاللهِ لاَ أَنْزِلُ الْيَوْمَ فِي ذِمَّةِ كافِرٍ. اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا نَبِيَّكَ، فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ، فَقَتَلُوا عاصِماً فِي سَبْعَةٍ.

فَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ بِالْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ خُبَيْبٌ الأَنْصَارِيُّ وَابْنُ دَثِنَةَ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَأَوْثَقُوهُمْ، فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ: هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ، وَاللهِ لاَ أَصْحَبُكُمْ، إِنَّ فِي هَؤُلاَءِ لأُسْوَةً . يُرِيدُ الْقَتْلَى .، فَجَرَّرُوهُ وَعالَجُوهُ عَلَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ، فَأَبَى، فَقَتَلُوهُ.

---

(١) واتە: ئەو کەسانەی وەڵامی خودا و پێغەمبەریان دایەوە-و.

فَانْطَلَقُوا بِخُبَيْبٍ وَابْنِ دَثِنَةَ حَتَّى بَاعُوهُمَا بِمَكَّةَ بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَابْتَاعَ خُبَيْباً بَنُو الحَارِثِ بْنِ عامر بْنِ نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ قَتَلَ الحَارِثَ بْنَ عامر يَوْمَ بَدْرٍ، فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيراً.

فَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنِ عِيَاضٍ: أَنَّ بِنْتَ الحَارِث أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهُمْ حِينَ اجْتَمَعُوا اسْتَعَارَ مِنْهَا مُوسى يَسْتَحِدُّ بِهَا فَأَعارَتْهُ، فَأَخَذَ ابْناً لِي وَأَنَا غَافِلَةٌ حِينَ أَتَاهُ، قَالَتْ: فَوَجَدْتُهُ مُجْلِسَهُ عَلَى فَخِذِهِ وَالموسى بِيَدِهِ، فَفَزِعْتُ فَزْعَةً عَرَفَهَا خُبَيْبٌ فِي وَجْهِي، فَقَالَ: تَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ ما كُنْتُ لأَفْعَلَ ذلِكَ. وَاللهِ ما رَأَيْتُ أَسِيراً قَطُّ خَيْراً مِنْ خُبَيْبٍ، وَاللهِ لَقَدْ وَجَدْتُهُ يَوْماً يَأْكُلُ مِنْ قِطْفِ عِنَبٍ فِي يَدِهِ، وَإِنَّهُ لَمُوثَقٌ فِي الحَدِيدِ، وَمَا بِمَكَّةَ مِنْ ثَمَرٍ، وَكَانَتْ تَقُولُ: إِنَّهُ لَرِزْقٌ مِنَ اللهِ رَزَقَهُ خُبَيْباً. فَلَمَّا خَرَجُوا مِنَ الحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ فِي الحِلِّ، قالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ: ذَرُونِي أَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، فَتَرَكُوهُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تَظُنُّوا أَنَّ ما بِي جَزَعٌ لَطَوَّلْتُهَا، اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَداً

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِماً عَلَى أَيِّ شِقٍّ كَانَ لِلَّهِ مَصْرَعِي
وَذلِكَ فِي ذَاتِ الإِلهِ وَإِنْ يَشَأْ يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

فَقَتَلَهُ ابْنُ الحَارِثِ، فَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ لِكُلِّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْراً.

فَاسْتَجَابَ اللهُ لِعَاصِمِ بْنِ ثَابِتٍ يَوْمَ أُصِيبَ، فَأَخْبَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَصْحَابَهُ خَبَرَهُمْ وَمَا أُصِيبُوا. وَبَعَثَ نَاسٌ مِنْ كُفَّارِ قُرَيْشٍ إِلَى عاصِمٍ حِينَ حُدِّثُوا أَنَّهُ قُتِلَ لِيُؤْتَوْا بِشَيْءٍ مِنْهُ يُعْرَفُ، وَكَانَ قَدْ قَتَلَ رَجُلاً مِنْ عُظَمَائِهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَبُعِثَ عَلَى عاصِمٍ مِثْلُ الظُّلَّةِ مِنَ الدَّبْرِ، فَحَمَتْهُ مِنْ رَسُولِهِمْ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى أَنْ يَقْطَعُوا مِنْ لَحْمِهِ شَيْئاً. [خ٣٠٤٥]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سریەیەکی دە کەسی وەك هەواڵگری رەوانە کرد، عاصمی کوری سابیتی ئەنصاری–باپیری[1] عاصمی کوری عومەری کوری خەتاب– کرد بە ئەمیر بەسەریانەوە، رۆیشتن تا گەیشتنە هەدئەت، ئەوەش لەنێوان عوسفان و مەککەدایە، ئەوان بۆ تیرەیە لە هوزەیل باسکرابوون کە پێیان دەوترا: بەنو لیحیان، نزیك بە دوو سەد کەسیان بۆ ئەوان رەوانە کرد، هەموویان تیر ئەنداز بوون، شوێنپێیان هەڵگرتن تا ناوکی ئەو خورمایەیان بینی وەك**

(1) باپیری لە دایکەوە–و.

توێشوو لە مەدینەوە هێنابوویان و خواردبوویان، وتیان: ئەمە خورمای یەسرریبە، بۆیە شوێن پێیان هەڵگرتن، کاتێ عاصم و هاوەڵانی ئەوانیان بینی، پەنایان برد بۆ بەرزاییەك، کۆمەڵەکە دەوریان گرتن، ئەوان پێیان وتن: دابەزن و ئەوەی پێتانە پێمانبدەن بەرامبەر ئەوە بەڵێن و پەیمانتان پێ دەدەین هیچ کەس لە ئێوە ناکوژین.

عاصمی کوڕی سابیت کە ئەمیری سریەکە بوو وتی: سوێند بە خودا، ئەمڕۆ بۆ پەنادانی بێباوەڕ دانابەزم، خودایە هەواڵەکەی ئێمە بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنە، تیربارانیان کردن و بە عاصمەوە حەوت کەسیان کوشت.

سیانەکەی تر بە بەڵێن و پەیمان دابەزین، ئەو سیانەش خوبەیب ئەنصاری و ئیبن دەسینە و پیاوێکی تر بوو، کاتێ دەستیان بەسەردا گرتن ژێی کەوانەکانیان دەرهێنا و ئەوانیان بەستەوە، پیاوی سێیەمیان وتی: ئەوە یەکەمین غەدرە، سوێند بە خودا، لەگەڵتان نایەم، لەوانەدا –مەبەستی کوژراوەکان بوو– بۆ من سەرمەشقی هەیە، ئەوانیش ڕایانکێشا و هەوڵیاندا لەگەڵی بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیان بیبەین، بەڵام نەیویست، بۆیە کوشتیان.

"خوبەیب و ئیبن دەسینە"یان برد تا لە مەککە فرۆشتنیان لە دوای ڕووداوی بەدر، کوڕەکانی حاریسی کوڕی عامری کوڕی نەوفلی کوڕی عەبدالمناف "حوبەیب"یان کڕی، حوبەیب بکوژی حاریسی کوڕی عامر بوو لەڕۆژی بەدر، بۆیە حوبەیب لە لایان بەدیلی مایەوە.

عوبەیدوڵای کوڕی عەیاز هەواڵی پێدام کە کچەکەی حاریس هەواڵی پێدابوو: ئەوان کاتێ لەسەری کۆبوونەوە[1] خوبەیب گوێزانێکی لێ دەخوازێت تا مووی لاشەی خۆی پێ پاك بکاتەوە، ئەویش گوێزانەکەی پێ دەدات: خوبەیب کوڕێکی من دەگرێت من بێئاگا بووم کاتێ هاتبوو بۆ لای، کچەکەی حاریس دەڵێت: بینیم منداڵەکە لەسەر ڕانی دانیشتبوو، خوبەیب گوێزانەکەی بەدەستەوە بوو، ترسێکی گەورەم لێنیشت، خوبەیب لە ڕووخساری مندا ترسەکەی بینی، وتی: "دەترسیت بیکوژم؟ من ئەو کارە

[1] واتە: کاتێ بڕیاری کوشتنی حوبەیبیان دەرکرد–و.

ناکەم"، سوێند بە خودا، دیلێکم هەرگیز نەبینیوە باشتر و چاکتر لە خوبەیب، سوێند بە خودا، ڕۆژێك بینینم بۆڵە ترێی بەدەستەوە بوو دەیخوارد، لە کاتێکدا ئەو بە ئاسن کۆت و بەند کرابوو لە مەککەش لەو جۆرە بەروبوومە نەبوو، ئافرەتەکە دەیوت: ئەوە ڕۆزییەك بوو لە خوداوە ڕۆزی خوبەیبی پێ دابوو، کە لە مانگەکانی حەرام دەرچوون بۆ ئەوەی لە مانگە حەڵاڵەکاندا بیکوژن خوبەیب پێی وتن: ڕێگەم بدەن دوو ڕکات نوێژ بکەم، ئەوانیش ڕێگەیان پێدا دوو رکات نوێژی کرد، پاشان وتی: گەر وا گومان نەبەن ترس و نیگەرانیم هەیە، نوێژەکەم درێژ دەکردەو،ە خودایە ئەمانە بەرباد بکە

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِماً عَلَى أَيِّ شِقٍّ كَانَ لِلَّهِ مَصْرَعِي
وَذلِكَ في ذَاتِ الإِلهِ وَإِنْ يَشَأْ يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

کوڕەکەی حاریس کوشتی، خوبەیب ئەو دوو ڕکات نوێژەی ڕەنگڕێژ کرد بۆ هەر مرۆیەکی مسوڵمان ئارامگرانە کوژرابێت.

خودا وەڵامەکەی عاصمی کوڕی سابیتی دایەوە، ئەو ڕۆژەی عاصمی کوڕی سابیت تووش هات خوادا وەڵامی دوعاکەی دایەوە و پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵەکەیدا بە هاوەڵانی، دەربارەی ئەوەی تووشیان هاتووە هەواڵەکەی پێدان.

خەڵکانێ لە بێباوەڕانی قورەیش کەسانێکیان نارد بۆ سەر عاصم کاتێ باسی ئەوەیان بۆکرا کوژراوە، بۆ ئەوەی شتێك لە لاشەکەی بهێنن بۆ ئەوان و بەوەدا بناسرێتەوە، عاصم لە ڕۆژی بەدر یەکێك لە گەورەکانی ئەوانی کوشتبوو، پۆلێك زەردەواڵە لە شێوەی هەور ڕەوانەکرا بۆسەر عاصم، بۆیە لە دەستی نێراوەکانی ئەوان پاراستیان و نەیانتوانی شتێك لە گۆشتەکەی ببڕن و ببەن بۆ ئەوان.

## ٨- دەروازەی: ڕۆژی بیری مەعونە

**٣٦٣٧**- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قالَ: دَعَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الَّذِينَ قَتَلوا أَصحَابَ بِئْرِ مَعُونَةَ ثَلاَثِينَ غَدَاةً، عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ، عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهُ.

[خ٢٨١٤ (١٠٠١)/ م٦٧٧]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سی ڕۆژ دوعای کرد لەوانەی هاوەڵانی "بیری مەعونە"یان کوشت، دوعا لە ڕیعل و و زەکوان و عوصییە، ئەوانەی لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخیبوون.**

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالُوا: أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالاً يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُمُ: الْقُرَّاءُ، فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ، وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَيَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ، وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لأَهْلِ الصُّفَّةِ، وَلِلْفُقَرَاءِ. فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيْهِمْ، فَعَرَضُوا لَهُمْ فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ. فَقَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا؛ أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ، وَرَضِيتَ عَنَّا. قَالَ: وَأَتَى رَجُلٌ حَرَاماً، خَالَ أَنَسٍ، مِنْ خَلْفِهِ فَطَعَنَهُ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ. فَقَالَ حَرَامٌ: فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَصْحَابِهِ: (**إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا، وَإِنَّهُمْ قَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا؛ أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ، وَرَضِيتَ عَنَّا**). [م: الإمارة ٦٧٧ (١٤٧)]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: موسلیمدا وتی: خەڵکانێك هاتن بۆ لای پێغەمەبەر(ﷺ) وتیان: پیاوانێك لەگەڵمان بنێرە قورئان و سوننەتمان فێربکەن، پێغەمبەر(ﷺ) حەفتا کەس لەئەنصاری بۆ ڕەوانەکردن پێیان دەوترا قورئان خوێنەکان، لەناو ئەوانەدا خاڵی منی تێدابوو کە ناوی "حەرام" بوو، ئەوان قورئانیان دەخوێند و بە شەو دیراسەتیان دەکرد و بەڕۆژیش ئاویان دەهێنا بۆ مزگەوت و دایاندەنا، داریان کۆدەکردەوە و دەیانفرۆشت و خۆردنیان پێدەکڕی بۆ ئەهلی صوفە و بۆ هەژاران، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی ڕەوانەکرد بۆ لایان[1]، ئەوانیش بۆیان دانیشتن و بەر لەوەی بگەنە جێگەی خۆیان هەموویان کوشتن، بۆیە قورئانخوێنەکان وتیان: خودایە، هەواڵەکە لە ئێمەوە بە پێغەمبەرەکەمان بگەیەنە، ئێمە بە تۆ گەیشتن، ل ەتۆ ڕازین و تۆش لە ئێمە ڕازی ببە،**

---

(1) واتە: بۆ لای ئەو خەڵکانەی داوای قورئانخوێنیان لە پێغەمبەر کرد–و.

وتی: پیاوێك هات بۆ حەرام -خاڵی ئەنەس- لە دواوە ڕمێکی لێدا تا ڕمەکە لەودیوەوە دەرچوو، حەرام وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە، سەرفرازیم بەدەستهێنا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە هاوەڵانی خۆی فەرمووی: (**براکانتان کوژراون، ئەوان وتویانە خودایە لە ئێمەوە هەواڵەکە بە پێغەمبەرەکەمان بگەیەنە کە ئێمە بە خزمەتی تۆ گەیشتوین، ئێمە لە تۆ ڕازین و تۆش لە ئێمە ڕازی بە**).



## بەشی شەشەم

# غەزوەی خەندەق و ئەوەی بەدوایدا هات

## ١- دەرووازەی هەڵکەندنی خەندەقەکە

**٣٦٣٨-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى الخَنْدَقِ، فَإِذَا المهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ فِي غَدَاةٍ بَارِدَةٍ، فَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ عَبِيدٌ يَعْمَلُونَ ذلِكَ لَهُمْ، فَلَمَّا رَأَى ما بِهِمْ مِنَ النَّصَبِ وَالجوعِ، قالَ: (**اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ، فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ**). فَقَالُوا مُجِيبِينَ لَهُ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدا          عَلَى الْجِهَادِ ما بَقِينَا أَبَدا

[خ٢٨٣٤/ م١٨٠٥]

**(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتەدەرەوە بۆ خەندەقەکە بینی موهاجیرین و ئەنصار لەبەیانیەکی سارددا چاڵەکە هەڵدەکەنن، ئەوان کۆیلە و بەندەیان نەبوو ئەو کارەیان بۆ ئەنجام بدەن، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) شەکەتی و ماندووبوون و برسییەتی ئەوانی بینی فەرمووی: (خودایە ژیان و گوزەران ژیان و گوزەرانی دوارۆژە، لە ئەنصار و لە موهاجیرین خۆشببە) ئەوانیش وەك وەڵامدانەوەی پێغەمبەر وتیان:**

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدا          عَلَى الْجِهَادِ ما بَقِينَا أَبَدا

**(ئێمە ئەوانەین لەسەر جیهاد بەیعەتمان بە محەمەد دا  تا لە ژیاندا بین و بۆ هەتاهەتا).**

**٣٦٣٩-** (ق) عَنِ البَرَاءِ ﷺ قالَ: كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَنْقُلُ التُّرَابَ يَوْمَ الخَنْدَقِ، حَتَّى أَغْمَرَ بَطْنُهُ، أَوِ اغْبَرَّ بَطْنُهُ، يَقُولُ:

(واللهِ! لَوْلاَ اللَّهُ ما اهْتَدَيْنَا     وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا
فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا     وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا
إِنَّ الأُلى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا     إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا)
وَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ: (أَبَيْنَا أَبَيْنَا).     [خ٤١٠٤ (٢٨٣٦)/ م١٨٠٣]

**(ق)** لە بەرائەوە (خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی خەندەق خۆڵی دەگوێزایەوە تا هەموو سکی داپۆشی یان تا سکی تۆزاوی کرد، دەیفەرموو:

(واللهِ! لَوْلاَ اللَّهُ ما اهْتَدَيْنَا     وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا
فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا     وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا
إِنَّ الأُلى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا     إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا)

واتە گەر خودا نەبوایە هیدایەتمان وەرنەدەگرت و صەدەقەمان ئەنجام نەدەدا و نوێژمان نەدەکرد، بۆیە خودایە سەکینە دابەزێنە بۆ سەرمان و پێیەکانمان جێگیر بکە کاتێ ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە، ئەوانە دەستدرێژی دەکەنە سەر ئێمە، ئەوانە گەر فیتنەیان بۆ ئێمە بوێت ڕازی نابین.

پێغەمبەر(ﷺ) بە وتنی **(أبينا أبينا)** دەنگی بەرز دەکردەوە.

## ٢- دەروازەی: خواردنی جابر

**٣٦٤٠-** (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قالَ: لَمَّا حُفِرَ الخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِالنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم خَمَصاً شَدِيداً، فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِي، فَقُلْتُ: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ فَإِنِّي رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَمَصاً شَدِيداً، فَأَخْرَجَتْ إِلَيَّ جِرَاباً فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَلَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ فَذَبَحْتُهَا، وَطَحَنَتِ الشَّعِيرَ، فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِي، وَقَطَّعْتُهَا فِي بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَتْ: لاَ تَفْضَحْنِي بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَبِمَنْ مَعَهُ، فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وَطَحَنَّا صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ كانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ وَنَفَرٌ مَعَكَ، فَصَاحَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(يَا أَهْلَ الخَنْدَقِ! إِنَّ جابِراً قَدْ صَنَعَ سُوراً، فَحَيَّ هَلاً بِكُمْ)**. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، وَلاَ تَخْبِزُنَّ عَجِينَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ)**.

فَجِئْتُ وَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْدُمُ النَّاسَ حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِي، فَقَالَتْ: بِكَ وَبِكَ، فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي قُلْتِ، فَأَخْرَجَتْ لَهُ عَجِيناً فَبَصَقَ فِيهِ وَبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا فَبَصَقَ وَبَارَكَ، ثُمَّ قالَ: (ادْعُ خابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعِي، وَاقْدَحِي مِنْ بُرْمَتِكُمْ وَلاَ تُنْزِلُوهَا). وَهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللهِ لَقَدْ أَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ وَانْحَرَفُوا، وَإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كما هِيَ، وَإِنَّ عَجِينَنَا لَيُخْبَزُ كما هُوَ. [خ٤١٠٢ (٣٠٧٠)/ م٢٠٣٩]

**(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: کاتێ خەندەقەکە لێدرا پێغەمبەرم(ﷺ) بینی سکی خاڵی بوو، گەڕامەوە بۆلای ژنەکەم و پێم وت: ئایا شتێکت لە لایە؟ من پێغەمبەری خودام(ﷺ) بینی سکی خاڵی و برسی بوو، ئەویش هەمانەیەکی دەرهێنا صاعێ لە جۆی تێدابوو، کاریلەیەکی دابەستەشمان هەبوو سەرمبڕی، ئەویش جۆیەکەی هاڕی و کردیە ناو ئەو مەنجەڵەی گۆشتەکەم تێدا پارچە پارچە کرد بوو، پاشان گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)، ژنەکەم وتی: شەرمەزارم مەکە بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەوانەی لەگەڵینی، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا و بە چپە پێم وت: ئەی پێغەمبەری خودا، کاریلەیەکمان سەربڕیوە و صاعێك جۆمان لەلابوو هاڕیومانە، خۆت و چەند کەسێك لەگەڵم وەرن، پێغەمبەر(ﷺ) هاواری کرد و فەرمووی: (ئەی ئەهلی خەندەق، جابر خواردنی دروستکردووە، وەرن با هەموومان بڕۆین)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (مەنجەڵەکەتان دامەگرن و هەویرەکەتان مەکەن بە نان تا من دێم).**

هاتم و پێغەمبەری خوداش(ﷺ) پێش خەڵکەکە کەوت، تا هاتم بۆلای ژنەکەم، ژنەکە وتی: (بك وبك[1])، وتم: بەو جۆرەم کرد تۆ وتت، ژنەکە هەویرەکەی بۆ پێغەمبەر هێنایە دەرەوە و لیکی دەمی خۆی تێکرد و بەرەکەتی تێکەوت، پاشان ڕۆیشت بۆ لای مەنجەڵەکە و لیکی دەمی خۆی تێکرد و بەرەکەتی تێکەوت، پاشان فەرمووی: (**نانکەرەکە بانگ بکە با لەگەڵم نان بکات، مەنجەڵەکەتان دامەگرن و لێی**

(١) "بك و بك": دەربڕینێکە بۆ نارەزایی و قسە پێ وتن، چونکە ژنەکەی جابر ترسی کەمی خواردنەکەی بوو بۆ ئەو خەڵکە زۆرە-و.

**هەڵبگۆزن**)، ئەوان هەزار کەسبوون، سوێند بە خودا ـ ئەوان لێیان خوارد تا لێیان مایەوە و تێربوون و پشتیان هەڵکرد هێشتا مەنجەڵەکەمان وەك خۆی وابوو، لەسەر ئاگرەکە دەکوڵا و دەنگی کوڵانەکەی دەبیسترا، هەویرەکەمان کە نانی لێدەکرا هەر وەك خۆی وابوو.

- ولفظ مسلم: (ادْعِي خَابِزَةً، فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ..).

لەفزەکەی موسلیم: (**نانکەرەکە بانگبکە باڵەگەڵت نانەکە بکات**[1]).

- وفي رواية للبخاري: قَالَ: إِنَّا يَوْمَ الخَنْدَقِ نَحْفِرُ، فَعَرَضَتْ كُدْيَةٌ شَدِيدَةٌ، فَجَاؤُوا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالُوا: هذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضَتْ فِي الخَنْدَقِ، فَقَالَ: (**أَنَا نَازِلٌ**). ثُمَّ قَامَ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ، وَلَبِثْنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ لاَ نَذُوقُ ذَوَاقاً، فَأَخَذَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الْمِعْوَلَ فَضَرَبَ فِي الْكُدْيَةِ، فَعَادَ كَثِيباً أَهْيَلَ، أَوْ أَهْيَمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي إِلَى الْبَيْتِ.. وذكر الحديث. [خ٤١٠١]

لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: بوخاریدا وتی: ڕۆژی خەندەق چاڵەکەمان هەڵدەکەند گابەردێکی گەورە هاتە بەردەمان، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: ئەم گابەردە هاتووەتە ناو چاڵەکە، پێغەمبەر فەرمووی: (**من دادەبەزم**) پاشان هەستا و سکی بە پشتوێنێك بەستبوو، سێ ڕۆژ ماینەوە هیچمان تام نەکردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) پیکێکی گرت بە دەستەوە و دای لە گابەردەکە و بوو بە تەپوتۆز، واتە ورد و خاش بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، مۆڵەتم بدە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، فەرموودەکەی باسکرد.

## ٣- دەروازەی: ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ﴾

**٣٦٤١**- (م) عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ حُذَيْفَةَ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَوْ أَدْرَكْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَاتَلْتُ مَعَهُ وَأَبْلَيْتُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: أَنْتَ كُنْتَ تَفْعَلُ ذلِكَ؟ لَقَدْ

---

[1] واتە: پێغەمبەر(ﷺ) بە ژنەکەی جابری فەرموو ئەو ئافرەتە بانگ بکات لەگەڵی نانەکە دەکات پێکەوە نانەکە بکەن ـ و.

رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَيْلَةَ الأَحْزَابِ، وَأَخَذَتْنَا رِيحٌ شَدِيدَةٌ وَقُرٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَلاَ رَجُلٌ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟**) فَسَكَتْنَا، فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ. ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ رَجُلٌ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟**) فَسَكَتْنَا، فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ. ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ رَجُلٌ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟**) فَسَكَتْنَا، فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ، فَقَالَ: (**قُمْ يَا حُذَيْفَةُ! فَأْتِنَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ**) فَلَمْ أَجِدْ بُدًّا، إِذْ دَعَانِي بِاسْمِي، أَنْ أَقُومَ. قَالَ: (**اذْهَبْ، فَأْتِنِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ، وَلاَ تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ**) فَلَمَّا وَلَّيْتُ مِنْ عِنْدِهِ جَعَلْتُ كَأَنَّمَا أَمْشِي فِي حَمَّامٍ، حَتَّى أَتَيْتُهُمْ، فَرَأَيْتُ أَبَا سُفْيَانَ يَصْلِي ظَهْرَهُ بِالنَّارِ، فَوَضَعْتُ سَهْماً فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْمِيَهُ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَلاَ تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ**) وَلَوْ رَمَيْتُهُ لأَصَبْتُهُ، فَرَجَعْتُ وَأَنَا أَمْشِي فِي مِثْلِ الْحَمَّامِ.

فَلَمَّا أَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِ الْقَوْمِ، وَفَرَغْتُ، قُرِرْتُ، فَأَلْبَسَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ فَضْلِ عَبَاءَةٍ كَانَتْ عَلَيْهِ يُصَلِّي فِيهَا، فَلَمْ أَزَلْ نَائِماً حَتَّى أَصْبَحْتُ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ قَالَ: (**قُمْ يَا نَوْمَانُ!**). [م١٧٨٨]

**(م)** لە ئیبراهیمی تەیمیەوە لە باوکیەوە وتی: لای حوزەیفە بووین پیاوێك وتی: گەر بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بگەیشتمایە لە خزمەتی دەجەنگام و جێ دەستیشم دیار بوو، حوزەیفە وتی: ئایا تۆ ئەوە کارەت دەکرد، گەر ئێمەت ببینیبایە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)[1]، لە شەوی ئەحزاب بایەکی زۆر توندی سارد لێی هەڵکردبووین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئایا پیاوێك هەیە هەواڵی ئەو قەومەم بۆ بهێنێت؟ خودا لە ڕۆژی قیامەت دەیکاتە هاوڕێی من**)، هەمووان بێدەنگ بووین، هیچ کەس لە ئێمە ئەوەی پێخۆش نەبوو، پاشان فەرمووی: (**ئایا پیاوێك هەیە هەواڵی ئەو قەومەم بۆ بهێنێت؟ خودا لە ڕۆژی قیامەت دەیکاتە هاوڕێی من**)، هەموو بێدەنگبووین، هیچ کەس لە ئێمە ئەوەی پێخۆش نەبوو، فەرمووی: (**ئەی حوزەیفە هەستە هەواڵی ئەو قەومەمان بۆ بهێنە**)، هیچ چارم نەما بۆ هەستانەوە، چونکە بە ناوی خۆم بانگی کردم، فەرمووی: **بڕۆ خەبەری ئەو قەومەم بۆ بهێنە، مەیانجوڵێنە بۆ**

---

[1] واتە: گەر تەنگانەی شەوی ئەحزابت ببینیبایە ئەو قسەت نەدەکرد-و.

سەرم)، کاتێ لە لای پشتم هەڵکرد وەك ئەوەی بە حەمامێکدا بڕۆم تا هاتم بۆ ناویان، ئەبو سوفیانم بینی پشتی بە ئاگر گەرم دەکردەوە، تیرێکم خستە ناو کەوانەکەم ویستم بیتەقێنم بیری قسەکەی پێغەمبەری خودام(ﷺ) کەوتەوە کە فەرمووی: (مەیانجوڵێنە بۆ سەرم)، گەر تیرەکەم بۆ بتەقاندبایە لێم دەدا، گەڕامەوە و من هەر وەك ئەوەی بە حەمامێکدا بڕۆم.

هاتم بۆلای پێغەمبەر و هەواڵی قەومەکەم پێدا، کە تەواوبووم سەرما دایگرتمەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەبایەکی زیادەی لەسەر شان بوو نوێژی تێدا دەکرد کردیە بەرم، بەردەوام لە خەودا بووم تا ڕۆژم لێبوویەوە، کاتێ ڕۆژم لێبوویەوە پێغەمبەر فەرمووی: (هەستە خەواڵو).

## ٤- دەروازەی: سەرقاڵبوونی موسوڵمانان لە نوێژ

**٣٦٤٢-** (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ جَاءَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ، حَتَّى كَادَتِ الشَّمْسُ تَغْرُبُ، قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**واللهِ مَا صَلَّيْتُهَا**). فَقُمْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ لِلصَّلاَةِ وَتَوَضَّأْنَا لَهَا، فَصَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ.

[خ٥٩٦/ م٦٣١]

(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە: عومەری کوڕی خەتاب ڕۆژی خەندەق هات لەدوای ئەوەی خۆر ئاوابوو جنێوی بە بێباوەڕانی قورەیش دەدا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، نەمتوانی نوێژی عەصر ئەنجام بدەم، تا خۆر ئاوا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**سوێند بە خودا منیش ئەنجامم نەداوە**) هەستاین بۆ بوتحان[1]، پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی هەڵگرت و ئێمەش دەستنوێژمان بۆگرت و نوێژی عەصری کرد لەدوای ئەوەی خۆر ئاوابوو، بە دوایدا نوێژی مەغریبی کرد.

---

[1] شیوێك بووە ئاوی بەناودا جاری بووە-و.

## ٥- دەروازەی: دواین غەزوەیەك قورەیش پێی هەڵبستێت

**٣٦٤٣-** (خ) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ، حِينَ أَجْلَى الأَحْزَابُ عَنْهُ: **(الآنَ نَغْزُوهُمْ وَلاَ يَغْزُونَنَا، نَحْنُ نَسِيرُ إِلَيْهِمْ)**.      [خ٤١١٠ (٤١٠٩)]

**(خ) لە سولەیمانی کوڕی سورەدەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ)- کاتێ کە ئەحزاب ڕۆیشتن- دەیفەرموو: (ئێستا ئێمە غەزوی ئەوان دەکەین و ئەوان غەزوی ئێمە ناکەن)[1].**

## ٦- دەروازەی: نوێژی عەصر لەبەنی قورەیزە

**٣٦٤٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لَنَا لَمَّا رَجَعَ مِنَ الأَحْزَابِ: **(لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ)**. فَأَدْرَكَ بَعْضَهُمُ الْعَصْرُ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي، لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذلِكَ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِداً مِنْهُمْ.      [خ٩٤٦/ م١٧٧٠]

**(ق) لە ئیبن عومەرەوە وتی: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەحزاب گەڕایەوە پێی فەرمووین: (هیچ کەس نوێژی عەصر نەکات لەبەنی قورەیزە نەبێت)، هەندێکیان لە ڕێگە نوێژیان بەسەردا هات، بەشێکیان وتیان: نوێژەکە ناکەین تا دەگەینە بەنی قورەیزە، هەندێکی تر لەوان وتیان: بەڵکو نوێژەکە دەکەین، پێغەمبەر ئەوەی لە ئێمە نەویستووە[2]، ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا لە هیچ دەستەیەك لەو دوو دەستە توند نەبوویەوە[3].**

---

[1] واتە: لە ئێستاوە و لێرە بەدواوە ئێمە هێرش دەکەینە سەر ئەحزاب، نەك ئەحزاب هێرش بۆ سەر ئێمە بهێنێت-و.

[2] واتە: پێغەمبەر(ﷺ) نەیویستووە ئێمە نوێژەکەمان دوابخەین، بەڵکو مەبەستی بووە زوو بگەینە بەنی قورەیزە-و.

[3] واتە: هەردوو هەڵوێستەکەی لا پەسەند بوو-و.

## ٧- دەروازەی: مردنی سەعدی کوڕی موعاز(خوای لێ ڕازی بێت)

٣٦٤٥- (ق) عَنْ عائشة ﵂ قَالَتْ: أُصِيبَ سَعْدٌ يَوْمَ الخَنْدَقِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ، يُقَالُ لَهُ: حِبَّانُ بْنُ العَرِقَةِ، رَمَاهُ فِي الأَكْحَلِ، فَضَرَبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم خَيْمَةً فِي المسْجِدِ لِيَعُودَهُ مِنْ قَرِيبٍ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الخَنْدَقِ، وَضَعَ السِّلاَحَ وَاغْتَسَلَ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عليه السلام وَهْوَ يَنْفُضُ رَأْسَهُ مِنَ الْغُبَارِ، فَقَالَ: قَدْ وَضَعْتَ السِّلاَحَ، وَاللهِ ما وَضَعْتُهُ، اخْرُجْ إِلَيْهِمْ. قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (فَأَيْنَ). فَأَشَارَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ، فَأَتَاهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَنَزَلُوا عَلَى حُكْمِهِ، فَرَدَّ الحكْمَ إِلَى سَعْدٍ، قالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ: أَنْ تُقْتَلَ المقَاتِلَةُ، وَأَنْ تُسْبَى النِّسَاءُ وَالذُّرِّيَّةُ، وأَنْ تُقْسَمَ أَمْوَالُهُمْ.

وَعَنْها: أَنَّ سَعْداً قالَ: اللَّهُمَّ! إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أُجَاهِدَهُمْ فِيكَ، مِنْ قَوْمٍ كَذَّبُوا رَسُولَكَ صلّى الله عليه وسلّم وَأَخْرَجُوهُ. اللَّهُمَّ! فَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّكَ قَدْ وَضَعْتَ الحَرْبَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ، فَإِنْ كَانَ بَقِيَ مِنْ حَرْبِ قُرَيْشٍ شَيْءٌ فَأَبْقِنِي لَهُ، حَتَّى أُجَاهِدَهُمْ فِيكَ، وَإِنْ كُنْتَ وَضَعْتَ الحَرْبَ فَافْجُرْهَا وَاجْعَلْ مَوْتَتِي فِيهَا، فَانْفَجَرَتْ مِنْ لَبَّتِهِ، فَلَمْ يَرُعْهُمْ، وَفِي المسْجِدِ خَيْمَةٌ مِنْ بَنِي غِفَارٍ؛ إِلاَّ الدَّمُ يَسِيلُ إِلَيْهِمْ، فَقَالُوا: يَا أَهْلَ الخَيْمَةِ! مَا هَذَا الَّذِي يَأْتِينَا مِنْ قِبَلِكُمْ؟ فَإِذَا سَعْدٌ يَغْذُو جُرْحُهُ دَماً، فَمَاتَ مِنْهَا ﵁. [خ٤١٢٢ (٤٦٣)/ م١٧٦٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت): ڕۆژی خەندەق سەعد بریندار بوو، پیاوێك لە قورەیش تیرێکی تێتەقاند پێی دەوترا حیبانی کوڕی عەریقە، ئەو تیرێکی تەقاندە کەمەری سەعد، پێغەمبەر(ﷺ) خێمەیەکی لە مزگەوت بۆ هەڵدا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە سەردانی بکات، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خەندەق گەڕایەوە شمشێرەکەی دانا و خۆی شۆری، جبریل(علیه السلام) هات و ئەو تەپوتۆزی لەسەر خۆی دەکردەوە[1]، وتی: چەکت داناوە، سوێند بە خودا، من دامنەناوە، بڕۆ بۆیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**بۆ کوێ؟**)، جبریل ئاماژەی کرد بۆ بەنی قورەیزە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشت بۆیان، دابەزین بۆ حوکمی پێغەمبەر، بەڵام حوکمەی ڕەدکردەوە بۆ سەعد،

---

[1] واتە: تەپوتۆزی مەیدانی جەنگ-و.

سەعد وتی: من بە مجۆرە حوکم دەکەم تیایاندا، جەنگاوەرانیان بکوژرێن، ژنەکانیان و منداڵەکانیان بەخسیر بکرێن و ماڵ و سامانیان دابەشبکرێت.

هەر لە عائیشەوە، سەعد وتی: خودایە، تۆ دەزانیت هیچ شتێك بەقەدەر ئەوە لام خۆشەویست نییە لە پێناوی تۆ جیهاد بکەم دژ بە قەومێك پێغەمبەرەکەی(ﷺ) تۆیان بە درۆ زانی و دەریان کرد، خودایە، من وا گومان دەبەم تۆ جەنگت لەنێوان ئێمە و ئەوان کۆتا پێهێناوە، گەر شتێك لە جەنگی قورەیش ماوە منی بۆ بهێڵەوە تا لە پێناوی تۆ جیهادیان بکەم، ئەگەر جەنگ کۆتا هاتووە برینەکەم بتەقێنە و مردنی منی تێدابێت، لەسینەیەوە برینەکەی تەقی، ئەوان پێیان نەزانی، لە مزگەوت خێمەیەك لە بەنی غیفار هەڵدرا بوو، خوێنی لێ دەڕۆیشت، وتیان: ئەی ئەهلی خێمە ئەم خوێنە چییە لای ئێوەوە دێت؟ بینییان برینەکەی سەعدە خوێنەکەی لەبەردەڕوات، لەوەوە سەعد(خوا لێی رازی بێت) کۆچی دوایی کرد.

## ٨- دەروازەی: هاوسەرگیری پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەگەڵ زەینەب و دابەزینی حیجاب

**٣٦٤٦-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ دَعَا الْقَوْمَ فَطَعِمُوا، ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ، وَإِذَا هُوَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ فَلَمْ يَقُومُوا، فَلَمَّا رَأَى ذٰلِكَ قَامَ، فَلَمَّا قامَ قَامَ مَنْ قَامَ وَقَعَدَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِيَدْخُلَ فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ، ثُمَّ إِنَّهُمْ قامُوا، فَانْطَلَقْتُ فَجِئْتُ، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُمْ قَدِ انْطَلَقُوا، فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ، فَأَلْقَى الْحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ﴾ [الأحزاب: ٥٣].          [خ٤٧٩١/ م١٤٢٨]

**(ق)** لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خوا لێی رازی بێت) وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوسەرگیری لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش کرد خەڵکانێکی بانگهێش کرد،

نانیان خوارد، پاشان دانیشتن قسەیان دەکرد، وەك ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ئامادە بکات بۆ هەستان، بەڵام هەڵنەستان، کاتێ کە ئەوەی بینی پێغەمبەر هەستا، کە پێغەمبەر هەستا خەڵکانێ هەستان و سێ کەس دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ئەوەی بچێتە ژوورەوە بینی ئەوان دانیشتوون، پاشان ئەوانیش هەستان، منیش ڕۆیشتم و هاتم و هەواڵمدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوان ڕۆیشتوون، پێغەمبەر هات تا چووە ژوورەوە منیش لەگەڵی چوومە ژوورەوە لە نێوان من و خۆی حیجابەکەی دادایەوە، خودا ئایەتی دابەزاند ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ ﴾ [الأحزاب: ٥٣].



# بەشی حەوتەم

# غەزوەی بەنی میستەلیق

## ١- دەروازەی: لەشکرکێشی بۆ سەر بەنی میستەلیق

**٣٦٤٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عَوْنٍ قالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ، فَكَتَبَ إِلَيَّ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَغَارَ عَلَى بَنِي المصْطَلِقِ وَهُمْ غارُّونَ، وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الماءِ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ، وَسَبَى ذَرَارِيَّهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَةَ. حَدَّثَنِي بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَكَانَ فِي ذلِكَ الجَيْشِ.
[خ٢٥٤١/ م١٧٣٠]

**(ق) لەئیبن عەونەوە وتی: بۆ نافیعم نووسی و ئەویش بۆی نوسیمەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دای بەسەر بەنی میستەلیقدا و ئەوان بێئاگابوون و ئاژەڵەکانیان ئاویان دەخواردەوە، جەنگاوەرەکانی کوشتن و ژن و منداڵەکانی یەخسیرکردن، لەو ڕۆژەدا جوەیریەی بەدەستهێنا، عەبدوڵا ی کوڕی عومەر ئەمەی بۆ باسکردووم، ئەو لەناو ئەو سوپایەدا بوو.**

- وعند مسلم: قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنِ الدُّعَاءِ قَبْلَ الْقِتَالِ، قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ قَدْ أَغَارَ..

**لای موسلیم وتی: نووسیم بۆ نافیع، داوای دوعای پێش جەنگانم لێکرد، وتی: ئەویش بۆی نووسیمەوە ئەوە لەسەرەتای ئیسلامەوە بوو، پێغەمبەر دای بەسەر...**

## ٢- دەروازەی: لێگەڕێن ئەوە بۆگەنە

**٣٦٤٨-** (ق) عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَقَدْ ثَابَ مَعَهُ نَاسٌ مِنَ المهَاجِرِينَ حَتَّى كَثُرُوا، وَكَانَ مِنَ المهَاجِرِينَ رَجُلٌ لَعَّابٌ، فَكَسَعَ أَنْصَارِيّاً، فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ غَضَباً شَدِيداً حَتَّى تَدَاعَوْا، وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ! وَقَالَ المهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ!

فَخَرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (ما بَالُ دَعْوَى أَهْلِ الجَاهِلِيَّةِ؟ ثُمَّ قَالَ: ما شَأْنُهُمْ)؟. فَأُخْبِرَ بِكَسْعَةِ المهَاجِرِيِّ الأَنْصَارِيَّ، قالَ: فَقَالَ: النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (دَعُوهَا، فَإِنَّهَا خَبِيثَةٌ). وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلولَ: أَقَدْ تَدَاعَوْا عَلَيْنَا، لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى المدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ، فَقَالَ عُمَرُ: أَلاَ نَقْتُلُ يَا رَسُولَ اللهِ هذَا الخَبِيثَ؟ لِعَبْدِ اللهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّهُ كانَ يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ). [خ٣٥١٨/ م٢٥٨٤]

**(ق)** له جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) غەزامان کرد، کۆمەڵێك لە موهاجیرین کۆبوونەوە تا ژمارەیان زۆر بوو، پیاوێك هەبوو لە کۆچکەران شۆخیکار بوو، دەستیبرد بۆ دواوەی پیاوێکی ئەنصاری، پیاوە ئەنصارییەکە تورەبوو بە تورەبوونێکی زۆر توند تا هەریەکەیان پەنای برد[1]، ئەنصاریەکە وتی: هاوار بۆ ئەنصار، کۆچکەرەکەش وتی: هاوار بۆ کۆچکەران.

پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە و فەرمووی: **(ئەو بانگەوازە نەفامییە چی یە؟)** پاشان فەرمووی: **(ئەوانە چییانە؟)** هەواڵی پێدرا بەدەستبردنی پیاوە کۆچکەرەکە بۆ ئەنصاریەکە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(وازی لێبهێنن ئەوە کارێکی پیسە)**.

عەبدولای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وتی: ئەوانە بۆ سەر ئێمە هانا و پەنا داوا دەکەن، گەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە خاوەن عیززەتەکان زەلیلەکان دەردەکەن، عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئەم پیسە نەکوژین؟ مەبەستی عەبدولا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(باخەڵکی نەڵێن ئەو هاوەڵانی خۆی دەکوژێت)**.

## ٣- دەروازەی: بوختان

**٣٦٤٩-** (ق) عَنْ عائشة ﷺ قَالَتْ: كانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا أَرَادَ سَفَراً أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَعَهُ. قَالَتْ عائشة: فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا، فَخَرَجَ فِيهَا سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه

---

[1] واتە: تا هەریەکەیان پەنای برد بۆ دەستەکەی خۆی، ئەو بۆ ئەنصار و ئەمیش بۆ کۆچکەران–و.

وسلّم بَعْدَ ما أُنْزِلَ الْحِجَابُ، فَكُنْتُ أُحْمَلُ فِي هَوْدَجِي وَأُنْزَلُ فِيهِ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ وَقَفَلَ، وَدَنَوْنَا مِنَ المدِينَةِ قَافِلِينَ، آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جاوَزْتُ الجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى رَحْلِي، فَلَمَسْتُ صَدْرِي فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ ظَفَارِ قَدِ انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي، فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ.

قَالَتْ: وَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كانُوا يَرْحَلُونَ لِي، فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ عَلَيْهِ، وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنِّي فِيهِ، وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافاً لَمْ يَهْبُلْنَ، وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، إِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ خِفَّةَ الْهَوْدَجِ حِينَ رَفَعُوهُ وَحَمَلُوهُ، وَكُنْتُ جارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الجَمَلَ فَسَارُوا، وَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَما اسْتَمَرَّ الجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنَازِلَهُمْ وَلَيْسَ بِهَا مِنْهُمْ دَاعٍ وَلاَ مُجِيبٌ، فَتَيَمَّمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ فِيهِ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونَنِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ.

فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ فِي مَنْزِلِي، غَلَبَتْنِي عَيْنِي فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ المعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الجَيْشِ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي، فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَعَرَفَنِي حِينَ رَآنِي، وَكَانَ رَآنِي قَبْلَ الْحِجَابِ، فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِي، فَخَمَّرْتُ وَجْهِي بِجِلْبَابِي، وَوَاللهِ ما تَكَلَّمْنَا بِكَلِمَةٍ، وَلاَ سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً غَيْرَ اسْتِرْجَاعِهِ، وَهَوَى حَتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، فَوَطِئَ عَلَى يَدِهَا، فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَرَكِبْتُهَا، فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِيَ الرَّاحِلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ مُوغِرِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ وَهُمْ نُزُولٌ.

قَالَتْ: فَهَلَكَ فِيَّ مَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى كِبْرَ الإِفْكِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ.

قَالَ عُرْوَةُ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ كانَ يُشَاعُ وَيُتَحَدَّثُ بِهِ عِنْدَهُ، فَيُقِرُّهُ وَيَسْتَمِعهُ وَيَسْتَوْشِيهِ.

قَالَتْ عائشة: فَقَدِمْنَا المدِينَةَ، فَاشْتَكَيْتُ حِينَ قَدِمْتُ شَهْراً، وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ فِي قَوْلِ أَصْحَابِ الإِفْكِ، لاَ أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذلِكَ، وَهْوَ يُرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لاَ أَعْرِفُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَشْتَكِي، إِنَّمَا يَدْخُلُ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَيُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُولُ: (**كَيْفَ تِيكُمْ؟**)، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَذلِكَ يَرِيبُنِي وَلاَ أَشْعُرُ بِالشَّرِّ. حَتَّى خَرَجْتُ حِينَ نَقَهْتُ، فَخَرَجْتُ مَعَ أُمِّ مِسْطَحٍ قِبَلَ المنَاصِعِ، وَكَانَ مُتَبَرَّزَنَا، وَكُنَّا لاَ نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ، وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيباً مِنْ بُيُوتِنَا. قَالَتْ: وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الأُوَلِ فِي الْبَرِّيَّةِ قِبَلَ الْغَائِطِ، وَكُنَّا نَتَأَذَّى بِالْكُنُفِ أَنْ نَتَّخِذَهَا عِنْدَ بُيُوتِنَا.

قَالَتْ: فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ، وَهْيَ ابْنَةُ أَبِي رُهْمِ بْنِ المطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَأُمُّهَا بِنْتُ صَخْرِ بْنِ عامر خالَةُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَابْنُهَا مِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ بْنِ عَبَّادِ بْنِ المطَّلِبِ، فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ بَيْتِي حِينَ فَرَغْنَا مِنْ شَأْنِنَا، فَعَثَرَتْ أُمُّ مِسْطَحٍ فِي مِرْطِهَا فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ ما قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلاً شَهِدَ بَدْراً؟ فَقَالَتْ: أَيْ هَنْتَاهْ! وَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالَ؟ قَالَتْ: وَقُلْتُ: وَمَا قَالَ؟ فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ، قَالَتْ: فَازْدَدْتُ مَرَضاً عَلَى مَرَضِي. فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَسَلَّمَ، ثُمَّ قالَ: (**كَيْفَ تِيكُمْ**)؟ فَقُلْتُ لَهُ: أَتَأْذَنُ لِي أَنْ آتِيَ أَبَوَيَّ؟ قَالَتْ: وَأُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا.

قَالَتْ: فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ لأُمِّي: يَا أُمَّتَاهُ ماذَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ؟ قَالَتْ: يا بُنَيَّةُ هَوِّنِي عَلَيْكِ، فَوَاللهِ لَقَلَّمَا كانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةً عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا، لَهَا ضَرَائِرُ، إِلاَّ أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا. قَالَتْ: فَقُلْتُ: سُبْحَانَ اللهِ، أَوَلَقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بِهذَا؟ قَالَتْ: فَبَكَيْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ، وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، ثُمَّ أَصْبَحْتُ أَبْكِي...

قالَتْ: فَبَكَيْتُ يَوْمِي ذلِكَ كُلَّهُ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ. قَالَتْ: وَأَصْبَحَ أَبَوَايَ عِنْدِي، وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْماً، لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، حَتَّى إِنِّي لأَظُنُّ أَنَّ الْبُكَاءَ فالِقٌ كَبِدِي، فَبَيْنَا أَبَوَايَ جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا، فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي. قالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذلِكَ دَخَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْنَا، فَسَلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ، قَالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مُنْذ قِيلَ ما قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ لَبِثَ شَهْراً لاَ يُوحى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي بِشَيْءٍ، قالَتْ: فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ جَلَسَ، ثُمَّ قالَ: (**أَمَّا بَعْدُ، يَا عائشة إِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً، فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ، فَاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ ثُمَّ تابَ، تَابَ اللهُ عَلَيْهِ**).

قَالَتْ: فَلَمَّا قَضى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَقَالَتَهُ، قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى ما أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، فَقُلْتُ لأَبِي: أَجِبْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنِّي فِيما قالَ، فَقَالَ أَبِي: وَاللهِ ما أَدْرِي ما أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ لأُمِّي: أَجِيبِي رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِيما قالَ، قالَتْ أُمِّي: وَاللهِ ما أَدْرِي ما أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَقُلْتُ، وَأَنَا جارِيَةٌ حَدِيثَةِ السِّنِّ لاَ أَقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ كَثِيراً: إِنِّي وَاللهِ لَقَدْ عَلِمْتُ: لَقَدْ سَمِعْتُمْ هَذَا الحَدِيثَ حَتَّى اسْتَقَرَّ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ: إِنِّي بَرِيئَةٌ، لاَ تُصَدِّقُونَنِي، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ

لَكُمْ بِأَمْرٍ، وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي مِنْهُ بَرِيئَةٌ، لَتُصَدِّقُنِّي! فَوَاللهِ لاَ أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلاً إِلاَّ أَبَا يُوسُفَ حِينَ قالَ: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴿١٨﴾﴾ [يوسف: ١٨].

ثُمَّ تَحَوَّلْتُ وَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي، وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي حِينَئِذٍ بَرِيئَةٌ، وَأَنَّ اللهَ مُبَرِّئِي بِبَرَاءَتِي، وَلكِنْ وَاللهِ ما كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللهَ مُنْزِلٌ فِي شأْنِي وَحْياً يُتْلَى، لَشَأْنِي فِي نَفْسِي كانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللهُ فِيَّ بِأَمْرٍ، وَلكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللهُ بِهَا. فَوَاللهِ ما رَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَجْلِسَهُ، وَلاَ خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ، حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِنَ الْعَرَقِ مِثْلُ الجُمَانِ، وَهْوَ فِي يَوْمٍ شَاتٍ، مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَسُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهْوَ يَضْحَكُ، فَكَانَتْ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قالَ: (**يَا عائشة، أَمَّا اللهُ فَقَدْ بَرَّأَكِ**).

قَالَتْ: فَقَالَتْ لِي أُمِّي: قُومِي إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: وَاللهِ لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، فَإِنِّي لاَ أَحْمَدُ إِلاَّ اللهَ عزّ وجل.

قَالَتْ: وَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾[النور: ١١] الْعَشْرَ الآيَاتِ، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ هذَا فِي بَرَاءَتِي. [خ٤١٤١/ م٢٧٧٠]

**(ق) له عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت) وتی: گەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەفەرێکی بکردبایە لەنێوان هاوسەرەکانی قورعەی دەکرد، هەرکامیان قورعەکەی بۆ دەرچووبایە لەگەل پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڕۆیشت عائیشە وتی: لە غەزایەك لە غەزاکان لەنێوان قورعەی کرد، قورعەکەی من دەرچوو، لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچووم لە دوای ئەوەی کە ئایەتی حیجاب دابەزی بوو، لە کەژاوەکەمدا هەڵدەگیرام و لە کەژاوەکەم دادەنرام، ڕۆیشتین تا پێغەمبەر(ﷺ) لەو غەزایەی تەوابوو و گەڕایەوە، کاروانیەکەمان نزیك بوویەوە لە مەدینە، شەوەکەی مۆڵەتی ڕۆیشتنی دابوو، کاتێ مۆڵەتی ڕۆشتنی دا منیش هەستام و ڕۆیشتم تا لە سوپاکە دوورکەوتمەوە، کاتێ کارەکەم تەوابوو گەڕامەوە بۆلای کۆڵ و بارەکەم، دەستم لە سینەی خۆم دا ئەو ملوانکەی لە مورووی یەمانی بوو پچرابوو، گەڕامەوە بەدوای ملوانکەکەدا گەڕام، هەوڵی دۆزینەوەی بەندی کردم.**

**عائیشە وتی: ئەو کۆمەڵەی کەژاوەکەیان هەڵدەگرتم هاتبوون کەژاوەکەیان بەرز کردبووەوە و خستبوویانە سەر ئەو حوشترەی منی لەسەر سوار دەبووم، ئەوان وایان زانی بوو منی تێدایە، ئافرەتان لەو ڕۆژگارەدا لات و لاوازبوون، قەڵەو نەبووبوون و گۆشت**

داینەپۆشیبوون، ئەوان شتێکی کەمیان لە خواردن دەخوارد، بۆیە خەڵکەکە سوکی کەژاوەکەی منیان لا ئاسایی بوو کاتێ بەرزیان کرد بوو و خستبوویانە سەر حوشترەکە، ئەو ڕۆژگارەش من کچۆڵەیەك بووم تەمەنم کەم بوو، حوشترەکەیان دابوویەبەر و ڕۆیشتبوون، منیش ملوانکەکەم دۆزییەوە دوای ئەوەی سوپاکە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، هاتم بۆ شوێنەکەیان هیچ بانگکەر و وەڵامدەرەوەیەك نەبوو، بۆیە لەو شوێنەی تیایدا بووم مامەوە، وا گومانم برد ئەوان بەدوامدا دەگەڕێن و دەگەڕێنەوە بۆ لام.

کاتێ کە من دانیشتبووم لە شوێنەکەم، خەو زاڵبوو بەسەر چاوەکانمدا و خەوم لێکەوت، صەفوانی کوڕی موعەتەمی سولەیمی پاشان زەکوانی لە دوای سوپاکەوە بوو، بەیانی گەیشتە شوێنەکەی من، تارمایی مرۆڤێکی خەوتووی بینی، کاتێ کە بینیمی منی ناسییەوە، ئەو پێش حیجاب منی بینی بوو، بۆیە بە استرجاعی ئەو[1] منیش بە ئاگا هاتم، کاتێ ناسیمی بەجیلبابەکەم ڕوخساری خۆم داپۆشی، سوێند بە خودا، تەنها وشەیکیش قسەمان نەکرد و تەنها وشەیەکیشم لێ نەبیست جگە لە استرجاع، دابەزی و حوشترەکەی یەخدا پێی لەسەر پێی دانا، منیش هەستام و سواری بووم، ڕۆیشت و حوشتەرەکەی لێخوڕی تا هاتین بۆ لای سوپاکە، چووبوونە ناو گەرمای نیوەڕۆوە، ئەوان دابەزیبوون.

عائیشە وتی: کەسانێك کە دەربارەی من قسەیان کرد تیاچوون، ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی درۆ و بوختانەکەی دەکرد عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو.

عوروە وتی: هەواڵم پێدرا ئەو بوختانە بڵاو دەکرایەوە و لە لای ئەو[2] باس و خواس دەکرا، ئەویش دانی پێدا دەنا و گوێی بۆ دەگرت و بڵاوەی پێ دەکرد.

عائیشە وتی: هاتینەوە بۆ مەدینە، کاتێ گەیشتمە بەرەوە مانگێك نەخۆش کەوتم، خەڵکیش بەردەوامبوون لە وتنی قسەی ئەوانەی کە درۆ و بوختانەکەیان دەکرد، من هەستم بە شتێك لەوە نەدەکرد، ئەوەی جێگەی شك و گومان بوو ئەوەبوو لە

---

[1] واتە: بە وتنی "إنا لله وإنا إليه راجعون"—و.

[2] واتە: عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول—و.

ئازەرەکەمدا من له پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لوتفم نەدەبینی، ئەوەی جاران دەمبینی کاتێ نەخۆش دەکەوتم، بەڵکو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەهاتە ژوورەوە بۆ لام سەلامی دەکرد و پاشان دەیفەرموو: (**نەخۆشیەکەتان چۆنە**)، پاشان دەڕۆیشت، ئەوە شك و گومانی بۆ دروستکردبووم، بەڵام هەستم بە شەڕ نەدەکرد، تا کاتێ بەرەو چاکبوونەوە ڕۆیشتم، لەگەڵ ئوم میستەح چوومە دەرەوە بەرەو مەناسیع، ئەو شوێنە شوێنی ئافرەتان بوو، ئەم شەو بۆ ئەو شەو دەچووین بۆ ئەو شوێنە، ئەوەش بەرلەوەی ساتیر[1] نزیك بە ماڵەکانمان دروست بکەین، عائیشە وتی: حاڵ و بارمان وەك حاڵی عەرەبەکانی پێشین بوو لە دەشت و دەر بۆ چوونە سەر پێشاو، ئێمە بێزار دەبووین بە شوێنی پێشاو لای ماڵەکانمان دروستی بکەین.

عائیشە وتی: من و ئوم میستەح ڕۆیشتین، ئەو کچی ئەبی ڕوهمی کوڕی موتەلیبی کوڕی عبدالمناف بوو، دایکی کچی سەخری کوڕی عامر بوو-پوری ئەبوبەکری صدیق- کوڕەکەی ناوی میستەحی کوڕی ئوساسەی کوڕی عەبادی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو، کە لە کاروبارمان تەواو بووین من و ئوم میستەح ڕوو بە ماڵەکەی من دەگەڕاینەوە، ئوم میستەح لە پۆشاکە خوریەکەیدا هەڵکەوت و وتی: تیاچێت میستەح، منیش پێم وت خراپترین شتت وت، ئایا قسە بە پیاوێك دەڵێی بەدری بینیوە؟ ئەویش وتی: ئەی فلان، بۆ تۆ ئەوەی ئەو دەیلێت نەتبیستووە؟ عائیشە وتی: وتم ئەو چی دەڵێت؟ ئوم میستەح هەواڵی پێدام دەربارەی ئەهلی بوختانەکە، وتی: نەخۆشییەکی ترم لەسەر نەخۆشییەکەم بۆ زیادبوو، کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە و سەلامی کرد، پاشان فەرمووی: (**ئێوە چۆنن؟**) پێم وت ئایا مۆڵەتم دەدەی بگەڕێمەوە بۆ لای دایك و باوکم؟ عائیشە وتی: ویستم لە لای ئەوان ڕاستەقینەی هەواڵەکەم دەست بکەوێت.

وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) مۆڵەتی دام، بەدایکم وت: دایکی خۆم خەڵکی باسی چی دەکەن؟ ئەویش وتی: کچی خۆم کارەکە لەسەر خۆت سووك بکە، سوێند بە

---

[1] ساتیر: وەك ئاودەست وابووە-و.

خودا کەم ئافرەتی جوان و پێکەوتوو هەیە لای پیاوێك خۆشیان بوێت و هەوێی هەبێت قسەی جۆراو جۆری لەسەر نەکرابێت، عائیشە وتی: سبحان الله! ئایا خەڵکی ئەو جۆرە قسانە دەکەن؟ وتی: ئەو شەوە گریام تا ڕۆژم لێبوویەوە فرمێسکم وشك نەبوویەوە و خەو نەچووە چاوانم، پاشان ڕۆژم لێ بوویەوە و من دەگریام..

عائیشە وتی: هەموو ڕۆژەکەم خەریکی گریان بووم و فرمێسکم نەدەبڕا و خەو نەدەچووە چاوانم، وتی: باوك و دایکم لە لام بوون، دوو شەو و ڕۆژێك من گریام، فرمێسکم وشك نەدەبوویەوە و خەو نەدەچووە چاوانم، تا وا گومان دەبرد گریان جگەرم بکات بە دوو لەتەوە، کاتێ دایك و باوکم لام دانیشتبوون و من دەگریام ئافرەتێك لە ئەنصار داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد، منیش مۆڵەتم دا ئەویش دانیشت و دەستی بە گریان کرد، عائیشە وتی: لە کاتێکدا ئێمە لەسەر ئەو حاڵە بووین پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لامان، سەلامی کرد پاشان دانیشت، عائیشە وتی: لەو کاتەوەی ئەو قسە و باسانە کرابوو لە لام دانەنیشت بوو، یەك مانگ مابوویەوە و شتێك دەربارەی ئەو کاروبارەی بەمن نەوتبوو، عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) شایەتوومانی هێنا و دانیشت پاشان فەرمووی: (**أما بعد، ئەی عائیشە، ئەوە و ئەوە دەربارەی تۆ بە من گەیشتووە، ئەگەر تۆ بەریت خودا بەریت دەکات، گەر بە گوناهێکیش توشبوویت داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە و بگەڕێرەوە بۆ لای خودا، چونکە گەر بەندە دانی نا بە گوناهی خۆیدا و پاشان تۆبەی کرد خودا تەوبەی لێقبوول دەکات**).

عائیشە وتی: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەکەی تەواو بوو، فرمێسکم وشك بوویەوە تەنانەت هەستم بە دڵۆپێك نەکرد، وتم بە باوکم لە منەوە وەڵامی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدەرەوە لەوەی فەرمووی، باوکم وتی: سوێند بەخودا من نازانم چی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڵێم، وتم بە دایکم لە منەوە وەڵامی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدەرەوە لەوەی فەرمووی، دایکم وتی: سوێند بە خودا من نازانم چی وەڵامی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدەمەوە، من جاریەکی کەم تەمەن بووم زۆر قورئانم نەدەخوێند، وتم: سوێند بە خودا، من دەزانم ئێوە ئەو قسانەتان بیستووە و لە

نەفستان جێگیر بووە و باوەڕتان پێهێناوە، گەر پێتان بڵێم: مـن بـەریم، بـاوەڕم پـێ ناکەن، گەر بۆ ئێوە دان بنێم بە کارێکدا باوەڕم پێ دەکەن و خـوداش دەزانێـت مـن لەو کارە بەریم، سوێند بە خودا، نموونەی من و ئێوە لـە بـاوکی یوسـفدا دەبینمـەوە کاتێك کە فەرمووی: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ [يوسف: ١٨].

پاشان پشتم هەڵکرد و لەسەر جێگەکەمەم ڕاکشام، خودا دەزانێ من لـەو دەمـەدا بەریم، بۆیە خودا من بەری دەکات بە بەرائەتی خۆم، بەڵام سوێند بە خودا، وا گومانم نەدەبرد خودا وەحییەك دەربارەی من دابەزێنێ و بخوێنرێتەوە، شان و شـکۆی خـۆم سوك و کەمتر لەوە تەماشا دەکرد خودا دەربارەی من قسـە بفـەرموێ، بـەڵام ڕجـام وابوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خەودا خەونێك ببینێ و بەوە خـودا مـن بـەری بکـات، سوێند بە خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەجلیسەکە جیانەبوویەوە و هیچ کەس لـە خانەوادەکە نەچووە دەرەوە تا وەحی بۆ سەر دابـەزی، ئـەو توندییـە داگیریکـرد لـە وەحیدا داگیری دەکرد، تەنانەت ئەو لە ڕۆژێکی زۆر سـاردا ئارەقـەی لێدەچۆڕا وەك دەنکە مرواری لە قورسی ئەو قەولەی دادەبەزێنرا بۆ سەری، عائیشە وتـی: وەحیەکـە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گیرایەوە و ئـەو پێدەکـەنی، یەکـەمین کەلیمـەك فـەرمووی: ئەوەبوو فەرمووی: **(ئەی عائیشە، سوێند بە خودا، خودا بەری کردیت)**.

عائیشە وتی: دایکم پێی وتم: هەستە بۆ خزمەتی پێغەمبـەر(ﷺ)، وتم: سـوێند بـە خودا، هەڵناستم بۆ لای، من تەنها حەمدی خودا(عز وجل) دەکەم.

عائیشە وتی: خودا(سبحانه وتعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾[النور: ١١]، دە ئایـەت، بەدوایانـدا خـودا دەربـارەی بەرائـەتی مـن ئایەتی دابەزاند.

## ٤- دەروازەی: سریەی شمشێری دەریا

٣٦٥٠- (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم ثَلاَثَمِائَةِ رَاكِبٍ، وَأَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ، نَرْصُدُ عِيراً لِقُرَيْشٍ، فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الخَبَطَ،

فَسُمِّيَ جَيْشَ الخَبَطِ، وَأَلْقَى الْبَحْرُ حُوتاً يُقَالُ لَهُ الْعَنْبَرُ، فَأَكَلْنَا نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا بِوَدَكِهِ، حَتَّى صَلَحَتْ أَجْسَامُنَا. قالَ: فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعاً مِنْ أَضْلاَعِهِ فَنَصَبَهُ، فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ. وَكَانَ فِينَا رَجُلٌ، فَلَمَّا اشْتَدَّ الجُوعُ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ ثَلاَثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ نَهَاهُ أَبُو عُبَيْدَةَ.

[خ٤٩٤٥ (٢٤٨٣)/ م١٩٣٥]

**(ق) لە جابری کوری عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانەیکردین سێ سەد سوار بووین، ئەمیرەکەمان ئەبو عوبێدە بوو، چاودێری کاروانییەکی قورەیشمان دەکرد، برسێتییەکی زۆر توندمان تووشهات تا گەڵای دار(الخَبَط)مان دەخوارد، بۆیە سوپاکە ناونرا سوپای (الخبط)، دەریا حوتێکی هەڵدابووە دەرەوە، پێ دەوترا عەنبەر، نیو مانگ لێمان خوارد، بە چەوری ڕۆنەکەی خۆمان چەور دەکرد، تا جەستەمان بەرەو باشی ڕۆیشت، وتی: ئەبو عوبێدە پەراسوویەك لە پەراسوەکانی داکوتی: سوار بەژێریدا تێدەپەڕی، پیاوێك لە ناومان بوو کاتێ برسێتی زۆری هێنا سێ حوشتری سەربڕی، پاشان سیانی تر، پاشان ئەبو عوبێدە نەهی لێکرد لە سەربڕین.**

- وفي رواية للبخاري: قال: فَخَرَجْنَا، وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ فَنِيَ الزَّادُ، فَأَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِأَزْوَادِ الجَيْشِ فَجُمِعَ، فَكَانَ مِزْوَدَيْ تَمْرٍ، فَكَانَ يُقَوِّتُنَا كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلاً قَلِيلاً حَتَّى فَنِيَ، فَلَمْ يَكُنْ يُصِيبُنَا إِلاَّ تَمْرَةٌ تَمْرَةٌ، فَقُلْتُ: ما تُغْنِي عَنْكُمْ تَمْرَةٌ؟ فَقَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَنِيَتْ، ثُمَّ انْتَهَيْنَا إِلَى الْبَحْرِ، فإذا حوتٌ مثلُ الظَّرِبِ. [خ٤٣٦٠]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: بوخاریدا: وتی: ڕۆیشتین لە بەشێك لە ڕێگەکە توێشوومان تەواو بوو، ئەبو عوبێدە فەرمانی کرد توێشووی سوپاکە کۆکرایەوە، توێشوەکەی من خورما بوو، هەموو ڕۆژێك کەم کەم پێی دەداین تا تەواو بوو، تەنها دەنك دەنك خورمای پێ دەداین، وتم: دەبێت دەنکێك خورما چی لە برسێتی ئێوە بکات؟ جابر وتی: کاتێ خورماکە تەواو بوو هەستمان کرد نەبوونی چەند کاریگەرە، پاشان گەیشتینە دەریا، بینیمان حوتێك وەك چیایەکی بچووك بوو.**

## بەشی هەشتەم

# سوڵحی حودەیبیە و ئەوەی بەدوایدا دێت

## ١- دەروازەی: فەزڵی هاوەڵانی بەیعەتی ڕیزوان

**٣٦٥١-** (خ) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قالَ: تَعُدُّونَ أَنْتُمُ الْفَتْحَ فَتْحَ مَكَّةَ، وَقَدْ كانَ فَتْحُ مَكَّةَ فَتْحاً، وَنَحْنُ نَعُدُّ الْفَتْحَ بَيْعَةَ الرِّضْوَانِ يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ، كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، وَالْحُدَيْبِيَةُ بِئْرٌ، فَنَزَحْنَاهَا فَلَمْ نَتْرُكْ فِيهَا قَطْرَةً، فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَتَاهَا، فَجَلَسَ عَلَى شَفِيرِهَا، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ ماءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَدَعَا ثُمَّ صَبَّهُ فِيهَا، فَتَرَكْنَاهَا غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ إِنَّهَا أَصْدَرَتْنَا ما شِئْنَا نَحْنُ وَرِكابَنَا. [خ٤١٥٠ (٣٥٧٧)]

**(خ) لەبەرائەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئێوە فەتحی مەککە بە فەتح دەزانن، فەتحی مەککە فەتحێك بوو، بەڵام ئێمە بەیعەتی ڕیزوانی ڕۆژی حودەیبییە بە فەتح دەزانین، ئێمە هەزار و چوارسەد کەس لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، حودەیبییە بیرێك بوو، لای بیرەکە خستمان، دڵۆپێك ئاوی تێدا نەما، ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت و هات بۆ لای بیرەکە، لە قەراغی بیرەکە دانیشت، پاشان داوای دەفرێك ئاوی کرد، دەستنوێژی گرت، پاشان ئاوی کردە دەمی و دوعای کرد و پاشان کردیە ناو بیرەکەوە، بۆ ماوەیەك بەجێمانهێڵا، پاشان چەندمان ویست بۆ خۆمان و وڵاخەکانمان لێمان هەڵگۆزی.**

**٣٦٥٢-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قالَ: أَخْبَرَتْنِي أُمُّ مُبَشِّرٍ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ عِنْدَ حَفْصَةَ: (**لاَ يَدْخُلُ النَّارَ إِنْ شَاءَ اللهُ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ أَحَدٌ، الَّذِينَ بَايَعُوا تَحْتَهَا**) قَالَتْ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! فَانْتَهَرَهَا. فَقَالَتْ حَفْصَةُ: ﴿**وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا**﴾ [مريم: ٧١] فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**قَدْ قَالَ اللهُ عز وجل: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾** [مريم: ٧١]). [م٢٤٩٦]

**(م)** لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: ئوم موبەشیر هەواڵی پێدام، ئەو گوێی لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) لای حەفصە دەیفەرموو: (**انشا ْالله هیچ کام لە هاوەڵانی درەختەکە ناچنە ناو ئاگرەوە، ئەوانەی لە ژێر درەختەکەدا بەیعەتیان دا**) حەفصە وتی: با، ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر هەڕەشەی لێ کرد، حەفصە وتی: ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ [مریم: ٧١]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودا (عز وجل) فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ [مریم: ٧١]).

**٣٦٥٣**– (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ: (**أَنْتُمْ خَيْرُ أَهْلِ الأَرْضِ**) وَكُنَّا أَلْفاً وَأَرْبَعَمَائَةٍ، وَلَوْ كُنْتُ أُبْصِرُ الْيَوْمَ لأَرَيْتُكُمْ مَكَانَ الشَّجَرَةِ. [خ٤١٥٤ (٣٥٧٦)/ م١٨٥٦]

**(ق)** لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی حودەیبیە پێی فەرمووین (**ئێوە باشترین ئەهلی زەوین**)، ئێمە هەزار و چوارسەد کەس بووین، گەر ئەمڕۆ چاوم ببینیبا شوێنی درەختەکەم پێ نیشان دەدان.

**٣٦٥٤**– (ق) عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ: عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى المَوْتِ.
[خ٤١٦٩ (٢٩٦٠)/ م١٨٦٠]

**(ق)** لە یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەیدەوە، وتی: بە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعم وت: ڕۆژی حودەیبییە لەسەر چ شتێك بەیعەتان کرد بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ وتی: لەسەر مردن.

**٣٦٥٥**– (م) عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي يَوْمَ الشَّجَرَةِ، وَالنَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يُبَايِعُ النَّاسَ، وَأَنَا رَافِعٌ غصْناً مِنْ أَغْصَانِهَا عَنْ رَأْسِهِ، وَنَحْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً. قَالَ: لَمْ نُبَايِعْهُ عَلَى الْمَوْتِ، وَلَكِنْ بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لاَ نَفِرَّ. [م١٨٥٨]

**(م)** لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە، ڕۆژی درەختەکە گەر منت ببینیبایە پێغەمبەر(ﷺ) بەیعەتی بەخەڵك دەدا من لقێك لە لقەکانی دارەکەم بەرز کردبووەوە لە

ئاستی سەرم، ئێمە هەزار و چوارسەد کەس بووین، وتی: لەسەر مردن بەیعەتمان پێ نەکرد، بەڵکو لەسەر هەڵنەهاتن بەیعەتمان پێ کرد.

## ٢- دەروازەی: دانووستانی سوڵح و نووسینی

٣٦٥٦- (خ) عَنْ مَعْمَرٍ قالَ: أَخْبَرَنِي الزُّهْرِيُّ قالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ ـ يُصَدِّقُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا حَدِيثَ صَاحِبِهِ ـ قَالاَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم زَمَنَ الحُدَيْبِيَةِ، حَتَّى إذا كانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ خالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ بِالْغَمِيمِ، فِي خَيْلٍ لِقُرَيْشٍ طَلِيعَةً، فَخُذُوا ذَاتَ الْيَمِينِ)**.

فَوَاللهِ ما شَعَرَ بِهِمْ خَالِدٌ حَتَّى إِذَا هُمْ بِقَتَرَةِ الجَيْشِ، فَانْطَلَقَ يَرْكُض نَذِيراً لِقُرَيْشٍ، وَسَارَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى إِذَا كانَ بِالثَّنِيَّةِ الَّتِي يُهْبَطُ عَلَيْهِمْ مِنْهَا، بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ، فَقَالَ النَّاسُ: حَلْ حَلْ، فَأَلَحَّتْ، فَقَالُوا خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ، خَلأَتِ القَصْوَاءُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(ما خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ، وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلكِنْ حَبَسَهَا حابِسُ الْفِيلِ)**. ثُمَّ قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يَسْأَلُونَنِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُماتِ اللهِ؛ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا)**، ثُمَّ زَجَرَهَا فَوَثَبَتْ.

قالَ: فَعَدَلَ عَنْهُمْ حَتَّى نَزَلَ بِأَقْصى الحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَمَدٍ قَلِيلِ الماءِ، يَتَبَرَّضُهُ النَّاسُ تَبَرُّضاً، فَلَمْ يُلَبِّثْهُ النَّاسُ حَتَّى نَزَحُوهُ، وَشُكِيَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْعَطَشُ، فَانْتَزَعَ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهُ فِيهِ، فَوَاللهِ ما زَالَ يَجِيشُ لَهُمْ بِالرِّيِّ حَتَّى صَدَرُوا عَنْهُ.

فَبَيْنَمَا هُمْ كَذلِكَ، إِذْ جاءَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ الخُزَاعِيُّ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ خُزَاعَةَ ـ وَكَانُوا عَيْبَةَ نُصْحِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ أَهْلِ تِهَامَةَ ـ فَقَالَ: إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيٍّ وَعامر بْنَ لُؤَيٍّ نَزَلُوا أَعْدَادَ مِيَاهِ الحُدَيْبِيَةِ، وَمَعَهُمُ الْعُوذُ المطَافِيلُ، وَهُمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنِ الْبَيْتِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّا لَمْ نَجِئْ لِقِتَالِ أَحَدٍ، وَلكِنَّا جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ، وَإِنَّ قُرَيْشاً قَدْ نَهِكَتْهُمُ الحَرْبُ، وَأَضَرَّتْ بِهِمْ، فَإِنْ شَاؤُوا مادَدْتُهُمْ مُدَّةً، وَيُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ النَّاسِ، فَإِنْ أَظْهَرْ: فَإِنْ شَاؤُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِيمَا دَخَلَ فِيهِ النَّاسُ فَعَلُوا؛ وَإِلاَّ فَقَدْ جَمُّوا، وَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَذَا حَتَّى تَنْفَرِدَ سَالِفَتِي، وَلَيُنْفِذَنَّ اللهُ أَمْرَهُ)**. فَقَالَ بُدَيْلٌ: سَأُبَلِّغُهُمْ ما تَقُولُ.

قَالَ: فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى قُرَيْشاً، قالَ: إِنَّا قَدْ جِئْنَاكُمْ مِنْ هَذَا الرَّجُلِ، وَسَمِعْنَاهُ يَقُول قَوْلاً، فَإِنْ شِئْتُمْ أَنْ نَعْرِضَهُ عَلَيْكُمْ فَعَلْنَا، فَقَالَ سُفَهَاؤُهُمْ: لاَ حاجَةَ لَنَا أَنْ تُخْبِرَنَا عَنْهُ بِشَيْءٍ، وَقَالَ ذَوُو

الرَّأْيِ مِنْهُمْ: هَاتِ ما سَمِعْتَهُ يَقُولُ، قالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا، فَحَدَّثَهُمْ بِمَا قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم.

فَقَامَ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ، أَلَسْتُمْ بِالْوَالِدِ؟ قالُوا: بَلَى، قالَ: أَوَلَسْتُ بِالْوَلَدِ؟ قالُوا: بَلَى، قالَ: فَهَلْ تَتَّهِمُونَنِي؟ قالوا: لاَ، قالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي اسْتَنْفَرْتُ أَهْلَ عُكَاظٍ، فَلَمَّا بَلَّحُوا عَلَيَّ جِئْتُكُمْ بِأَهْلِي وَوَلَدِي وَمَنْ أَطَاعَنِي؟ قالُوا: بَلَى، قالَ: فَإِنَّ هذا قَدْ عَرَضَ لَكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ، اقْبَلُوهَا وَدَعُونِي آتِيهِ، قالُوا: ائتِهِ، فَأَتَاهُ، فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم نَحْواً مِنْ قَوْلِهِ لِبُدَيْلٍ، فَقَالَ عُرْوَةُ عِنْدَ ذلِكَ: أَيْ مُحَمَّدُ، أَرَأَيْتَ إِنِ اسْتَأْصَلْتَ أَمْرَ قَوْمِكَ، هَلْ سَمِعْتَ بِأَحَدٍ مِنَ الْعَرَبِ اجْتَاحَ أَهْلَهُ قَبْلَكَ؟ وَإِنْ تَكُنِ الأُخْرَى، فَإِنِّي وَاللهِ لا أَرَى وُجُوهاً، وَإِنِّي لأَرَى أَشْوَاباً مِنَ النَّاسِ خَلِيقاً أَنْ يَفِرُّوا وَيَدَعُوكَ. فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: امْصُصْ بِبَظْرِ الَّلاتِ، أَنَحْنُ نَفِرُّ عَنْهُ وَنَدَعُهُ؟ فَقَالَ: مَنْ ذَا؟ قالُوا: أَبُو بَكْرٍ، قالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ يَدٌ كانَتْ لَكَ عِنْدِي لَمْ أَجْزِكَ بِهَا لأَجَبْتُكَ. قَالَ: وَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَكُلَّمَا تَكَلَّمَ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ، وَالمغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قائِمٌ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ، فَكُلَّمَا أَهْوَى عُرْوَةُ بِيَدِهِ إِلَى لِحْيَةِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ، وَقَالَ لَهُ: أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَرَفَعَ عُرْوَةُ رَأْسَهُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: المغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَقَالَ: أَيْ غُدَرُ! أَلَسْتُ أَسْعَى فِي غَدْرَتِكَ.

وَكَانَ المغِيرَةُ صَحِبَ قَوْماً فِي الجَاهِلِيَّةِ فَقَتَلَهُمْ، وَأَخَذَ أَمْوَالَهُمْ، ثُمَّ جاءَ فَأَسْلَمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَمَّا الإِسْلاَمَ فَأَقْبَلُ، وَأَمَّا المَالَ فَلَسْتُ مِنْهُ فِي شَيْءٍ)**.

ثُمَّ إِنَّ عُرْوَةَ جَعَلَ يَرْمُقُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِعَيْنَيْهِ، قالَ: فَوَاللهِ ما تَنَخَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نُخَامَةً؛ إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ، وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ كادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ، وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيماً لَهُ.

فَرَجَعَ عُرْوَةُ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ، وَاللهِ لَقَدْ وَفَدْتُ عَلَى المُلُوكِ، وَوَفَدْتُ عَلَى قَيْصَرَ وَكِسْرَى وَالنَّجَاشِيِّ. وَاللهِ إِنْ رَأَيْتُ مَلِكاً قَطُّ يُعَظِّمُهُ أَصْحَابُهُ مَا يُعَظِّمُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم مُحَمَّداً. وَاللهِ إِنْ تَنَخَّمَ نُخَامَةً؛ إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ، وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ كادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ، وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيماً لَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ عَرَضَ عَلَيْكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ فَاقْبَلُوهَا.

فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي كِنَانَةَ: دَعُونِي آتِيهِ، فَقَالُوا: ائْتِهِ، فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابِهِ، قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَذَا فُلاَنٌ، وَهُوَ مِنْ قَوْمٍ يُعَظِّمُونَ الْبُدْنَ، فَابْعَثُوهَا لَهُ**). فَبُعِثَتْ لَهُ، وَاسْتَقْبَلَهُ النَّاسُ يُلَبُّونَ، فَلَمَّا رَأَى ذلِكَ قالَ: سُبْحَانَ اللهِ! ما يَنْبَغِي لِهَؤُلاَءِ أَنْ يُصَدُّوا عَنِ الْبَيْتِ، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ قالَ: رَأَيْتُ الْبُدْنَ قَدْ قُلِّدَتْ وَأُشْعِرَتْ، فَمَا أَرَى أَنْ يُصَدُّوا عَنِ الْبَيْتِ.

فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، يُقَالُ لَهُ مِكْرَزُ بْنُ حَفْصٍ، فَقَالَ: دَعُونِي آتِيهِ، فَقَالُوا ائْتِهِ، فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ، قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَذَا مِكْرَزٌ، وَهُوَ رَجُلٌ فاجِرٌ**). فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَبَيْنَما هُوَ يُكَلِّمُهُ إِذْ جاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو.

قالَ مَعْمَرٌ: فَأَخْبَرَنِي أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ: أَنَّهُ لَمَّا جاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَقَدْ سَهُلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ**).

قَالَ مَعْمَرٌ: قالَ الزُّهْرِيُّ فِي حَدِيثِهِ: فَجَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فَقَالَ: هَاتِ اكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَاباً، فَدَعا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم الْكَاتِبَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ**). قالَ سُهَيْلٌ: أَمَّا الرَّحْمنُ، فَوَاللهِ مَا أَدْرِي مَا هُوَ، وَلكِنِ اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ كما كُنْتَ تَكْتُبُ، فَقَالَ المسْلِمُونَ: وَاللهِ لاَ نَكْتُبُهَا إِلاَّ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ**). ثُمَّ قالَ: (**هَذَا ما قاضى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ**). فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللهِ لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ مَا صَدَدْنَاكَ عَنِ الْبَيْتِ وَلاَ قاتَلْنَاكَ، وَلكِنِ اكْتُبْ: مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَاللهِ إِنِّي لَرَسُولُ اللهِ وَإِنْ كَذَّبْتُمُونِي، اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ**).

قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَذلِكَ لِقَوْلِهِ: (**لاَ يَسْأَلُونَنِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُماتِ اللهِ؛ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا**).

فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَى أَنْ تُخَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَنَطُوفَ بِهِ**). فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللهِ لاَ تَتَحَدَّثُ الْعَرَبُ أَنَّا أُخِذْنَا ضُغْطَةً، وَلكِنْ ذلِكَ مِنَ الْعَامِ المقْبِلِ، فَكَتَبَ، فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَعَلَى أَنَّهُ لاَ يَأْتِيكَ مِنَّا رَجُلٌ، وَإِنْ كانَ عَلَى دِينِكَ؛ إِلاَّ رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا. قالَ المسْلِمُونَ: سُبْحَانَ اللهِ، كَيْفَ يُرَدُّ إِلَى المشْرِكِينَ وَقَدْ جاءَ مُسْلِماً؟!

فَبَيْنَمَا هُمْ كَذلِكَ، إِذْ دَخَلَ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو يَرْسُفُ فِي قُيُودِهِ، وَقَدْ خَرَجَ مِنْ أَسْفَلِ مَكَّةَ حَتَّى رَمى بِنَفْسِهِ بَيْنَ أَظْهُرِ المسْلِمِينَ، فَقَالَ سُهَيْلٌ: هَذَا يَا مُحَمَّدُ أَوَّلُ ما أُقاضِيكَ عَلَيْهِ أَنْ تَرُدَّهُ إِلَيَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّا لَمْ نَقْضِ الْكِتَابَ بَعْدُ**). قالَ: فَوَاللهِ إِذاً

لَمْ أُصَالِحْكَ عَلَى شَيْءٍ أَبَداً، قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**فَأَجِزْهُ لِي**). قالَ: مَا أَنَا بِمُجِيزِهِ لَكَ، قالَ: (**بَلَى فَافْعَلْ**). قالَ: مَا أَنَا بِفَاعِلٍ، قالَ مِكْرَزٌ: بَلْ قَدْ أَجَزْنَاهُ لَكَ، قالَ أَبُو جَنْدَلٍ: أَيْ مَعْشَرَ المسْلِمِينَ، أُرَدُّ إِلَى المشْرِكِينَ وَقَدْ جِئْتُ مُسْلِماً، أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ لَقِيتُ؟ وَكَانَ قَدْ عُذِّبَ عَذَاباً شَدِيداً فِي اللهِ.

قالَ: فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: فَأَتَيْتُ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقُلْتُ: أَلَسْتَ نَبِيَّ اللهِ حَقّاً؟ قالَ: (**بَلَى**). قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: (**بَلَى**). قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذاً؟ قالَ: (**إِنِّي رَسُولُ اللهِ، وَلَسْتُ أَعْصِيهِ، وَهُوَ نَاصِرِي**). قُلْتُ: أَوَلَيْسَ كُنْتَ تُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي البَيْتَ فَنَطُوفُ بِهِ؟ قالَ: (**بَلَى، فَأَخْبَرْتُكَ أَنَّا نَأْتِيهِ العَامَ**)؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، قالَ: (**فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ**). قالَ: فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلَيْسَ هَذَا نَبِيَّ اللهِ حَقّاً؟ قَالَ: بَلَى، قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: بَلَى، قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذاً؟ قالَ: أَيُّهَا الرَّجُلُ، إِنَّهُ لَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلَيْسَ يَعْصِي رَبَّهُ، وَهْوَ نَاصِرُهُ، فَاسْتَمْسِكْ بِغَرْزِهِ، فَوَاللهِ إِنَّهُ عَلَى الحَقِّ، قُلْتُ: أَلَيْسَ كانَ يُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي الْبَيْتَ وَنَطُوفُ بِهِ؟ قالَ: بَلَى، أَفَأَخْبَرَكَ أَنَّكَ تَأْتِيهِ العَامَ؟ قُلْتُ: لاَ، قالَ: فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمَطَّوِّفٌ بِهِ.

قَالَ عُمَرُ: فَعَمِلْتُ لِذلِكَ أَعْمَالاً.

قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِ الْكِتَابِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَصْحَابِهِ: (**قُومُوا فَانْحَرُوا، ثُمَّ احْلِقُوا**). قَالَ: فَوَاللهِ ما قامَ مِنْهُمْ رَجُلٌ، حَتَّى قالَ ذلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا لَمْ يَقُمْ مِنْهُمْ أَحَدٌ دَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَذَكَرَ لَهَا مَا لَقِيَ مِنَ النَّاسِ، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا نَبِيَّ اللهِ أَتُحِبُّ ذلِكَ؟ اخْرُجْ، ثم لاَ تُكَلِّمْ أَحَداً مِنْهُمْ كَلِمَةً، حَتَّى تَنْحَرَ بُدْنَكَ، وَتَدْعُوَ حَالِقَكَ فَيَحْلِقَكَ.

فَخَرَجَ فَلَمْ يُكَلِّمْ أَحَداً مِنْهُمْ حَتَّى فَعَلَ ذلِكَ، نَحَرَ بُدْنَهُ، وَدَعَا حَالِقَهُ فَحَلَقَهُ، فَلَمَّا رَأَوْا ذلِكَ قامُوا فَنَحَرُوا، وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَحْلِقُ بَعْضاً، حَتَّى كادَ بَعْضُهُمْ يَقْتُلُ بَعْضاً غَمّاً.

ثُمَّ جاءَهُ نِسْوَةٌ مُؤْمِنَاتٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ**﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿**بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ**﴾ [الممتحنة: ١٠] فَطَلَّقَ عُمَرُ يَوْمَئِذٍ امْرَأَتَيْنِ، كَانَتَا لَهُ فِي الشِّرْكِ، فَتَزَوَّجَ إِحْدَاهما مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، وَالأُخْرَى صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ.

ثُمَّ رَجَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى المدِينَةِ فَجَاءَهُ أَبُو بَصِيرٍ - رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ وَهْوَ مُسْلِمٌ، فَأَرْسَلُوا فِي طَلَبِهِ رَجُلَيْنِ، فَقَالُوا: الْعَهْدَ الَّذِي جَعَلْتَ لَنَا، فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ، فَخَرَجَا بِهِ حَتَّى

بَلَغَا ذَا الحُلَيْفَةِ، فَنَزَلُوا يَأْكُلُونَ مِنْ تَمْرٍ لَهُمْ، فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ: وَاللهِ إِنِّي لأَرَى سَيْفَكَ هَذَا يَا فُلاَنُ جَيِّداً، فَاسْتَلَّهُ الآخَرُ، فَقَالَ: أَجَلْ، وَاللهِ إِنَّهُ لَجَيِّدٌ، لَقَدْ جَرَّبْتُ بِهِ، ثُمَّ جَرَّبْتُ، فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ: أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْهِ، فَأَمْكَنَهُ مِنْهُ، فَضَرَبَهُ، حَتَّى بَرَدَ، وَفَرَّ الآخَرُ حَتَّى أَتَى المَدِينَةَ، فَدَخَلَ المسْجِدَ يَعْدُو، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ رَآهُ: (**لَقَدْ رَأَى هَذَا ذُعْراً**). فَلَمَّا انْتَهى إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: قُتِلَ وَاللهِ صَاحِبِي وَإِنِّي لَمَقْتُولٌ، فَجَاءَ أَبُو بَصِيرٍ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، قَدْ وَاللهِ أَوْفَى اللهُ ذِمَّتَكَ، قَدْ رَدَدْتَنِي إِلَيْهِمْ، ثُمَّ أَنْجَانِي اللهُ مِنْهُمْ، قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَيْلُ أُمِّهِ! مِسْعَرَ حَرْبٍ، لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ**). فَلَمَّا سَمِعَ ذلِكَ عَرَفَ أَنَّهُ سَيَرُدُّهُ إِلَيْهِمْ، فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى سِيفَ الْبَحْرِ.

قَالَ: وَيَنْفَلِتُ مِنْهُمْ أَبو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلٍ، فَلَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، فَجَعَلَ لاَ يَخْرُجُ مِنْ قُرَيْشٍ رَجُلٌ قَدْ أَسْلَمَ؛ إلاَّ لَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، حَتَّى اجْتَمَعَتْ مِنْهُمْ عِصَابَةٌ، فَوَاللهِ ما يَسْمَعُونَ بِعِيرٍ خَرَجَتْ لِقُرَيْشٍ إِلَى الشَّامِ؛ إلاَّ اعْتَرَضُوا لَهَا، فَقَتَلُوهُمْ وَأَخَذُوا أَمْوَالَهُمْ. فَأَرْسَلَتْ قُرَيْشٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم تُنَاشِدُهُ بِاللهِ وَالرَّحِمِ لَمَّا أَرْسَلَ فَمَنْ أَتَاهُ فَهُوَ آمِنٌ، فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيْهِمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿**وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ**﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿**حَمِيَّةَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ**﴾ [الفتح: ٢٤ ـ ٢٦] وَكَانَتْ حَمِيَّتُهُمْ أَنَّهُمْ لَمْ يُقِرُّوا أَنَّهُ نَبِيُّ اللهِ، وَلَمْ يُقِرُّوا بِبِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، وَحالُوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْبَيْتِ.

[خ٢٧٣١ و٢٧٣٢ (١٦٩٤ و١٦٩٥)]

**(خ) لە مەعمەرەوە وتی: زوهری هەواڵی پێدام، وتی: عورووەی کوڕی زوبێر لە میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەروانەوە هەواڵی پێدام-هەریەکەیان فەرموودەکەی هاوەڵەکەی تری تەصدیق دەکرد- وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژگاری حودەیبییە چووە دەرەوە تا لە هەندێك لە ڕێگەکان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خالیدی کوڕی وەلید لە غەمیمە لەگەڵ کۆمەڵێك ئەسپسواری قورەیش پێشەنگی سوپاکەیانن، بۆیە لای ڕاست بگرن).**

سوێند بە خودا خالید هەستی بەوان نەکرد تا تەپوتۆزی سوپاکەیان بینی، خالید بەپەلە بۆی دەرچوو و هەڵهات وەك ئاگادارکەرەوە بۆ قورەیش، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو تەپۆڵکانەی بەسەر قورەیشدا دەڕوانن، حوشترەکەی هات بە

چۆکدا، خەڵکی دەنگیان دایە حوشترەکە و وتیان: (حـل حـل)[1]، بـەڵام حوشـترەکە پێداگربوو، بۆیە وتیان: قەصـوا[2] مـانیگرتووە، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (**قەصـوا مانینەگرتووە ئەوە نەرێتی قەصوا نییە بەڵکو ئەو بەندکەرە بەندی کرد فیلەکانی ئەبرەهەی بەند کرد بوو**)، پاشـان فـەرمووی: (**سـوێند بـەو کەسـەی نەفسـی مـنی بەدەستە هەر شتێکی ڕۆشنی ڕەوام لێ داوا بکەن تیایدا سنوورەکانی خـودا بـە مەزن ڕابگرن، پێیان دەبەخشم**)[3]، پاشان تەکانیدا بە حوشترەکە و هەستا.

وتی: لەوان لایدا تا گەیشتە دوورترینی حودەیبیە لسەر بیرێکی کەم ئـاو، خـەڵکی کەم کەم ئاویان لێهەڵدەگۆزی، خەڵکی بواریان نەدەدا ئاوی تێبێتەوە تا وشکی کـرد، سکاڵای تینوێتی برا بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو تیرێکی لە تیردانەکـەی خـۆی دەرهێنا، پاشان فەرمانی پێکردن بیخەنە ناو بیرەکـەوە، سـوێند بـە خـودا بـەردەوام سوپاکە پاراوبوون تا لەو شوێنە گواستیانەوە.

لەکاتێکدا ئەوان لەو بارەدابوون بـودەیلی کـوڕی وەرقـائی خـوزاعی لەگـەڵ چـەند کەسێك لە هۆزەکەی –هۆزی خوزاعە– هاتن، ئەوان ملکەچییان هەبوو بۆ پێغەمبـەری خودا(ﷺ) لە ئەهلی تیهامە، بودەیل وتی: من کەعبی کـوڕی لوئـەی و عـامری کـوڕی لوئەیم بەدوای خۆمدا بەجێهێڵاوە لەسەر چەند بیرێکی ئاوداری حودەیبیە، ژنەکانیان بە منداڵەوە هێناوە[4]، ئەوان دژ بە تـۆ دەجـەنگن و ڕێگـەت لێـدەگرن بچییە بەیتـەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئێمە بۆ جەنگانی هیچ کەس نـەهاتووین، بـەڵکو هاتووین بۆ عەمرە، قورەیش جەنگ هیلاکی کردووە و زیانی پێ گەیاندووە، گـەر دەیانەوێت ماوەیەك مۆڵەتیان دەدەم، ئەوان ڕێگە بدەن لەنێوان و من وخەڵك، گەر**

---

[1] "حل حل" وشەیەکە تەکانی لە حوشتر پێ دەدرێ کاتێ لە ڕۆیشتن بوەستێت–و.

[2] ناوی حوشترەکەی پێغەمبەر بوو–و.

[3] واتە: قورەیش هەر داوایەکی ڕەوام لێ داوا بکەن مـەزن ڕاگـرتنی مەککـە و مـاڵی خـودای تێدا بێت، بۆیان جێبەجێ دەکەم–و.

[4] واتە: دەیانەوێ دژ بە پێغەمبەر شەڕی سەروماڵی بکەن–و.

**سەرکەوتنی بەدەستهێنا و ویستیان با بێنە ناو ئەوەی خەڵکی چووەتە ناویەوە[1]، ئەگەر نە، پشووی خۆیان وەرگرتووە، گەر ئەوان نەیانویست، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، لەسەر ئەمرەی خۆم دژ بەوان دەجەنگم تا لە گەردنم دەدرێت، یان خودا کارەکەی خۆی سەردەخات)**، بودەیل وتی: ئەوەی تۆ وتت بەوانی دەگەیەنم.

وتی: بودەیل ڕۆیشت تا هات بۆلای قورەیش و پێی وتن: من لای ئەو پیاوەوە هاتووم بۆ لاتان، گوێمان لێگرت و ئەو قسەیەك دەڵێت، گەر دەتانەوێت بۆتان بخەمە ڕوو باشە، گەمژەکانیان وتیان: پێویستمان بە هیچ شتێك نییە لەوەوە بۆمان باس بکەیت، خاوەن ڕاوبۆچوونەکانیان وتیان: ئەوەی بیستووتە بیڵێ، وتی: گوێم لێ بوو ئەمە و ئەوەی دەوت، ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووبووی بۆ ئەوانی باس کرد.

عورووەی کوڕی مەسعود هەستایە سەر پێ و وتی: ئەی قەوم، ئایە ئێوە باوك نین؟ وتیان: با ، وتی: ئایە من ڕۆڵەی ئێوە نیم؟ وتیان: با، وتی: ئایا بە هیچ شتێك من تۆمەتبار دەکەن؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئایا دەزانن من هەموو ئەهلی عوکازم کۆکردەوە، کاتێك ڕێگرییان لە من کرد خانەوادە و منداڵەکانم و ئەوانەی گوێڕایەڵم بوون بۆ ئێوەم هێنا؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەو پیاوە کارێکی ڕۆشن و ڕەوا و درووستی خستووەتە بەردەم ئێوە، قبووڵی بکەن و ڕێگەم بدەن بچم بۆلای، وتیان: بڕۆ بۆ لای ئەویش هات و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر ئەو قسانەی بە بودەیلی فەرمووبوو بەویشی فەرموو، عورووە لەو بارەدا وتی: ئەی موحەمەد، باشە گەر کاروباری هۆزەکەت ڕیشەکەند بکەی، ئایا بیستووتە بەر لە تۆ یەکێ لە عەرەب بەسەر خانەوادەکەی خۆیدا بدات؟ گەر کارەکە بەو جۆرەبێت سوێند بەخودا، من ڕوخسارگەلێك نابینم، بەڵکو خەڵکانێکی تێکەڵاو دەبینم، هەڵدێن و بەجێت دەهێڵن، ئەبوبەکر پێی وت: هێنی لات[2] بمژە، ئێمە هەڵدێین و پێغەمبەر بە جێدەهێڵین؟

---

[1] واتە: بێنە ناو ئیسلامەوە—و.

[2] لات یەکێکە لە خواوەندەکانی قورەویش بوو، ناوی مێینەیان لێ نابوو، چونکە بە پەیکەری فریشتەیان دانابوو و پێیان وابوو فریشتەکان کچی خودان، بۆیە ئەبوبەکر ناوی هێنی لات دەهێنێ وەك ئەو پارچە گۆشتە زیادەی لە هێنی ئافرەتدایە—و.

پرسی: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەبوبەکر، وتی: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە گەر چاکەیەکت لەسەرم نەبوایە ڕێگەم نەدەدای و وەڵامی تۆم دەدایەوە، وتی: بەردەوامبوو لە قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، هەرکات قسەیەکی دەکرد ڕیشی دەگرت[1]، موغیرەی کوڕی شوعبە لەسەر سەری پێغەمبەر(ﷺ) وەستابوو، شمشێرێکی بەدەستەوە بوو، کڵاوخودەیەکی لەسەربوو هەرکات عوروە دەستی دەبرد بۆ ڕیشی پێغەمبەر(ﷺ) بە تەختی شمشێرەکەی دەیدا لە دەستی و پێی دەوت: دەستت دوور بخەرەوە لە ڕیشی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، عوروە سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: موغیرەی کوڕی شوعبەیە، وتی: ئەی غەدرباز، من ئەو کەسە نەبووم لە غەدرەکانی تۆدا هەوڵ و کۆشانم کرد، موغیرە هاوەڵی کۆمەڵێکی کرد بوو لە سەردەمی جاهیلیدا و ئەوانی کوشتبوو ماڵ و سامانەکەی بردبوون، پاشان هات و موسوڵمان بوو، پێغەمبەری(ﷺ) فەرمووی: (**ئیسلامەکەت قبووڵ دەکەم، بەڵام ماڵ وسامانەکە من تیایدا نیم**)

عوروە بە دوو چاوانی سەرنجی هاوەڵانی پێغەمبەری خودای دەدا، وتی: سوێند بە خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەر تفێکی هەڵبدایە دەکەوتە دەستی پیاوێك لە ئەوان و ڕوخسار و پێستی خۆی پێدەهەنوو، کاتێ فەرمانی پێ بکردبان دەستپێشخەرییان بۆ دەکرد، کاتێك دەستنوێژی بگرتبایە خەریکبوو لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی شەڕ دروست دەبوو، کاتێ قسەی دەکرد دەنگی خۆیان لە لا نزم دەکردەوە، لای پێغەمبەر توند و تیژ نەبوون وەك مەزن ڕاگرتنی پێغەمبەر(ﷺ).

عوروە گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی خۆی و وتی: ئەی قەوم، سوێند بە خودا، من وەك وەفد ڕۆیشتووم بۆ لای مەلیکان، بە وەفد چووم بۆ لای قەیسەر و کیسرا و نەجاشی، سوێند بە خودا، هەرگیز مەلیکێکم نەبینیوە هاوەڵانی مەزن ڕایبگرن وەك مەزن ڕاگرتنی هاوەڵانی موحەمەد بۆ موحەمەد، سوێند بە خودا، تفێك هەڵبدات دەکەوێتە دەستی پیاوێك لە ئەوان و دەیهێنێت بە ڕوخسار و پێستیدا، کاتێ فەرمانێکیان پێ دەکات دەستپێشخەری دەکەن، کاتێ دەستنوێژ دەگرێت خەریکە

---

[1] وەك تکا کردن لە پێغەمبەر دەستی بۆ ڕیشی بردووە–و.

لەسەر دەستنوێژەکەی جەنگ پەیدا دەبێت، کاتێ قسە دەکات دەنگیان لە لای نەرم دەکەنەوە، لە لای ئەو توند و تیژی نانوێنن لەبەر مەزن تەماشاکردنی ئەو، کارێکی ڕۆشن و ڕەوا و دروستی خستووەتە بەردەمتان قبوڵی بکەن.

پیاوێك لە بەنی کینانە وتی: ڕێگەم بدەن بچم بۆ لای، وتیان: بچۆ، کاتێك نزیك بووەیەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەوە فڵان کەسە، ئەوە لە هۆزێکە هەدیی ماڵی خودا**[1] **بەمەزن ڕادەگرن، هەدییەکان ببەن بە پیریەوە**) خەڵکی پێشوازیان لێکرد بە تەلبیەکردن[2]، کاتێ ئەوەی بینی وتی: سبحان الله! خەڵکانێکی لەم جۆرە نابێ ڕێگرییان لێ بکرێت لە ماڵی خودا، کاتێ گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی وتی: هەدیەکانی ماڵی خوام بینی دیاریکرابوون و درووشمیان لێدرابوو، بۆیە پێم باش نییە ئەوانە لە ماڵی خودا ڕێگرییان لێ بکرێت.

پیاوێك لەوان ڕاستبوویەوە –پێی دەوترا میکرەزی کوڕی حەفص– وتی: ڕێگەم بدەن بچم بۆ لای، وتیان: بچۆ، کاتێ لەوان نزیك بوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئەوە میکرەزە، ئەو پیاوێکی فاجیرە**)، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بە قسەکردن کرد، کاتێ ئەو قسەی دەکرد سوهەیلی کوڕی عەمر هات.

مەعمەر وتی: ئەیوب هەواڵی پێداوم لە عیکریمەوە: کاتێ سوهەیلی کوڕی عەمر هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لقد سَهُلَ لكم من أمركم–**کارەکەتان ئاسان بوو**).

مەعمەر وتی: زوهری لەفەرموودەکەیدا وتی: سوهەیلی کوڕی عەمر هات و وتی: نوسراوێك بێنن لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بینووسین، پێغەمبەر(ﷺ) نووسەری بانگ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**بسم الله الرحمان الرحيم**)، سوهەیل وتی: ئێمە نازانین ڕەحمان کێیە و چییە، بەڵکو بنووسە: (باسمك اللهم)، وەك چون جاران دەتنووسی، موسوڵمانان وتیان: سوێند بە خودا، ناینووسین جگە لە (بسم الله الرحمن الرحيم)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**بنووسە (بسمك اللهم)**)، پاشان فەرمووی: (**ئەمە ئەوەیە**

---

(١) هەدی: بریتییە لەو حوشتر و وڵاخانەی هەدیەی ماڵی خودا دەکرێن–و.

(٢) واتە: وتنی (لبيك اللهم لبيك)–و.

**موحەمەد رسول الله لەسەری پێکهاتووە و بڕیاری لێداوە)**، سوهەیل وتی: سوێند بە خودا، گەر بمانزانیبایە تۆ پێغەمبەری خودای ڕێگریمان لێ نەدەکردی لە بەیت و دژ بە تۆ نەدەجەنگاین، بەڵکو بنووسە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**سوێند بە خودا من پێغەمبەری خودام با ئێوەش بە درۆم بزانن، بەڵام بنووسە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا**).

زوهری وتی: ئەوەش لەبەر فەرموودەکەی خۆی کە فەرمووی: (**سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە هەر شتێکی ڕۆشنی ڕەوام لێ داوا بکەن تیایدا سنوورەکانی خودا بە مەزن ڕابگرن، پێیان دەبەخشم**)[1].

پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (**لەسەر ئەوەی ڕێگەمان بدەن تەواف بەیت بکەین**)، سوهەیل وتی: نە، سوێند بە خودا، دواتر عەرەب باس لەوە بکەن ئێمە ژێردەستە کراوین، بەڵکو ئەوە ساڵی داهاتوو دەبێت، ئەوەشی نووسی، سوهەیل وتی: هەروەها لەسەر ئەوەی هەر پیاوێك لە ئێمە هات بۆ لای تۆ-با لەسەر دینەکەی تۆش بێت- دەبێ بۆمان بگێڕییەوە، موسڵمانان وتیان: سبحان الله! چۆن ڕەوانە دەکرێتەوە بۆ لای هاوەڵدانەران لە کاتێکدا ئەو بە موسڵمانی هاتووە.

لە کاتێکدا ئەوان لەو بار و دۆخەدا بوون ئەبو جوندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر(**سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە هەر شتێکی ڕۆشنی ڕەوام لێ داوا بکەن تیایدا سنوورەکانی خودا بە مەزن ڕابگرن، پێیان دەبەخشم**)[2] هاتە ناویان، بە کۆت و بەندەکەیەوە بەهێواشی دەڕۆیشت، ئەو لە دامێنی مەککەوە دەرچوو بوو تا خۆی گەیاندبووە ناو موسڵمانان، سوهەیل وتی: ئەی محەمەد، ئەمە یەکەمین کەسە لەسەری داوای جێبەجێ کردنی بڕیارەکە دەکەم لە تۆ تا بۆم بگێڕییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئێمە هێشتا نووسراوەکەمان واژوو نەکردووە**)، وتی:

---

(١) واتە: قورەیش هەر داوایەکی ڕەوام لێ داوا بکەن مەزن ڕاگرتنی مەککە و ماڵی خودای تێدا بێت، بۆیان جێبەجێ دەکەم-و.

(٢) ئەبو جوندەل کوڕی ئەو پیاوە بوو خەریکی دانوستان بوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)-و.

کەوابوو سوێند بە خودا، لەسەر هیچ شت لەگەڵت رێناکەوم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(لەمەدا رێگەم بدە)**، وتی: رێگەت نادەم، پێغەمبەر فەرمووی: **(با، ئەو کارە بکە)**، وتی: ئەو کارە ناکەم، میکرەز وتی: بەڵکو لەمەدا رێگەت دەدەین، ئەبو جوندەل وتی: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان: ئایا من رەوانە دەکرێمەوە بۆ لای هاوەڵدانەران لە کاتێکدا من بە موسڵمانی هاتوون، نابینن تووشی چی هاتووم؟ ئەو لەپێناوی خودا سزایەکی توند درابوو.

وتی: عومەری کوڕی خەتاب وتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا و وتم: ئایا تۆ بە حەق پێغەمبەری خودا نیت؟ فەرمووی: **(با)**، وتم: ئایا ئێمە لەسەر حەق نین و دوژمنەکەمان لەسەر باتڵ؟ فەرمووی: **(با)**، وتم: ئەی بۆچی لە دینەکەماندا رسوایی قبووڵ بکەین؟ فەرمووی: **(من پێغەمبەری خودام و لێی یاخی نابم و ئەو سەرمدەخات)**، وتم: ئەی تۆ باسی ئەوەت بۆ نەکردین ئێمە دێین بۆ لای بەیت و تەواف دەکەین؟! فەرمووی: **(با، من هەواڵم بە تۆ دا لەم ساڵەدا تەواف دەکەین؟)**، وتی: وتم: نەخێر، فەرمووی: **(تۆ دێی بۆ بەیت و تەوافی دەکەی)**، وتی: هاتم بۆ لای ئەبوبەکر و وتم: ئایا ئەو بە حەق پێغەمبەری خودا نییە؟ وتی: با، وتم: ئایا ئێمە لەسەر حەق نین و دوژمنەکەمان لەسەر باتڵ؟ وتی: با، وتم: ئەی بۆچی لە دینەکەماندا رسوایی قبووڵ بکەین؟ وتی: ئەی پیاو، ئەو پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، ئەو لە پەروەردگاری خۆی یاخی نابێت، پەروەردگار سەرخەری ئەوە، دەستبگرە بە کۆڵ و باری ئەوەوە، سوێند بە خودا ئەو لەسەر حەقە، وتم: ئەی ئەو باسی بۆ نەکردین دێین بۆ بەیت و تەواف دەکەین؟ وتی: با، ئایا هەواڵی پێدای تۆ لەم ساڵەدا دێیە بەیت؟ وتم: نەخێر، وتی: تۆ دێی بۆ بەیت و تەوافی دەکەی.

عومەر وتی: کۆمەڵێك کاری چاکەم بۆ ئەو کارەم ئەنجام دا[1].

وتی: کاتێ لە بابەتی نووسراوەکە بوویەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: **(هەستن هەدیەکانتان سەرببڕن و پاشان سەرتان بتاشن)**، وتی: سوێند بە

---

(1) وەك کەفارەتی ئەو هەڵوێست و قسانەی کردی.

خودا، پیاوێك لەوان هەڵنەستا، تا سێ جار ئەوەی فەرموو، کاتێ کەس لەوان هەڵنەستا چووە ژوورەوە بۆ لای ئوم سەلەمە، باسی ئەوەی بۆ کرد تووشی هاتووە لە خەڵکەکەوە، ئوم سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەت پێخۆشە؟ بچۆ دەرەوە و پاشان یەك وشەش لەگەڵ خەڵکەکە مەڵێ تا حوشترەکەی خۆت سەردەبڕی و بانگی سەرتاشەکەت دەکەی سەرت دەتاشێت.

چووە دەرەوە و قسەی لەگەڵ هیچ کام لەوان نەکرد تا ئەو کارەی کرد، حوشترەکەی سەربڕی و بانگی سەرتاشی کرد و سەری تاشی، کاتێ خەڵکەکە ئەوەیان بینی هەستان و حوشترەکانیان سەربڕی و هەندێکیان سەری هەندێکی تریان تاشی، تا لە خەم و پەژارەدا خەریك بوو هەندێکیان هەندێکی تریان بکوژن[(١)].

پاشان ئافرەتە باوەڕدارەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر، خودا(تعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَـٰتُ مُهَـٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ﴾، تا گەیشتە: ﴿بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ [الممتحنة: ١٠]، لەو ڕۆژەدا عومەر دوو ئافرەتی تەڵاق دا کە هاوسەری ئەو بوون لە سەردەمی هاوەڵداناندا، یەکێکیان موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، ئەویتریان صەفوانی کوڕی ئومەیە.

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە و ئەبو بەصیر -کە پیاوێکی قورەیش بوو و موسڵمان بوو بوو- هات بۆ لای، قورەیش دوو پیاویان بەدوایدا ڕەوانە کرد، وتیان: ئەو پەیمانەی بە ئێمەت دابوو[(٢)]، بۆیە پێغەمبەر ئەبو بەصیری دایەوە دەستی دوو پیاوەکە، ئەوانیش بردیان تا گەیاندیانە "ذا الحُلَيفة"، دابەزین و خەریکی خواردنی خورما بوون کە پێیان بوو، ئەبو بەصیر وتی بە یەکێك لە پیاوەکان: سوێند بە خودا، من ئەم شمشێرەی تۆ زۆر بە چاك دەبینم، پیاوەکە شمشێرەکەی لە کێلان

---

(١) واتە: لەبەر خەم و پەژارەی نەکردنی تەواف ئەوەندە بێئاگا بووبوون خەریك بوو لە سەرتاشیندا بە تیغەکانیان یەکتر بریندار بکەن-و.

(٢) واتە: ئەو پەیمانەی لە سوڵحی حودەیبییە بە ئێمەش دابوو بۆمان جێبەجێ بکە-و.

هێنایە دەرەوە و وتی: بەڵێ بەو جۆرەیە، سوێند بە خودا، شمشێرێکی چاکە، تاقیمکردووەتەوە، ئەبو بەصیر وتی: نیشانم بدە تەماشایەکی بکەم، کابرا شمشێرەکەی دایە دەستی، ئەویش بە شمشێرەکە لێیدا تا ساردبوویەوە، ئەویتریان هەڵهات تا هات بۆ مەدینە، بە راکردن خۆی کرد بە مزگەوتدا، کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوی بینی فەرمووی: (**ئەمە ترس و تۆقانێکی بینیوە**)، کاتێ گەیشتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: سوێند بە خودا، هاوەڵەکەم کوژراوە و منیش کوژراوم، ئەبو بەصیر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، سوێند بە خودا، خودا لە گەردنی تۆی لاداوە، تۆ منت بۆ ئەوان گێڕایەوە و پاشان خودا منی لەوان رزگار کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**وەیل بۆ دایکی بەرپاکەری جەنگ گەر یەکێکی لەگەڵ بێت**)، کاتێ ئەبو بەصیر ئەوەی بیست زانی پێغەمبەر ئەو دەگێڕێتەوە بۆ ئەوان، بۆیە لە مەدینە دەرچوو تا خۆی گەیاندە کەناری دەریا.

وتی: "ئەبو جوندەلی کوڕی سوهەیل"یش لە دەستی قورەیش هەڵهات و پەیوەندی کرد بە ئەبو بەصیرەوە، هەر پیاوێك لە قورەیش موسڵمان دەبوو پەیوەندی دەکرد بە ئەبو بەصیرەوە تا کۆمەڵێکیان لێ دروست بوو، سوێند بە خودا، هەر کات دەیانبیست کاروانییەکی قورەیش بەرەو شام دەرچووە بەریان دەگرت و دەیانکوشتن و ماڵ و سامانەکانیان دەبرد، قورەیش نێردەی رەوانەی لای پێغەمبەر(ﷺ) کرد و بە خودا و بە سیلەی رەحم تکایان لێکرد بنێرێ بەدوای ئەبو بەصیر و دەستەکەیدا، هەرکەس بێت بۆ لای پێغەمبەر لە ئاسایشدایە، پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بەدوایاندا، خودا(تعالى) ئایەتی دابەزاند: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾، تا گەیشتە: ﴿حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ [الفتح: ٢٤ ـ ٢٦]، دەمارگیرییەکەیان(الحمية) ئەوە بوو دانیاننەنا بەوەی ئەو پێغەمبەری خودایە و دانیاننەنا بە "بسم الله الرحمن الرحيم"دا و بوونە بەربەست لە نێوان پێغەمبەر و ماڵی خودا.

## ٣- دەروازەی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾

**٣٦٥٧-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ① لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَوْزًا عَظِيمًا ⑤﴾ [الفتح: ١ ـ ٥] مَرْجِعَهُ مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ وَهُمْ يُخَالِطُهُمُ الْحُزْنُ وَالْكَآبَةُ، وَقَدْ نَحَرَ الْهَدْيَ بِالْحُدَيْبِيَةِ، فَقَالَ: (لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آيَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعاً). [م١٧٨٦]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: کاتێک ئایەتی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ① لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ﴾، تا ئایەتی: ﴿فَوْزًا عَظِيمًا ⑤﴾ [الفتح: ١ - ٥]، دابەزی- کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر لە حودەیبیە- ئەوان دڵتەنگی و پەستی پێیان تیکەڵ بوو، پێغەمبەر هەدیەکانیماڵی خودای لە حودەیبیە سەربڕی و فەرمووی: ئایەتێکم بۆ سەر دابەزیوە لە هەموو دنیا لام خۆشەویستره.**

## ٤- دەروازەی: شوێنی درەختەکە[1]

**٣٦٥٨-** (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ الشَّجَرَةَ، ثُمَّ أَتَيْتُهَا بَعْدُ فَلَمْ أَعْرِفْهَا. [خ٤١٦٢/ م١٨٥٩]

**(ق) لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە، لە باوکیەوە وتی: من درەختەکەم بینی پاشان هاتمەوە بۆ لای نەمناسیەوە.**

- وفي رواية لهما: عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ الرحمن قالَ: انْطَلَقْتُ حَاجّاً، فَمَرَرْتُ بِقَوْمٍ يُصَلُّونَ، قُلْتُ: ما هَذَا المسْجِدُ؟ قالُوا: هَذِهِ الشَّجَرَةُ، حَيْثُ بَايَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَيْعَةَ الرِّضْوَانِ، فَأَتَيْتُ سَعِيدَ بْنَ المسَيَّبِ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ سَعِيدٌ: حَدَّثَنِي أَبِي: أَنَّهُ كانَ فِيمَنْ

---

(١) مەبەست ئەو درەختەی خودا لە قورئاندا ناوی هێناوە و لەوانە رازی بوو لە ژێریدا بەیعەتیان بە پێغەمبەر دا: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾ [الفتح: ١٨]-و.

بَايَعَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَحْتَ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَلَمَّا خَرَجْنَا مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ أُنْسِينَاهَا، فَلَمْ نَقْدِرْ عَلَيْهَا.

فَقَالَ سَعِيدٌ: إِنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَعْلَمُوهَا، وَعَلِمْتُمُوهَا أَنْتُمْ؟ فَأَنْتُمْ أَعْلَمُ! [خ٤١٦٣]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: لە تاریقی کوڕی عبدالرحمانەوە وتی: دەرچووم بۆ حەج بەپاڵ کۆمەڵێکدا تێپەڕیم نوێژیان دەکرد، وتم ئەم مزگەوتە چییە؟ وتیان: ئەمە درەختەکەیە، ئەو شوێنەی پێغەمبەر(ﷺ) بەیعەتی ڕیزوانی تێدا ئەنجامدا، هاتم بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەییەب هەواڵم پێدا، سەعید وتی: باوکم بۆی باس کردم ئەو لەو کەسانە بوو بەیعەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) داوە، ئەو وتی: کە لە ساڵی داهاتوو دەرچووین بۆ حەج لە بیرمانبرایەوە و نەمانتوانی بیدۆزینەوە.**

**سەعید وتی: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) درەختەکەیان نەدۆزییەوە ئێوە دەیدۆزنەوە؟ ئێوە لەوان زاناترن؟!.**

## ٥- دەروازەی: نوسراوەکانی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بۆ مەلیکانی بێباوەڕان، بانگی دەکردن بۆ ئیسلام

**٣٦٥٩-** (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَتَبَ إِلَى كِسْرَى، وَإِلَى قَيْصَرَ، وَإِلَى النَّجَاشِي، وَإِلَى كُلِّ جَبَّارٍ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ تَعَالَى، وَلَيْسَ بِالنَّجَاشِي الَّذِي صَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم. [م١٧٧٤]

**(م) لەئەنەسەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوسراوی نووسی بۆ کیسرا و بۆ قەیسەر و بۆ نەجاشی[1] بۆ هەر ملهوڕ و دەسەڵاتدارێکی تر، ئەو بانگی دەکردن بۆ لای خودا(تعالی)، ئەو نەجاشییە نە کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد.**

[1] نەجاشی نازناوی مەلیکانی حەبەشەیە-و.

**٣٦٦٠-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ بِكِتَابِهِ إِلَى كِسْرَى، مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى، فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ. فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ المسَيَّبِ قالَ. فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ. [خ٤٤٢٤ (٦٤)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوسراوی بە عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهمیدا نووسراوی خۆی ڕەوانە کرد بۆ لای کیسرا، فەرمانی پێکرد بیداتە دەست گەورەی بەحرەین، گەورەی بەحرەینیش دایە دەست کیسرا، کاتێ نوسراوەکەی بینی دڕاندی، وابزانم ئیبن موسەییەب وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوعای لێکردن پارچە پارچە بېن.**

**٣٦٦١-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ مِنْ فِيهِ إِلَى فِيَّ قالَ: انْطَلَقْتُ فِي المدَّةِ الَّتِي كانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قالَ: فَبَيْنَا أَنَا بِالشَّامِ، إِذْ جِيءَ بِكِتَابٍ مِنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى هِرَقْلَ، قالَ: وَكانَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ جاءَ بِهِ، فَدَفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إِلَى هِرَقْلَ، قَالَ: فَقَالَ هِرَقْلُ: هَلْ هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ قَوْمِ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ.

قالَ: فَدُعِيتُ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ، فَأُجْلِسْنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَباً مِنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ: أَنَا، فَأَجْلَسُونِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِي خَلْفِي، ثُمَّ دَعَا بِتَرْجُمَانِهِ، فَقَالَ: قُلْ لَهُمْ: إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعَمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ، قالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَايْمُ اللهِ! لَوْلاَ أَنْ يُؤْثِرُوا عَلَيَّ الْكَذِبَ لَكَذَبْتُ.

ثُمَّ قالَ لِتَرْجُمَانِهِ: سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قالَ: قُلْتُ: هُوَ فِينَا ذو حَسَبٍ، قالَ: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، قالَ: فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ ما قالَ؟ قُلْتُ: لاَ، قالَ: أَيَتَّبِعُهُ أَشْرَافُ النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قالَ: قُلْتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، قَالَ: يَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، بَلْ يَزِيدُونَ، قالَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، قالَ: فَهَلْ قاتَلْتُمُوهُ؟ قالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قالَ: فَكَيْفَ كانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قالَ: قُلْتُ: تَكُونُ الحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالاً، يُصِيبُ مِنَّا وَنُصِيبُ مِنْهُ، قالَ: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، وَنَحْنُ مِنْهُ فِي هذِهِ المدَّةِ لاَ نَدْرِي ما هُوَ صَانِعٌ فِيهَا.

– قَالَ: وَاللهِ ما أَمْكَنَنِي مِنْ كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئاً غَيْرَ هذِهِ –.

قَالَ: فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ قُلْتُ: لاَ.

ثُمَّ قَالَ لِتُرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُ: إِنِّي سَأَلْتُكَ عَنْ حَسَبِهِ فِيكُمْ، فَزَعَمْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي أَحْسَابِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كانَ فِي آبَائِهِ مَلِكٌ، فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ، قُلْتُ: رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ، وَسَأَلْتُكَ عَنْ أَتْبَاعِهِ: أَضُعَفَاؤهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ؟ فَقُلْتَ: بَلْ ضُعَفَاؤهُمْ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ ما قالَ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ عَلَى اللهِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ، فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، وَكَذلِكَ الإِيمَانُ إِذَا خالَطَ بَشَاشَةَ الْقُلُوبِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدونَ، وَكَذلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قاتَلْتُمُوهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّكُمْ قاتَلْتُمُوهُ، فَتَكُونُ الحَرْبُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سِجَالاً، يَنَالُ مِنْكُمْ وَتَنَالُونَ مِنْهُ، وَكَذلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى، ثُمَّ تَكُونُ لَهُمُ الْعَاقِبَةُ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَغْدِرُ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ لاَ يَغْدِرُ، وَكَذلِكَ الرُّسُلُ لاَ تَغْدِرُ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قَالَ أَحَدٌ هذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كانَ قالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ، قُلْتُ: رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ.

قَالَ: ثُمَّ قَالَ: بِمَ يَأْمُرُكُمْ؟ قالَ: قُلْتُ: يَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ، وَالزَّكَاةِ، وَالصِّلَةِ، وَالْعَفَافِ.

قَالَ: إِنْ يَكُ ما تَقُولُ فِيهِ حَقًّا فَإِنَّهُ نَبِيٌّ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ، وَلَمْ أَكُ أَظُنُّهُ مِنْكُمْ، وَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمَيْهِ، وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ ما تَحْتَ قَدَمَيَّ، قَالَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَرَأَهُ، فَإِذَا فِيهِ:

(**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ: فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ، وَ ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾**، إِلَى قَوْلِهِ: **﴿ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ۝٦٤﴾** [آل عمران: ٦٤]).

فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ، ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ عِنْدَهُ وَكَثُرَ اللَّغَطُ، وَأُمِرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا، قَالَ: فَقُلْتُ لأَصْحَابِي حِينَ خَرَجْنَا: لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إِنَّهُ لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ، فَما زِلْتُ مُوقِناً بِأَمْرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمَ.

قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَدَعَا هِرَقْلُ عُظَمَاءَ الرُّومِ، فَجَمَعَهُمْ فِي دَارٍ لَهُ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الرُّومِ! هَلْ لَكُمْ فِي الْفَلاَحِ وَالرَّشَدِ آخِرَ الأَبَدِ، وَأَنْ يَثْبُتَ لَكُمْ مُلْكُكُمْ؟ قالَ: فَحَاصُوا حَيْصَةَ حُمُرِ الْوَحْشِ إِلَى الأَبْوَابِ، فَوَجَدُوهَا قَدْ غُلِّقَتْ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِهِمْ، فَدَعَا بِهِمْ فَقَالَ: إِنِّي إِنَّمَا اخْتَبَرْتُ شِدَّتَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ، فَقَدْ رَأَيْتُ مِنْكُمُ الَّذِي أَحْبَبْتُ، فَسَجَدُوا لَهُ وَرَضُوا عَنْهُ.     [خ٤٥٥٣ [٧]/ م١٧٧٣]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە وتی: ئەبوسوفیان لە دەمی خۆیەوە بۆ دەمی من بۆی باس کردم، وتی: لە ماوەی سوڵحی حودەبیەدا کە لەنێوان من و پێغەمبەر خودا(ﷺ) بوو، ڕۆیشتم بۆ شام، وتی: ئەو کاتەی من لە شام بووم نوسراوێك لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هێنرا بۆ هیرەقل، وتی: دیحیەی کەلبی نوسراوەکەی هێنابوو و دابوویە دەست گەورەی بوصرا و گەورەی بوصرایش دایە دەست هیرەقل، وتی: هیرەقل وتی: ئایە لێرە کەسێك هەیە لە هۆزی ئەم پیاوە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات؟ وتیان: بەڵێ.

ئەبو سوفیان، وتی: من و چەند کەسێکی قورەیشی بانگکراین و چووینە ژوورەوە بۆ لای هیرەقل، لەبەردەمی دانراین، هیرەقل وتی: کام لە ئێوە لەڕووی رەچەڵەکەوە نزیکترینە بەو پیاوەی بانگەشە دەکات پێغەمبەرە؟ ئەبوسوفیان وتی: وتم من، منیان لەبەردەمی دانا و هاوەڵانم لە دوای منەوە، پاشان وەرگێڕەکەی خۆی بانگ کرد و وتی: پێیان بڵێ من پرسیار دەکەم لەم کەسە دەربارەی ئەو پیاوەی بانگەشە دەکات پێغەمبەرە، گەر درۆی لەگەڵ کردم ئێوە ڕایبگەیەنن درۆی کردووە، ئەبو سوفیان وتی: سوێند بە خودا، گەر بەدرۆیان نەخستمایەوە درۆم دەکرد.

پاشان بە وەرگێڕەکەی وت: پرسیاری لێ بکە: پلە و پایەی لەنێوان ئێوەدا چۆنە؟ ئەبوسوفیان وتی: وتم ئەو لەناو ئێمەدا خاوەن پلە و پایەیە، هیرەقل وتی: ئایا لە باوباپیرانی مەلیك هەبووە؟ ئەبوسوفیان وتی: وتم نەخێر، هیرەقل وتی: ئایە بەرلەوەی ئەوەی کە دەیڵێت بیڵێ تۆمەتبارتان کردووە بە درۆ؟ وتم نەخێر، پرسی: ئایا دەوڵەمەندان و دەسەڵاتدارانی خەڵك شوێنی دەکەون یان لاوازەکانیان؟ وتم بەڵکو لاوازەکانیان شوێنی دەکەون، هیرەقل وتی: ئەوان زیاد دەکەن یان کەم دەکەن؟ وتی: وتم نەخێر، بەڵکو زیاد دەکەن، هیرەقل وتی: هیچ کام لەوانە لەدوای ئەوەی

دەچنە ناو دینەکەیەوە پاشگەز دەبنەوە وەکو بێزاری و تووڕەبوون لە ئەو؟ ئەبو سوفیان وتی: وتم نەخێر، هیرەقل وتی: ئایا دژ بە ئەو جەنگاون؟ ئەبوسوفیان وتی: وتم: بەڵێ، هیرەقل وتی: جەنگەکە لە نێوانتان چۆن بووە؟ ئەبو سوفیان وتی: وتم جەنگ لە نێوان ئێمە و ئەو بە نۆرەیە سەردەکەوێ بەسەرماندا و سەردەکەوین بەسەریدا، پرسی ئایا غەدر دەکات، ئەبو سوفیان وتی: وتم: نەخێر، لە نێوان ئەم سوڵحی حودەیبیەدا ئێمە نازانم ئەو تیایدا چی دەکات.

ئەبو سوفیان وتی: سوێند بە خودا، نەمتوانی وشەیەك بخەمە ناو قسەکانم جگە لەم قسەی دوایی.

هیرەقل وتی: ئایا هیچ کەس بەر لە ئەو ئەم قسەی ئەوی کردووە؟ وتم نەخێر.

پاشان وتی: بە وەرگێڕەکەی پێی بڵێ: من پرسیارم لێ کردی دەربارەی پلە و پایەی لە ناو ئێوەدا تۆ وتت ئەو خاوەنی پلە و پایەیە، هەر بەو جۆرە پێغەمبەران لە ناو هۆزەکانیان لە بنەماڵەداران ڕەوانە دەکرێن، پرسیارم لێ کردی ئایا لە باب و باپیرانی مەلیك هەبووە؟ تۆ وتت نەخێر، وتم گەر لە باب و باپیرانی مەلیك هەبوایە دەموت پیاوێکە بەدوای مەلیکی باب و باپیرانیدا دەگەڕێت، پرسیارم لێ کردی دەربارەی شوێنکەوتوانی، ئایا لاوازانن یان دەسەڵاتداران؟ تۆ وتت لاوازانن، شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانیش هەر بەو جۆرەن، پرسیارم لێ کردی ئایا بەرلەوەی ئەمەی کە دەیڵێ بیڵێت تۆمەتبارتان کردووە بە درۆ؟ تۆ وتت نەخێر، منیش زانیم کەسێ دۆری لەگەڵ خەڵك نەکردبێت ناچێت درۆ بە دەم خوداوە بکات، پرسیارم لێ کردی ئایا هیچ کەس لە شوێنەکەوتوانی لە ئاینەکەی ئەو پاشگەز دەبنەوە لە دوای ئەوەی دەچنە ناو ئاینەکەوە؟ تۆش وتت نەخێر، ئیمانیش هەر بەو جۆرەیە کاتێ دەچێتە ناو دڵانەوە، پرسیارم لێ کردی ئایە ئەوان زیاد دەکەن یان کەم دەکەن؟ تۆ وتت زیاد دەکەن، هەر بەو جۆرەیە تا ئیمان تێر و تەواو دەبێت، پرسیارم لێ کردی ئایا ئێوە دژ بە ئەو جەنگاون؟ وتت ئێمە جەنگاوین و جەنگ لە نێوانتان بە نۆرەیە، ئەو سەردەکەوێت بەسەر ئێوەدا و ئێوەش سەردەکەون بەسەر ئەودا، هەر بەو جۆرە پێغەمبەران تووشی بەڵا و ناخۆشی دەبن، بەڵام سەرئەنجام بۆ ئەوانە، پرسیارم لێ

کردی ئایا غەدر دەکات؟ تۆ وتت غەدر ناکات، هەر بەو جۆرە پێغەمبەران غەدر ناکەن، پرسیارم لێ کردی ئایا هیچ کەس بەر لە ئەو ئەم قسەی ئەوی کردووە؟ تۆ وتت نەخێر، منیش وتم گەر بەر لە ئەو کەسێك ئەو قسەی بکردبایە دەموت پیاوێکە شوێنی قسەی کەسانی پێش خۆی کەوتووە.

ئەبوسوفیان وتی: پاشان وتی: فەرمانتان بەچی پێدەکات؟ وتم: فەرمانمان بە نوێژ و بە زەکات و بە سیلەی ڕەحم و بە پاکێتی فەرمانمان پێ دەکات.

هیرەقل وتی: گەر ئەوەی تۆ دەیڵێی دەربارەی ئەو حەق بێت، ئەو پێغەمبەرە دەمزانی ئەو ڕەوانەدەکرێت، بەڵام نەمدەزانی لە ئێوەیە، گەر بمزانیبا دەتوانم پێی بگەم پێم خۆشبوو بگەم بە لیقای، گەر لە لای ئەو بوومایە پێیەکانیم دەشۆری، موڵکی ئەو دەگاتە ئەمەی لەژێر دوو پێی مندایە، ئەبوسوفیان وتی: پاشان نوسراوەکەی پێغەمبەری خودای هێنا و خوێندییەوە، تیایدا نوسرابوو:

**(بسم الله الرحمن الرحيم، لە محەمەد پێغەمبەر خوداوە بۆ هیرەقل گەورەی ڕۆم، سەلام لەسەر ئەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت، پاشان من بانگی تۆ دەکەم بە بانگی ئیسلام، موسوڵمان ببە سەلامەت دەبیت، موسوڵمان ببە خودا دوو پاداشتت پێ دەدات، گەر پشت هەڵبکەی تاوان و گوناهی ڕەعیەتەکانت لەگەردنە:** ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، **تا:** ﴿ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٦٤﴾ [آل عمران: ٦٤]).

کاتێ لە خوێندنەوەی نوسراوەکە تەواو بوو، لە لای دەنگ بەرز بوویەوە و ژاوەژاو دروست بوو، فەرمانمان پێکرا و کراینە دەرەوە، ئەبوسوفیان وتی: کاتێ هاتینە دەرەوە وتم بە هاوەڵانی خۆم کاروباری کوڕەکەی ئیبن ئەبی کەبشە[1] سەریگرت، مەلیکی بەنی ئەصفەر لێی دەترسێت، بەردەوام یەقینم هەبوو بە ئەمری پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرکەتن بەدەست دەهێنێت تا خودا ئیسلامی هێنایە ناومەوە.

---

[1] کوڕەکەی ئیبن ئەبی کەپشە مەبەستی پێغەمبەرە—و.

زوهـری وتـی: هیرەقـل مەزنـەکانی ڕۆمـی بـانگهێش کـرد و لـە ماڵەکـەی خـۆی کۆیکردنەوە و وتی: ئەی کۆمەڵی ڕۆم، ئایە سەرفرازی و ڕێگەی ڕاست و دروستتان بۆ هەتا هـەتا دەوێت، دەتانـەوێ موڵکەکـەتان جـێگیر ببێـت و بمێنێتـەوە؟ وتـی: وەك گوێدرێـژی وەحشـی بـەرەو درگاکـان هـەڵهاتن، بـەڵام بینییـان دەرگاکـان داخـراون، هیرەقـل وتـی: ئەوانـەم بـۆ بێـنن، ئەوانـە هێنـران، پێـی وتـن: مـن تـەنها دەمویسـت توندوتۆڵی و دەمەزراویی ئێوە لەسەر دینەکەتان ببینم، بۆیە ئەوەم لە ئێوە بینی کە پێمخۆشبوو، ئەوانیش سوجدەیان بۆ برد و لێی ڕازیبوون.

## ٦- دەروازەی: غەزوەی "ذات القرد"

٣٦٦٢- (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: خَرَجْتُ قَبْلَ أَنْ يُؤَذَّنَ بِالأُولَى، وَكَانَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تَرْعى بِذِي قَرَدٍ، قالَ: فَلَقِيَنِي غُلاَمٌ لِعَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ فَقَالَ: أُخِذَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قُلْتُ: مَنْ أَخَذَهَا؟ قَالَ: غَطَفَانُ، قَالَ: فَصَرَخْتُ ثَلاَثَ صَرَخَاتٍ: يَا صَبَاحَاهُ! قَالَ: فَأَسْمَعْتُ ما بَيْنَ لاَبَتَيِ المدِينَةِ، ثُمَّ انْدَفَعْتُ عَلَى وَجْهِي حَتَّى أَدْرَكْتُهُمْ وَقَدْ أَخَذُوا يَسْتَقُونَ مِنَ الماءِ، فَجَعَلْتُ أَرْمِيهِمْ بِنَبْلِي، وَكُنْتُ رَامِياً، وأَقُولُ:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعْ          وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ

وَأَرْتَجِزُ، حَتَّى اسْتَنْقَذْتُ اللِّقَاحَ مِنْهُمْ، وَاسْتَلَبْتُ مِنْهُمْ ثَلاَثِينَ بُرْدَةً. قَالَ: وَجَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَالنَّاسُ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! قَدْ حَمَيْتُ الْقَوْمَ الماءَ وَهُمْ عِطَاشٌ، فَابْعَثْ إِلَيْهِمُ السَّاعَةَ، فَقَالَ: (يَا ابْنَ الأَكْوَعِ! مَلَكْتَ فَأَسْجِحْ). قَالَ: ثُمَّ رَجَعْنَا وَيُرْدِفُنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى نَاقَتِهِ حَتَّى دَخَلْنَا المدِينَةَ. [خ٤١٩٤ (٣٠٤١)/ م١٨٠٦]

(ق) لـە سـەلەمەی کـوڕی ئەکوەعـەوە، وتـی: بەرلـەوەی بـانگی یەکـەم بـدرێت دەرچووم، حوشترە ئاوسەکانی پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە "زی قەرەد" دەلەوەڕانـد، وتی: غولامێکی عبدالرحمانی کوڕی عـەوفم پێگەیشـت و وتـی: حوشـترە ئاوسـەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بران، وتم: کێ بردنی؟ وتی: غەتەفان، وتـی: سـێ هـاواری زۆر

توندم کرد: (یا صباحاه)[1]، وتی: دەنگەکەم گەیاندە نێوان دوو گەڕەکەکەی مەدینە، پاشان سەری خۆم هەڵگرت و بەدوایاندا ڕۆیشتم تا پێیان بگەم، ئەوان ئاویان هەڵدەگۆزی، منیش تیر بارانم دەکردن، من کەسێکی تیر ئەندازبووم دەموت:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعْ          وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ

هۆنراوەم دەوت تا حوشترە ئاوسەکانم لێوەرگرتنەوە و دەستم گرت بەسەر سی بوردەدا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) و خەڵکەکە هاتن، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێگەم نەداوە ئەو کۆمەڵە ئاو بخۆنەوە ئەوان ئێستا تینویانە، هەر ئێستا بەدوایاندا بچن، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەی کوڕی ئەکوەع، حوشترەکانت بەدەستهێناوەتەوە بۆیە نەرمونیان بە**)، وتی: پاشان گەڕاینەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر حوشترەکەی لە پاشکۆی خۆی سواری کردم تا چووینە ناو مەدینەوە.



[1] "یا صباحاه" دەربڕینێکە بۆ بە هاناوە هاتن و فریاکەوتن-و.

# بەشی نۆیەم

## غەزوەی خەیبەر و ئەوەی بە دوایدا هات

### ١- دەروازەی: دەرچوون بۆ خەیبەر و فەتحی خەیبەر

**٣٦٦٣-** (ق) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم غَزَا خَيْبَرَ، فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلاَةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ، فَرَكِبَ نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ، وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ، فَأَجْرَى نَبِيُّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ، وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِيِّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ حَسَرَ الإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ، حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ نَبِيِّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ: (**اللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ، فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ**). قَالَهَا ثَلاَثاً.

قَالَ: وَخَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ، فَقَالُوا: مُحَمَّدٌ . قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: وَقَالَ بَعْضُ أَصحَابِنَا: وَالْخَمِيسُ؛ يَعْنِي: الْجَيْشَ..

قَالَ: فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً، فَجُمِعَ السَّبْيُ، فَجَاءَ دِحْيَةُ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ! أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ، قَالَ: (**اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً**). فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ! أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ، لاَ تَصْلُحُ إِلاَّ لَكَ، قَالَ: (**ادْعُوهُ بِهَا**). فَجَاءَ بِهَا، فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ غَيْرَهَا**). قَالَ: فَأَعْتَقَهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، وَتَزَوَّجَهَا.

فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا؟ قَالَ: نَفْسَهَا، أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا. حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ، جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَرُوساً، فَقَالَ: (**مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ**). وَبَسَطَ نِطَعاً، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ، قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَدْ ذَكَرَ السَّوِيقَ، قَالَ: فَحَاسُوا حَيْساً، فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٣٧١/ م: النكاح ١٣٦٥ (٨٤)]

**(ق) لە ئەنەسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزوەی خەیبەری کرد، نوێژی بەیانیمان بە تاریك و لێڵە لای خەیبەر ئەنجامدا، پێغەمبەر(ﷺ) سوار بوو، ئەب وتەڵحەش سوار**

بوو، من لە پاشکۆی ئەبو تەڵحەدا بووم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەپەلە گەیشتە رێگە تەسك و باریکەکانی خەیبەر، ئەژنۆم دەیدا لە رانی پێغەمبەر خودا(ﷺ)[1]، پاشان پۆشاکەکەی خوارەوەی لەسەر رانی خۆی لادا تا من تەماشای سپێتی رانی پێغەمبەری خودام(ﷺ) کرد، کاتێ رۆیشتە ناو ئاوەدانییەکە فەرمووی: (**"الله اکبر" خەیبەر وێران بوو، إنا إذا نزلنا بساحة قوم، فساء صباح المُنْذَرين–ئێمە گەر دابەزین بۆ مەیدانی قەومێك خراپترین بەیانی ترسێنراوانە**)، سێجار ئەمەی فەرموو.

وتی: خەڵکەکە هاتنە دەرەوە بۆ کاروباریان، وتیان: محەمەد، عبدالعزیز دەڵێت: هەندێك لە هاوەڵانمان دەڵێن: "الخميس" واتە سوپا.

وتی: بەزۆر دەستمان بەسەردا گرت، دیلەکان کۆکرانەوە، دیحیە هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، جاریەیەك لەو دیلانەم پێ بدە، فەرمووی: برۆ دانەیەکیان ببە، ئەویش صەفیەی کچی حوییەی برد، پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، صەفیەی کچی حوییەت داوە بە دیحیە ئەو خاتوونی بەنی قورەیزە و بەنی نەزیرە، تەنها شایستەی تۆیە، پێغەمبەر فەرمووی: **دیحیە بە ئافرەتەکەوە بانگ بکەنەوە**)، ئەویش هێنای، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) تەماشای کرد فەرمووی: (**جاریەیەك لە دیلەکانی تر جگە لەمە ببە**)، پێغەمبەر(ﷺ) رزگاری کرد و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، سابیت بەئەنەسی وت: ئەی باوکی حەمزە، مارەییەکەی چی بوو؟ وتی: خۆی بوو، رزگاری کرد و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد[2]، تا لە رێگە ئوم سولەیم صەفیەی ئامادە کرد و لە شەو هەدیەی پێغەمبەری کرد، پێغەمبەر(ﷺ) رۆژی لێ بوویەوە و زاوا بوو، پێغەمبەر فەرمووی: (**هەرکەس شتێکی لە لایە با بیهێنێت**)، پێستێکی بەرینیان راخست وەك سفرە، پیاوێك خورمای دەهێنا و پیاوێکی رۆنی دەهێنا، وتی: وادەزانم باسی ئاردی نەرم و بێژراوەی کرد، وتی: کەشك و رۆن و خورمایان ئامادە کرد، ئەوە وەلیمەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

---

(1) ئەوەش لەبەر تەسکی و باریکی رێگەکە–و.

(2) واتە: مارەییەکەی بریتی بوو لە رزگار کردنی–و.

■ وفي رواية للبخاري: أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَمَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم صَفِيَّةُ مُرْدِفُهَا عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا كانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَثَرَتِ النَّاقَةُ، فَصُرِعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَالمَرْأَةُ، وَإِنَّ أَبَا طَلْحَةَ ـ قَالَ: أَحْسِبُ قَالَ ـ اقْتَحَمَ عَنْ بَعِيرِهِ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ، هَلْ أَصَابَكَ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: (**لاَ، وَلكِنْ عَلَيْكَ بِالمَرْأَةِ**). فَأَلْقَى أَبُو طَلْحَةَ ثَوْبَهُ عَلَى وَجْهِهِ فَقَصَدَ قَصْدَهَا، فَأَلْقَى ثَوْبَهُ عَلَيْهَا، فَقَامَتِ المَرْأَةُ، فَشَدَّ لَهُمَا عَلَى رَاحِلَتِهِمَا فَرَكِبَا، فَسَارُوا حَتَّى إِذَا كانُوا بِظَهْرِ المَدِينَةِ ـ أَوْ قَالَ: أَشْرَفُوا عَلَى المَدِينَةِ ـ قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**آيِبُونَ تَائِبُونَ عابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ**). فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُهَا، حَتَّى دَخَلَ المَدِينَةَ. [خ٣٠٨٦]

**لە ڕیوایەتی بوخاریدا: ئەو و ئەبوتەڵحە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتن، صەفیە لە پاشکۆی پێغەمبەردا بوو لەسەر وڵاخی سواریەکەی، گەیشتنە شوێنێك حوشترەکە سەرسمیدا، پێغەمبەر(ﷺ) و ئافرەتەکە[1] بەربوونەوە، وتی: پێموایە وتی: ئەبو تەلحە لە حوشترەکەی دابەزی و هات بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، خودا من بکات بە فیدای تۆ، ئایا هیچ شتێکت توشهات؟ فەرمووی: (نەخێر، بەڵام برۆ بە لای ئەو ئافرەتەوە)، ئەبوتەڵحە پۆشاکەی دا بەڕووی خۆدا و ڕووی لە ئافرەتەکە کرد و پۆشاکەکەی هەڵدایە سەری، ئافرەتەکە هەستایەوە، هەردووکیانی توند لەسەر وڵاخی سواریەکەیان دابەست و سواربوون و ڕۆیشتن تا گەیشتنە نزیك مەدینە، یان وتی: تا ڕوانیان بەسەر مەدینەدا، پێغەمبەر فەرمووی: (آیبون، تائبون، عابدون، لربنا حامدون) بەردەوام ئەوەی دەوتەوە تا ڕۆیشتە ناو مەدینە.**

**٣٦٦٤**- (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى خَيْبَرَ، فَسِرْنَا لَيْلاً، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ لِعامر: يَا عامر، أَلاَ تُسْمِعُنَا مِنْ هُنَيْهَاتِكَ؟ وَكَانَ عامر رَجُلاً شَاعِراً، فَنَزَلَ يَحْدُو بِالْقَوْمِ يَقُولُ:

---

[1] **واتە: صەفییەی هاوسەری پێغەمبەر ـ و.**

اللَّهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ ما اهْتَدَيْنَا　　وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

فَاغْفِرْ فِدَاءً لَكَ مَا اتَّقَيْنَا　　وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا

وَأَلْقِيَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا　　إِنَّا إِذَا صِيحَ بِنَا أَبَيْنَا

وَبِالصِّيَاحِ عَوَّلُوا عَلَيْنَا

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ هَذَا السَّائِقُ**)؟ قَالُوا: عامر بْنُ الأَكْوَعِ، قَالَ: (**يَرْحَمُهُ اللهُ**). قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: وَجَبَتْ يَا نَبِيَّ اللهِ، لَوْلاَ أَمْتَعْتَنَا بِهِ؟

فَأَتَيْنَا خَيْبَرَ فَحَاصَرْنَاهُمْ حَتَّى أَصَابَتْنَا مَخْمَصَةٌ شَدِيدَةٌ، ثُمَّ إِنَّ اللهَ تَعَالَى فَتَحَهَا عَلَيْهِمْ، فَلَمَّا أَمْسى النَّاسُ مَسَاءَ الْيَوْمِ الَّذِي فُتِحَتْ عَلَيْهِمْ، أَوْقَدُوا نِيرَاناً كَثِيرَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا هذِهِ النِّيرَانُ؟ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ تُوقِدُونَ**)؟ قَالُوا: عَلَى لَحْمٍ، قَالَ: (**عَلَى أَيِّ لَحْمٍ**)؟ قَالُوا: لَحْمُ حُمُرِ الإِنْسِيَّةِ، قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَهْرِيقُوهَا وَاكْسِرُوهَا**). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَوْ نُهَرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا؟ قَالَ: (**أَوْ ذَاكَ**).

فَلَمَّا تَصَافَّ الْقَوْمُ، كَانَ سَيْفُ عامر قَصِيراً، فَتَنَاوَلَ بِهِ سَاقَ يَهُودِيٍّ لِيَضْرِبَهُ، وَيَرْجِعُ ذُبَابُ سَيْفِهِ، فَأَصَابَ عَيْنَ رُكْبَةِ عامر فَمَاتَ مِنْهُ. قَالَ: فَلَمَّا قَفَلُوا قَالَ سَلَمَةُ: رَآنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِي قَالَ: (**مَا لَكَ**)؟ قُلْتُ لَهُ: فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، زَعَمُوا أَنَّ عامراً حَبِطَ عَمَلُهُ؟ قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**كَذَبَ مَنْ قَالَهُ، إِنَّ لَهُ لأَجْرَيْنِ**. وَجَمَعَ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ. **إِنَّهُ لَجَاهِدٌ مُجَاهِدٌ، قَلَّ عَرَبِيٌّ مَشى بِهَا مِثْلَهُ**). حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، قَالَ: (**نَشَأَ بِهَا**).

[خ٤١٩٦ (٢٤٧٧)/ م١٨٠٢]

**(ق) لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووین بۆ خەیبەر، شەو ڕۆیشتین، پیاوێك لە خەڵکە وتی بە عامر: ئەی عامر، لە هۆنراوە کورتەکانی خۆتمان پێ ببیستە، عامر پیاوێکی شاعیر بوو، دابەزی و هۆنراوەی بۆ خەڵکەکە دەوت و دەیوت:**

اللَّهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ ما اهْتَدَيْنَا　　وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

فَاغْفِرْ فِدَاءً لَكَ مَا اتَّقَيْنَا　　وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا

وَأَلْقِيَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا　　إِنَّا إِذَا صِيحَ بِنَا أَبَيْنَا

وَبِالصِّيَاحِ عَوَّلُوا عَلَيْنَا

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەو تەکان پێدەرە کێیە؟**) وتیان: عامری کوڕی ئەکوەعە، فەرمووی: (**ڕەحمەتی خودای لێ بێت**)، پیاوێك لە خەڵکە وتی: شەهادەتی بۆ واجب بوو، ئەی پێغەمبەری خودا نەدەکرا بە ئەو خۆشیمان پێ ببەخشی؟.

هاتین بۆ خەیبەر ئابلۆقەماندا تا تووشی برسیەکی زۆر توند هاتین، پاشان خودا(تعالى) بەسەر خەڵکەکەدا فەتحی کرد، کە خەڵکە ئەو ڕۆژەی خەیبەریان بەسەردا فەتح کرا ئێوارەیان بەسەردا هات ئاگری زۆریان کردەوە، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەو ئاگرانە چین؟ بۆ چ شتێك کراونەتەوە؟**)، وتیان: بۆ گۆشت، فەرمووی: (**چ جۆرە گۆشتێك؟**) وتیان: بۆ گۆشتی گوێدرێژی ماڵی، پێغەمبەر فەرمووی: **بیرێژن و مەنجەڵەکان بشکێنن**)، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ئەگەر بیرێژین و مەنجەڵەکان بشۆرین؟ فەرمووی: (**ئەوەش دەبێت**).

کاتێ خەڵکەکە ڕیزیان بەست، شمشێرەکەی عامر کورت بوو، دەستی بۆ برد لە لاقی کەسێکی یەهودی بدات بەشی سەرەوەی شمشێرەکەی گەڕایەوە و دای لە ئەژنۆی عامر و بەهۆی ئەوەوە مرد، وتی: کاتێ خەڵکەکە گەڕانەوە سەلەمە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) منی بینی و ئەو دەستی منی گرتبوو فەرمووی: (**چیتە؟**)، پێم وت: دایك و باوکم فیدات بێت، خەڵکەکە بانگەشەی ئەوە دەکەن عامر کارەکەی پووچ بووبێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**هەر کەس ئەوەی وت درۆی کردووە، ئەو دوو پاداشتی هەیە**-دوو پەنجەی خۆی کۆکردەوە- **ئەو جاهید و موجاهیدە کەم عەرەب هەیە بە نموونەی ئەو بەوەوە ڕۆشتبێت**)، قوتەیبە بۆی باسکردین و وتی: حاتیم بۆی باسکردووین پێغەمبەر فەرمووی: (**نشأ بها**[1]).

## ٢- دەروازەی: حەرامکردنی موتعەی ئافرەتان و گۆشتی گوێدرێژی ماڵی

**٣٦٦٥**- (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ أَكْلِ لُحُومِ الحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. [خ٤٢١٦/ م١٤٠٧]

---

[1] واتە: لەسەر ئەو ئاکار و ڕەوشتە بەرزانە پەروەردە بوو بێت-و.

**(ق) لە عەلی کوڕی ئەبی تالبەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی خەیبەر نەهی کرد لە موتعەکردن لەگەڵ ئافرەت و خواردنی گوێدرێژی ماڵی.**

- وفي رواية لهما، واللفظ لمسلم: أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يُلَيِّنُ فِي مُتْعَةِ النِّسَاءِ فَقَالَ: مَهْلاً، يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَهى عَنْهَا يَوْمَ خَيْبَرَ، وعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. [خ٦٩٦١]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: هەردووکیاندا–لەفزەکە بۆ موسلیم دەگەڕێتەوە–: عەلی بیستی ابن عەباس لە موتعەی ئافرەتاندا نەرمی دەنوێنێت، پێی وت: بۆستە ئەی ئیبن عباس، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی خەیبەر نەهی لێکرد هەروەها نەهی کرد لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی.**

## ٣- دەروازەی: مەڕی ژەهراویکراو

**٣٦٦٦**– (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ أُهْدِيَتْ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**اجْمَعُوا إِلَيَّ مَنْ كَانَ هَاهُنَا مِنْ يَهُودَ**). فَجُمِعُوا لَهُ، فَقَالَ: (**إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ**)؟. فَقَالُوا: نَعَمْ، قالَ لَهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أَبُوكُمْ**)؟ قالوا: فُلاَنٌ، فَقَالَ: (**كَذَبْتُمْ، بَلْ أَبُوكُمْ فُلاَنٌ**). قَالُوا: صَدَقْتَ، قَالَ: (**فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُ عَنْهُ**)؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ! وَإِنْ كَذَبْنَا عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عَرَفْتَهُ فِي أَبِينَا، فَقَالَ لَهُمْ: (**مَنْ أَهْلُ النَّارِ**)؟ قالُوا: نَكُونُ فِيهَا يَسِيراً، ثُمَّ تَخْلُفُونَا فِيهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**اخْسَؤُوا فِيهَا، وَاللهِ لاَ نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَداً**). ثُمَّ قَالَ: (**هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ، إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ**)؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، يَا أَبَا الْقَاسِمِ، قالَ: (**هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هذِهِ الشَّاةِ سُمّاً**)؟ قالُوا: نَعَمْ، قالَ: (**ما حَمَلَكُمْ عَلَى ذلِكَ**)؟ قَالُوا: أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كاذِباً نَسْتَرِيحُ، وَإِنْ كُنْتَ نَبِيّاً لَمْ يَضُرَّكَ. [خ٣١٦٩]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کاتێ فەتحی خەیبەر کرا مەڕێکی برژاو ژەهری تێدابوو هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوانەی لێرەن لەیەهود بۆم کۆ بکەنەوە)، بۆی کۆکرانەوە، فەرمووی: (من پرسیارێکتان**

لێدەکەم دەربارەی شتێك، ئایا لەگەڵم ڕاست دەکەن؟) وتیان: بەڵێ، پێغەمبەری(ﷺ) فەرمووی: (کێ باوکی ئێوەیە؟)، وتیان: فلان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (درۆتان کرد، باوکی ئێوە فلانە)، وتیان: ڕاستدەکەی، فەرمووی: (ئایا لەگەڵم ڕاست دەکەن گەر پرسیارێکتان لێبکەم؟) وتیان: بەڵێ، ئەی باوکی قاسم، گەر درۆت لەگەڵ بکەین درۆکەمان دەزانێت، پێی فەرموون: (کێ ئەهلی ئاگرە؟) وتیان: ئێمە کەمێك تیایدا دەمێنینەوە پاشان ئێوە تیایدا جێگەی ئێمە دەگرنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دەمکوتبن تیایدا، سوێند بە خودا ئێمە هەرگیز لە ئاگر جێیگەی ئێوە ناگرینەوە)، پاشان فەرمووی: (گەر پرسیارێکتان لێ بکەم ئێوە لەگەڵم ڕاست دەکەن؟) وتیان: بەڵێ، ئەی باوکی قاسم، فەرمووی: (ئایا ژەهرتان کردبووە ئەو مەڕەوە؟)، وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (چی وایلێکردن ئەو کارە بکەن؟)، وتیان: ویستمان بزانین، گەر تۆ درۆزن بیت لە دەستت ڕزگارمان دەبێت[1]، گەر پێغەمبەری خودا بیت زیانت پێ ناگەیەنێت.

## ٤- ڕاگوێزانی یەهودی خەیبەر لە دوای ناپاکیەکەیان

**٣٦٦٧**- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا فَدَعَ أَهْلُ خَيْبَرَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، قَامَ عُمَرُ خَطِيباً فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ عامَلَ يَهُودَ خَيْبَرَ عَلَى أَمْوَالِهِمْ، وَقَالَ: (**نُقِرُّكُمْ ما أَقَرَّكُمُ اللهُ**)، وَإِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ خَرَجَ إِلَى مالِهِ هُنَاكَ، فَعُدِيَ عَلَيْهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَفُدِعَتْ يَدَاهُ وَرِجْلاَهُ، وَلَيْسَ لَنَا هُنَاكَ عَدُوٌّ غَيْرُهُمْ، هُمْ عَدُوُّنَا وَتُهْمَتُنَا، وَقَدْ رَأَيْتُ إِجْلاَءَهُمْ.

فَلَمَّا أَجْمَعَ عُمَرُ عَلَى ذلِكَ، أَتَاهُ أَحَدُ بَنِي أَبِي الْحُقَيْقِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! أَتُخْرِجُنَا، وَقَدْ أَقَرَّنَا مُحَمَّدٌ صلّى الله عليه وسلّم، وَعَامَلَنَا عَلَى الأَمْوَالِ، وَشَرَطَ ذلِكَ لَنَا. فَقَالَ عُمَرُ: أَظَنَنْتَ أَنِّي نَسِيتُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**كَيْفَ بِكَ إِذَا أُخْرِجْتَ مِنْ خَيْبَرَ تَعْدُو بِكَ قَلوصُكَ لَيْلَةً بَعْدَ لَيْلَةٍ**). فَقَالَ: كَانَتْ هذِهِ هُزَيْلَةً مِنْ أَبِي الْقَاسِمِ، قالَ: كَذَبْتَ يَا عَدُوَّ اللهِ! فَأَجْلاَهُمْ عُمَرُ، وَأَعْطَاهُمْ قِيمَةَ ما كَانَ لَهُمْ مِنَ التَّمَرِ، مالاً وَإِبِلاً وَعُرُوضاً مِنْ أَقْتَابٍ وَحِبَالٍ وَغَيْرِ ذلِكَ. [خ٢٧٣٠]

---

[1] واتە: واتە ژەهرەکە دەتکوژێت-و.

(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: کاتێ ئەهلی خەیبەر دەست و قاچی عەبدوڵای کوڕی عومەریان شکاند عومەر وتاری دا و وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) یەهودی خەیبەری لەسەر ماڵ و سامانیان بەکارهێنا فەرمووی: **(دان دەنێین بەوادا خودا بۆی دیاری کردوون)**، عەبدوڵا ی کوڕی عومەر ڕۆیشتوە بەلای ماڵ وسامانییەوە لەو شوێنە شەو دەستدرێژی کراوەتە سەری و هەردوو دەستی و هەردوو لاقی شکێنراوە، ئێمە لەو شوێنە دوژمنێکمان نییە جگە لەوان، ئەوانە دوژمنی ئێمەن و تۆمەتباری ئێمەن، بۆیە پێمباشە لە شوێنی خۆیان کۆچیان پێبکەین.

کاتێ عومەر لەسەر ئەوە کۆبویەوە یەکێك لە بەنی ئەبی حوقەیق هات و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا تۆ ئێمە دەردەکەی لە کلتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی لەو شوێنە هێڵاوەتە و ئێمەی بەکارهێناوە لەسەر ماڵ وسامان و ئەوەی کردووە بە مەرج؟ عومەر وتی: ئایا پێتوایە من قسەکەی پێغەمبەری خودام(ﷺ) لەبیرچووە: **(دەبێت حاڵت چۆن بێت کاتێ لە خەیبەر دەردەکرێی و حوشترە مێیەکەت شەو لەدوای شەو بەردەوام دەبێت لە ڕۆشتن)**، کەسەکە وتی: ئەوە شۆخییەك بوو لە ئەبی قاسمەوە، عومەر وتی: درۆت کرد، ئەی دوژمنی خودا، بۆیە کۆچی پێکردن و نرخی ئەو بەروبوومەی پێدان کە هەیان بوو، نرخی ماڵ و سامان و حوشتر و کەرەستەی ئاودان و پەت و گوریس و شتانی تر.

## ٥- دەروازەی: گەڕانەوەی کۆچکەرانی حەبەشە

**٣٦٦٨**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ قَالَ: بَلَغْنَا مَخْرَجُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَنَحْنُ بِالْيَمَنِ، فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ إِلَيْهِ أَنَا وَأَخَوَانِ لِي أَنَا أَصْغَرُهُمْ، أَحَدُهُمَا أَبُو بُرْدَةَ وَالآخَرُ أَبُو رُهْمٍ، إِمَّا قَالَ: فِي بِضْعٍ، وَإِمَّا قَالَ: فِي ثَلاَثَةٍ وَخَمْسِينَ، أَوِ اثْنَيْنِ وَخَمْسِينَ رَجلاً مِنْ قَوْمِي، فَرَكِبْنَا سَفِينَةً، فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالحَبَشَةِ، فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَأَقَمْنَا مَعَهُ حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعاً، فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، وَكَانَ أُنَاسٌ مِنَ النَّاسِ يَقُولُونَ لَنَا ـ يَعْنِي: لِأَهْلِ السَّفِينَةِ ـ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ.

وَدَخَلَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنَا، عَلَى حَفْصَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ زَائِرَةً، وَقَدْ كَانَتْ هَاجَرَتْ إِلَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ، فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَى حَفْصَةَ، وَأَسْمَاءُ عِنْدَهَا، فَقَالَ عُمَرُ حِينَ رَأَى أَسْمَاءَ: مَنْ هذِهِ؟ قَالَتْ: أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، قَالَ عُمَرُ: آلْحَبَشِيَّةُ هذِهِ، آلْبَحْرِيَّةُ هذِهِ؟ قَالَتْ أَسْمَاءُ: نَعَمْ، قَالَ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ، فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللهِ مِنْكُمْ، فَغَضِبَتْ وَقَالَتْ: كَلاَّ وَاللهِ، كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ، وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ، وَكُنَّا فِي دَارٍ ـ أَوْ فِي أَرْضٍ ـ الْبُعَدَاءِ الْبُغَضَاءِ بِالْحَبَشَةِ، وَذلِكَ فِي اللهِ وَفِي رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم. وَايْمُ اللهِ! لاَ أَطْعَمُ طَعَاماً، وَلاَ أَشْرَبُ شَرَاباً، حَتَّى أَذْكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللهِ، وَنَحْنُ كُنَا نُؤْذَى وَنُخَافُ، وَسَأَذْكُرُ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَسْأَلُهُ، وَاللهِ لاَ أَكْذِبُ، وَلاَ أَزِيغُ، وَلاَ أَزِيدُ عَلَيْهِ.

فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ! إِنَّ عُمَرَ قَالَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: **(فَمَا قُلْتِ لَهُ)**؟. قَالَتْ: قُلْتُ لَهُ: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: **(لَيْسَ بِأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ، وَلَهُ وَلِأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، وَلَكُمْ أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ)**. قَالَتْ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسى وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ يَأْتُونَنِي أَرْسَالاً، يَسْأَلُونَنِي عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، مَا مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ هُمْ بِهِ أَفْرَحُ وَلاَ أَعْظَمُ فِي أَنْفُسِهِمْ مِمَّا قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم.

قَالَ: أَبُو بُرْدَةَ: قَالَتْ أَسْمَاءُ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسى وَإِنَّهُ لَيَسْتَعِيدُ هذَا الْحَدِيثَ مِنِّي.

[خ٤٢٣٠ و٤٢٣١ (٣١٣٦)/ م٢٥٠٢ و٢٥٠٣]

**(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ)مان پێگەیشت، ئێمە لە یەمەن بووین، وەك كۆچكەر دەرچووین بۆ لای ئەو، من و دوو برای ترم، من بچووكترینیان بووم، یەكیان ئەبو بوردە بوو و ئەویتریان ئەبو ڕوهم، جا یان وتی: چەندین پیاو، یان وتی: پەنجا و سێ، یان وتی: پەنجا و دوو پیاو لە هۆزەكەم، سواری كەشتیەك بووین، كەشتییەكەمان ئێمەی گەیاندە لای نەجاشی لە حەبەشە، جەحفەری كوڕی ئەبی تالیبمان پێگەیشت لە لای ماینەوە تا هەموومان گەڕاینەوە، كاتێ خەیبەری فەتح كرد بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتین، خەڵكانێ بە ئێمەیان دەوت–واتە بە ئەهلی كەشتیەكە– ئێمە بە كۆچ كردن پێش ئێوە كەوتین.**

ئەسمای کچی عومەیس هاتە ژوورەوە، ئەو یەکێك بوو لەوانەی لەگەڵمان هـاتبوو، وەك سەردانیکار هاتە ژوورەوە بۆلای حەفصە، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو لەگـەڵ ئەوانەی کۆچیان کرد بوو کۆچی کرد بوو بۆ لای نەجاشی، عومـەر هاتـە ژوورەوە بـۆ لای حەفصە و ئـەسمای لـەلا بـوو، عومـەر کـاتێ ئـەسمای بـینی وتـی: ئەمـە کێیـە؟ حەفصە وتی: ئەسمای کچـی عومەیسـە، عومـەر وتـی: ئەمـە حەبەشـییەکەیە، ئەمـە دەریاییەکەیە؟ ئەسما وتی: بەڵێ، عومەر وتی: ئێمە پێشتان کـەوتین بـە کۆچـکردن، ئێمە لە پێشترین بە پێغەمبـەری خـودا لـە ئێـوە، وەسمـا تـورە بـوو، وتـی: نـەخێر، سوێند بە خودا، ئێوە لەگـەڵ پێغەمبـەری خودابـوون(ﷺ) برسـییەکانی ئێـوەی نـان دەدا، نەزان و نەفامەکانی ئێوەی ئامۆژگاری دەکرد، بەڵام ئێمە لە خانەیـەك بـووین، یان لە زەویەك بووین لە حەبەشە زۆردوور و زۆر ناخۆش، ئەوەش لە پێناوی خـودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، سوێند بە خودا، خواردن تام ناکەم و ئاو ناخۆمـەوە تـا ئـەوەی وتت بۆ پێغەمبەری خودای بـاس دەکـەم، ئێمـە ئازارمـان دەخـوارد و دەترسـێنراین، ئـەوە بـۆ پێغەمبـەری(ﷺ) بـاس دەکـەم و پرسـیاری لـێ دەکـەم، سـوێند بـە خـودا درۆناکەم و لادانی تێناخەم و زیاد لەسەری باس ناکەم.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هات ئەسما وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، عومـەر ئـاوا و ئـاوا دەڵێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەی تۆ چیت پێ وت؟**) ئەسماش وتی: ئاوا و ئاوام پێ وت ، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەو لە ئێوە بە من لەپێشتر نییە، بۆ ئەو و بۆ هاوەڵانی یەك کۆچ هەیە بەڵام ئێوەی ئەهلی کەشتیەکە دوو کۆچتان بۆ هەیە**)، ئەسما وتی: ئەبوموسـا و هـاوەڵانی کەشـتیەکەم بـینی بەدواییەکـدا هـاتن بـۆ لام، پرسـیاری ئـەو فەرموودەیان لێ دەکردم، لەبەر ئەفسیان هیچ شت لە دنیا لایـان دڵخۆشـتر و مـەزنتر نەبوو لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەر فەرموو بووی، وتی: ئـەبو بـوردە وتـی: ئـەسما وتی: ئەبو موسام بینی ئەو داوای دوبارەکردنەوەی ئەم فەرموودەی دەکرد لە من.

## ٦- دەروازەی: گێڕانەوەی پێدانەکانی ئەنصار لە لایەن کۆچکەرانەوە

**٣٦٦٩-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ المهَاجِرُونَ المدِينَةَ مِنْ مَكَّةَ، وَلَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ ـ يَعْنِي: شَيْئاً ـ، وَكَانَتِ الأَنْصَارُ أَهْلَ الأَرْضِ وَالعَقَارِ، فَقَاسَمَهُمُ الأَنْصَارُ عَلَى أَنْ يُعْطُوهُمْ ثِمَارَ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ، وَيَكْفُوهُمُ الْعَمَلَ وَالمؤُونَةَ، وَكَانَتْ أُمُّهُ أُمُّ أَنَسٍ أُمُّ سُلَيْمٍ، كَانَتْ أُمَّ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، فَكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِذَاقاً، فَأَعْطَاهُنَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلاَتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمَّا فَرَغَ مِنْ قِتَالِ أَهْلِ خَيْبَرَ، فَانْصَرَفَ إِلَى المدِينَةِ، رَدَّ المهَاجِرُونَ إِلَى الأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمُ الَّتِي كَانُوا مَنَحُوهُمْ مِنْ ثِمَارِهِمْ، فَرَدَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى أُمِّهِ عِذَاقَهَا، وَأَعْطَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أُمَّ أَيْمَنَ مَكَانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ. [خ٢٦٣٠/ م١٧٧١]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ ڕازی بێت)، وتی: کاتێ کۆچکەران هاتن بۆ مەدینە لە دەستیاندا نەبوو، واتە هیچ شتێك، ئەنصار خاوەن زەوی و خانووبەرە بوون ئەنصار لەگەڵ ئەوان دابەشیان کرد، لەسەر ئەوەی هەموو ساڵێك بەری ماڵ وسامانەکەیان پێ بدەن و کارکردن و زەحمەت و ئەرکیان لە کۆڵکەنەوە، دایکی واتەدایکی ئەنەس، ئوم سولەیم- کە دایکی عەبدوڵای کوڕی ئەبی تەڵحەشە- ئوم ئەنەس دارخورکایەکی دابوو بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دای بە ئوم ئەیمەن، مەولای خۆی کە دایکی ئوسامەی کوڕی زەید بوو.**

**ئیبن شیهاب وتی: ئەنەسی کوڕی مالیك هەواڵی پێدام: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگانی ئەهلی خەیبەر دەستی بەتاڵبوو گەڕایەوە بۆ مەدینە، کۆچکەران ئەو شتانەی پێیان درابوو لە بەروبووم گێڕایانەوە بۆ ئەنصار، پێغەمبەر(ﷺ) دارخورماکەی گێڕایەوە بۆ دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك لە جێگەی ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) باخێکی دا بە ئوم ئەیمەن.**

**٣٦٧٠-** (خ) عَنْ عائشة ﷺ قَالَتْ: لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ قُلْنَا: الآنَ نَشْبَعُ مِنَ التَّمْرِ. [خ٤٢٤٢]

**(خ) لە عائیشەوە (خوا لێی رازی بێت)، وتی: کاتێ خەیبەر فەتح کرا وتمان ئێستە لە خورما تێر دەبین.**

## ٧- دەروازەی: ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" و هاوەڵانی چۆن بوو؟

٣٦٧١- (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا أُنَاساً فُقَرَاءَ، وَأَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ، وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ**). وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلاَثَةٍ، فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِعَشَرَةٍ.
[خ٦٠٢/ م٢٠٥٧]

**(ق) لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی بەکرەوە: هاوەڵانی صوفە خەڵکانێکی هەژار بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس خواردنی دوانی لە لایە با سێهەمیان ببات، هەرکەس چواری لە لایە با پێنجەمیان یان شەشەمیان ببات)، ئەبوبەکر هات و سیانی هێنا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەی هێنابوو.**

٣٦٧٢- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: رَأَيْتُ سَبْعِينَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ، مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ عَلَيْهِ رِدَاءٌ، إِمَّا إِزَارٌ وَإِمَّا كِسَاءٌ، قَدْ رَبَطُوا فِي أَعْنَاقِهِمْ، فَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ نِصْفَ السَّاقَيْنِ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ الْكَعْبَيْنِ، فَيَجْمَعُهُ بِيَدِهِ كَرَاهِيَةَ أَنْ تُرَى عَوْرَتُهُ. [خ٤٤٢]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: حەفتا لە هاوەڵانی صوفەم بینی، پیاوێك لەوانم نەبینی کراسی لەبەربێت، تەنها خوارپۆشاکێك و سەرپۆشاکێك بە گەردنی خۆیانەوە بەستبوو، هەیانبوو دەگەیشتە نیوەی لاقی هەیانبوو دەگەیشتە قولاپێی، بەدەستی خۆی کۆی دەکردەوە لە ترسی ئەوەی عەورەتی دەربکەوێت.**

٣٦٧٣- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قال: آللهِ الَّذِي لاَ إِلهَ إِلاَّ هُوَ، إِنْ كُنْتُ لأَعْتَمِدُ بِكَبِدِي عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لأَشُدُّ الْحَجَرَ عَلَى بَطْنِي مِنَ الْجُوعِ. وَلَقَدْ قَعَدْتُ يَوْماً عَلَى طَرِيقِهِمُ الَّذِي يَخْرُجُونَ مِنْهُ، فَمَرَّ أَبُو بَكْرٍ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ، مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِيُشْبِعَنِي،

فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ. ثُمَّ مَرَّ بِي عُمَرُ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ، مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ. ثُمَّ مَرَّ بِي أَبُو الْقَاسِمِ صلّى الله عليه وسلّم، فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآنِي، وَعَرَفَ مَا فِي نَفْسِي وَمَا فِي وَجْهِي، ثُمَّ قَالَ: (**يَا أَبَا هِرٍّ**) ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**الْحَقْ**)، ومَضَى فاتَّبَعْتُهُ، فَدَخَلَ، فَاسْتَأْذَنَ، فَأَذِنَ لِي، فَدَخَلَ، فَوَجَدَ لَبَناً فِي قَدَحٍ، فَقَالَ: (**مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ**)؟ قالوا: أَهْدَاهُ لَكَ فُلاَنٌ أو فُلاَنَةٌ، قال: (**أَبَا هِرٍّ**)، قُلْتُ: لَبَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**الْحَقْ إِلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ لِي**).

- قَالَ: وَأَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ الإِسْلاَمِ، لاَ يَأْوُونَ عَلَى أَهْلٍ وَلاَ مَالٍ وَلاَ عَلَى أَحَدٍ، إِذَا أَتَتْهُ صَدَقَةٌ بَعَثَ بِهَا إِلَيْهِمْ، وَلَمْ يَتَنَاوَلْ مِنْهَا شَيْئاً، وَإِذَا أَتَتْهُ هَدِيَّةٌ أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ وَأَصَابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فِيهَا .- فَسَاءَنِي ذلِكَ، فَقُلْتُ: وَمَا هَذَا اللَّبَنُ فِي أَهْلِ الصُّفَّةِ؟ كُنْتُ أَحَقَّ أَنَا أَنْ أُصِيبَ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ شَرْبَةً أَتَقَوَّى بِهَا، فَإِذَا جَاؤوا أَمَرَنِي، فَكُنْتُ أَنَا أُعْطِيهِمْ، وَمَا عَسَى أَنْ يَبْلُغَنِي مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ طَاعَةِ اللهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم بُدٌّ، فَأَتَيْتُهُمْ فَدَعَوْتُهُمْ فَأَقْبَلُوا، فَاسْتَأْذَنُوا فَأَذِنَ لَهُمْ، وَأَخَذُوا مَجَالِسَهُمْ مِنَ الْبَيْتِ، قَالَ: (**يَا أَبَا هِرٍّ**)، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**خُذْ فَأَعْطِهِمْ**). قَالَ: فَأَخَذْتُ الْقَدَحَ، فَجَعَلْتُ أُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ، فَأُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ.

حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَقَدْ رَوِيَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ، فَأَخَذَ الْقَدَحَ فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ، فَنَظَرَ إِلَيَّ فَتَبَسَّمَ، فَقَالَ: (**أَبَا هِرٍّ**)، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**بَقِيتُ أَنَا وَأَنْتَ**). قُلْتُ: صَدَقْتَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**اقْعُدْ فَاشْرَبْ**). فَقَعَدْتُ فَشَرِبْتُ، فَقَالَ: (**اشْرَبْ**). فَشَرِبْتُ، فَمَا زَالَ يَقُولُ: (**اشْرَبْ**). حَتَّى قُلْتُ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَجِدُ لَهُ مَسْلَكاً، قَالَ: (**فَأَرِنِي**). فَأَعْطَيْتُهُ الْقَدَحَ، فَحَمِدَ اللهَ وَسَمَّى وَشَرِبَ الْفَضْلَةَ. [خ٦٤٥٢]

**(خ) لەئەبی هورەیرەوە، وتی: سوێند بەخودایەی هیچ خودایەك نییە جگە لە ئەو، لە برسان سکم بەزەویەوە دەنووسان، لە برسان توند بەردم لەسەر سکم دەبەست، ڕۆژێك لەسەر ئەو ڕێگەیان دانیشتم لێی دەهاتنە دەرەوە[1]، ئەبوبەکر**

---

[1] مەبەست ڕێگەی مزگەوتە-و.

تێپەڕی لە کتێبەکەی خودا پرسیاری ئایەتێکم لێکرد تەنها بۆ ئەوە پرسیارم لێ کرد تێرم بکات، تێپەڕی و ئەوەی نەکرد[1]، پاشان عومەر بە پاڵمدا تێپەڕی لە کتێبەکەی خودا پرسیاری ئایەتێکم لێکرد تەنها بۆ ئەوە پرسیارم لێ کرد تێرم بکات، تێپەڕی و ئەوەی نەکرد، پاشان باوکی قاسم(ﷺ) بە پاڵمدا تێپەڕی، کاتێ بینیمی خەندەیەکی کرد، ئەوەی لە دەروونمدا بوو و ئەوەی لە ڕوخسارم دیاربوو زانی چییە، پاشان فەرمووی: (**یا ئەبا هیر**)، وتم: لبیك[2]، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**وەرە بە دوامدا**)، ئەو ڕۆیشت و منیش بەدوایدا ڕۆیشتمە ژوورەوە، داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی منیش درا، پێغەمبەر چووە ژوورەوە لە جامێکدا شیری بینی، فەرمووی: (**ئەم شیرە لە کوێوەیە؟**)، وتیان: فلان پیاو یان فلان ئافرەت هەدیەی کردوویت، پێغەمبەر فەمووی: (**ئەی ئەبا هیر**)، وتم: لبیك، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**برۆ بۆ لای ئەهلی صوفە و بانگیان بکە بۆ لام**).

ئەبو هورەیرە وتی: ئەهلی صوفە میوانانی ئیسلام بوون خانەوادە و ماڵ وسامان و هیچ کەسێکیان نەبوو ڕووی لێبکەن، کاتێ صەدەقەیەك بۆ پێغەمبەر دەهات ڕەوانەی دەکرد بۆ ئەوان و هیچی بۆ خۆی هەڵنەدەگرت، کاتێ هەدیەك بهاتبایە بۆ ئەوانی ڕەوانەدەکرد و شتێکی کەمی بۆ خۆی هەڵدەگرت، ئەوانی تێدا بەشدار دەکرد، من ئەوەم پێناخۆش بوو و وتم[3]: جا دەبێت ئەم شیرە چیبێت بۆ ئەهلی صوفە؟ من لەپێشتر بووم خواردنەوەیەك لەم شیرەم بەربکەوێت و بیخۆمەوە و پێی بەهێز ببم، کاتێ ئەهلی صوفە دێن پێغەمبەر فەرمانم پێ دەکات من پێیان بدەم، جا دەبێ ئەو کاتە چەندێ لەم شیرەم بەربکەوێت هیچ چاریشم نییە دەبێت گوێڕایەڵی لە خودا و گوێڕایەڵی لە پێغەمبەرەکەی بکەم(ﷺ)[4]، هاتم بۆ لایان و بانگم کردن و ئەوانیش

---

(1) دەکرێ ئەبوبەکر لە ماڵەوە هیچی شك نەبردبێت تا پێی ببەخشێت-و.

(2) "لبيك" واتە بانگەکەتم بیست و وەڵامم دایەوە-و.

(3) واتە: لە دڵ و خەیاڵی خۆمدا ئەوەم وت-و.

(4) ئەم قسانە ڕاستگۆیی ئەبو هورەیرە نیشان دەدەن-و.

هاتن، داوای مۆڵەتیان کرد و مۆڵەتیان پێدرا، لە ماڵەکەدا دانیشتن، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەی ئەبا هیر**)، وتم: "لبيك" ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**بگرە و پێیان بدە**)، ئەبوهورەیرە وتی: جامەکەم گرت و دەمدا بە پیاوێك دەیخواردەوە تا پاراو دەبوو، پاشان جامەکەی بۆ دەگەێرامەوە و دەمدا بە پیاوێکی تر دەیخواردەوە تا پاراو دەبوو، پاشان جامەکەی بۆ دەگێڕامەوە.

تا گەیشتمە پێغەمبەر(ﷺ) هەموو خەڵکەکە پاراو بووبوون، جامەکەی بە دەستەوە گرت، تەماشای کردم و خەندەیەکی بۆ کرد، فەرمووی: (**ئەی ئەبا هیر**)، وتم: "لبيك"، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**من و تۆ ماوین**)، وتم: ڕاستەکەی، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**دانیشە و بخۆرەوە**)، دانیشتم و خواردمەوە، فەرمووی: (**بخۆرەوە**)، خواردمەوە، بەردەوام دەیفەرموو: (**بخۆرەوە**) تا وتم سوێند بەو کەسەی بە حەق ڕەوانەی کردویت جێگەیەك نەماوە تێی بکەم، فەرمووی: (**دەی نیشام بدە**)، منیش جامەکەم پێدا حەمدی خودای کرد و پاشان زیادەکەی خواردەوە.

**٣٦٧٤-** (م) عَنِ الْمِقْدَادِ قَالَ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَصَاحِبَانِ لِي، وَقَدْ ذَهَبَتْ أَسْمَاعُنَا وَأَبْصَارُنَا مِنَ الْجَهْدِ، فَجَعَلْنَا نَعْرِضُ أَنْفُسَنَا عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْهُمْ يَقْبَلُنَا. فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَانْطَلَقَ بِنَا إِلَى أَهْلِهِ، فَإِذَا ثَلاَثَةُ أَعْنُزٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**احْتَلِبُوا هَذَا اللَّبَنَ بَيْنَنَا**). قَالَ: فَكُنَّا نَحْتَلِبُ، فَيَشْرَبُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنَّا نَصِيبَهُ، وَنَرْفَعُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم نَصِيبَهُ. قَالَ: فَيَجِيءُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيُسَلِّمُ تَسْلِيماً لاَ يُوقِظُ نَائِماً، وَيُسْمِعُ الْيَقْظَانَ. قَالَ: ثُمَّ يَأْتِي الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّي، ثُمَّ يَأْتِي شَرَابَهُ فَيَشْرَبُ. [م٢٠٥٥]

(م) لە میقدادەوە، وتی: من و دوو هاوەڵم هاتین، بەهۆی شەکەتییەوە بیستن و بینینمان نەمابوو، خۆمان بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر دەخستە ڕوو هیچ کام لەوان ئێمەی قبووڵ نەدەکرد، هاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئێمەی برد بۆلای خانەوادەکەی، سێ بزنیان هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئەو شیری ئەو بزنانە بدۆشن بۆ هەموومان**)، وتی: ئێمەش دۆشیمان، هەر مرۆڤێك لە ئێمە بەشی خۆی خواردەوە، بەشی پێغەمبەری خوداشمان(ﷺ)دا. وتی: شەو دەهات سەلامێکی دەکرد خەوتووی خەبەر

نەدەکردەوە و بە کەسی بەئاگای دەبیست[(١)]، وتی: پاشان دەهات بۆ مزگەوت و نوێژی دەکرد، پاشان خواردنەوەکەی بۆ دەهات و دەیخواردەوە.

**٣٦٧٥**- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ يَوْمٍ . أَوْ لَيْلَةٍ .، فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقَالَ: (**مَا أَخْرَجَكُمَا مِنْ بِيُوتِكُمَا هَذِهِ السَّاعَةَ**)؟ قَالاَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**وَأَنَا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَخْرَجَنِي الَّذِي أَخْرَجَكُمَا. قُومُوا**) فَقَامُوا مَعَهُ.

فَأَتَى رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَإِذَا هُوَ لَيْسَ فِي بَيْتِهِ، فَلَمَّا رَأَتْهُ الْمَرْأَةُ قَالَتْ: مَرْحَباً وَأَهْلاً، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيْنَ فُلاَنٌ**)؟ قَالَتْ: ذَهَبَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا مِنَ الْمَاءِ. إِذْ جَاءَ الأَنْصَارِيُّ فَنَظَرَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَصَاحِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ للهِ، مَا أَحَدٌ الْيَوْمَ أَكْرَمَ أَضْيَافاً مِنِّي. قَالَ: فَانْطَلَقَ فَجَاءَهُمْ بِعِذْقٍ فِيهِ بُسْرٌ وَتَمْرٌ وَرُطَبٌ، فَقَالَ: كُلُوا مِنْ هَذِهِ، وَأَخَذَ الْمُدْيَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِيَّاكَ وَالْحَلُوبَ**) فَذَبَحَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ، وَمِنْ ذلِكَ الْعِذْقِ، وَشَرِبُوا. فَلَمَّا أَنْ شَبِعُوا وَرَوُوا، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُسْأَلُنَّ عَنْ هَذَا النَّعِيمِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمُ الْجُوعُ، ثُمَّ لَمْ تَرْجِعُوا حَتَّى أَصَابَكُمْ هَذَا النَّعِيمُ**). [م٢٠٣٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك یان شەوێك چووە دەرەوە، ئەبوبەکر و عومەری بینی فەرمووی: (**بەم کاتە چی لە ماڵەکانتان ئێوەی هێناوەتە دەرەوە**)، وتیان: برسێتی، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: (**منیش هەر بەو جۆرە، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی لە دەستدایە ئەوەی ئێوەی هێناوەتە دەرەوە منیشی هێناوەتە دەرەوە، هەستن**)، ئەوانیش لەگەڵی هەستان.

هات بۆ لای پیاوێك لە ئەنصار، ئەو لە ماڵەوە نەبوو، کاتێ ژنەکەی پێغەمبەری بینی وتی: (مرحبا وأهلا[(٢)])، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**فلان لە کوێیە؟**)،

---

(١) واتە: کەسی بەئاگا سەلامەکەی دەبیست-و.

(٢) دەربڕینێکە بۆ میوان بەکاردەهێنرێت، واتە تۆ ڕێت لە بەرین و دڵاوایی کەوتووە و شایستەی بە پێشوازی و فەرموو لێ کردن-و.

وتی: ڕۆیشتووە هەوڵی ئاوی شیرینمان بۆ بدات، کەسە ئەنصاریەکە هات و سەیری پێغەمبەری خودا(ﷺ) و دوو هاوەڵەکەی کرد، پاشان وتی: الحمدالله، لە ئەمڕۆدا هیچ کەس لەمن میوانی بەڕێزتری نەهاتووە، ڕۆیشت و بۆڵە خورمایەکی هێنا، خورمای تەڕ و تازە و کاڵ و پێگەیوی تێدابوو، وتی: لەمە بخۆن، چەقۆیەکی هەڵگرت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئاگاداری ئاژەڵی شیردەر بە)**، مەڕێکی بۆ سەربڕین و لێیان خوارد، هەروەها لەو بۆڵە خورمایان خوارد و خوردیانەوە، کاتێ تێربوون و پاراوبوون پێغەمبەر خودا(ﷺ) بە ئەبوبەکرو عومەری فەرموو: **(سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە لە ڕۆژی قیامەت لەم نیعمەتە پرسیارتان لێ دەکرێت، برسێتی لە ماڵەکانتان ئێوەی هێنایە دەرەوە پاشان نەگەڕانەوە تا ئەم نیعمەتەتان تووش هات)**.

## ٨- غەزوەی "ذات الرقاع"

**٣٦٧٦**– (ق) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ قالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي غَزَاةٍ وَنَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ، بَيْنَنَا بَعِيرٌ نَعْتَقِبُهُ، فَنَقِبَتْ أَقْدَامُنَا، وَنَقِبَتْ قَدَمَايَ، وَسَقَطَتْ أَظفَارِي، وَكُنَّا نَلفُّ عَلَى أَرْجُلِنَا الخِرَقَ، فَسُمِّيَتْ غَزْوَةَ ذَاتِ الرِّقَاعِ، لِمَا كُنَّا نَعْصِبُ مِنَ الخِرَقِ عَلَى أَرْجُلِنَا. وَحَدَّثَ أَبُو مُوسى بِهَذَا، ثُمَّ كَرِهِ ذَاكَ، قالَ: ما كُنْتُ أَصْنَعُ بِأَنْ أَذْكُرَهُ، كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَكُونَ شَيْءٌ مِنْ عَمَلِهِ أَفْشَاهُ. [خ٤١٢٨/ م١٨١٦]

**(ق)** لە ئەبی بوردەوە، لە ئەبی موساوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوون بۆ غەزایەك ئێمە شەش کەس بووین، حوشترێك لە نێوانماندا بوو بەنۆرە سواری دەبووین، پێیەکانمان تووشی برینداری هات، دوو پێیەکانم بریندار بوون، نینۆکەکانم کەوتن، سوتکمان لە پێیەکانمان دەنا، غەزاکە ناونرا غەزای "ذات الرقاع" ئەوەش لەبەر ئەو سوتکەی دەمانننا لە لاقەکانمان، ئەبو موسا باسی ئەوەی کرد، پاشان ئەوەی لا ناپەسەند بوو، وتی: نەدەبوا باسی بکەم وەك ئەوەی لای ناپەسەند بێت شتێك لە کارەکانی بڵاوە پێ بکات.

## ٩- دەروازەی: عومرەی قەزا

**٣٦٧٧-** (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ مُعْتَمِراً، فَحالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَنَحَرَ هَدْيَهُ، وَحَلَقَ رَأْسَهُ بِالحُدَيْبِيَةِ، وَقَاضَاهُمْ عَلَى: أَنْ يَعْتَمِرَ الْعَامَ المقْبِلَ، وَلاَ يَحْمِلَ سِلاَحاً عَلَيْهِمْ إِلاَّ سُيُوفاً، وَلاَ يُقِيمَ بِهَا إِلاَّ ما أَحَبُّوا. فَاعْتَمَرَ مِنَ الْعَامِ المقْبِلِ، فَدَخَلَهَا كما كان صَالَحَهُمْ، فَلَما أَقَامَ بِهَا ثَلاَثاً، أَمَرُوهُ أَنْ يَخْرُجَ فَخَرَجَ. [خ٢٧٠١]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە مەبەستی عەمرە دەرچوو، بێباوەڕانی قورەیش کەوتنە نێوان ئەو و ماڵی خودا، بۆیە هەدیەکانی کەعبەی سەربڕی و لە حودەیبیە سەری خۆی تاشی، لەسەر ئەوە لەگەڵیان ڕێکەوت ساڵی داهاتوو عەمرە بکات، هیچ جۆرە چەکێك لەسەر ئەوان هەڵنەگرێت جگە لە شمشێر، ئەوەندەی قورەیش پێیخۆشە تیادا بمێنێتەوە، ساڵی داهاتوو عەمرەی کرد، بەو جۆرە چووە ناو مەککە لەسەری پێکهاتبوون، کە سێ ڕۆژ تیایدا مایەوە فەرمانیان پێ کرد لە مەککە بچێتە دەرەوە، ئەویش چووە دەرەوە.**

**٣٦٧٨-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَاعْتَمَرْنَا مَعَهُ، فَلَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ طَافَ وَطُفْنَا مَعَهُ، وَأَتَى الصَّفَا وَالمرْوَةَ وَأَتَيْنَاهُمَا مَعَهُ، وَكُنَّا نَسْتُرُهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يَرْمِيَهُ أَحَدٌ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبٌ لِي: أَكَانَ دَخَلَ الْكَعْبَةَ؟. قَالَ: لاَ.

[خ١٧٩١ (١٦٠٠)]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەمرەی کرد و ئێمەش عەمرەمان لەگەڵ کرد، کاتێ چووە ناو مەککە تەوافی کرد و ئێمەش لەگەڵی تەوافمان کرد، هات بۆ سەفا و مەروە و ئێمەش هاتین لەگەڵی بۆ سەفا و مەروە، ئێمە لە ئەهلی مەککە پێغەمبەرمان داپۆشیبوو نەبادا یەکێك تیرێکی بۆ هەڵبدات هاوەڵێکم پێی وت: ئایە چووە ناو کەعبەوە؟ وتی: نەخێر.**

## ١٠- غەزوەی موئتە

**٣٦٧٩-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَمَّرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي غَزْوَةِ مُؤْتَةَ زَيْدَ بْنَ حارِثَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنْ قُتِلَ زَيْدٌ فَجَعْفَرٌ، وَإِنْ قُتِلَ جَعْفَرٌ فَعَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ)**.

قَالَ عَبْدُ اللهِ: كُنْتُ فِيهِمْ فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ، فَالْتَمَسْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَوَجَدْنَاهُ فِي الْقَتْلَى، وَوَجَدْنَا مَا فِي جَسَدِهِ بِضْعاً وَتِسْعِينَ، مِنْ طَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ. [خ٤٢٦١ (٤٢٦٠)]

**(خ) لە عەبدولڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەیدی کوڕی حاریسەی کرد بە ئەمیری غەزوەی موئتە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (گەر زەید کوژرا جەعفەر، گەر جەعفەر کوژرا عەبدولڵای کوڕی ڕەواحە)، عەبدولڵا وتی: لەو غەزوە لەگەڵیان بووم بەدوای جەعفەری کوڕی ئەبی تالبدا گەڕاین بینیمان کوژرا بوو لە جەستەیدا نەوەد و ئەوەندە برینداى هەبوو لە لێدان بە شمشێر و بەرکەوتنی تیر.**

**٣٦٨٠-** (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا خالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ عَنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ، فَفُتِحَ عَلَيْهِ، وَمَا يَسُرُّنِي، أَوْ قَالَ: ما يَسُرُّهُمْ، أَنَّهُمْ عِنْدَنَا)**. وَقَالَ: وَإِنَّ عَيْنَيْهِ لَتَذْرِفَانِ. [خ٣٠٦٣ (١٢٤٦)]

**(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتاریدا و فەرمووی: (زەید بەیداخەکەی گرت و تووشهات[1]، پاشان جەعفەر بەیداخەکەی گرت و تووشهات، پاشان عەبدولڵای کوڕی ڕەواحە بەیداخەکەی گرت و تووشهات، پاشان خالیدی کوڕی وەلید بەبێ ئەوەی ئەمیر بێت بەیداخەکەی گرت و خودا لەسەر دەستی ئەو فەتحی کرد دڵخۆشم ناکات، یان فەرمووی: ئەوان دڵخۆش نەبوون لای ئێمە بن، ئەنەس وتی: دوو چاوی پێغەمبەر فرمێسکیان لێ دەباری).**

---

[1] واتە: بێباوەڕان لێیاندا و کوشتیان-و.

**٣٦٨١-** (خ) عَنْ خالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ قالَ: لَقَدِ انْقَطَعَتْ فِي يَدِي يَوْمَ مُؤْتَةَ تِسْعَةُ أَسْيَافٍ، فَمَا بَقِيَ فِي يَدِي إِلاَّ صَفِيحَةٌ يَمَانِيَةٌ. [خ٤٢٦٥]

**(خ) لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە لە ڕۆژی موئتە نۆ شمشێر بە دەستمەوە قرتا، تەنها شمشێرێکی یەمانیم بەدەستمەوە مابوو.**



# بەشی دەیەم

## فەتحی مەکە و ئەوەی بەدوایدا هات

### ١- دەروازەی: نامەکەی حاتیب(خوا لێی رازی بێت)

**٣٦٨٢-** (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالمِقْدَادَ فَقَالَ: (**انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوهُ مِنْهَا**). قَالَ: فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ، قُلْنَا لَهَا: أَخْرِجِي الْكِتَابَ، قَالَتْ: ما معِي كِتَابٌ، فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ، أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، قالَ: فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَإِذَا فِيهِ: مِنْ حاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ، إِلَى نَاسٍ بِمَكَّةَ مِنَ المشْرِكِينَ، يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يَا حَاطِبُ، مَا هَذَا**)؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقاً فِي قُرَيْشٍ . يَقُولُ: كُنْتُ حَلِيفاً . وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا، وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ المهَاجِرِينَ، مَنْ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ، أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَداً يَحْمُونَ قَرَابَتِي، وَلَمْ أَفْعَلْهُ ارْتِدَاداً عَنْ دِينِي، وَلاَ رِضاً بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلاَمِ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ**). فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا المنَافِقِ. فَقَالَ: (**إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْراً، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ اطَّلَعَ عَلَى مَنْ شَهِدَ بَدْراً فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ**). فَأَنْزَلَ اللهُ السُّورَةَ: ﴿**يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ**﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿**فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ①**﴾ [الممتحنة: ١].

[خ٤٢٧٤ (٣٠٠٧)/ م٢٤٩٤]

(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) من و زوبەیر و میقدادی ڕەوانە کرد و فەرمووی: (**بڕۆن تا دەگەنە ڕەوزەت خاخ[1] زەعینە[2] لەوێیە نوسراوێکی لەگەڵە لێی وەرگرن**) عەلی وتی: ڕۆیشتین و ئەسپەکانمان بەخێرای دەڕۆیشتن تا هاتینە ڕەوزە، بینیمان زەعینە لەوێیە، پێمان وت نوسراوەکە دەربهێنە، وتی: نووسراوم پێ نییە، وتمان نووسراوەکە دەردێنیت یان پۆشاکەکەت لەبەر بکەینەوە؟ عەلی وتی: نووسراوەکەی لەناو پەلکەکانی دەرهێنا، نووسراوەکەمان هێنا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەمەی تێدابوو: لە حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە بۆ خەڵکانێك لە مەککە لە هاوەڵدانەران، لە هەندێ کاروباری پێغەمبەر خودا (ﷺ) ئاگاداری کردبوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئەی حاتیب ئەمە چی یە؟**)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، پەلەمەکە لێم، من لەگەڵ قورەیش پیاوێکی "مُلَصَق" بووم-دەڵێت: من هاوپەیمانیان بووم- لە خودی قورەیش نەبووم، ئەوانەی لەگەڵ تۆ بوون لە کۆچکەران لەوان بوون، کەسانێك بوون خزمایەتیان هەبوو خانەوادە و ماڵ وسامانیان بۆ دەپاراستن، کاتێ من لەگەڵ قورەیش ئەوەم لە دەستچوو لە ڕەچەڵەك پێمباش بوو چاکەیەکیان لەگەل بکەم و کەس و کارم بپارێزن، وەك پاشگەز بوونەوە لە دینەکەم و ڕازیبوون بە کوفر-لەدوای ئیسلام- ئەو کارەم ئەنجام نەداوە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**بزانن کە حاتیب ڕاستتان لەگەڵ دەکات**)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ڕێگەم بدە لە گەردنی بدەم، ئەمە دووڕووە، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەو بەدری بینیوە تۆ چوزانی لەوانەیە خودا تەماشای ئەهلی بەدری کرد بێت و فەرموبێتی بڕۆن هەرچی دەکەن بیکەن لێتان خۆشبووم**) خودا سورەتی دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ﴾، تا فەرموودەی خودا: ﴿فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١﴾ [الممتحنة: ١].

---

[1] ڕەوزەت خاخ(روضة خاخ) لە نێوان مەککە و مەدینەدایە، لە مەدینەوە نزیکترەوە.

[2] ناوی ئافرەتێکە-و.

## ٢- دەروازەی: غەزوەی فەتح لە ڕەمەزان

**٣٦٨٣-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ فِي رَمَضَانَ مِنَ المدِينَةِ وَمَعَهُ عَشَرَةُ آلاَفٍ، وَذلِكَ عَلَى رَأْسِ ثَمَانِ سِنِينَ وَنِصْفٍ مِنْ مَقْدَمِهِ المدِينَةَ، فَسَارَ هُوَ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ المسْلِمِينَ إِلَى مَكَّةَ، يَصُومُ وَيَصُومُونَ، حَتَّى بلغ الْكَدِيدَ، وَهُوَ مَاءٌ بَيْنَ عُسْفَانَ وَقُدَيْدٍ، أَفْطَرَ وَأَفْطَرُوا. [خ٤٢٧٦ (١٩٤٤)/ م١١١٣]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕەمەزان لە مەدینە دەرچوو، دە هەزار کەسی لەگەڵ بوو، ئەوەش هەشتساڵ و نیو دوای هاتنی بۆ مەدینە، خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون لە موسوڵمانان ڕۆیشتن بۆ مەککە، پێغەمبەر بەڕۆژوو دەبوو ئەوانیش بەڕۆژوو دەبوون تا گەیشتە کەدید ئەوەش ئاوێکە لە نێوان عوسفان و قودەیدا، پێغەمبەر ڕۆژووەکەی شکاند و ئەوانیش ڕۆژووەکانیان شکاند.**

## ٣- دەروازەی: چوونە ناو مەککە

**٣٦٨٤-** (خ) عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: لَمَّا سَارَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عامَ الْفَتْحِ، فَبَلَغَ ذلِكَ قُرَيْشاً، خَرَجَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ، وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ، وَبُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ، يَلْتَمِسُونَ الْخَبَرَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَقْبَلُوا يَسِيرُونَ حَتَّى أَتَوْا مَرَّ الظَّهْرَانِ، فَإِذَا هُمْ بِنِيرَانٍ كَأَنَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: ما هذِهِ، لَكَأَنَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ: نِيرَانُ بَنِي عَمْرٍو، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: عَمْرٌو أَقَلُّ مِنْ ذلِكَ، فَرَآهُمْ نَاسٌ مِنْ حَرَسِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَدْرَكُوهُمْ فأَخَذُوهُمْ، فَأَتَوْا بِهِمْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَسْلَمَ أَبُو سُفْيَانَ، فَلَمَّا سَارَ قالَ لِلْعَبَّاسِ: (**احْبِسْ أَبَا سُفْيَانَ عِنْدَ خَطْمِ الْجَبَلِ، حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ**).

فَحَبَسَهُ الْعَبَّاسُ، فَجَعَلَتِ الْقَبَائِلُ تَمُرُّ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، تَمُرُّ كَتِيبَةً كَتِيبَةً عَلَى أَبِي سُفْيَانَ، فَمَرَّتْ كَتِيبَةٌ، قَالَ: يَا عَبَّاسُ مَنْ هذِهِ؟ قَالَ: هذِهِ غِفَارُ، قَالَ: مَا لِي وَلِغِفَارٍ، ثُمَّ مَرَّتْ جُهَيْنَةُ، قَالَ مِثْل ذلِكَ، ثُمَّ مَرَّتْ سَعْدُ بْنُ هُذَيْمٍ، فَقَالَ مِثْل ذلِكَ، وَمَرَّتْ سُلَيْمُ، فَقَالَ مِثْلَ ذلِكَ، حَتَّى أَقْبَلَتْ كَتِيبَةٌ لَمْ يَرَ مِثْلَهَا، قالَ: مَنْ هذِهِ؟ قالَ: هؤُلاَءِ الأَنْصَارُ، عَلَيْهِمْ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ مَعَهُ الرَّايَةُ، فَقَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا أَبَا سُفْيَانَ! الْيَوْمُ يَوْمُ الْمَلْحَمَةِ، الْيَوْمَ تُسْتَحَلُّ الْكَعْبَةُ.

فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: يَا عَبَّاسُ! حَبَّذَا يَوْمُ الذِّمَارِ. ثُمَّ جاءَتْ كَتِيبَةٌ، وَهْيَ أَقَلُّ الْكَتَائِبِ، فِيهِمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَصْحَابُهُ، وَرَايَةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَعَ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، فَلَمَّا مَرَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِأَبِي سُفْيَانَ قَالَ: أَلَمْ تعْلَمْ مَا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ؟ قَالَ: (**مَا قَالَ**)؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: (**كَذَبَ سَعْدٌ، ولكِنْ هَذَا يَوْمٌ يُعَظِّمُ اللهُ فِيهِ الْكَعْبَةَ، وَيَوْمٌ تُكْسى فِيهِ الْكَعْبَةُ**). قَالَ: وَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ تُرْكَزَ رَايَتُهُ بِالْحَجُونِ...

قَالَ: وَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَئِذٍ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ أَنْ يَدْخُلَ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ مِنْ كَدَاءٍ، وَدَخَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ كُدًا، فَقُتِلَ مِنْ خَيْلِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ ﷺ يَوْمَئِذٍ رَجُلانِ: حُبَيْشُ بْنُ الأَشْعَرِ، وَكُرْزُ بْنُ جابِرٍ الْفِهْرِيُّ.          [خ٤٢٨٠ (٢٩٧٦)]

**(خ)** لە عورووەوە، وتی: کە پێغەمبەر(ﷺ) ساڵی فەتح ڕۆیشت ئەو هەواڵە بە قورەیش گەیشت، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقا هاتنە دەرەوە بە دوای هەواڵی پێغەمبەردا(ﷺ) دەگەڕان، هاتن و ڕۆیشتن تا گەیشتنە مەڕە زەهران[1]، بینییان ئاگر هەیە وەك ئاگرەکانی عەرەفە، ئەبی سوفیان وتی: ئەمە چییە، وەك ئەوەی ئاگرەکانی عەرەفە بێت؟ بودەیلی کوڕی وەرقا وتی: ئاگری بەنی عەمرە، ئەبی سوفیان وتی: عەمر کەمترن لەوانە، خەڵکانێك لە پاسەوانانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی بینی پێیان گەیشتن و گرتنیان و هێنانیان بۆ لای پیغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەبو سوفیان موسوڵمان بوو، کاتێ ڕۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) بە عەباسی فەرموو: (**ئەبوسوفیان لە تەنگەی چیاکەدا ڕابگرە تا موسوڵمانان ببینێت**)، عەباس ئەوی ڕاگرت و هۆزەکان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کەتیبە کەتیبە بەسەر ئەبو سوفیاندا تێدەپەڕین، کەتیبەیەك تێپەڕی وتی: ئەی عەباس ئەمانە کێن؟ وتی: ئەمانە غیفارن، وتی: من چیمداوە لە غیفار، پاشان جوهەینە تێپەڕی هەمان شتی وت، پاشان سەعدی کوڕی هوزەیم تێپەڕی هەمان شتی وت، پاشان سولەیم تێپەڕی هەمان شتی وت، تا کەتیبەیەك تێپەڕی نموونەی ئەوەی نەبینیبوو، وتی: ئەمانە کێن؟ وتی: ئەمانە ئەنصارن، سەعدی کوڕی عوبادە لەسەریان بوو بەیداخەکەی لەگەڵ بوو، سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەی ئەبو سوفیان ئەمڕۆ ڕۆژی مەلحەمەیە،

---

[1] مەڕە زەهران(مرَّ الظهران): دۆڵێکی گەورەیە لە دۆڵەکانی تیهامە-و.

ئەمڕۆ کەعبە حەلاڵ دەبێت، ئەبو سوفیان وتی: ئەی عەباس خۆزگەم بە ڕۆژی تیاچوون، پاشان کەتیبەیەك هات کەمتر بوو، پێغەمبەری خودا و(ﷺ) هاوەڵانی تێدا بوو، بەیداخەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لای زوبەیری کوڕی عەوام بوو، کاتێك پێغەمبەر خودا(ﷺ) بەپاڵ ئەبو سوفیاندا تێپەڕی وتی: ئایا دەزانیت سەعدی کوڕی عوبادە چی وتووە؟ پێغەمبەر فەرمووی: **چی وتووە؟**)، ئەبوسوفیان وتی: ئاوا و ئاوای وتووە، پێغەمبەر فەرمووی: سەعد درۆ دەکات، بەڵکو ئەمە ڕۆژێکە خودا تیایدا کەعبە بە مەزن ڕادەگرێ و پۆشاك بە بەر کەعبەدا دەکرێت، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی کرد بەیداخەکەی لە حەجون[1] دابکوترێت.

وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو ڕۆژەدا فەرمانی بە خالیدی کوڕی وەلید کرد لە بەرزاییەکانی مەککەوە لە کیدائەوە بچێتە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە کوداوە چووە ژوورەوە، لەو ڕۆژەدا لە ئەسپەکانی خالیدی کوڕی وەلیدەوە(خوا لێی ڕازی بێت) دوو پیاو کوژران، حوبەیشی کوڕی ئەشعەر و کورزی کوڕی جابری فەهری.

## ٤- دەروازەی: لابردنی بتەکان

**٣٦٨٥-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ، وَحَوْلَ الْبَيْتِ سِتُّونَ وَثَلاَثُمِائَةِ نُصُبٍ، فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ فِي يَدِهِ وَيَقُولُ: (﴿جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ﴾[الإسراء: ٨١]، ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ [سبأ: ٤٩]).
[خ٤٢٨٧ (٢٤٧٨)/ م١٧٨١]

(ق) لە عەبدوڵا ی کوڕی مەسعودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی فەتح چووە ناو مەککە بە دەوروبەری بەیتدا سێسەد و شەست بتی داکوتراو هەبوون، بە جیلکەیەك کە بە دەستیەوە بوو لێی دەدان و دەیفەرموو: (﴿جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ﴾[الإسراء: ٨١]، ﴿جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ [سبأ: ٤٩]).

[1] حەجوون(الحجون): شوێنێکە لە بەرزاییەکانی مەککە-و.

## ٥- دەروازەی: لە دوای فەتح کۆچکردن نییە

**٣٦٨٦**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: (لاَ هِجْرَةَ، وَلكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا). [خ٣٠٧٧ (١٣٤٩)/ م١٣٥٣]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمووی: (کۆچکردن نییە[1]، بەڵکو جیهاد و نێت گەر داوای دەرچوونی گشتیتان لێکرا[2] دەربچن).**

**٣٦٨٧**- (خ) عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: زُرْتُ عائشة مَعَ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، فَسَأَلَهَا عَنِ الْهِجْرَة، فَقَالَتْ: لاَ هِجْرَةَ الْيَوْمَ، كَانَ المؤْمِنُ يَفِرُّ أَحَدُهُمْ بِدِينِهِ إِلَى اللهِ وَإِلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم، مَخَافَةَ أَنْ يُفْتَنَ عَلَيْهِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَقَدْ أَظْهَرَ اللهُ الإِسْلاَمَ، فَالمؤْمِنُ يَعْبُدُ رَبَّهُ حَيْثُ شَاءَ، وَلكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ. [خ٤٣١٢ (٣٠٨٠)]

**(خ) لە عەتای کوڕی ئەبی ڕەباحەوە، وتی: لەگەڵ عوبەیدی کوڕی عومەیر سەردانی عائیشەم کرد، عوبەید دەربارەی هیجرەت لێی پرسی، عائیشە وتی: ئەمڕۆ[3] هیجرەت نییە، کاتی خۆی یەکێك لە باوەڕداران بەدینەکەی خۆیەوە بۆ لای خودا و بۆ لای پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هەڵدەهات لەترسی ئەوەی لەسەر دینەکەی تووشی فیتنە بکرێت[4]، بەڵام ئەمڕۆ خودا ئیسلامی سەرخستووە، باوەڕدار چۆن بخوازێت پەروەردگاری خۆی دەپەرستێت بەڵکو جیهاد و نێت هەیە.**

---

(١) واتە: بە فەتحی مەککە کۆکردن تەواو بوو-و.

(٢) واتە: گەر لە نەفیری گشتیدا ئەمیری باوەڕداران داوای لێکردن دەرچوونی گشتی بکەن بۆ جیهاد ئەوا دەربچن، لەو بارەدا جیهاد فەرزی عەینە-و.

(٣) واتە: لەو دەم و ڕۆژگارەی ئەودا-و.

(٤) واتە: یەکێك لە هۆیەکانی هیجرەت فیرار بوو بە دینی خۆیەوە-و.

## ٦- چاوەڕوانی عەرەب بۆ مسوڵمانبوون تا موسوڵمانبوونی ئەهلی مەککە

**٣٦٨٨-** (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: كُنَّا بِمَاءٍ مَمَرَّ النَّاسِ، وَكَانَ يَمُرُّ بِنَا الرُّكْبَانُ فَنَسْأَلُهُمْ: مَا لِلنَّاسِ، مَا لِلنَّاسِ؟ مَا هَذَا الرَّجُلُ؟ فَيَقُولُونَ: يَزْعَمُ أَنَّ اللهَ أَرْسَلَهُ، أَوْحى إِلَيْهِ ـ أَوْ: أَوْحى اللهُ بِكَذَا ـ فَكُنْتُ أَحْفَظُ ذلِكَ الْكَلاَمَ، وَكَأَنَّمَا يُقَرُّ فِي صَدْرِي، وَكَانَتِ الْعَرَبُ تَلَوَّمُ بِإِسْلاَمِهِمِ الْفَتْحَ، فَيَقُولُونَ: اتْرُكُوهُ وَقَوْمَهُ، فَإِنَّهُ إِنْ ظَهَرَ عَلَيْهِمْ فَهُوَ نَبِيٌّ صَادِقٌ. فَلَمَّا كَانَتْ وَقْعَةُ أَهْلِ الْفَتْحِ، بَادَرَ كُلُّ قَوْمٍ بِإِسْلاَمِهِمْ، وَبَدَرَ أَبِي قَوْمِي بِإِسْلاَمِهِمْ، فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: جِئْتُكُمْ وَاللهِ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حَقًّا. [خ٤٣٠٢]

**(خ) لە عەمری کوڕی سەلەمەوە، وتی: لەسەر ئاوێك بووین جێگوزەرکەردەی خەڵکی بوو، سواران بەپاڵماندا تێدەپەڕین پرسیارمان لێدەکردن: خەڵك خەریکی چین؟ دەنگ و باسی خەڵك چییە؟ ئەو پیاوە کێیە؟ دەیانووت بانگەشەی ئەوە دەکات خودا ڕەوانەی کردووە و وەحی بۆ ناردووە، یان خودا ئەو وەحییەی ناردووە، منیش ئەو کەلامەم لەبەردەکرد وەك ئەوەی بگاتە سینەم، عەرەب لە موسوڵمانبوونیان چاوەڕوانی فەتحیان دەکرد دەیانوت: وازبهێنن لە ئەو و هۆزەکەی، گەر سەرکەوت بەسەریاندا ئەو پێغەمبەرێکی ڕاستگۆیە، کاتێ ڕووداوی ئەهلی فەتح ڕوویدا هەرچی هۆزە دەستپێشخەریان کرد بە موسوڵمانبوونیان، باوکم دەسپێشخەری کرد بە موسوڵمانکردنی هۆزەکەم، کاتێ هات وتی: سوێند بە خودا، من هاتووم بۆ لای ئێوە لە لایەن پێغەمبەرێکی(ﷺ) حەقەوە.**

## ٧- دەروازەی: غەزوەی حونەین

**٣٦٨٩-** (م) عَنِ العباس ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَلَزِمْتُ أَنَا وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمْ نُفَارِقْهُ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ بَيْضَاءَ، أَهْدَاهَا لَهُ فَرْوَةُ بْنُ نُفَاثَةَ الْجُذَامِيُّ. فَلَمَّا الْتَقَى الْمُسْلِمُونَ وَالْكُفَّارُ، وَلَّى الْمُسْلِمُونَ مُدْبِرِينَ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَرْكُضُ بَغْلَتَهُ قِبَلَ الْكُفَّارِ.

قَالَ عَبَّاسٌ: وَأَنَا آخِذٌ بِلِجَامِ بَغْلَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَكُفُّهَا إِرَادَةَ أَنْ لاَ تُسْرِعَ، وَأَبُو سُفْيَانَ آخِذٌ بِرِكَابِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَيْ عَبَّاسُ، نَادِ أَصْحَابَ السَّمُرَةِ**). فَقَالَ عَبَّاسٌ ـ وَكَانَ رَجُلاً صَيِّتاً ـ: فَقُلْتُ بِأَعْلَى صَوتِي: أَيْنَ أَصْحَابُ السَّمُرَةِ؟ قَالَ: فَوَاللهِ لَكَأَنَّ عَطْفَتَهُمْ، حِينَ سَمِعُوا صَوتِي: ، عَطْفَةُ الْبَقَرِ عَلَى أَوْلاَدِهَا، فَقَالُوا: يَا لَبَّيْكَ! يَا لَبَّيْكَ! قَالَ: فَاقْتَتَلُوا وَالْكُفَّارَ، وَالدَّعْوَةُ فِي الأَنْصَارِ يَقُولُونَ: يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! قَالَ: ثُمَّ قُصِرَتِ الدَّعْوَةُ عَلى بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ. فَقَالُوا: يَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ! يَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ! فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ عَلَى بَغْلَتِهِ، كَالْمُتَطَاوِلِ عَلَيْهَا، إِلَى قِتَالِهِمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هَـذَا حِينَ حَمِيَ الْوَطِيسُ**). قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَصَيَاتٍ فَرَمَى بِهِنَّ وُجُوهَ الْكُفَّارِ. ثُمَّ قَالَ: (**انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ!**) قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا الْقِتَالُ عَلَى هَيْئَتِهِ فِيمَا أَرَى. قَالَ: فَوَاللهِ! مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَمَاهُمْ بِحَصَيَاتِهِ، فَمَا زِلْتُ أَرَى حَدَّهُمْ كَلِيلاً وَأَمْرَهُمْ مُدْبِراً. [م١٧٧٥]

**(م) لە عەباسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی حونەین ئامادەبووم، من و ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، لێی جیانەدەبووینەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر ئێسترێکی سپی خۆی بوو فەروەی کوڕی نوفاسەی جوزامی هەدیەی کرد بوو، کاتێ موسوڵمانان و بێباوەڕان بەیەکتر گەیشتن موسوڵمانان پشتیان هەڵکرد و هەڵهاتن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەردەوام ئێسترەکەی بەرەو ڕووی بێباوەڕان تەکان پێدەدا[١].**

**عەباس وتی: من ڕەشوەی ئێسترەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گرتبوو دەمگێڕایەوە لەوەی بەرەو پێشەوە بڕوات، ئەبو سوفیان پێغەمبەری خودای(ﷺ) گرتبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عەباس، بانگ لە هاوەڵانی سەمورە[٢] بکە)، عەباس-کە پیاوێکی دەنگ بەرز بوو- وتی: بە بەرزترین دەنگی خۆم وتم: ئێوە لە کوێن هاوەڵانی سەمورە؟ عەباس وتی: سوێند بە خودا، کاتێ بانگم کردن وەك ئەوەی مانگا بگەڕێتەوە بۆ لای بەچکەکەی ئاوا گەڕانەوە و وتیان: (یا لبیك، یا لبیك[١])،**

---

[١] واتە هێرشی دەبرد بۆ سەر بێباوەڕان-و.

[٢] سەمووره(السمُرَة): ئەو درەختە بوو بەیعەتی ریزوانی لەژێردا ئەنجام درا-و.

[١] واتە: بانگەکەمان بیست و وەڵامت دەدەینەوە-و.

عەباس وتی: ئەوان و بێباوەڕان کەوتنە جەنگ و تێـڕژان، بانگکـەران لـە ئەنصـارەوە دەیانوت: (ئەی کۆمەڵی ئەنصار، ئەی کۆمەڵی ئەنصار)، پاشان بانگەکە لەسەر بەنی حارسی کوڕی خەزرەج کورت هەڵهات و وتیان: ئەی بەنی حاریسـی کـوڕی خـەزرەج، ئەی بەنی حاریسی کوڕی خەزرەج، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە لەسەر ئێسترەکەی بوو وەك ئەوەی بزانێت چی دەکەن، تەماشای جەنگەکەیانی دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئەمە ئەو کاتەیە تـەنوور گـەرم دادێـت**[1])، عـەباس وتـی: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) چـەند زیـخ و چـەوێکی هـەڵگرتوو و هەڵیـدا بـە ڕووی بێباوەڕانـدا، پاشـان فەرمووی: شکستیان خواردووە، سـوێند بـە پـەروەردگاری موحەمـەد، عـەباس وتـی: چووم تەماشام کرد جەنگەکە لە شێوەی خۆیدا بـوو، وەك ئـەوەی مـن بینـیم، وتـی: سوێند بە خودا، هەر ئەوەنـدەی پێغەمبـەر چـەوەکانی هەڵدا بـە ڕوویانـدا بـەردەوام دەمبینی هێزیان بەرەو لاوازی دەڕوات و کارەکەیان بەرەو پشت هەڵکردن.

- وفي رواية: قَالَ: وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم يَرْكُضُ خَلْفَهُمْ عَلَى بَغْلَتِهِ. وفيها: (انْهَزَمُوا وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، انْهَزَمُوا وَرَبِّ الْكَعْبَةِ) حَتَّى هَزَمَهُمُ اللهُ.

لەڕیوایەتێکدا: عەباس وتـی: وەك ئـەوەی تەماشـای پێغەمبـەر(ﷺ) بکـەم لەسـەر ئێسترەکەی بەدوایاندا ڕایدەکرد، هەر لـەو ڕیوایەتـەدا هـاتووە: (**شکسـتیان خـوارد، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە، شکستیان خوارد سوێند بە پەروەردگاری کەعبە**) تا خودا شکستی پێهێنان.

## ٨- دەروازەی: سریەی ئەوتاس

**٣٦٩٠-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ﷺ قَالَ: لَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ حُنَيْنٍ بَعَثَ أَبَا عامر عَلَى جَيْشٍ إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقِيَ دُرَيْدَ بْنَ الصِّمَّةِ، فَقُتِلَ دُرَيْدٌ وَهَزَمَ اللهُ أَصْحَابَهُ. قَالَ أَبُو مُوسى: وَبَعَثَنِي مَعَ أَبِي عامر، فَرُمِيَ أَبُو عامر فِي رُكْبَتِهِ، رَمَاهُ جُشَمِيٌّ بِسَهْمٍ فَأَثْبَتَهُ فِي رُكْبَتِهِ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا عَمِّ مَنْ رَمَاكَ؟ فَأَشَارَ إِلَى أَبِي مُوسى فَقَالَ: ذَاكَ قَاتِلِي الَّذِي رَمَانِي،

---

[1] نموونەیەکە بۆ توندی جەنگ دەهێنرێتەوە.

فَقَصَدْتُ لَهُ فَلَحِقْتُهُ، فَلَمَّا رَآنِي وَلَّى، فَاتَّبَعْتُهُ وَجَعَلْتُ أَقُولُ لَهُ: أَلاَ تَسْتَحِي، أَلاَ تَثْبُتُ، فَكَفَّ. فَاخْتَلَفْنَا ضَرْبَتَيْنِ بِالسَّيْفِ فَقَتَلْتُهُ، ثُمَّ قُلْتُ لأَبِي عامر: قَتَلَ اللهُ صَاحِبَكَ، قَالَ: فَانْزِعْ هَذَا السَّهْمَ، فَنَزَعْتُهُ، فَنَزَا مِنْهُ الماءُ، قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! أَقْرِئِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم السَّلاَمَ، وَقُلْ لَهُ: اسْتَغْفِرْ لِي، وَاسْتَخْلَفَنِي أَبُو عامر عَلَى النَّاسِ، فَمَكُثَ يَسِيراً ثُمَّ ماتَ.

فَرَجَعْتُ، فَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْتِهِ عَلَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وعَلَيْهِ فِرَاشٌ، قَدْ أَثَّرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بِظَهْرِهِ وَجَنْبَيْهِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِنَا وَخَبَرِ أَبِي عامر، وَقَالَ: قُلْ لَهُ اسْتَغْفِرْ لِي، فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عامر**) ، وَرَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ! اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ مِنَ النَّاسِ**). فَقُلْتُ: وَلِي فَاسْتَغْفِرْ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! اغْفِرْ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلاً كَرِيماً**).

قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: إِحْدَاهُمَا لأَبِي عامر، والأُخْرَى لأَبِي مُوسى. [خ٤٣٢٣ (٢٨٨٤)/ م٢٤٩٨]

**(ق) لە ئەبی موساوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە حونەین بوویەوە، ئەبا عامری لەسەر سوپایەك ڕەوانەكرد بۆ ئەوتاس، بە دورەیدی كوڕی صیمە گەیشت، دورەید كوژرا و خودا هاوەڵانی شكست پێهێنا، ئەبو موسا وتی: پێغەمبەر لەگەڵ ئەبو عامر ڕەوانەی كردم، تیرێك تەقێنرایە ئەژنۆی، جوشەمی تیرێكی تێگرت لە ئەژنۆیدا جێگیری كرد، خۆم گەیاندە ئەبو عامر و وتم، ئەی مامی خۆم، كێ تیرەكەی تێ تەقاندی؟ بە ئەبو موسای وت ئەو كەسە بكوژی منە و تیرەكەی تێ تەقاندووم، منیش چووم بۆی و پێی گەیشتم، كاتێ منی هەڵهات، منیش شوێنی كەوتم و پێم دەوت: تۆشەرم ناكەیت، ئایا خۆت ڕانەگری، بۆستە، دوو لێدانم بە شمشێر لێدا و كوشتم، پاشان وتم بە ئەبوعامر: خودا كەسەكەی كوشت، ئەبو عامر وتی: ئەم تیرە دەربهێنە، منیش تیرەكەم دەرهێنا ئاوی لێهاتە خوارەوە، وتی: برازای خۆم سەلامی من بە پێغەمبەر(ﷺ) بگەیەنە، پێی بڵێ: داوای لێخۆشبوونم بۆ بكات، ئەبو عامر منی بەسەر خەڵكەكەوە دانا، كەمێك مایەوە و پاشان مرد.**

**منیش گەڕامەوە و چوم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لە ماڵەكەی لەسەر هەرزاڵێكی پەلكە دارخورما بوو، فەرشێكی بەسەردا داخرابوو، ئەسەری پەلكە دارخورماكانی هەرزاڵەكە بە پشتی و بەلاكانییەوە دیاربوو، هەواڵی خۆمانم پێدا، هەروەها هەواڵی ئەبی عامر و ئەوەی**

وتی: بە پێغەمبەر بڵێ: داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، پێغەمبەر داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی گرت، پاشان دوو دەستی خۆی بەرز کردەوە و فەرمووی: (**خودایە، لە عوبەید، ئەبی عامر، خۆشببە**)، سپێتی دوو بن باڵی پێغەمبەرم بینی[1]، پاشان فەرمووی: (**خودایە لە ڕۆژی قیامەت بیخە سەرەوەی زۆرێك لە دروستکراوی خۆت لە خەڵکی**)، وتم: بۆ منیش داوای لێخۆشبوون بکە، فەرمووی: (خودایە، **لە گوناهەکانی عەبدوڵای کوڕی قەیس خۆشببە و ڕۆژی قیامەت بیبەرە ناو شوێنێکی ڕێزدار و پڕ بەخشندەیی**).

ئەبو بوردە وتی: یەکێکیان بۆ ئەبی عامر و ئەویتریان بۆ ئەبی موسا.

## ٩- دەروازەی: غەزوەی تائیف

**٣٦٩١-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: حَاصَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَهْلَ الطَّائِفِ فَلَمْ يَفْتَحْهَا، فَقَالَ: (**إِنَّا قَافِلُونَ غَداً إِنْ شَاءَ اللهُ**). فَقَالَ المسْلِمُونَ: نَقْفُلُ وَلَمْ نَفْتَحْ، قَالَ: (**فَاغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ**). فَغَدَوْا، فَأَصَابَتْهُمْ جِرَاحَاتٌ، قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّا قَافِلُونَ غَداً إِنْ شَاءَ اللهُ**). فَكَأَنَّ ذلِكَ أَعْجَبَهُمْ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم.

[خ٧٤٨٠ (٤٣٢٥)/ م١٧٧٨]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئابلۆقەی ئەهلی تائیفی** دا و فەتحی نەکرد، فەرمووی: (**إنشاءالله سبەینێ قافڵەکەمان بەڕێدەکەوێت**)، موسوڵمانان وتیان: قافڵەکەمان بەڕێدەکەوێت و فەتحمان نەکردووە؟! فەرمووی: (**سبەینێ بۆ جەنگان خۆتان ئامادەبکەن**)، کە سبەینێ هات چەندین برینداریان تووش هات، پێغەمبەر فەرمووی: (**إنشاءالله سبەینێ قەفڵەکەمان بەڕێدەکەوێت**)، وەك ئەوەی ئەوە[1] جێی پەسەنییان بێت، پێغەمبەر(ﷺ) خەندەیەکی بۆ کرد.

---

[1] واتە: ئەوەندە بە دوعا دوو دەستی بەرز کردەوە سپێتی بنباڵیم بینی-و.

[1] واتە: ئەو بڕیارەی پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕۆیشتن-و.

## ١٠- دەروازەی: داواکردن بۆ دابەشکردنی غەنیمەتی حونەین

٣٦٩٢- (خ) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ: أَنَّهُ بَيْنَما هُوَ يَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَعَهُ النَّاسُ، مَقْفَلَهُ مِنْ حُنَيْنٍ، فَعَلِقَهُ النَّاسُ يَسْأَلُونَهُ، حَتَّى اضْطَرُّوهُ إِلَى سَمُرَةٍ، فَخَطِفَتْ رِدَاءَهُ، فَوَقَفَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (أَعْطُونِي رِدَائِي، لَوْ كَانَ لِي عَدَدُ هذِهِ الْعِضَاهِ نَعَماً لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ، ثُمَّ لاَ تَجِدُونِي بَخِيلاً، وَلاَ كَذُوباً، وَلاَ جَبَاناً). [خ٢٨٢١]

(خ) لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ئەو کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڕۆیشت و کۆمەڵێك خەڵکی لەگەڵ بوو-کاتی گەڕانەوەی لە حونەین- خەڵکی خۆیان پێدا هەڵواسی و داوای شتیان لێ دەکرد، تا ناچاریان کرد بە درەختێك[1]، ڕیدائەکەیان فڕاندن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕیدائەکەم بۆ بگێڕنەوەن گەر بە ژمارەی دڕکی ئەم درەختانە حوشترم لەلا بوایە لە نێوانتان دابەشم دەکرد، پاشان منتان وەك کەسێکی دەسنوقاو و درۆزن و ترسنۆك نەدەبینیەوە.

## ١١- دەروازەی: گلەیی ئەنصار دەربارەی دابەشکردنەکە

٣٦٩٣- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ، آثَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أُنَاساً فِي الْقِسْمَةِ، فَأَعْطَى الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ، وَأَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْلَ ذلِكَ، وَأَعْطَى أُنَاساً مِنْ أَشْرَافِ الْعَرَبِ، فَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ. قَالَ رَجُلٌ: وَاللهِ إِنَّ هذِهِ الْقِسْمَةَ ما عُدِلَ فِيهَا، وَمَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللهِ. فَقُلْتُ: وَاللهِ لأُخْبِرَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (فَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ يَعْدِلِ اللهُ وَرَسُولُهُ؟! رَحِمَ اللهُ مُوسى، قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ). [خ٣١٥٠/ م١٠٦٢]

(ق) لە عەبدوڵای کوڕی مسعودەوە (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: کە ڕۆژی حونەین پێغەمبەر(ﷺ) لە دابەشکردندا کەسانێکی پێشخست، سەد حوشتری دا بە عەقرەعی کوڕی حابیس، بەهەمان شێوە ئەوەندەی دا بە عویینە، هەروەها بە خەڵکانێك لە

---

[1] واتە: تا پێغەمبەریان(ﷺ) ناچار کرد پەنا بۆ درەختێك بدات-و.

ئەشرافی عەرەب، لەو ڕۆژەدا لەدابەشکردن ئەوانی پێشخست، پیاوێك وتی: سوێند بە خودا، ئەم دابەشکردنە عەدالەتی تێدا ئەنجام نەدراوە و مەبەست تێیدا ڕووی پاکی خودا نەبووە، منیش وتم: سوێند بە خودا، ئەو هەواڵە دەدەم بە پێغەمبەر(ﷺ)، هاتم و هەواڵەکەم پێدا، فەرمووی: **(کێ عەدالەت دەکات گەر خودا و پێغەمبەرەکەی عەدالەت نەکەن؟! ڕەحمەتی خودا لە موسا، بەزیاتر لەمە ئازاردرا و ئارامیگرت).**

**٣٦٩٤**– (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّ نَاساً مِنَ الأَنْصَارِ قَالُوا لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، حِينَ أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ أَمْوَالِ هَوَازِنَ ما أَفَاءَ، فَطَفِقَ يُعْطِي رِجالاً مِنْ قُرَيْشٍ الْمِائَةَ مِنَ الإِبِلِ، فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللهُ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، يُعْطِي قُرَيْشاً وَيَدَعُنَا، وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ!

قَالَ أَنَسٌ: فَحُدِّثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمَقَالَتِهِمْ، فَأَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ، وَلَمْ يَدْعُ مَعَهُمْ أَحَداً غَيْرَهُمْ، فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جاءَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: **(ما كَانَ حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ)**؟ قالَ لَهُ فُقَهَاؤُهُمْ: أَمَّا ذَوُو آرَائِنَا يَا رَسُولَ اللهِ فَلَمْ يَقُولُوا شَيْئاً، وَأَمَّا أُنَاسٌ مِنَّا حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ، فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللهُ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، يُعْطِي قُرَيْشاً، وَيَتْرُكُ الأَنْصَارَ، وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنِّي أُعْطِي رِجَالاً حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، أَما تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ، وَتَرْجِعُوا إِلَى رِحَالِكُمْ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَوَاللهِ ما تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ)**. قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ رَضِينَا، فَقَالَ لَهُمْ: **(إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً شَدِيدَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوُا اللهَ تَعَالَى وَرَسُولَهُ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الحَوْضِ)**. قَالَ أَنَسٌ: فَلَمْ نَصْبِرْ.

[خ٣١٤٧ (٣١٤٦)/ م١٠٥٩]

**(ق)** لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، کاتێ خودا ماڵ وسامانی هەوازنی بە پێغەمبەری خودا بەخشی، بە پیاوانێکی قورەیش سەد حوشتری دەدا، خەڵکانێ لە ئەنصار بە پێغەمبەری خودایان(ﷺ) وت: خودا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆشببێت، بە قورەیش دەبەخشێت و لە ئێمە وازدەهێنێت، ئێمە شمشێرەکانمان هێشتا خوێنی لێدەڕژێت.

ئەنەس وتی: ئەو قسەیان بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسکرا، ناردی بە دوای ئەنصاردا لە خێمەیەکی چەرمدا کۆیکردنەوە، کاتێ کۆبوونەوە نەیهێڵا هیچ کەسێك جگە لەوان لەگەڵیان بێت، پێغەمبەر خودا(ﷺ) هات بۆلایان و فەرمووی: (**ئەو قسەیە چییە لە ئێوەوە بە من گەیشتووە؟**)، کەسە فەقیهیەکانیان بە پێغەمبەریان وت: خاوەن بۆچوونەکانمان شتێکیان نەوتووە، ئەی پێغەمبەری خودا، بەڵام خەڵکانێك لەوانەی تازە وادەن بە ئیسلام وتیان: خودا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوشببێت، بە قورەیش دەبەخشێت و واز لە ئەنصار دێنێت، شمشێرەکانی ئێمە هێشتا خوێنی لێدەچۆڕێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**من بە پیاوانێك دەبەخشم تازە وازیان لە کوفر هێناوە، ئایا ڕازی نابن خەڵکی ماڵ وسامان ببەنەوە و ئێوە بە کۆڵ و بارەکانتان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ببەنەوە، سوێند بە خودا، ئەوەی کە ئێوە دەیبەنەوە باشتر و چاکترە لەوەی خەڵکی دەیبەنە**)، وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە ڕازین، بۆیە پێغەمبەر فەرمووی: (**لە دوای من فەزڵدانێکی زۆر بەسەر ئێوەدا دەبینن، ئارام بگرن تا بە خودا(تعالى) و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەگەن لەسەر حەوزەکەی**) ئەنەس وتی: بەڵام ئارامماں نەگرت.

## ١٢- گێڕانەوەی دیلەکان بۆ سەر هەوازن

**٣٦٩٥**- (خ) عَنْ مَرْوَانَ وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَامَ حِينَ جاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ، فَسَأَلُوهُ: أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَأَحَبُّ الحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ: إِمَّا السَّبْيَ، وَإِمَّا المَالَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِكُمْ**). وَكَانَ أَنْظَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلاَّ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ، قَالُوا: فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي المسْلَمِينَ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ جَاؤُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذلِك؛ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللهُ عَلَيْنَا؛ فَلْيَفْعَلْ**).

فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ طَيَّبْنَا ذلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّا لاَ نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِي ذلِكَ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ**). فَرَجَعَ النَّاسُ، فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ قَدْ طَيَّبُوا، وَأَذِنُوا. [خ٤٣١٨ (٢٣٠٧)]

(خ) لە مەروان و میسوەری کوڕی مەخرەمەوە: کاتێ نێردەیەکی موسڵمانی هەوازن هاتن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا، ئەوانیش داوایان لێ کرد ماڵ و سامان و دیلەکانیان بۆ بگێڕیتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموون[١]: (**ئەوانە دەبینن لەگەڵ منن[٢]، خۆشەویسترین قسە لە لام ڕاسگۆترین قسەیە[٣]، یەکێك لەم دوو بەشە هەڵبژێرن: یان دیلەکان یان ماڵ و سامانەکە، من چاوەڕوانی ئێوەبووم و پەلەم نەکرد[٤]**) پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەندین شەو چاوەڕوانی ئەوانی کرد، کاتێ لە تائیف بەند بوو، کە بۆیان ڕوون بوویەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) یەکێك لەو دووانەیان بۆ دەگێڕێتەوە وتیان: ئێمە دیلەکانمان دەوێتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناو موسوڵمانان هەستایە سەر پێ و حەمد و سەنای خودای کرد بەوەی کە شایستەیەتی، دواتر فەرمووی: (**پاشان: براکانتان بە تۆبەکاری هاتوون، من وادەبینم دیلەکانیان بۆ بگێڕینەوە، هەرکەس پێیخۆشە ئەو کارە بکات با ئەنجامی بدات، هەرکەس لە ئێوەش پێیخۆشە لەسەر بەشەکەی خۆی بمێنێتەوە با لەسەر بەشەکەی خۆی بێت تا پێی دەدەین لە یەکەم غەنیمەت کە خودا بە ئێمەی دەبەخشێت**).

خەڵکانێك وتیان: ئێمە بە دڵ ئەوەمان پێخۆشە، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**ئێمە نازانین کێ لە ئێوە مۆڵەتی ئەوە دەدا و کێ لە ئێوە**

---

(١) واتە: بە نێردەی هەوازینی فەرموو-و.

(٢) ئەوانە: واتە هاوەڵانی-و.

(٣) واتە: قسە و بەڵێنی ڕاستگۆیانە خۆشەویسترین شتە لە لام، ئەوەی پێتان دەڵێم قسەی ڕاست و دروستە-و.

(٤) واتە: پەلەم نەکرد لە دابەش کردنیان-و.

مۆڵەتی ئەوە نادات[1]، بگەڕێنەوە تا عەریفەکانتان[2] کاروبارەکانی ئێوە بەرز دەکەنەوە) خەڵکی گەڕانەوە عەریفەکانیان قسەیان لەگەڵ کردن، پاشان گەڕانەوە بۆلای پیغەمبەر(ﷺ) هەواڵیان پێدا ئەوان پێیان خۆشە و مۆڵەتیانداوە[3].

## ١٣- دەروازەی: سریەی زیخولەصە

٣٦٩٦- (ق) عَنْ جُرَيْرٍ الجَبَلِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ بَيْتٌ فِي الجَاهِلِيَّةِ يُقَالُ لَهُ: ذُو الخَلَصَةِ، وَالْكَعْبَةُ الْيَمَانِيَةُ، وَالْكَعْبَةُ الشَّامِيَّةُ، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الخَلَصَةِ). فَنَفَرْتُ فِي مِائَةٍ وَخَمْسِينَ رَاكِباً فَكَسَرْنَاهُ، وَقَتَلْنَا مَنْ وَجَدْنَا عِنْدَهُ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرْتُهُ، فَدَعَا لَنَا وَلأَحْمَسَ. [خ٤٣٥٥ (٣٠٢٠)/ م٢٤٧٦]

(ق) لە جورەیری جەبەلییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لەسەردەمی نەفامیدا خانەیەك هەبوو پێدەوترا زیخولەصە، کەعبەی مەککەش کەعبەی یەمانی و کەعبەی شامی پێدەوترا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم: (**ئاسوودەم ناکەی لە زیخولەصە؟**[1])، منیش سەد و پەنجا سوارم برد و شکاندمان، ئەوانەی لە لای بوون کوشتنمان، هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵم پێدا دوعای کرد بۆ من و بۆ ئەحمەس.

---

(١) واتە: نازانین کێ لە ئێوە بەشەکەی خۆی دەگێڕێتەوە و بریتی ناوێت، کێش بەشەکەی خۆی دەگێڕێتەوە و بریتی دەوێت-و.

(٢) عەریف: ئەو کەسەیە کاروباری هۆزەکەی دەزانێت و وەك سەرۆك و ریشپی ئەوانە-و.

(٣) واتە: بێبەرانبەر بۆ برا موسڵمانەکانیان دیلەکانی جەنگیان ئازاد کرد و داوای بریتییان لە پێغەمبەر(ﷺ) نەکرد-و.

(١) واتە: بچیت و ئەو بتخانەیە وێران بکەی کە کردوویانە بە جێگرەوەی کەعبەی پیرۆز و ماڵی خودا-و.

## ١٤- دەروازەی: سەرپشکی ژنەکانی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لەلایەن پێغەمبەرەوە

**٣٦٩٧-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ عَنْ آيَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجّاً فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا رَجَعْتُ وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، عَدَلَ إِلَى الأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ، قَالَ: فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وَعائشة، قَالَ: فَقُلْتُ: وَاللهِ إِنْ كُنْتُ لأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ، قَالَ: فَلاَ تَفْعَلْ، مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَاسْأَلْنِي، فَإِنْ كَانَ لِي عِلْمٌ خَبَّرْتُكَ بِهِ. [خ٤٩١٣ (٨٩)/ م١٤٧٩]

**(ق) لەئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: ساڵێك مامەوە دەمویست پرسیار لە عومەری کوڕی خەتاب بکەم دەربارەی ئایەتێك، نەمدەتوانی پرسیاری لێ بکەم لەبەر هەیبەت وترس لە ئەو، تا دەرچوو بۆ حەجکردن و منیش لەگەڵی دەرچووم، کاتێ گەڕاینەوە لەهەندێ لە ڕێگەکە عومەر لایدا و بۆ پێویستییەکی خۆی ڕووی لە درەختێکی ئەراك کرد، وتی: منیش وەستام تا تەواوبوو، پاشان لەگەڵی ڕۆیشتم و وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەو دوو ئافرەتە کێ بوون لە ژنەکانی موزاهەرەیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد؟ وتی: حەفصە و عائیشە بوون، ئیبن عەباس وتی: منیش وتم سوێند بە خودا، ئەوە ساڵێکە دەمەوێت دەربارەی ئەوە پرسیارت لێ بکەم نەمدەتوانی پرسیارت لێ بکەم لە هەیبەت و ترس لە تۆ، عومەر وتی: ئەو کارە مەکە، هەرکاتێ گومانت برد زانستێ لە لای منە پرسیارم لێ بکە، ئەگەر زانستێکم لەلا بێت هەواڵت پێ دەدەم.**

- وفي رواية لهما: قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ، مَنِ المرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، اللَّتَانِ قالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾؟ [التحريم: ٤] قالَ: وَاعَجَباً لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! هُمَا عائشة وَحَفْصَةُ.

ثُمَّ اسْتَقْبَلَ عُمَرُ الحَدِيثَ يَسُوقُهُ قالَ: كُنْتُ أَنَا وَجارٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ، وَهُمْ مِنْ عَوَالِي المَدِينَةِ، وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَيَنْزِلُ يَوْماً وَأَنْزِلُ يَوْماً، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِمَا حَدَثَ مِنْ خَبَرِ ذلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْوَحْيِ أَوْ غَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذلِكَ.

وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى الأَنْصَارِ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَأْخُذْنَ مِنْ أَدَبِ نِسَاءِ الأَنْصَارِ، فَصَخِبْتُ عَلَى امْرَأَتِي فَرَاجَعَتْنِي، فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي، قالَتْ: وَلِمَ تُنْكِرُ أَنْ أُرَاجِعَكَ؟ فَوَاللهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لَيُرَاجِعْنَهُ، وَإِنَّ إِحْدَاهُنَّ لَتَهْجُرُهُ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ، فَأَفْزَعَنِي ذلِكَ وَقُلْتُ لَهَا: قَدْ خَابَ مَنْ فَعَلَ ذلِكَ مِنْهُنَّ، ثُمَّ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيابِي، فَنَزَلْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ حَفْصَةُ! أَتُغَاضِبُ إِحْدَاكُنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ؟ قالَتْ: نَعَمْ، فَقُلْتُ: قَدْ خِبْتِ وَخَسِرْتِ، أَفَتَأْمَنِينَ أَنْ يَغْضَبَ اللهُ لِغَضَبِ رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم فَتَهْلِكِي؟ لاَ تَسْتَكْثِرِي النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَلاَ تُرَاجِعِيهِ فِي شَيْءٍ وَلاَ تَهْجُرِيهِ، وَسَلِينِي ما بَدَا لَكِ، وَلاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كانَتْ جارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. يُرِيدُ عائشة ..

قَالَ عُمَرُ: وَكُنَّا قَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ الْخَيْلَ لِغَزْوِنَا، فَنَزَلَ صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ، فَرَجَعَ إِلَيْنَا عِشَاءً فَضَرَبَ بَابِي ضَرْباً شَدِيداً، وَقَالَ: أَثَمَّ هُوَ؟ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ حَدَثَ الْيَوْمَ أَمْرٌ عَظِيمٌ، قُلْتُ: ما هُوَ، أَجاءَ غَسَّانُ؟ قالَ: لاَ، بَلْ أَعْظَمُ مِنْ ذلِكَ وَأَهْوَلُ، طَلَّقَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم نِسَاءَهُ، فَقُلْتُ: خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ، قَدْ كُنْتُ أَظُنُّ هَذَا يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ، فَجَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، فَصَلَّيْتُ صَلاةَ الْفَجْرِ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَدَخَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَشْرُبَةً لَهُ فَاعْتَزَلَ فِيهَا، وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي، فَقُلْتُ: مَا يُبْكِيكِ؟ أَلَمْ أَكُنْ حَذَّرْتُكِ هَذَا، أَطَلَّقَكُنَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قَالَتْ: لاَ أَدْرِي، هَا هُو ذَا مُعْتَزِلٌ فِي المَشْرُبَةِ.

فَخَرَجْتُ فَجِئْتُ إِلَى الْمِنْبَرِ، فَإِذَا حَوْلَهُ رَهْطٌ يَبْكِي بَعْضُهُمْ، فَجَلَسْتُ مَعَهُمْ قَلِيلاً، ثُمَّ غَلَبَنِي ما أَجِدُ، فَجِئْتُ المَشْرُبَةَ الَّتِي فِيهَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْتُ لِغُلاَمٍ لَهُ أَسْوَدَ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ الْغُلاَمُ فَكَلَّمَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم ثُمَّ رَجَعَ. فَقَالَ: كَلَّمْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ، فَانْصَرَفْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي ما أَجِدُ فَجِئْتُ فَقُلْتُ لِلْغُلاَمِ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ،

فَرَجَعْتُ فَجَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي ما أَجِدُ، فَجِئْتُ الْغُلاَمَ فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ فَقَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ، فَلَمَّا وَلَّيْتُ مُنْصَرِفاً، قالَ: إِذَا الْغُلاَمُ يَدْعُونِي، فَقَالَ: قَدْ أَذِنَ لَكَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم.

فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَإِذَا هُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى رِمَالِ حَصِيرٍ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ، قَدْ أَثَّرَ الرِّمَالُ بِجَنْبِهِ، مُتَّكِئاً عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَرَفَعَ إِلَيَّ بَصَرَهُ فَقَالَ: (**لاَ**). فَقُلْتُ: اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَسْتَأْنِسُ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوْ رَأَيْتَنِي وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا المدِينَةَ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ رَأَيْتَنِي وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: لاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كانَتْ جارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ يُرِيدُ عائشة ـ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم تَبَسُّمَةً أُخْرَى، فَجَلَسْتُ حِينَ رَأَيْتُهُ تَبَسَّمَ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي فِي بَيْتِهِ، فَواللهِ ما رَأَيْتُ فِي بَيْتِهِ شَيْئاً يَرُدُّ الْبَصَرَ، غَيْرَ أَهَبَةٍ ثَلاَثَةٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ فَلْيُوَسِّعْ عَلَى أُمَّتِكَ، فَإِنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ قَدْ وُسِّعَ عَلَيْهِمْ وَأُعْطُوا الدُّنيَا، وَهُمْ لاَ يَعْبُدُونَ اللهَ، فَجَلَسَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَكَانَ مُتَّكِئاً فَقَالَ: (**أَوَ فِي هَذَا أَنْتَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ؟! إِنَّ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلُوا طَيِّبَاتِهِمْ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا**). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ اسْتَغْفِرْ لِي.

فَاعْتَزَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم نِسَاءَهُ مِنْ أَجْلِ ذلِكَ الحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عائشة تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ قالَ: (**ما أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْراً**). مِنْ شِدَّةِ مَوْجِدَتِهِ عَلَيْهِنَّ حِينَ عاتَبَهُ اللهُ.

فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً دَخَلَ عَلَى عائشة فَبَدَأَ بِهَا، فَقَالَتْ لَهُ عائشة: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ كُنْتَ قَدْ أَقْسَمْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْراً، وَإِنَّمَا أَصْبَحْتَ مِنْ تِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَعُدُّهَا عَدّاً، فَقَالَ: (**الشَّهْرُ تِسعٌ وَعِشْرُونَ**). فَكَانَ ذلِكَ الشَّهْرُ تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً. قالَتْ عائشة: ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى آيَةَ التَّخَيُّرِ، فَبَدَأَ بِي أَوَّلَ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ فَاخْتَرْتُهُ، ثُمَّ خَيَّرَ نِسَاءَهُ كُلَّهُنَّ، فَقُلْنَ مِثْلَ ما قَالَتْ عائشة. [خ٥١٩١]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: ئیبن عەباس وتی: پێموت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەو دوو ئافرەتە کێ بوون لە ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو دووانەی خودا دەربارەیان فەرمووی: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ﴾؟**

[التحريم: ٤]، وتی: هاوار بۆ سەرسوڕمان لە تۆ، ئەی ئیبن عەباس، ئەوانە عائیشە و حەفصە بوون.

پاشان عومەر دەستی بە قسەکردن کرد و بەمجۆرە دەستی پێکرد، وتی: من و جیرانێکم لە ئەنصار لە بەنی ئومەییەی کوڕی زەید-ئەوان لە بەرزایەکانی مەدینە بوون- بەنۆرە دەهاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو ڕۆژێك دادەبەزی و منیش ڕۆژێك دادەبەزیم، کە من دادەبەزیم هەواڵی ئەو ڕۆژەم لە وەحی و شتانی تر بۆ دەهێنا، کە ئەویش دادەبەزی هەمان شتی منی دەکرد.

ئێمە کۆمەڵی قورەیش زاڵبووین بەسەر ژناندا کاتێ هاتین بۆلای ئەنصار قەومێکمان بینی ژنەکانیان بەسەریاندا زاڵبوون، بەردەوام ژنەکانی ئێمە ئەدەبی ژنەکانی ئەنصاریان وەردەگرت بۆیە توند و توڕەبووم لە ژنەکەم و ئەویش وەڵامی دامەوە، منیش پێمناخۆش بوو وەڵامی دامەوە، ئەویش پێی وتم بۆچی پێتناخۆشە وەڵام بدەمەوە، سوێند بە خودا، ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی دەدەنەوە، یەکێك لەوان ئەمڕۆ کۆچی لێ دەکات تا شەو[1]، ئەوە ترساندمی و پێم وت: ئەو کەسەی لە ژنەکانی ئەو کارە دەکات زیانۆمەند بووە، پاشان پۆشاکەکەی خۆم کۆکردەوە و دابەزیم و چووم بۆ لای حەفصە و پێموت: ئەی حەفصە، ئایا یەکێك لە ئێوە پێغەمبەر توڕە دەکات ڕۆژەکەی تا ئێوارە؟ وتی: بەڵێ، وتم: زیانۆمەند بوویت، ئایا تۆ لە ئاسایشدای خودا لێت توڕەببێت لەبەر توڕەیی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و بەو هۆیەوە تیابچیت؟ داوای زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) مەکە و لە هیچ شت وەڵامی نەدەیتەوە و کۆچی لێ نەکەی، هەرچیەکت پێویست بوو داوا لە من بکە، بەوە فریو مەخۆ هەویەکەت لەتۆ جوانتر و پێکەوتوتر بێت و لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆشەویستربێت -مەبەستی عائیشە بوو-.

عومەر وتی: ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد غەسان ئەسپەکانیان ناڵ دەکەن بۆ غەزوی ئێمە، هاوەڵە ئەنصاریەکەم ڕۆژی سەرەی خۆی دابەزی، عیشا گەڕایەوە بۆ

---

[1] واتە: یەکێك لە ژنەکانی لە بەیانییەوە تا شەو کۆچ لە پێغەمبەر دەکات-و.

لامان، زۆر بە توندی کێشای بە دەرگاکەمدا، وتی: کەسێك لەوێ هەیە؟ منیش ترسام و هاتمە دەرەوە، وتی: ئەمڕۆ کارێکی گەورە ڕوویداوە؟ وتم ئەو کارە چی یە، غەسان هاتووە؟ وتی: نەخێر، گەورەتر لەوە و ترسناکتر لەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ژنەکانی تەلاقداوە، وتم: حەفصە زیانۆمەند بوو، گومانم دەبرد بەم نزیکانە ئەوە ڕووبدات، بۆیە منیش خۆم کۆکردەوە و نوێژی بەیانیم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەر(ﷺ) هەرزاڵێکی هەبوو چووە ناو هەرزاڵەکەی خۆی و لە ژنەکانی کەنارگیر بوو، چووم بۆ لای حەفصە، بینیم دەگری، وتم: چی دەتگریەنێت؟ وتم: ئایا من تۆم لەمە نەترساند، ئایا پێغەمبەر(ﷺ) تەلاقیداویت؟ وتی: نازانم، ئەوەتە ئەو لە هەرزاڵەکەدا کەنارگیر بووە.

منیش دەرچووم و هاتم بۆ مینبەر بینیم کۆمەڵێکی زۆر لەدەوریەتی و هەندێکیان دەگرین، منیش کەمێك لەگەڵیان دانیشتم، پاشان ئەوەی کە لە ناخمدا بوو بەسەرمدا زاڵ بوو، هاتم بۆ هەرزاڵەکە کە پێغەمبەری خودای(ﷺ) تێدابوو، غولامێکی ڕەش پێستی هەبوو، پێم وت: بڕۆ مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە، غولامەکە ڕۆیشتە ژوورەوە و لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) قسەی کرد و پاشان گەڕایەوە وتی: قسەم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد و ئەوەم بۆ باس کرد بێدەنگ بوو، منیش ڕۆیشتم و تا لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی لای مینبەرەکە بوون دانیشتم، پاشان ئەوەی لە ناخمدا بوو بەسەرمدا زاڵ بوو، دیسان هاتمەوە و وتم بە غولامەکە مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە، چووە ژوورە و پاشان گەڕایەوە وتی: بۆم باس کرد و بێدەنگ بوو، دیسان گەڕامەوە بۆ لای ئەو کۆمەڵەی لای مینبەرەکە دانیشتبوون، پاشان ئەوەی لە ناخمدا بوو بەسەرمدا زاڵ بوو هاتمەوە بۆلای غولامەکە و پێم وت: مۆڵەت بۆ عومەر وەرگرە چووە ژوورەوە و هاتە دەرەوە و وتی: بۆم باس کرد بێدەنگ بوو، کاتێ پشتم هەڵکرد و ویستم بڕۆم غولامەکە بانگی کردم و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتیدای.

چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەو لەسەر حەسیرێکی چنراو ڕاکشابوو، لە نێوان ئەو و حەسیرەکە فەرشێك نەبوو، بۆیە ئەسەری حەسیرە چنراوەکە لە لا ڕوخساری پێغەمبەر دەرچووبوو، شانی لەسەر ڕاخەرێکی چەرم

دادابوو کە بە بەڵم ناواخن کرابوو، سەلامم لێ کرد و من بە پێوەبووم، پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ژنەکانت تەڵاقداوە؟ چاوێکی بۆ بەرزکردمەوە و فەرمووی: (**نەخێر**)، وتم: الله أكبر، من بە پێوەبووم و پاشان هۆگرانە وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمەی کۆمەڵەی قورەیش بەسەر ژنەکانمان زاڵ بووین، کاتێ هاتین بۆ مەدینە قەمێکمان بینی ژنەکانیان بەسەریاندا زاڵ بوون پێغەمبەر(ﷺ)، خەندەیەکی بۆ کرد، پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر منت ببینیایە چوومە ژوورەوە بۆلای حەفصە چیم پێ وت ، پێم وت: ئەوە فریوت نەدات هەویەکەت لەتۆ جوانتر و خۆشەیستر بێت لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)–مەبەستی عائیشە بوو– پێغەمبەر(ﷺ) خەندەیەکی تری بۆ کرد، منیش کاتێك بینیم خەندەی کرد دانیشتم، چاوم بە ژوورەکەدا گێڕا، سوێند بە خودا، لە ژوورەکەی هیچم نەبینی چاو ببیینێت، جگە لە سێ پارچە چەك، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، داوا لە خودا بکە بۆ ئومەتەکەت بەرین بکات، فارس و رۆم بۆیان بەرینکراوە و دنیایان پێدراوە، ئەوان خوداش ناپەرستن، پێغەمبەر(ﷺ) کە شانی دادابوو هەستایەوە و فەرمووی: (**ئایا تۆ لەمەدای ئەی کوڕەکەی خەتاب؟! ئەوانە قەومێکن خۆشییەکانی ژیانی دنیایان بۆ پێشکەوتووە**)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە.

پێغەمبەر(ﷺ) بیست و نۆ شەو کۆچی لە ژنەکانی کرد، لەبەر ئەو قسەی حەفصە و عائیشە بڵاوەیان پێ کردبوو، ئەو فەرمووبووی: (**من مانگێك ناچمە لایان**)، لەبەر ئەوەی لە دڵیدا بوو بەرامبەریان کاتێ خودا سەرزەنشتی کرد.

کە بیست و نۆ شەوەکە تێپەڕی رۆیشت بۆ لای عائیشە و بەو دەستی پێ کرد، عائیشە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ سوێندت خواردبوو مانگێك نەچییە لامان، تۆ لە بیست و نۆهەمین شەودای، دانە بە دانە ژماردوومە؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**مانگ بیست و نۆ شەوە**)، ئەو مانگە بیست و نۆ شەو بوو، عائیشە وتی: پاشان خودا (تعالى) ئایەتی سەرپشکردنی دابەزاند، پێغەمبەر وەك یەکەمین ئافرەت لە ژنەکانی بە من دەستی پێ کرد، منیش پێغەمبەری خودام هەڵبژارد، پاشان هەموو ژنەکانی سەرپش کرد ئەوەیان وت کە عائیشە وتبووی.

**٣٦٩٨-** (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَوَجَدَ النَّاسَ جُلُوساً بِبَابِهِ، لَمْ يُؤْذَنْ لأَحَدٍ مِنْهُمْ. قَالَ: فَأُذِنَ لأَبِي بَكْرٍ فَدخَلَ، ثُمَّ أَقْبَلَ عُمَرُ فَاسْتَأْذَنَ فَأُذِنَ لَهُ، فَوَجَدَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم جَالِساً، حَوْلَهُ نِسَاؤُهُ، وَاجِماً سَاكِتاً. قَالَ: فَقَالَ: لأَقُولَنَّ شَيْئاً أُضْحِكُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ رَأَيْتَ بِنْتَ خَارِجَةَ سَأَلَتْنِي النَّفَقَةَ، فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَوَجَأْتُ عُنُقَهَا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَقَالَ: (**هُنَّ حَوْلِي كَمَا تَرَى، يَسْأَلْنَنِي النَّفَقَةَ**).

فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عائشة يَجَأُ عُنُقَهَا، فَقَامَ عُمَرُ إِلَى حَفْصَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، كلاَهُمَا يَقُولُ: تَسْأَلْنَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا لَيْسَ عِنْدَهُ، فَقُلْنَ: وَاللهِ لاَ نَسْأَلُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَيْئاً أَبَداً لَيْسَ عِنْدَهُ. ثُمَّ اعْتَزَلَهُنَّ شَهْراً أَوْ تِسْعاً وَعِشْرِينَ. ثُمَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ**﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿**لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ٢٩**﴾ [الأحزاب: ٢٨، ٢٩] قَالَ: فَبَدَأَ بِعائشة، فَقَالَ: (**يَا عائشة، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْراً أُحِبُّ أَنْ لاَ تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِي أَبَوَيْكِ**) قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَتَلاَ عَلَيْهَا الآيَةَ. قَالَتْ: أَفِيكَ، يَا رَسُولَ اللهِ أَسْتَشِيرُ أَبَوَيَّ؟ بَلْ أَخْتَارُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ. وَأَسْأَلُك أَنْ لاَ تُخْبِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِكَ بِالَّذِي قُلْتُ، قَالَ: (**لاَ تَسْأَلُنِي امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ إِلاَّ أَخْبَرْتُهَا. إِنَّ اللهَ لَمْ يَبْعَثْنِي مُعَنِّتاً وَلاَ مُتَعَنِّتاً، وَلَكِنْ بَعَثَنِي مُعَلِّماً مُيَسِّراً**). [م١٤٧٨]

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە و داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد، بینی خەڵك لەبەر دەرگاکەی دانیشتوون، مۆڵەتی هیچ کەسێك لەوانەی نەداوە، وتی: مۆڵەتی ئەبوبەکر درا و چووە ژوورەوە، پاشان عومەر هات و داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی درا، بینی پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتووە دڵتەنگ و خامۆش و بێدەنگ، و ژنەکانی بەدەوریدان، وتی[1]: وتم شتێك بڵێم پێغەمبەر(ﷺ) بێنێتە پێکەنین، بۆیە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر کچەکەی خاریجەت ببینیبایە، داوای خەرجی لێ دەکردم، منیش هەستام و ملم بادا، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: (ئەمانەش بەدەورمدا بەوجۆرەن کە دەیانبینی، داوای خەرجیم لێ دەکەن).**

(١) واتە: عومەر وتی –و.

ئەبوبەکر هەستا بۆ عائیشە و ملی بادەدا، عومەریش هەستا بۆ حەفصە و ملی بادەدا، هەردووکیان پێیان دەوتن داوای شتێك لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکەن لەلای نییە، ئەوانیش وتیان: سوێند بە خودا، هەرگیز داوای شتێك لە پێغەمبەر(ﷺ) ناکەین لە لای نەبێت، دواتر مانگێك یان بیست و نۆ ڕۆژ کۆچی لێ کردن، پاشان ئەم ئایەتە بۆسەری دابەزی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ﴾، تاگەیشتە: ﴿لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٢٨، ٢٩]، وتی: بە عائیشە دەستی پێ کرد[١]، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەی عائیشە، دەمەوێت شتێکت بۆ بخەمە ڕوو، پێمخۆشە پەلەی تێدا نەکەی تا ڕاوێژی دایك وباوکت دەکەیت**)، عائیشە وتی: ئەوە چییە، ئەی پێغەمبەری خودا؟ ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، عائیشە وتی: ئایا دەربارەی تۆ ڕاوێژ لەگەڵ دایك باوکم بکەم، ئەی پێغەمبەری خودا؟ بەڵکو خودا و پێغەمبەری خودا و خانەی دواڕۆژ هەڵدەبژێرم، داوات لێدەکەم هەواڵنەدەیت بە هیچ ژنێك لە ژنەکانت بەوەی من وتم، پێغەمبەر فەرمووی: (**هەر ژنێك لەوان پرسیارم لێ بکات هەواڵی پێ دەدەم، خودا منی ڕەوانە نەکردووە وەك تەنگەلانکەری خەڵك و گەڕان بەدوای ناتەواوییەکانیان، بەڵکو منی وەك فێرکارێك و کار ئاسانکەرێك ڕەوانە کرد**).



[١] واتە: بۆ سەرپشك کردنی ژنەکانی پێغەمبەر بە عائشە دەستی پێکرد–و.

# بەشی یازدەهەم

## غەزوەی تەبووك و ئەوەی بەدوایدا هات

### ١- دەروازەی: باسی تەوبەی کەعب و چیرۆکی غەزووەکە

**٣٦٩٩**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ. وَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ. قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مالِكٍ يُحَدِّثُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ قِصَّةِ تَبُوكَ، قَالَ كَعْبٌ: لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا؛ إِلاَّ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، غَيْرَ أَنِّي كُنْتُ تَخَلَّفْتُ فِي غَزْوَةِ بَدْرٍ، وَلَمْ يُعَاتِبْ أَحداً تَخَلَّفَ عَنْهَا، إِنَّمَا خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُرِيدُ عِيرَ قُرَيْشٍ، حَتَّى جَمَعَ اللهُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَدُوِّهِمْ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ، وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ، حِينَ تَوَاثَقْنَا عَلَى الإِسْلاَمِ، وَمَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ، وَإِنْ كانَتْ بَدْرٌ أَذْكَرَ فِي النَّاسِ مِنْهَا.

كَانَ مِنْ خَبَرِي: أَنِّي لَمْ أَكُنْ قَطُّ أَقْوَى وَلاَ أَيْسَرَ حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي تِلْكَ الْغَزَاةِ، وَاللهِ! ما اجْتَمَعَتْ عِنْدِي قَبْلَهُ رَاحِلَتَانِ قَطُّ، حَتَّى جَمَعْتُهُمَا فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ، وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُرِيدُ غَزْوَةً؛ إِلاَّ وَرَّى بِغَيْرِهَا، حَتَّى كانَتْ تِلْكَ الْغَزْوَةُ، غَزَاهَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، وَاسْتَقْبَلَ سَفَراً بَعِيداً، وَمَفَازاً وَعَدُوّاً كَثِيراً، فَجَلَّى لِلْمُسْلِمِينَ أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا أُهْبَةَ غَزْوِهِمْ، فَأَخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِ الَّذِي يُرِيدُ، وَالمسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَثِيرٌ، وَلاَ يَجْمَعُهُمْ كِتَابٌ حافِظٌ. يُرِيدُ: الدِّيوَانَ.

قَالَ كَعْبٌ: فَمَا رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَتَغَيَّبَ؛ إِلاَّ ظَنَّ أَنْ سَيَخْفَى لَهُ، ما لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْيُ اللهِ، وَغَزَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تِلْكَ الْغَزْوَةَ حِينَ طَابَتِ الثِّمَارُ وَالظِّلاَلُ، وَتَجَهَّزَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَالمسْلِمُونَ مَعَهُ، فَطَفِقْتُ أَغْدُو لِكَيْ أَتَجَهَّزَ مَعَهُمْ، فَأَرْجِعُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئاً، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي: أَنَا قادِرٌ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَزَلْ يَتَمَادَى بِي حَتَّى اشْتَدَّ بِالنَّاسِ الْجِدُّ، فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَالمسْلِمُونَ مَعَهُ، وَلَمْ أَقْضِ مِنْ جَهَازِي شَيْئاً، فَقُلْتُ: أَتَجَهَّزُ بَعْدَهُ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ ثُمَّ أَلْحَقُهُمْ، فَغَدَوْتُ بَعْدَ أَنْ فَصَلُوا لأَتَجَهَّزَ، فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئاً، ثُمَّ غَدَوْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئاً، فَلَمْ يَزَلْ بِي حَتَّى أَسْرَعُوا وَتَفَارَطَ الْغَزْوُ.

وَهَمَمْتُ أَنْ أَرْتَحِلَ فَأُدْرِكَهُمْ، وَلَيْتَنِي فَعَلْتُ، فَلَمْ يُقَدَّرْ لِي ذلِك، فَكُنْتُ إِذَا خَرَجْتُ فِي النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَطُفْتُ فِيهِمْ، أَحْزَنَنِي أَنِّي لاَ أَرَى؛ إِلاَّ رَجُلاً مَغْمُوصاً عَلَيْهِ النِّفَاقُ، أَوْ رَجُلاً مِمَّنْ عَذَرَ اللهُ مِنَ الضُّعَفَاءِ، وَلَمْ يَذْكُرْنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى بَلَغَ تَبُوك، فَقَالَ، وَهُوَ جالِسٌ فِي الْقَوْمِ بِتَبُوكَ: (**ما فَعَلَ كَعْبٌ**)؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ! حَبَسَهُ بُرْدَاهُ، وَنظَرُهُ فِي عِطْفَيْهِ. فَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: بِئْسَ ما قُلْتَ، واللهِ يَا رَسُولَ اللهِ ما عَلِمْنَا عَلَيْهِ إِلاَّ خَيْراً. فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم.

قالَ كَعْبُ بْنُ مالِكٍ: فَلَمَّا بَلَغَنِي أَنَّهُ تَوَجَّهَ قافِلاً حَضَرَنِي هَمِّي، وَطَفِقْتُ أَتَذَكَّرُ الْكَذِبَ وَأَقُولُ: بِمَاذَا أَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ غَداً؟ وَاسْتَعَنْتُ عَلَى ذلِكَ بِكُلِّ ذِي رَأْيٍ مِنْ أَهْلِي، فَلَمَّا قِيلَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ أَظَلَّ قَادِماً، زَاحَ عَنِّي الْبَاطِلُ، وَعَرَفْتُ أَنِّي لَنْ أَخْرُجَ مِنْهُ أَبَداً بِشَيءٍ فِيهِ كَذِبٌ، فَأَجْمَعْتُ صِدْقَهُ، وَأَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قادِماً، وَكَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالمسْجِدِ، فَيَرْكَعُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ.

فَلَمَّا فَعَلَ ذلِكَ جاءَهُ الْمُخَلَّفُونَ، فَطَفِقُوا يَعْتَذِرُونَ إِلَيْهِ وَيَحْلِفُونَ لَهُ، وَكَانُوا بِضْعَةً وَثَمَانِينَ رَجُلاً، فَقَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلاَنِيَتَهُمْ، وَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، ووَكَلَ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللهِ، فَجِئْتُهُ، فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ تَبسَّمَ تَبَسُّمَ الْمُغْضَبِ، ثُمَّ قالَ: (**تَعَالَ**). فَجِئْتُ أَمْشِي حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ لِي: (**ما خَلَّفَكَ، أَلَمْ تَكُنْ قَدِ ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ**)؟ فَقُلْتُ: بَلَى، إِنِّي وَاللهِ - يَا رَسُولَ اللهِ - لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، لَرَأَيْتُ أَنْ سَأَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذْرٍ، وَلَقَدْ أُعْطِيتُ جَدَلاً، وَلكِنِّي وَاللهِ، لَقَدَ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثْتُكَ الْيَوْمَ حَدِيثَ كَذِبٍ تَرْضى بِهِ عَنِّي، لَيُوشِكَنَّ اللهُ أَنْ يُسْخِطَكَ عَلَيَّ، وَلَئِنْ حَدَّثْتُكَ حَدِيثَ صِدْقٍ تَجِدُ عَلَيَّ فِيهِ، إِنِّي لأَرْجُو فِيهِ عَفْوَ اللهِ. لاَ وَاللهِ ما كانَ لِي مِنْ عُذْرٍ، وَاللهِ ما كُنْتُ قَطُّ أَقْوَى وَلاَ أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمَّا هَذَا، فَقَدْ صَدَقَ، فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللهُ فِيكَ**). فَقُمْتُ.

وَثَارَ رِجالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَاتَّبَعُونِي، فَقَالُوا لِي: وَاللهِ! ما عَلِمْنَاكَ كُنْتَ أَذْنَبْتَ ذَنْباً قَبْلَ هَذَا، وَلَقَدْ عَجَزْتَ أَنْ لاَ تَكُونَ اعْتَذَرْتَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِمَا اعْتَذَرَ إِلَيْهِ المتَخَلِّفُونَ، قَدْ كانَ كَافِيكَ ذَنْبَكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَكَ. فَوَاللهِ! ما زَالُوا يُؤَنِّبُونَنِي حَتَّى أَرَدْتُ أَنْ أَرْجِعَ فَأُكَذِّبَ نَفْسِي، ثُمَّ قُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَقِيَ هَذَا مَعِي أَحَدٌ؟ قَالُوا: نَعَمْ،

رَجُلاَنِ قَالاَ مِثْلَ ما قُلْتَ، فَقِيلَ لَهُمَا مِثْلُ ما قِيلَ لَكَ، فَقُلْتُ: مَنْ هُمَا؟ قَالُوا: مُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعِ الْعَمْرِيُّ وَهِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ الْوَاقِفِيُّ، فَذَكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ، قَدْ شَهِدَا بَدْراً، فِيهِمَا أُسْوَةٌ، فَمَضَيْتُ حِينَ ذَكَرُوهُمَا لِي.

وَنَهى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم المسْلِمِينَ عَنْ كَلاَمِنَا أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ، فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ وَتَغَيَّرُوا لَنَا، حَتَّى تَنَكَّرَتْ فِي نَفْسِي الأَرْضُ فَمَا هِيَ الَّتِي أَعْرِفُ، فَلَبِثْنَا عَلَى ذلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، فَأَمَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَا وَقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا يَبْكِيَانِ، وَأَمَّا أَنَا فَكُنْتُ أَشَبَّ الْقَوْمِ وَأَجْلَدَهُمْ، فَكُنْتُ أَخْرُجُ فَأَشْهَدُ الصَّلاَةَ مَعَ المسْلِمِينَ، وَأَطُوفُ فِي الأَسْوَاقِ وَلاَ يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ، وَآتِي رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهْوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي: هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلاَمِ عَلَيَّ أَمْ لاَ؟ ثُمَّ أُصَلِّي قَرِيباً مِنْهُ، فَأُسَارِقُهُ النَّظَرَ، فَإِذَا أَقْبَلْتُ عَلَى صَلاَتِي أَقْبَلَ إِلَيَّ، وَإِذَا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ أَعْرَضَ عَنِّي، حَتَّى إِذَا طَالَ عَلَيَّ ذلِكَ مِنْ جَفْوَةِ النَّاسِ، مَشَيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ، وَهْوَ ابْنُ عَمِّي وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَوَاللهِ ما رَدَّ عَلَيَّ السَّلاَمَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا قَتَادَةَ، أَنْشُدُكَ بِاللهِ هَلْ تَعْلَمُنِي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُوْلَهُ؟ فَسَكَتَ، فَعُدْتُ لَهُ فَنَشَدْتُهُ، فَسَكَتَ، فَعُدْتُ لَهُ فَنَشَدْتُهُ، فَقَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَفَاضَتْ عَيْنَايَ، وَتَوَلَّيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ الْجِدَارَ.

قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي بِسُوقِ المدِينَةِ، إِذَا نَبَطِيٌّ مِنْ أَنْبَاطِ أَهْلِ الشَّامِ، مِمَّنْ قَدِمَ بِالطَّعَامِ يَبِيعُهُ بِالمدِينَةِ، يَقُولُ: مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْنِ مالِكٍ؟ فَطَفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ، حَتَّى إِذَا جَاءَنِي دَفَعَ إِلَيَّ كِتَاباً مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ، فَإِذَا فِيهِ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ، وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلاَ مَضْيَعَةٍ، فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ. فَقُلْتُ لَمَّا قَرَأْتُهَا: وَهذا أَيْضاً مِنَ الْبَلاَءِ، فَتَيَمَّمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهُ بِهَا، حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ لَيْلَةً مِنَ الخَمْسِينَ، إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَأْتِينِي فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ، فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لاَ، بَلِ اعْتَزِلْهَا وَلاَ تَقْرَبْهَا. وَأَرْسَلَ إِلَى صَاحِبَيَّ مِثْلَ ذلِكَ، فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ، فَتَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللهُ فِي هَذَا الأَمْرِ.

قَالَ كَعْبٌ: فَجَاءَتِ امْرَأَةُ هِلاَلِ بْنِ أُمَيَّةَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ شَيْخٌ ضَائِعٌ، لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ، فَهَلْ تَكْرَهُ أَنْ أَخْدُمَهُ؟ قَالَ: **(لاَ، وَلكِنْ لاَ يَقْرَبْكِ)**. قَالَتْ: إِنَّهُ وَاللهِ ما بِهِ حَرَكَةٌ إِلَى شَيْءٍ، وَاللهِ ما زَالَ يَبْكِي مُنْذُ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ ما كَانَ

إِلَى يَوْمِهِ هَذَا. فَقَالَ لِي بَعْضُ أَهْلِي: لَوِ اسْتَأْذَنْتَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي امْرَأَتِكَ، كما أَذِنَ لِامْرَأَةِ هِلاَلِ بْنِ أُمَيَّةَ أَنْ تَخْدُمَهُ؟ فَقُلْتُ: وَاللهِ لاَ أَسْتَأْذِنُ فِيهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ومَا يُدْرِينِي ما يَقُولُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا اسْتَأْذَنْتُهُ فِيهَا، وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ؟ فَلَبِثْتُ بَعْدَ ذلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ، حَتَّى كَمُلَتْ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً مِنْ حِينَ نَهَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ كَلاَمِنَا.

فَلَمَّا صَلَّيْتُ صَلاَةَ الْفَجْرِ صُبْحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، وَأَنَا عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا، فَبَيْنَا أَنَا جالِسٌ عَلَى الحَالِ الَّتِي ذَكَرَ اللهُ: قَدْ ضَاقَتْ عَلَيَّ نَفْسِي، وَضَاقَتْ عَلَيَّ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ، سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ أَوْفَى عَلَى جَبَلِ سَلْعٍ، بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا كَعْبُ بْنَ مالِكٍ أَبْشِرْ! قَالَ: فَخَرَرْتُ سَاجِداً، وَعَرَفْتُ أَنْ قَدْ جاءَ فَرَجٌ.

وَآذَنَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِتَوْبَةِ اللهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَذَهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا، وَذَهَبَ قِبَلَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ، وَرَكَضَ إِلَيَّ رَجُلٌ فَرَساً، وَسَعى سَاعٍ مِنْ أَسْلَمَ، فَأَوْفَى عَلَى الجَبَلِ، وَكَانَ الصَّوْتُ أَسْرَعَ مِنَ الْفَرَسِ، فَلَمَّا جاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي، نَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَّ، فَكَسَوْتُهُ إِيَّاهُمَا بِبُشْرَاهُ. وَاللهِ ما أَمْلِكُ غَيْرَهُمَا يَوْمَئِذٍ، وَاسْتَعَرْتُ ثَوْبَيْنِ فَلَبِسْتُهُمَا، وَانْطَلَقْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجاً فَوْجاً، يُهَنُّونَنِي بِالتَّوْبَةِ يَقُولُونَ: لِتَهْنِكَ تَوْبَةُ اللهِ عَلَيْكَ.

قَالَ كَعْبٌ: حَتَّى دَخَلْتُ المسْجِدَ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جالِسٌ حَوْلَهُ النَّاسُ، فَقَامَ إِلَيَّ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّانِي، وَاللهِ ما قامَ إِلَيَّ رَجُلٌ مِنَ المهَاجِرِينَ غَيْرُهُ، وَلاَ أَنْسَاهَا لِطَلْحَةَ.

قَالَ كَعْبٌ: فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَهْوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنَ السُّرُورِ: (**أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ**). قالَ: قُلْتُ: أَمِنْ عِنْدِكَ يَا رَسُولَ اللهِ، أَمْ مِنْ عِنْدِ اللهِ؟ قَالَ: (**لاَ، بَلْ مِنْ عِنْدِ اللهِ**). وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ، وَكُنَّا نَعْرِفُ ذلِكَ مِنْهُ. فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللهِ وَإِلَى رَسُولِ اللهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ**). قُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِي الَّذِي بِخَيْبَرَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ إِنَّمَا نَجَّانِي بِالصِّدْقِ، وَإِنَّ

مِنْ تَوْبَتِي أَنْ لاَ أُحَدِّثَ إِلاَّ صِدْقاً ما بَقِيتُ. فَوَاللهِ ما أَعْلَمُ أَحَداً مِنَ المسْلِمِينَ أَبْلاَهُ اللهُ في صِدْقِ الحَدِيثِ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَحْسَنَ مِمَّا أَبْلاَنِي، ما تَعَمَّدْتُ مُنْذُ ذَكَرْتُ ذلِكَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِلَى يَوْمِي هَذَا كَذِباً، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِي اللهِ فِيمَا بَقِيتُ.

وَأَنْزَلَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿١١٩﴾﴾ [التوبة: ١١٧- ١١٩] فَوَاللهِ ما أَنْعَمَ اللهُ عَلَيَّ مِنْ نعْمَةٍ قَطُّ، بَعْدَ أَنْ هَدَانِي لِلإِسْلاَمِ، أَعْظَمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَنْ لاَ أَكُونَ كَذَبْتُهُ فَأَهْلِكَ كما هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا، فَإِنَّ اللهَ قَالَ لِلَّذِينَ كَذَبُوا - حِينَ أَنْزَلَ الْوَحْيَ - شَرَّ مَا قَالَ لأَحَدٍ، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ﴿٩٦﴾﴾ [التوبة: ٩٥، ٩٦].

قَالَ كَعْبٌ: وَكُنَّا تَخَلَّفْنَا أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ عَنْ أَمْرِ أُولئِكَ الَّذِينَ قَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ حَلَفُوا لَهُ، فَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، وَأَرْجأَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَمْرَنَا حَتَّى قَضى اللهُ فِيهِ، فَبِذلِكَ قالَ اللهُ: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ﴾[التوبة: ١١٨] وَلَيْسَ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ مِمَّا خُلِّفْنَا عَنِ الْغَزْوِ، إِنَّمَا هُوَ تَخْلِيفُهُ إِيَّانَا، وَإِرْجاؤُهُ أَمْرَنَا، عَمَّنْ حَلَفَ لَهُ وَاعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَبِلَ مِنْهُ. [خ٤٤١٨ (٢٧٥٧)/ م٢٧٦٩]

**(ق) لە عەبدوڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، ئەو لەو کوڕانەی بوو کە دەستی باوکی ڕادەکێشا کاتێ نابینا بوو، وتی: گوێم لە کەعبی کوڕی مالیك بوو[1] باسی چیرۆکی تەبووکی دەکرد کاتێ لە غەزاکە دواکەوت، کەعب وتی: لە غەزایەك لە غەزاکان دوانەکەوتووم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، جگە لە غەزوەی تەبووك، لە غەزوەی بەدریش دواکەوتم کەس سەرزەنشتی کەسێکی تری نەکرد لە دواکەوتن لەو غەزایە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە و کاروانییەکەی قورەیشی دەویست تا خودا ئەوان و دوژمنەکانی ئەوانی بەبێ دیاریکردنی وادەیەك کۆکردەوە، من لە شەوی عەقەبەدا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامادەبووم کاتێ پەیمانماندا لەسەر ئیسلام،**

---

[1] واتە: گوێی لە باوکی بوو-و.

ئامادەبوونی شەوی عەقەبە لە ئامادەبوونی شەوی بەدر لام خۆشەویستر بوو با بەدریش لەناو خەڵکدا زۆرتر باس بکرێت.

حاڵ و بارم وابوو هەرگیز بەهێزتر و کارئاسانتر نەبووم کاتێ لەو غەزایە دواکەوتم، سوێند بە خودا، پێشتر هەرگیز دوو حوشتری بارم لا کۆنەبووەتەوە تا لەو غەزادا دوو حوشترم لا کۆبوویەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزوەیەکی بوویستبایە بە شتێکی تر دەریدەبڕی، تا ئەو غەزوەیە هاتەبەرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە گەرمایەکی زۆردا غەزاکەی ئەنجامدا، ڕووبەڕووی سەفەرێکی دوور و ڕێگەبڕینێکی زۆر و دوژمنێکی زۆر دەبوویەوە، بۆیە کاروبارەکەی بۆ موسوڵمانان ڕۆشن کردەوە تا خۆیان ئامادەبکەن بۆ غەزاکەیان، هەواڵیپێدان دەربارەی ئەو ئاراستەی دەیەوێت بیگرێتەبەر، موسوڵمانان لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) زۆربوون، نوسراوێکی تۆمارکەر ئەوانی کۆنەدەکردەوە –مەبەستی دیوان بوو–.

کەعب وتی: هەر پیاوێك بیویستبایە بزر و نائامادە بێت گومانی ئەوەی دەبرد بشارڕێتەوە[1] گەر وەحی خودا دەربارەی ئەو دانەبەزیبایە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو غەزوەی ئەنجامدا کاتێ بەرووبووم و سێبەر خۆش بووبوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) و موسوڵمانانیش لەگەڵی خۆیان ئامادە کرد، منیش بەردەوام زوو هەڵدەستام بۆئەوەی لەگەڵیان خۆم ئامادە بکەم، دەگەڕامەوە و کارێکم ئەنجام نەدەدا، بە نەفسی خۆم دەوت توانام هەیە بەسەریدا[2]، بەردەوام ئەو حاڵە تیامدا درێژبوویەوە تا خەڵکی بەتەواوی جەنگ و جۆربوون، پێغەمبەری خودا و موسوڵمانان ڕۆژیان لێبوویەوە و من شتێك لە پێویستییەکانم ئامادە نەکردبوو، وتم لە دوای پێغەمبەری خودا بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ خۆم ئامادە دەکەم و پاشان بەوان دەگەم، دوای ئەوەی ئەوان جیابوونەوە ڕۆژم لێ بوویەوە تا خۆم ئامادە بکەم، بەڵام گەڕامەوە و هیچ کارێکم نەکرد، پاشان ڕۆژێکی ترم بەسەردا هات، گەڕامەوە و هیچ

---

(1) واتە: ئەوەندە ژمارەی سوپاکە زۆر بوو کەسێك بیویستبایە نەچێت وا گومانی دەبرد کەس پێی نازانێت–و.

(2) واتە: دەتوانم خۆم بۆ غەزاکە ئامادە بکەم و دواناکەوم–و.

کارێکم نەکرد، بەردەوام ئەمە حاڵی من بوو تا ئەوان خێرابوون و غەزاکەران پێشکەوتن و ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوە.

بیری ئەوەم بۆ دروست بوو منیش بڕۆم و پێیان بگەم، خۆزگە ئەوەم ئەنجام بدابایە، بەڵام ئەوەشم پێ نەکرا، لە دوای دەرچوونی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە دەچوومە دەرەوە بۆ ناو خەڵك و بەناویاندا دەگەڕام ئەوەی دڵتەنگی دەکردم کەسێکم نەدەبینی جگە لە پیاوێك تانە لە دینی درابوو بە دووڕووی یان پیاوێك لە لاوازان خودا مۆڵەتیدابوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی منی نەکربوو، تا گەیشتبووە تەبووك، ئەو لە تەبووك لەناو کۆمەڵێك دانیشتبوو فەرمووبووی: (**کەعب چی کردووە؟**) پیاوێك لەبەنی سەلەمە وتبووی: ئەی پێغەمبەری خودا، دوو بوردەکەی و سەرسامی بەخۆی و پۆشاکەکەی بەندی کردووە، موعازی کوڕی جەبەل وتبووی: خراپترین قسەت کرد، سویند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا جگە لەخێر شتێکی ترمان لە ئەو نەبینیووە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بێدەنگ بووبوو.

کەعبی کوڕی مالیك وتی: کاتێ پێمگەیشت کاروانی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە خەم و پەژارە و دڵتەنگی ڕووی لێ کردم، بەردەوام بیرم لە درۆیەك دەکردەوە و دەمـوت: سبەینێ بە چی لە تووڕەبوونی پێغەمبەر بچمە دەرەوە؟ لەو بارەیەوە کۆمەکیم لە هەموو خاوەن بۆچوونێك لە خانەوادەکەم وەرگرت، کاتێ وترا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەریکە دێتەوە، شتی پووچ لێم دوورکەوتەوە، زانیم هەرگیز ناتوانم لەو دۆخە بە شتێکی درۆ بچمە دەرەوە، بۆیە لەسەر ڕاست وتن لەگەڵی عەزمم بۆ دروست بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەڕایەوە، کاتێ لە سەفەرێك دەگەڕایەوە بە مزگەوت دەستی پێ دەکرد و دوو ڕکات نوێژی ئەنجام دەدا و پاشان دادەنیشت لەناو خەڵك.

کە ئەو کارەی ئەنجامدا داوکەوتووان هاتن بۆ لای، بەردەوام بیانوویان بۆ دەهێنایەوە و سوێندیان بۆ دەخوارد، ئەوان هەشتا و ئەوەندە پیاو بوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاشکرا و ڕواڵەتی ئەوانی لێ قبووڵ کردن و بەیعەتی پێدان و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن و نهێنی ناوەوەی ئەوانی ڕادەستی خودا کرد، منیش هاتم بۆلای، کاتێ سەلامم لێ کرد خەندەیەکی بۆکردم بە خەندەی کەسێکی تووڕە،

پاشان فەرمووی: (وەرە)، منیش ڕۆیشتم تا لەبەردەمی دانیشتم، پێی فەرمووم: **(چی دوای خستیت؟ ئایا وڵاخی سواریت نەبوو؟)**، وتم: با، ئەی پێغەمبەری خودا، سوێند بە خودا، ئەی پێغەمبەری خودا گەر لای کەسێك جگە لەتۆ لە ئەهلی دنیا دابنیشتمایە پێموایە بە بیانوویەك خۆم لە تووڕەیی ئەو ڕزگار دەکرد، سوێند بە خودا، من زمانڕەوانیم پێدراوە، بەڵام سوێند بە خودا، من دەمزانی گەر ئەمڕۆ قسەیەکی درۆ لەگەڵ تۆ بکەم بەوە لێم ڕازی دەبیت، بەڵام خودا لێم تووڕە دەبێت، گەر بەڕاستی لەگەڵ تۆ قسە بکەم تۆ لێم تووڕە دەبیت و تیایدا ڕجای لێبووردنی خودا دەکەم، نە سوێند بە خودا، من هیچ بیانوویەکم نەبوو، سوێند بە خودا، هیچ کات ئەوەندە بەهێزتر و کارئاسانتر نەبووم کاتێك لە تۆ دواکەوتم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە ڕاست دەکات، هەستە بڕۆ تا بزانم خودا چ قەزاوەتێك دەربارەی تۆ دەکات)**، منیش هەستام.

پیاوانێك لەبەنی سەلەمە ڕاپەڕین و شوێنم کەوتن، پێیان وتم: سوێند بە خودا، ئێمە تۆمان نەبینیوە نەمانزانیوە بەر لەمە گوناهێکت ئەنجام دابێت، تۆ دەستەوسان بوویت لەوەی بیانوویەك بدۆزیتەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەوەی دواکەتووان بیانوویان بۆ هێنایەوە، ئەوەندە بەس بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای لێخۆشبوونی بۆ گوناهەکەت بکردایە، سوێند بە خودا، بەردەوام سەرزەنشتیان دەکردم تا ویستم بگەڕێمەوە و درۆیەك لەگەڵ نەفسی خۆم بکەم، پاشان پێم وتن: ئایا لەمەدا هیچ کەسی تر لەگەڵ من هەیە؟ وتیان: بەڵێ دوو پیاوی تر هەمان قسەی تۆیان کردووە، بۆیە هەمان شت کە بە تۆ وتراوە بەوانیش وتراوە، وتم ئەو دووانە کێن؟ وتیان: مورارەی کوڕی ڕەبیعی عەمری و هیلالی کوڕی ئومەیەی واقیفی، دوو پیاوی صاڵحیان بۆ باسکردم کە بەدریان بینی بوو و جوامێری و سەرمەشقیان هەبوو، کاتێك ئەوان ئەو دوانەیان بۆ باس کردم ڕۆیشتم.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە موسوڵمانان قسە بکەن لەگەڵ هەریەك لەو سیانە لەنێوان ئەوانەی بە ئەو دواکەوتبوون، خەڵکی لێمان دوورکەوتنەوە و بەرامبەرمان گۆڕان، تا زەویم لێهاتەوە یەك و ئەو زەویە نەبوو پێشتر دەمناسی،

لەسەر ئەو حاڵەتە پەنجا شەوماینەوە، دوو هاوەڵەکەم ڕووبەڕووی زەلیلی و ملکەچی بوونەوە و لە ماڵەوە دانیشتن و دەگریان، بەڵام من لەوان بەهێزتر و خۆڕاگرتر بووم دەچوومە دەرەوە و لە نوێژکردن لەگەڵ موسوڵمانان ئامادە دەبووم و بەبازاڕدا دەسوڕامەوە و هیچ کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم، دەهاتم بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەلامم لێ دەکرد ئەو لەدوای نوێژ لەمەجلیسەکەی دادەنیشت، لە نەفسی خۆم دەموت ئایا لێوەکانی جوڵانەوە بە وەڵامدانەوەی سەلامەکە لەسەرم یان نە، پاشان لە نزیکییەوە نوێژم دەکرد لە ژێرەوە تەماشام دەکرد کاتێ ڕووم لە نوێژەکەم دەکرد ڕووی لێ دەکردم، کاتێ لام دەکردەوە بەلایدا پشتی لێ دەکردم، تا ئەو دۆخەی سارد و سڕی خەڵك لەگەڵم لەسەرم درێژەی کێشا، ڕۆیشتم تا سەرکەوتم بەسەر دیواری باخەکەی ئەبی قەتادەدا ئەو ئامۆزام بوو، خۆشویسترین کەس بوو لەلام، سەلامم لێکرد، سوێند بە خودا، وەڵامی سەلامەکەمی نەدایەوە، وتم: ئەی ئەبو قەتادە، بە خودا داوات لێ دەکەم، ئایا تۆ دەزانیت من خودا و پێغەمبەرم خۆشدەوێت، ئەو بێدەنگ بوو، دووبارەم کردەوە و تکام لێ کرد، بەڵام هەر بێدەنگ بوو، دووبارەم کردەوە وتکام لێ کرد، ئەو وتی: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، چاوەکانم فرمێسکیان لێ باری و پشتم هەڵکرد و بەسەر دیواری باخەکەدا سەرکەوتم و ڕۆیشتم.

وتی: لە کاتێکدا من بە بازاڕی مەدینەدا دەڕۆیشتم کەسێکی نەبتی لە ئەنباتەکانی ئەهلی شام لەوانەی کە خواردنیان دەهێنا و لە مەدینە دەیانفرۆشت، دەیوت: کێ کەعبی کوڕی مالیکمان نیشان دەدات؟ خەڵکیش ئاماژەیان بۆ دەکردم، تا کەسەکە هاتە لام، نوسراوێکی پێدام لە مەلیکی غەسانەوە، ئەمەی تێدابوو: پاشان، من پێم گەیشتووە هاوەڵەکەت پشتی تێ کردوویت، خودا تۆی لە خانەی ڕسوایی و تیاچوون دانەناوە، بۆیە پەیوەندی بە ئێمەوە بکە ئێمە دڵنەوایت دەکەین، کاتێ خوێندمەوە وتم: ئەمەش بەڵایەکی ترە، فڕێمدایە ناو تەنورەکە و سوتاندم، تا چل شەو لە پەنجا شەوەکە تێپەڕی، نێردراوێك لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) هات بۆ لام و وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێ کردوویت لە ژنەکەت کەنارگیر ببیت، وتم تەڵاقی بدەم، یان چی بکەم؟ وتی: نا تەنها لێی دووربکەوە و نزیکی مەکەوە، هەر بەو جۆرە

ناردەکەی ڕەوانە کرد بوو بۆ لای دوو هاوەڵەکەی ترم، وتم بە ژنەکەم: بچۆرەوە بۆ لای خانەوادەکەت، لای ئەوان بە تا خودا دەربارەی کارەکەی من بڕیار دەردەکات.

کەعب وتی: ژنەکەی هیلالی کوڕی ئومەیە هاتبوو بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتبووی: ئەی پێغەمبەری خودا، هیلالی کوڕی ئومەیە پیاوێکی پیری ئەفتادەیە، خزمەتکاری نییە، ئایا لات ناپەسەندە خزمەتی بکەم؟ فەرمووبووی: (**نەخێر، بەڵام نزیکت نەکەوێت**)، ژنەکە وتبووی: سوێند بە خودا، ئەو هیچ جووڵە و بزوانێکی بۆ هیچ شتێ تێدا نەماوە، سوێند بە خودا، بەردەوام دەگری لەو ڕۆژەوە ئەمە لێی ڕوویداوە، کەعب وتی: یەکێك لە خانەوادەکەم پێی وتم: بۆ داوای مۆڵەت ناکەیت لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی ژنەکەت وەك چۆن مۆڵەتی هیلالی کوڕی ئومەی داوە خزمەتی بکات؟ وتم: سوێند بە خودا، تیایدا داوای مۆڵەت ناکەم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ، چووزانم پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی دەفەرمووێت گەر تیایدا داوای مۆڵەت بکەم، من پیاوێکی گەنجم، لەدوای ئەوە دە شەو مامەوە تا پەنجا شەومان بۆ تەواو بوو، لەو کاتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەهی کرد لە قسەکردن لەگەڵمان.

کاتێ نوێژی بەیانیم کرد-بەیانی پەنجاهەمین شەو- من لەسەر یەکێك لە بانی ماڵەکانمان بووم، من لەو حەڵەدا دانیشتبووم کە خودا باسی دەکات: هەموو نەفسم لێ بەرتەسك بووبوویەوە و زەوی بەو بەرینییە لێم تەنگەلان بووبوو، گوێم لە دەنگی هاوارێك بوو کە بە بەرزترین دەنگ لەسەر چیای سەلع هاواری دەکرد: ئەی کەعبی کوڕی مالیك، مژدەت لێ بێت، منیش چووم بە سوژدەدا و زانیم کە دەروو هاتووە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ نوێژی بەیانی کرد بە قوبوڵ کردنی تەوبەکەی ئێمە بانگی بەناو خەڵکدا ڕادێرابوو، خەڵکی دەهاتن مژدەیان پێ دەدایـن، مژدەدەران بەرەو ڕووی دوو هاوەڵەکەی ترم ڕۆیشتبوون، پیاوێك بە سواری ئەسپ بەرەو من و بە ڕاکردن هات بوو، یەکێکی تر بەپەلە لە ئەسلەمەوە هات بوو گەیشتبووە سەر چیاکە، دەنگەکەی ئەو خێراتر بوو لە ئەسپەکە، کاتێ ئەو کەسەی دەنگەکەیم بیست و مژدەی پێدام هات هەردوو پۆشاکەکەی خۆمم بۆ داکەند و کردمە بەری، وەك مژدانە، سوێند بە خودا، لەو ڕۆژەدا جگە لەوە هیچ شتێکی ترم شك نەدەبرد، دوو پۆشاکی

ترم خواست و لەبەرم کرد و ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ پێشوازییان لێ دەکردم، پیرۆزبایی تەوبەکەیان لێ دەکردم، دەیانوت: تەوبەی خودا لەسەر تۆ پیرۆز بێت.

کەعب وتی: تا چوومە ناو مزگەوتەکەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوو خەڵکانێك بە دەوریدا بوون، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا هەستا و بە راکردن هات بۆ لام تا تەوقەی لەگەڵ کردم و پیرۆزبایی لێ کردم، سوێند بە خودا، هیچ پیاوێك لە کۆچکەران جگە لە ئەو هەڵنەستا، ئەوەم بۆ تەڵحە لەبیر ناچێت.

کەعب وتی: کاتێ سەلامم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێغەمبەری خودا(ﷺ)—کە لە خۆشیدا ڕوخساری دەبریسکابەوە— فەرمووی: (**مژدەت لێ بێت بە باشترین ڕۆژێك بەسەر تۆدا تێپەڕیوە لەو کاتەوەی لەدایك بوویت**)، وتی: وتم: ئایا لە لایەن تۆوەیە، ئەی پێغەمبەری خودا، یان لەلایەن خوداوەیە؟ فەرمووی: (**نەخێر لەلایەن خوداوەیە**)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ دڵخۆش دەبوو ڕوخساری دەگەشایەوە تا وەك پارچەیەك لە مانگ بێت، ئێمە ئەوەمان لە ئەوەوە دەزانی، کاتێ لەبەردەستی دانیشتم وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، لە تەوبەکەم ئەوەیە کە لە ماڵەکەم بێمەدەرەوە، وەك صەدەقە بۆ خودا و بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەندێك لە ماڵەکەت دەستبەسەردا بگرە، وتم: ئەو بەشەی بەرم کەوتووە لە خەیبەر دەستی بەسەردا دەگرم، هەروەها وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خودا بە ڕاستگۆیی ڕزگاری کردم، لە تەوبەکەم ئەوەیە هەتا ماوم لەژیاندا ڕاستگۆ بم، سوێند بە خودا، یەکێك لە موسوڵمانان ناناسم خودا نیعمەتی صدقی قسەی پێدابێت باشتر لەوەی کە بە منی داوە، لەو کاتەوەی کە ئەوەم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کرد، لەو ڕۆژەوە ئەوەم بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) باس کردووە تا ئەم ڕۆژەم درۆیەکم نەکردووە، من ڕجام وایە لەمەی ماوە لە تەمەن پارێزگاریم لێ بکات.

خودا ئایەتی بۆسەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دابەزاند: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾، **تا ئەو بەشەی ئایەتەکە**: ﴿وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ١١٩﴾ [التوبة: ١١٧ - ١١٩]، سوێند بە خودا لە دوای ئەوەی کە خودا هیدایەتی داوم بۆ

ئیسلام هەرگیز نیعمەتێك لەو نیعمەتانەی خودا بە منی بەخشیوە مەزنتر نەبووە لە نەفسمدا لە ڕاستگۆیی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، درۆم لەگەڵ نەکرد تا تیابچم وەك ئەوانەی تیاچوون و درۆیان کرد، خودا خراپترین شتی فەرموو بەوانەی کە درۆیان کرد، کاتێك وەحی دابەزاند خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: ﴿سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ﴾، تائایەتی: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴿٩٦﴾﴾ [التوبة: ٩٥، ٩٦]. کەعب وتی: ئێمە ئەم سیانە جیاواز بووین لەوانەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیانووەکەی قبووڵ کردن کاتێ سوێندیان بۆ خوارد، بۆیە بەیعەتی پێدان و داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کارەکەی ئێمەی دواخست تا خودا تیایدا بڕیاری دا، بۆیە خودا فەرمووی: ﴿وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا﴾ [التوبة: ١١٨]، ئەوەی خودا باسی کرد لەوەی ئێمە دواخراوین لە غەزاکە، مەبەست دواخستنی کاروبارەکەمان لەوەی سوێندی بۆ پێغەمبەر خوارد و بیانووی بۆ هێنایەوە و لێی قبووڵ کرا.

## ٢- دەروازەی: ساڵی نۆیەمی کۆچی ئەبوبەکر حەجی بە خەڵکی کرد

٣٧٠٠- (ق) عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمنِ: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ أَخْبَرَهُ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ بَعَثَهُ، فِي الحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْهَا قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فِي رَهْطٍ، يُؤَذِّنُ فِي النَّاسِ: أَنْ لاَ يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ.

[خ٤٦٥٧ (٣٦٩)/ م١٣٤٧]

**(ق) لە حومەیدی کوڕی عبدالرحمانەوە، ئەبو هورەیرە هەواڵی پێداوە: ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت)—لەو حەجەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوی لەسەری کرد بوو بە ئەمیر لەناو کۆمەڵێك بەر لە حەجیماڵئاوایی— ئەوی ڕەوانە کرد بانگ بەناو خەڵکدا بدات: لە دوای ئەمساڵ هاوەڵدانەر حەج ناکات و کەس بەڕووتی بەدەوری بەیتدا تەواف ناکات.**

- وفي رواية للبخاري: قَالَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمنِ: ثُمَّ أَرْدَفَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلِيّاً، فَأَمَرَهُ أَنْ يُؤَذِّنَ بِـ «بَرَاءَةٌ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَأَذَّنَ مَعَنَا عَلِيٌّ فِي أَهْلِ مِنى يَوْمَ النَّحْرِ: لاَ يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. [خ٣٦٩]

لە ریوایەتێکی بوخاریدا: حومەیدی کوڕی عبدالرحمان وتی: پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەدوایدا عەلی ڕەوانەکرد فەرمانی پێ کرد بەناو خەڵکدا سورەتی بەرائە بخوێنێتەوە، ئەبوبەکر وتی: عەلی لەگەڵمان ڕۆژی قوربان بەناو خەڵکدا بانگی ڕادێرا: هاوەڵدانەر لە دوای ئەمساڵ حەج ناکات و بەدەوری بەیتدا کەسی رووت رووت تەواف ناکات.

## ٣- دەروازەی: نێردەی بەنی حەنیفە

**٣٧٠١-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَعَلَ يَقُولُ: إِنْ جَعَلَ لِي مُحَمَّدٌ الأَمْرَ مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ، وَقَدِمَهَا فِي بَشَرٍ كَثِيرٍ مِنْ قَوْمِهِ، فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَعَهُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَفِي يَدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قِطْعَةُ جَرِيدٍ، حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: **(لَوْ سَأَلْتَنِي هذِهِ الْقِطْعَةَ ما أَعْطَيْتُكَهَا، ولَنْ تَعْدُوَ أَمْرَ اللهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللهُ، وَإِنِّي لأَرَاكَ الَّذِي أُرِيتُ فِيهِ مَا رَأَيْتُ، وَهَذَا ثَابِتٌ يُجِيبُكَ عَنِّي)**. ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَأَلْتُ عَنْ قَوْلِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّكَ أُرَى الَّذِي أُرِيتُ فِيهِ ما رَأَيْتُ)**. فَأَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: **(بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا، فَأُوْحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ: أَنِ انْفُخْهُمَا، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ بَعْدِي)**. أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيُّ، وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةُ.

[خ٤٣٧٣، ٤٣٧٤ (٣٦٢٠، ٣٦٢١)/ م٢٢٧٣، ٢٢٧٤]

**(ق)** لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ رازی بێت)، وتی: موسەیلەمەی درۆزن لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات، ئەو دەیوت: گەر موحەمەد لە دوای خۆی کارەکە بداتە دەستی من شوێنی دەکەوم، خەڵکانێکی زۆر لە هۆزەکەی خۆی لەگەڵی هاتبوون، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێشوازی لێ کرد و سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسی لەگەڵ بوو[1]، لە دەستی پێغەمبەری خودادا(ﷺ) پەلکە خورمایەك هەبوو تا

[1] واتە: سابیت کە یەکێکە لە هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەر بوو-و.

لەسەر موسەیلەمە لەناو هاوەڵانی ڕاوەستا و فەرمووی: **(گەر داوای ئەم پارچەیەم لێ بکەیت پێت نادەم، کاری خودا نادرێت بە تۆ، گەر پشت هەڵبکەیت خودا تۆ تیا دەبات، تۆ ئەو کەسەی ئەوەم نیشاندرا دەربارەی کە نیشانم درا، ئەمەش سابیتە لەمنەوە وەڵامت دەداتەوە)**، پاشان پشتی لێهەڵکرد و ڕۆیشت.

ئیبن عەباس وتی: پرسیارم لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد: " **تۆ ئەو کەسەی ئەوەم نیشاندرا دەربارەی کە نیشانم درا** " ئەبو هورەیرە هەواڵی پێدام پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(من خەوتبووم دوو بازنەی زێڕ لە دەستمدا بوو کاروباری ئەو دوانە داگیری کرد بووم، لە خەوندا وەحیم بۆکرا: فویان پیادا بکە، منیش فوم پیادا کردن و فڕین، بەوە تەئویلم کرد دوو کەسی درۆزنن، لە دوای من دێنە دەرەوە)**، یەکێکیان عەنسی بوو ئەویتریان موسەیلەمە.

## ٤- دەرازەی: نێردەی ئەهلی نەجران

**٣٧٠٢-** (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: جاءَ الْعَاقِبُ وَالسَّيِّدُ، صَاحِبَا نَجْرَانَ، إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُرِيدَانِ أَنْ يُلاَعِنَاهُ، قالَ: فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: لاَ تَفْعَلْ، فَوَاللهِ لَئِنْ كانَ نَبِيّاً فَلاَعَنَنَا لاَ نُفْلِحُ نَحْنُ وَلاَ عَقِبُنَا مِنْ بَعْدِنَا. قَالاَ: إِنَّا نُعْطِيكَ مَا سَأَلْتَنَا، وَابْعَثْ مَعَنَا رَجُلاً أَمِيناً، وَلاَ تَبْعَثْ مَعَنَا إِلاَّ أَمِيناً. فَقَالَ: **(لأَبْعَثَنَّ مَعَكُمْ رَجُلاً أَمِيناً حَقَّ أَمِينٍ)**. فَاسْتَشْرَفَ لَهُ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: **(قُمْ يَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الجَرَّاحِ)**. فَلَمَّا قَامَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَذَا أَمِينُ هذِهِ الأُمَّةِ)**. [خ٤٣٨٠ (٣٧٤٥)/ م٢٤٢٠]

**(ق)** لە حوزەیفەوە، وتی: عاقیب و سەید دەسەڵاتدانی نەجران، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەوان دەیانویست موباهەلەی[1] لەگەڵ بکەن، وتی: یەکێکیان وتی بە هاوەڵەکەی ئەو کارە مەکە، سوێند بە خودا گەر ئەو پێغەمبەر بێت و

---

[1] موباهەلە جێبەجێ کردنی داوای ئەم ئایەتەیە بۆ دەرکەوتنی راستگۆ و درۆزن، و حەقرەو و ناحەق: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾﴾ [آل عمران: ٦١] -و.

نەفرەتمان لێ بکات ئێمە و ئەوەی بەدوامانـدا دێت سەرفرازی بەدەست ناهێنین، وتیان: ئەوەی تۆ داوات کردووە ئێمە پێتدەدەین، تەنها کەسێکی ئەمینمان لەگەڵ ڕەوانە بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(پیاوێکی ئەمینتان -کە باشترین ئەمینە- لەگەڵ ڕەوانە دەکەم)**، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) تەماگیرییان بۆ دروست بوو[1]، پێغەمبەر فەرمووی: **(هەستە ئەی ئەبو عەبەیدەی کوڕی جەڕاح)**، کاتێ هەستا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەمە ئەمینی ئەم ئومەتەیە)**.

## ٥- دەروازەی: ڕەوانەکردنی عەلی و خالید (خوایان لێ ڕازی بێت) بۆ یەمەن

**٣٧٠٣-** (خ) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَعَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ إِلَى الْيَمَنِ، قَالَ: ثُمَّ بَعَثَ عَلِيًّا بَعْدَ ذٰلِكَ مَكَانَهُ، فَقَالَ: **(مُرْ أَصْحَابَ خَالِدٍ، مَنْ شَاءَ مِنْهُمْ أَنْ يُعَقِّبَ مَعَكَ فَلْيُعَقِّبْ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُقْبِلْ)**. فَكُنْتُ فِيمَنْ عَقَّبَ مَعَهُ، قَالَ: فَغَنِمْتُ أَوَاقِيَّ ذَوَاتِ عَدَدٍ. [خ٤٣٤٩]

**(خ)** لەبەرائەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید ڕەوانەی کردنین بۆ یەمەن، بەراء وتی: پاشان عەلی بەدوای ئەودا و لە جێگەی ئەو ڕەوانە کرد و فەرمووی: **(فەرمان بکە بە هاوەڵانی خالید هەرکەس لەوان دەخوازێت بمێنێتەوە با بمێنێتەوە هەکەسیش دەخوازێت با بگەڕێتەوە)**، من یەکێك بووم لەوانەی لەگەڵی مامەوە، وتی: چەندین ئۆقەی[2] ژمارە زۆرم بە دەستهێنا[3].

---

[1] واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر هەریەکەیان پێیخۆش بوو ئەو کەسە بێت پێغەمبەر ڕەوانەی دەکات تا بەر ئەو وەسفە(ئەمین) بکەوێت -و.

[2] یەك ئۆقە: بریتی بووە لە چل درهەمی زیو -و.

[3] واتە: بە ڕێگەی غەنیمەت بەدەستی هێناوە -و.

## ٦- دەروازەی: ڕەوانەکردنی ئەبی موسا و موعاز بۆ یەمەن

**٣٧٠٤-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَ مُعَاذاً وَأَبَا مُوسى إِلَى الْيَمَنِ، قالَ: (**يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا وَلاَ تَخْتَلِفَا**).

[خ٣٠٣٨ (٢٢٦١)/ م١٧٣٣]

**(ق) لەئەبی موساوە: پێغەمبەر(ﷺ) موعاز و ئەبو موسای ڕەوانە کرد بۆ یەمەن و فەرمووی: (ئاسانکاری بکەن و گرانکاری مەکەن، و مژدەدەر بن و خەڵك ڕەوێـن[١] مەبم، تەبا بن لەگەڵ یەکتر و ناکۆکی نەکەێتە نێوانتان).**

- وفي رواية للبخاري وبعضها عند مسلم: عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَبَا مُوسى وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى الْيَمَنِ، قَالَ: وَبَعَثَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى مِخْلاَفٍ، قالَ: وَالْيَمَنُ مِخْلاَفَانِ، ثُمَّ قَالَ: (**يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا**). فَانْطَلَقَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِلَى عَمَلِهِ، وَكَانَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِذَا سَارَ فِي أَرْضِهِ وَكَانَ قَرِيباً مِنْ صَاحِبِهِ أَحْدَثَ بِهِ عَهْداً فَسَلَّمَ عَلَيْهِ. [خ٤٣٤١]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: بوخاریدا کە هەندێکی لای موسلیمە: لە ئەبی بوردەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبو موسا و موعازی کوڕی جەبەلی ڕەوانە کرد بۆ یەمەن، هەروەها ئەبو بوردە وتی: هەریەکەیانی ڕەوانە کرد بۆ سەر هەرێمێکی وڵاتەکە، وتی: یەمەن دوو هەرێمە، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: (کارئاسانی بکەن و کارگرنی مەکەن، مژدەدەر بن و خەڵك ڕەوێن مەبن)، هەریەك لەو دوانە ڕۆیشت بەلای کاری خۆیەوە، هەریەکەیان گەر بە زەوی ئەویتریاندا گوزەری بکردبایە[٢] و لە هاوەڵەکەیەوە نزیك بوایە پەیمانەکەی لەگەڵ نوێ دەکردەوە[٣] و سەلامی لێ دەکرد.**

---

[١] ڕەواندنی خەڵك: تۆراندنی خەڵکە لە دین-و.

[٢] واتە: بە هەرێمەکەی ئەویترياندا گوزەری بکردبایە-و.

[٣] پەیمانەکە بریتی بوو لە فەرمان و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر بۆ ئەو دوو هاوەڵە، وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە-و.

## بەشی دوازدەهەم

# نەخۆشی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" و وەفاتکرنی

## ١- دەروازەی:ماڵئاوای لەزیند و لە مردوو

**٣٧٠٥** – (ق) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عامر: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ يَوْماً، فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ عَلَى المَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: (**إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأَرْضِ، أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ، وَإِنِّي وَاللهِ ما أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلكِنْ أَخافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا**).
[خ١٣٤٤/ م٢٢٩٦]

**(ق) لە عوقبەی کوڕی عامرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك هاتە دەرەوە نوێژی کرد لەسەر ئەهلی ئوحد وەك چۆن نوێژی مردووی دەکرد، پاشان ڕووی لە مینبەرەکە کرد و فەرمووی: ( من پێشەنگی ئێوەم، من شایەتم لەسەر ئێوە، سوێند بە خودا، من ئێستا تەماشای حەوزەکەم دەکەم، من کلیلەکانی گەنجینەی زەویم پێدراوە-یان کلیلەکانی زەوی- سوێند بە خودا، من ترسم نییە لە ئێوە لە دوای من هاوەڵ بڕیار بدەن، بەڵام ترسم هەیە لە سەرتان ململانێی تێدا بکەن).**

- وفي رواية لهما: قَالَ: فَكَانَتْ آخِرَ نَظْرَةٍ نَظَرْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم.

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: هەردووکیاندا: عوقبەی کوڕی عامر وتی: ئەوە دواین بینین بوو پێغەمبەری خودام تێدا بینی.**

- وفيها عندهما: قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى قَتْلَى أُحُدٍ بَعْدَ ثَمَانِي سِنِينَ، كالمُوَدِّعِ لِلأَحْيَاءِ وَالأَمْوَاتِ، ثُمَّ طَلَعَ الْمِنْبَرَ. [خ٤٠٤٢]

**هەروەها لەو ڕیواتەدا لای هەردووکیان تیایدا هاتووە: وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر کوژراوانی ئوحد-لە دوای هەشت ساڵ- نوێژی کرد، وەك نوێژی ماڵئاوایی لە زیندووان و مردووان پاشان ڕۆیشتە سەر مینبەرەکە.**

## ٢- نوێژکردنی ئەبوبەکر بە خەڵك

**٣٧٠٦-** (ق) عَنْ عائشة قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، جَاءَ بِلاَلٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلاَةِ، فَقَالَ: **(مُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ)**. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، وَإِنَّهُ مَتَى مَا يَقُمْ مَقَامَكَ لاَ يُسْمِعُ النَّاسَ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ، فَقَالَ: **(مُرُوا أَبَا بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ)**. فَقُلْتُ لِحَفْصَةَ: قُولِي لَهُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ، وَإِنَّهُ مَتَى يَقُمْ مَقَامَكَ لاَ يُسْمِعُ النَّاسَ، فَلَو أَمَرْت عُمَر، قَالَ: **(إِنَّكُنَّ لأَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ)**.

فَلَمَّا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ، وَجَدَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي نَفْسِهِ خِفَّةً، فَقَامَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، وَرِجْلاَهُ تَخُطَّانِ فِي الأَرْضِ، حَتَّى دَخَلَ المَسْجِدَ، فَلَمَّا سَمِعَ أَبُو بَكْرٍ حِسَّهُ، ذَهَبَ أَبُو بَكْرٍ يَتَأَخَّرُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى جَلَسَ عَنْ يَسَارِ أَبِي بَكْرٍ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي قَائِماً، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُصَلِّي قَاعِداً، يَقْتَدِي أَبُو بَكْرٍ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَالنَّاسُ مُقْتَدُونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ. [خ٧١٣ (١٩٨)/ م٤١٨ (٩٥)]

(ق) لە عائیشەوە وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەخۆشییەکەی لێ گران بوو، **بیلال هات مۆڵەتی نوێژی لێ بخوازێت، فەرمووی: (فەرمان بکەن بە ئەبوبەکر نوێژ بە خەڵکی بکات)**، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەبوبەکر پیاوێکی دڵتەنگ و گریان زۆرە، ئەو هەر کات لە مەقامەکەی تۆ بوەستێت ناتوانێ دەنگی خۆی بە خەڵکی ببیستێت، گەر فەرمانت بە عومەر بکردبایە، پێغەمبەر فەرمووی: **(فەرمان بە ئەبوبەکر بکەن نوێژ بە خەڵکی بکات)**، ئەو قسەی بە پێغەمبەری خودام وت بە حەفصەم وت پێی بڵێ: ئەبوبەکر پیاوێکی دڵتەنگ و چاو بە گریانە، هەر کات لە مەقامەکەی تۆ بوەستێت ناتوانێت دەنگی خۆی بە خەڵك ببیستێت، گەر فەرمانت بە عومەر بکردبایە، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئێوە ئافرەتەکانی یوسفن، فەرمان بکەن بە ئەبوبەکر نوێژ بە خەڵکی بکات)**.

کاتێ ئەبوبەکر چووە ناو نوێژ پێغەمبەر خودا(ﷺ) بارسوکییەکی لە خۆی بینی، هەستا و لەسەر ژێر شانی دوو پیاودا دەڕۆیشت و لاقەکانی لە زەوی دەخشان تا

ڕۆیشتە ناو مزگەوتەوە، کاتێ ئەبوبەکر بیستنی هەستی پێغەمبەری کرد کەناری گرت و هاتە دواوە، پێغەمبەر خودا(ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد، پێغەمبەر خودا(ﷺ) هات تا لای چەپی ئەبوبەکرەوە دانیشت، ئەبوبەکر بە پێوە نوێژی دەکرد، پێغەمبەر خودا(ﷺ) بەدانیشتنانەوە نوێژی دەکرد، ئەبوبەکر ئیقتیدای بە نوێژەکەی پێغەمبەر خوداوە(ﷺ) کرد بوو، خەڵکەکەش ئیقتیدایان بە نوێژەکەی ئەبوبەکرەوە(خوا لێی رازی بێت) کردبوو.

- وفي رواية لهما: قَالَتْ: لَقَدْ رَاجَعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم في ذلِكَ، وَمَا حَمَلَنِي عَلَى كَثْرَةِ مُرَاجَعَتِهِ؛ إِلاَّ أَنَّهُ لَمْ يَقَعْ فِي قَلْبِي: أَنْ يُحِبَّ النَّاسُ بَعْدَهُ رَجُلاً قامَ مَقَامَهُ أَبَداً، وَلاَ كُنْتُ أُرَى أَنَّهُ لَنْ يَقُومَ أَحَدٌ مَقَامَهُ؛ إِلاَّ تَشَاءَمَ النَّاسُ بِهِ، فَأَرَدْتُ أَنْ يَعْدِلَ ذلِكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ أَبِي بَكْرٍ. [خ٤٤٤٥]

له ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: عائیشە وتی: لەوەدا وەڵامی پێغەمبەری خودام دایەوە، ئەوەی هانیدام بۆ وەڵامدانەوەی زۆری ئەو ئەوە بوو نەدەکەوتە دڵمەوە خەڵکی لە دوای پێغەمبەر هەرگیز پیاوێکیان خۆشبووێت لە شوێنی پێغەمبەر وەستابێت، وامدەبینی لە جێگەی پێغەمبەر بوەستێت خەڵکی شوومی دەدەنە پاڵ، ویستم پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوە لە ئەبوبەکر لابدات.

## ٣- دەروازەی: لە ماڵی عائیشە

**٣٧٠٧-** (ق) عَنْ عائشة قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لَيَتَعَذَّرُ فِي مَرَضِهِ: (أَيْنَ أَنَا الْيَوْمَ؟ أَيْنَ أَنَا غداً؟). اسْتِبْطَاءً لِيَوْمِ عائشة، فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي، قَبَضَهُ اللهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَدُفِنَ فِي بَيْتِي. [خ١٣٨٩ (٨٩٠)/ م٢٤٤٣]

(ق) له عائیشەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری دەکرد: **(من ئەمڕۆ لە کوێم؟ من سبەینێ لە کوێم؟)**. ڕۆژەکەی عائیشەی بەدوور دەبینی، کە ڕۆژەکەی من هات، خودا لە باوەشم و لە سەر گەردنم گیانی کێشا و لە ماڵەکەی من ئەسپەردەی خاك کرا.

- وفي رواية للبخاري: قَالَتْ: إِنَّ مِنْ نِعَمِ اللهِ عَلَيَّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تُوُفِّيَ فِي بَيْتِي، وَفِي يَوْمِي، وَبَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَأَنَّ اللهَ جَمَعَ بَيْنَ رِيقِي وَرِيقِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ: دَخَلَ عَلَيَّ عَبْدُ الرَّحْمنِ، وَبِيَدِهِ السِّوَاكُ، وَأَنَا مُسْنِدَةٌ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَرَأَيْتُهُ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَعَرَفْتُ أَنَّهُ يُحِبُّ السِّوَاكَ، فَقُلْتُ: آخُذُهُ لَكَ؟ فَأَشَارَ بِرَأْسِهِ: **(أَنْ نَعَمْ)**. فَتَنَاوَلْتُهُ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: أُلَيِّنُهُ لَكَ؟ فَأَشَارَ بِرَأْسِهِ: (أَنْ نَعَمْ). فَلَيَّنْتُهُ، فَأَمَرَّهُ، وَبَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ أَوْ عُلْبَةٌ ـ يَشُكُّ عُمَرُ ـ فِيهَا مَاءٌ، فَجَعَلَ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الماءِ فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ، يَقُولُ: **(لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ)**. ثُمَّ نَصَبَ يَدَهُ، فَجَعَلَ يَقُولُ: **(فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى)**. حَتَّى قُبِضَ وَمَالَتْ يَدُهُ.

له ریوایەتێکی بوخاریدا: عائیشە وتی: له نیعمەتەکانی خودا لەسەرم: پێغەمبەری خودا(ﷺ) له ماڵەکەی من و له ڕۆژەکەی من و لە باوەشم و لەسەر گەردنم کۆچی دوایی کرد و خودا لیکی دەمی پێغەمبەر و لیکی دەمی منی کۆکردەوە لە کاتی مردنی: عبدالرحمان[(١)] هاتە ژوورەوە بۆ لام و سیواکێکی لەدەستدا بوو، من پاڵپشتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووم[(٢)]، بینیم تەماشای دەکات، زانیم سیواکی پێخۆشە، وتم: بۆت وەربگرم؟ بە سەر ئاماژەی کرد: **(بەڵێ)**، منیش دامە دەستی، لەسەری گران بوو[(٣)]، پێم وت: بۆت نەرم بکەمەوە؟ بە سەر ئاماژەی کرد: **(بەڵێ)**، منیش بۆم نەرم کردەوە و ئەویش بەکاریهێنا[(٤)]، لەبەردەمی پێغەمبەر جەوەندەیەك یان جامێك– عومەر شکی هەیە– هەبوو ئاوی تێدا بوو، دوو دەستی دەبردە ناو ئاوەکە و دەیهێنان بە ڕوخساریدا و دەیفەرموو: **(لا إلـه إلا الله، مـردن سـەکەراتی هەیـە)**، پاشـان

---

[(١)] عبدالرحمان برای دایکی باوەڕداران عائیشەیە–و.

[(٢)] واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە پشتەوە پاڵی دابوویەوە بەسەر دایکی باوەڕداراندا، عائیشە–و.

[(٣)] واتە: سەری سیواکەکە وشك بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەکارهێنانی گران بوو–و.

[(٤)] واتە: دایکی باوەڕداران بە دەمی خۆی سیواکەکەی بۆ نەرم کردەوە، ئەوەش مانای ئەو قسەیەتی کە دەڵێت: خودا لیکی دەمی پێغەمبەر(ﷺ) و لیکی دەمی منی کۆکردەوە–و.

دەستەکانی بەرز کردەوە و دەیفەرموو: (فِي الرفيق الأعلى–بۆ لای دۆستی باڵا) تا گیانی سپارد و دەستی خواربوویەوە.

**٣٧٠٨–** (ق) عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَتْ عائشة: لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ، اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ لَهُ، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلاَهُ الأَرْضَ، وَكَانَ بَيْنَ الْعَبَّاسِ وَرَجُلٍ آخَرَ. قَالَ عُبَيْدُ اللهِ: فَذَكَرْتُ ذلِكَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ مَا قَالَتْ عائشة، فَقَالَ لِي: وَهَلْ تَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ تُسَمِّ عائشة؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ. [خ٦٦٥ (١٩٨)/ م٤١٨]

**(ق) لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: عائیشە وتی: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) قورسی دایگرتەوە و ئازاری زۆر بوو، داوای مۆڵەتی لە ژنەکانی کرد لەماڵەکەی مندا پەرستاری بکرێت، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، لە نێوان دوو پیاو ڕۆیشتە دەرەوە لاقەکانی لە زەوی دەخشان، لە نێوان عەباس و پیاوێکی تردا بوو. عوبەیدوڵا وتی: ئەوەی عائیشە باسی کرد بۆ ئیبن عەباسم باس کرد، پێی وتم: دەزانی ئەو پیاوەی تر کێ بوو عائیشە ناوی نەهێناوە؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەو عەلی کوڕی ئەبی تالب بوو.**

## ٤- دەروازەی: عەلی داوای ویلایەتی نەکردووە

**٣٧٠٩–** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَن عليَّ بن أَبِي طَالب ﷺ خَرَجَ مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي وَجَعِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَقَالَ النَّاسُ: يَا أَبَا حَسَنٍ، كَيْفَ أَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَقَالَ: أَصْبَحَ بِحَمْدِ اللهِ بَارِئاً، فَأَخَذَ بِيَدِهِ عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ المطَّلِبِ فَقَالَ لَهُ: أَنْتَ وَاللهِ بَعْدَ ثَلاَثٍ عَبْدُ الْعَصَا، وَإِنِّي وَاللهِ لأَرَى رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَوْفَ يُتَوَفَّى مِنْ وَجَعِهِ هَذَا، إِنِّي لأَعْرِفُ وُجُوهَ بَنِي عَبْدِ المطَّلِبِ عِنْدَ الموْتِ، اذْهَبْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَلْنَسْأَلْهُ فِيمَنْ هَذَا الأَمْرُ، إِنْ كَانَ فِينَا عَلِمْنَا ذلِكَ، وَإِنْ كَانَ فِي غَيْرِنَا عَلِمْنَاهُ، فَأَوْصَى بِنَا. فَقَالَ عَلِيٌّ: إِنَّا وَاللهِ لَئِنْ سَأَلْنَاهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَمَنَعَنَاهَا لاَ يُعْطِينَاهَا النَّاسُ بَعْدَهُ، وَإِنِّي وَاللهِ لاَ أَسْأَلُهَا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٤٤٤٧]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە: عەلی کوڕی ئەبی تالب(خوا لێی ڕازی بێت) لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)–لەو ئازار و نەخۆشییەی تیایدا کۆچی دوایی کرد– هاتە دەرەوە، خەڵکی وتیان: باوکی حەسەن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم بەیانییە چۆن ڕۆژی لێبوویەوە؟ وتی: بە حەمدی خودا بە چاکبوونەوەوە ڕۆژی لێبوویەوە، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب دەستی عەلی گرت و پێی وت: سوێند بە خودا، دوای سێ ڕۆژی تر دەبیت بە بەندەی ژێر دار، سوێند بە خودا، من پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەبینم لەم ئازار و نەخۆشییە کۆچی دوایی دەکات، بڕۆ با بچین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پرسیاری لێ بکەین ئەم ئەمرە بۆ کێیە؟ گەر لەناو ئێمەدا بێت ئەوە دەیزانین، گەر لەناو کەسانی تردا بێت جگە لە ئێمە دیسان دەیزانین و وەسێتمان پێ دەکات، عەلی وتی: سوێند بە خودا، گەر ئێمە لە پێغەمبەری خودای(ﷺ) داوا بکەین و ڕێگریمان لێ بکات لەدوای ئەو خەڵکی ئەو کارە نادەنە دەست ئێمە، سوێند بە خودا من ئەوە داوا ناکەم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ).

**٣٧١٠–** (ق) عَنِ الأَسْوَدِ قالَ: ذَكَرُوا عِنْدَ عائشة: أَنَّ عَلِيّاً رضي الله عنهما كان وصِيّاً، فَقَالَتْ: مَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ، وَقَدْ كُنْتُ مُسْنِدَتَهُ إِلَى صَدْرِي. أَوْ قَالَتْ: حَجْرِي. فَدَعا بِالطَّسْتِ، فَلَقَدِ انْخَنَثَ فِي حَجْرِي، فَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُ قَدْ ماتَ، فَمَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟ [خ٢٧٤١/ م١٦٣٦]

(ق) لە ئەسوەدەوە وتی: لای عائیشە باسی ئەوەیان کرد عەلی(خوا لێی ڕازی بێت) وەصییە[1]، عائیشە وتی: کەی وەصیەتی بۆ کرد؟ من پاڵپشتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووم لای سینەم–یان وتی: لە باوەشم– داوای تەشتێکی کرد لە باوەشمدا لاربوویەوە، هەستم نەکرد ئەو مردبێت، ئیتر دەبێ کەی وەصیەتی بۆ کرد بێت؟.

**٣٧١١–** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: يَوْمُ الخَمِيسِ، وَمَا يَوْمُ الخَمِيسَ؟! اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَجَعُهُ، فَقَالَ: (**ائْتُونِي أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَاباً لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَداً**). فَتَنَازَعُوا، وَلاَ يَنْبَغِي عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ، فَقَالُوا: ما شَأْنُهُ، أَهَجَرَ، اسْتَفْهِمُوهُ؟ فَذَهَبُوا يَرُدُّونَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (**دَعُونِي،**

---

[1] لێرەدا وەصی مانای جێنشینی هەیە–و.

فَالَّذِي أَنَا فِيهِ خَيْرٌ مِمَّا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ). وَأَوْصَاهُمْ بِثَلاَثٍ، قَالَ: (أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ ما كُنْتُ أُجِيزُهُمْ). وَسَكَتَ عَنِ الثَّالِثَةِ، أَوْ قَالَ: فَنَسِيتُهَا.
[خ٤٤٣١ (١١٤)/ م١٦٣٧]

**(ق)** لە ئیبن عەباسەوە وتی: ڕۆژی پێنجشەم، تۆ چووزانی ڕۆژی پێنجشەم چییە؟! ئازار و نەخۆشی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەرەی سەند، فەرمووی: **(بۆم بهێنن با نوسینێکتان بۆ بنووسم لە دوای خۆم هەرگیز گومڕانەبن)**، ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، نابێت لای پێغەمبەر ناکۆکی سەرهەڵبدات، وتیان: ئەوە چییەتی، بڵێی ئاگای لە خۆی نەمابێت، پرسیاری لێ بکەن، دەستیان کرد بە پرسیار کردن، پێغەمبەر فەرمووی: **(لێم گەڕێن، ئەوەی من ئێستا تیایدام باشتر و چاکترە لەوەی منی بۆ بانگ دەکەن)**، وەسێتی بۆ کردن بە سێ شت و فەرمووی: **(هاوەڵدانەران لە جەزیرەی عەرەب دەربکەن، بە ناردەکان ببەخشن بەو جۆرەی کە من پێم دەبەخشین)**، لە سێهەمیان بێدەنگ بوو، یان وتی: من لەبیرمچوو.

**٣٧١٢-** (خ) عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَتْ عائشة: وَارَأْسَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(ذَاكِ لَوْ كَانَ وَأَنَا حَيٌّ فَأَسْتَغْفِرَ لَكِ، وَأَدْعُوَ لَكِ)**. فَقَالَتْ عائشة: وَاثُكْلَيَاهْ! وَاللهِ إِنِّي لأَظُنُّكَ تُحِبُّ مَوتِي: ، وَلَوْ كَانَ ذلِكَ، لَظَلِلْتَ آخِرَ يَوْمِكَ مُعَرِّساً بِبَعْضِ أَزْوَاجِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(بَلْ أَنَا وَارَأْسَاهُ! لَقَدْ هَمَمْتُ، أَوْ أَرَدْتُ، أَنْ أُرْسِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَابْنِهِ وَأَعْهَدَ: أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُونَ، أَوْ يَتَمَنَّى الْمُتَمَنُّونَ، ثُمَّ قُلْتُ: يَأْبَى اللهُ وَيَدْفَعُ الْمُؤْمِنُونَ، أَوْ يَدْفَعُ اللهُ وَيَأْبَى الْمُؤْمِنُونَ)**. [خ٥٦٦٦]

**(خ)** لە قاسمی کوڕی موحەمەدەوە وتی: عائیشە وتی: هاوار لە ژانی سەرم، **پێغەمبەر خودا(ﷺ)** فەرمووی: **(ئەو قسە کاتێ بکە من مردبم، من زیندووم و داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم و دوعات بۆ دەکەم)**، عائیشە وتی: هاوار بۆ جەرگ سوتانم، سوێند بە خودا، من وا گومان دەبەم، تۆ مردنی منت پێخۆشبێت، گەر ئەوە ببێت لە کۆتایی ڕۆژەکەدا لەگەڵ ژنەکانت هاوسەری دەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(بەڵکو هاوار بۆ ژانی سەری من، هەمێکم بۆ دروست بوو، یان ویستم بنێرم بە دوای**

ئەبوبەکر و کوڕەکەیدا و جێنشینی دابنێم تا کەسێك قسەیەك نەکات و ئاواتخوازان ئاواتی بۆ نەخوازن، پاشان وتم خودا ئەو بڕیارە دەدات و باوەڕداران هەر ئەوەیان دەوێت، یان خودا هەر ئەوەی دەوێ و باوەڕداران هەر ئەو بڕیارە دەدەن).

## ٥- دەروازەی: سەرنجی ماڵئاوایی

٣٧١٣- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الأَنْصَارِيِّ ـ وَكَانَ تَبعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، وَخَدَمَهُ وَصَحِبَهُ ـ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ فِي وَجَع النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الاثْنَيْنِ، وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلاَةِ، فَكَشَفَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم سِتْرَ الْحُجْرَةِ، يَنْظُرُ إِلَيْنَا وَهُوَ قَائِمٌ، كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ، ثُمَّ تَبَسَّمَ يَضْحَكُ، فَهَمَمْنَا أَنْ نَفْتَتِنَ مِنَ الْفَرَحِ بِرُؤْيَةِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ، وَظَنَّ أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم خَارِجٌ إِلَى الصَّلاَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنْ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ. وَأَرْخَى السِّتْرَ، فَتُوُفِّيَ مِنْ يَوْمِهِ. [خ٦٨٠/ م٤١٩]

(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالکی ئەنصارییەوە، ئەو شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتبوو، خزمەتی دەکرد و هاوەڵی دەکرد، ئەبوبەکر نوێژی بە خەڵکی دەکرد لەو نەخۆشی و ئازارەی پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا کۆچی دوایی کرد، تا گەیشتە ڕۆژی دووشەممە ئەوان لە نوێژدا ڕیزیان بەستبوو پێغەمبەر(ﷺ) پەردەی ژوورەکەی لادا و تەماشای دەکردین و ئەو بەپێوە وەستابوو، وەك ئەوەی ڕوخساری پەڕەیەکی سپی گەشاوە بێت، پاشان خەندەیەکی بۆ کرد و پێکەنی، خەمی ئەوەمان بۆ دروست بوو لە خۆشیدا توشی فیتنە ببین بە بینینی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەبوبەکر هاتە دواوە تا بگاتە ڕیزەکە وا گومانی برد پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نوێژ هاتووەتە دەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ کردین نوێژەکەتان تەواو بکەن و پەردەکەی دادایەوە و ئەو ڕۆژە کۆچی دوایی کرد.

## ٦- دەروازەی: دواین شتێك پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" فەرمووی:

٣٧١٤- (ق) عَنْ عائشة قَالَتْ: كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ وَهُوَ صَحِيحٌ: (إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ، ثُمَّ يُخَيَّرَ). فَلَمَّا نَزَلَ بِهِ، وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي، غُشِيَ

عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى سَقْفِ الْبَيْتِ، ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ! الرَّفِيقَ الأَعْلَى). فَقُلْتُ: إِذاً لاَ يَخْتَارُنَا، وَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَدِيثُ الَّذِي كانَ يُحَدِّثُنَا وَهْوَ صَحِيحٌ، قَالَتْ: فَكَانَتْ آخِرَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا: (اللَّهُمَّ! الرَّفِيقَ الأَعْلَى). [خ٤٤٦٣ (٤٤٣٥)/ م٢٤٤٤]

**(ق)** لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ لەشساغ بوو دەیفەرموو: (**هیچ پێغەمبەرێك گیانی ناکێشرێ تا شوێنەکەی خۆی لە بەهەشت دەبینێت، پاشان سەرپشك دەکرێت**[1]) کاتێ نەخۆشی دایگرت، سەری لەسەر ڕانم بوو، بورایەوە، پاشان هۆشی کردەوە، چاوەکانی بەرزکردەوە بۆ سەقفی ماڵەکە، پاشان فەرمووی: (أللهم الرفيق الأعلى-**خودایە، دۆستی باڵا**)، وتم: کەوابوو ئێمە هەڵنابژێرێت، زانیم ئەوە ئەو فەرموودەیە بۆی باس کردین لە کاتی لەشساغیدا، عائیشە وتی: دوایین وشەیەك پێغەمبەر(ﷺ) بەزمانیدا هات فەرمووی: (أللهم الرفيق الأعلى-**خودایە، دۆستی باڵا**).

## ٧- دەروازەی: مردنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" و بەیعەتی ئەبوبەکر

**٣٧١٥-** (خ) عَنْ عائشة ﵂ . زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم .، قَالَتْ: أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ ﵁ عَلَى فَرَسِهِ مِنْ مَسْكَنِهِ بِالسُّنْحِ، حَتَّى نَزَلَ فَدَخَلَ المَسْجِدَ، فَلَمْ يُكَلِّمِ النَّاسَ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى عائشة ﵂، فَتَيَمَّمَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ مُسَجًّى بِبُرْدِ حِبَرَةٍ، فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ أَكَبَّ عَلَيْهِ فَقَبَّلَهُ، ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: بِأَبِي أَنْتَ يَا نَبِيَّ اللهِ، لاَ يَجْمَعُ اللهُ عَلَيْكَ مَوْتَتَيْنِ، أَمَّا المَوْتَةُ الَّتِي كُتِبَتْ عَلَيْكَ فَقَدْ مُتَّهَا. [خ١٢٤١]

**(خ)** لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، هاوەسەری پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت) بەسواری ئەسپەکەی لە شوێنەکەی کە لە بەرزاییەکان بوو گەڕایەوە تا دابەزی و چووە ناو مزگەوتەوە، قسەی لەگەڵ خەڵك نەکرد تا ڕۆیشتە ژوورەوە بۆلای عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت)، ڕووی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئەو بە

[1] واتە: پاشان سەرپشك دەکرێت لە نێوان مردن و درێژکردنەوەی تەمەنی-و.

**بووردێکی حیبەری پێچرابوویەوە، پەڕۆکەی لەسەر ڕوخساری لادا، پاشان خۆیدا بەسەریدا و ماچی کرد، پاشان گریا و وتی: باوکم فیدات بێت، ئەی پێغەمبەری خودا، خودا دوو مردنت لەسەر کۆناکاتەوە، ئەو مردنەی کە لەسەرت نوسرا بوو ئەوا مردیت.**

- وفي رواية: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَاتَ وَأَبُو بَكْرٍ بِالسُّنْحِ. قَالَ إِسْمَاعِيلُ: يَعْنِي: بِالْعَالِيَةِ. فَقَامَ عُمَرُ يَقُولُ: وَاللهِ ما مَاتَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَتْ: وَقَالَ عُمَرُ: وَاللهِ ما كَانَ يَقَعُ فِي نَفْسِي إِلاَّ ذَاكَ، وَلَيَبْعَثَنَّهُ اللهُ، فَلَيَقْطَعَنَّ أَيْدِيَ رِجالٍ وَأَرْجُلَهُمْ. فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ فَكَشَفَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَبَّلَهُ، قالَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، طِبْتَ حَيّاً وَمَيْتاً، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُذِيقُكَ اللهُ الْمَوْتَتَيْنِ أَبَداً.

ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: أَيُّهَا الحَالِفُ عَلَى رِسْلِكَ، فَلَمَّا تَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ جَلَسَ عُمَرُ، فَحَمِدَ اللهَ أَبُو بَكْرٍ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: أَلاَ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم فَإِنَّ مُحَمَّداً قَدْ مَاتَ، وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللهَ فَإِنَّ اللهَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ. وَقَالَ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾[الزمر: ٣٠] وَقَالَ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٤] فَنَشَجَ النَّاسُ يَبْكُونَ.

قَالَ: وَاجْتَمَعَتِ الأَنْصَارُ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَقَالُوا: مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ، فَذَهَبَ إِلَيْهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ، فَذَهَبَ عُمَرُ يَتَكَلَّمُ فَأَسْكَتَهُ أَبُو بَكْرٍ، وَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ: وَاللهِ ما أَرَدْتُ بِذلِكَ إِلاَّ أَنِّي قَدْ هَيَّأْتُ كَلاَماً قَدْ أَعْجَبَنِي، خَشِيتُ أَنْ لاَ يَبْلُغَهُ أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ تَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَتَكَلَّمَ أَبْلَغَ النَّاسِ، فَقَالَ فِي كَلاَمِهِ: نَحْنُ الأُمَرَاءُ وَأَنْتُمُ الْوُزَرَاءُ، فَقَالَ حُبَابُ بْنُ الْمُنْذِرِ: لاَ وَاللهِ لاَ نَفْعَلُ، مِنَّا أَمِيرٌ، وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: لاَ، وَلكِنَّا الأُمَرَاءُ، وَأَنْتُمُ الْوُزَرَاءُ، هُمْ أَوْسَطُ الْعَرَبِ دَاراً، وَأَعْرَبُهُمْ أَحْسَاباً، فَبَايِعُوا عُمَرَ أَوْ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، فَقَالَ عُمَرُ: بَلْ نُبَايِعُكَ أَنْتَ، فَأَنْتَ سَيِّدُنَا، وَخَيْرُنَا، وَأَحَبُّنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَأَخَذَ عُمَرُ بِيَدِهِ فَبَايَعَهُ، وَبَايَعَهُ النَّاسُ، فَقَالَ قَائِلٌ: قَتَلْتُمْ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، فَقَالَ عُمَرُ: قَتَلَهُ اللهُ. [خ٣٦٦٧ و٣٦٦٨]

لە ڕیوایەتێکدا: پێغەمبەری خودا(ﷺ) مرد و ئەبوبەکر لە "السُّنْح" بوو–ئیسماعیل وتی: واتە لە بەرزاییەکان– عومەر هەستایە سەر پێ و دەیوت: سوێند بە خودا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەمردووە، عائیشە وتی: عومەر وتی: سوێند بە خودا، تەنها ئەوە دەکەوێتە ناو نەفسمەوە خودا زیندووی دەکاتەوە و دەست و لاقی پیاوانێك دەبڕێت، ئەبوبەکر هات و پۆشاکەکەی لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) لادا و ماچی کرد و وتی: دایك و باوکم فیدات بێت، بەزیندوی و بە مردوی پاك و بۆن خۆشی، سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، خودا هەرگیز دوو مردن بەسەر تۆدا ناهێنێت.

پاشان چووە دەرەوە و وتی: ئەی ئەو کەسەی سوێند دەخۆیت هێواش بە، کاتێك ئەبوبەکر قسەی کرد عومەر دانیشت، ئەبوبەکر حەمدی خودای کرد و سەنای لەسەر کرد و وتی: دەزانن هەرکەس موحەمەدی دەپەرست ئەوا موحەمەد مرد، هەرکەس خودا دەپەرستێت زیندووە و نامرێت، هەروەها وتی: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ۝﴾[الزمر: ٣٠]، هەروەها وتی: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ۝﴾ [آل عمران: ١٤٤]، خەڵکەکە دایان لە کورپەی گریان، وتی: ئەنصار لای سەعدی کوڕی عوبادە لە سەقیفەی کوڕی ساعیدە کۆبوونەوە و وتیان: ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئێوە، ئەبوبەکر و عومەری کوڕی خەتاب و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح ڕۆیشتن بۆ لایان، عومەر دەستی بە قسەکردن کرد و ئەبوبەکر بێدەنگی کرد، عومەر دەیوت: سوێند بە خودا، بەو کارە من تەنها دەمویست قسانێك بکەم ئامادەم کردبوون و لام پەسەندبوون، ترسام ئەبوبەکر ئەو قسانە ڕانەگەیەنێت، پاشان ئەبوبەکر قسەی کرد و زمان ڕەوانترین کەس قسەی کرد، لە قسەکانیدا وتی: ئێمە ئەمیرانین و ئێوەش وەزیران، حوبابی کوڕی مونزیر وتی: نە، سوێند بە خودا، ئەو کارە ناکەین، لە ئێمە ئەمیرێك و لە ئێوە ئەمیرێك، ئەبوبەکر وتی: نەخێر، بەڵکو ئێمە ئەمیران و ئێوە وەزیران، ئەوان[1] ناوەندترینی عەرەبن لە ماڵ و جێگەدا، و دەسەڵاتدارترینن لە ناو عەرەبدا، بۆیە بەیعەت بە عومەر یان ئەبو

[1] واتە: قورەیش–و.

عوبەیدەی كوڕی جەڕاح بكەن، عومەر وتی: بەڵكو ئێمە بەیعەت بە تۆ دەكەین، تۆ سەرداری ئێمەی و باشترینی ئێمەی و خۆشەویسترین بوویت لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، عومەر دەستی گرت و بەیعەتی پێ كرد و خەڵكەكەش بەیعەتیان پێ كرد یەكێك وتی: سەعدی كوڕی عوبادەتان كوشت، عومەر وتی: خودا بیكوژێت.

## ٨-دەروازەی: فاتیمە پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" دەلاوێنێتەوە

**٣٧١٦-** (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم جَعَلَ يَتَغَشَّاهُ، فَقَالَتْ فاطِمَةُ عليها السلام: وَاكَرْبَ أَبَاهُ! فَقَالَ لَهَا: (**لَيْسَ عَلَى أَبِيكِ كَرْبٌ بَعْدَ الْيَوْمِ**). فَلَمَّا مَاتَ قَالَتْ: يَا أَبَتَاه أَجابَ رَبّاً دَعَاهُ. يَا أَبَتَاهُ مَنْ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاهُ. يَا أَبَتَاهُ إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعَاهُ. فَلَمَّا دُفِنَ قَالَتْ فاطِمَةُ عليها السلام: يَا أَنَسُ، أَطَابَتْ أَنْفُسُكُمْ أَنْ تَحْثُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم التُّرَابَ. [خ٤٤٦٢]

**(خ)** لە ئەنەسەوە، وتی: كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لاشەی قورسی نەخۆشی دایگرتەوە، فاتیمە(سەلامی خودای لەسەر بێت) وتی: هاوار بۆ تەنگانەی بابم، پێغەمبەر پێی فەرموو: (**لە ئەمڕۆ بەدواوە تەنگانەیەك لەسەر بابت نییە**)، كاتێ پێغەمبەر كۆچی دوایی كرد فاتیمە وتی: ئەی باوكی شیرینم، وەڵامی پەروەردگارت دایەوە كاتێ بانگهێشی كردیت، ئەی باوكی شیرینم، شوێن و جێگەت فیردەوسە، ئەی باوكی شیرینم، هەواڵی مردنەكەت بە جیبریل رادەگەیەنین، كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) شارایەوە فاتیمە(سەلامی خودای لەسەر بێت) وتی: ئەی ئەنەس، ئایە دڵتان هات خۆڵ بدەن بەسەر پێغەمبەری خودادا(ﷺ)؟.

## ٩- دەروازەی: تەمەنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" ئەو ڕۆژەی كۆچی دوایی كرد

**٣٧١٧-** (ق) عَنْ عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم تُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [خ٤٤٦٦ (٣٥٣٦)/ م٢٣٤٩]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت): پێغەمبەر خودا(ﷺ) مرد و ئەو رۆڵەی شەست و سێ ساڵان بوو.

٣٧١٨- (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قُبِضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. وَأَبُو بَكْرٍ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. وَعُمَرُ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [م٢٣٤٨]

(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی کرد و ئەو رۆڵەی شەست و سێ ساڵان بوو، و ئەبوبەکر رۆڵەی شەست و سێ ساڵان بوو، و عومەر رۆڵەی شەست و سێ ساڵان بوو.

## ١٠- دەروازەی: ژمارەی غەزاکانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

٣٧١٩- (ق) عَنْ أَبِي إِسحاقَ: كُنْتُ إِلَى جَنْبِ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، فَقِيلَ لَهُ: كَمْ غَزَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ غَزْوَةٍ؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ، قِيلَ: كَمْ غَزَوْتَ أَنْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ، قُلْتُ: فَأَيُّهُمْ كَانَتْ أَوَّلَ؟ قَالَ: الْعُشَيْرُ أَوِ الْعُسَيْرَةُ، فَذَكَرْتُ لِقَتَادَةَ فَقَالَ: الْعُشَيْرَةُ.

[خ٣٩٤٩/ م: الجهاد ١٢٥٤ (١٤٣)]

(ق) لە ئەبی ئیسحاقەوە: لە تەنیشتی زەیدی کوڕی عەرقەم بووم، پێی وترا: پێغەمبەر(ﷺ) چەند غەزای کرد؟ وتی: نۆزدە، وترا: تۆ لە چەند غەزا لەگەڵی بووی؟ وتی: حەڤدە، پێم وت: کامیان یەکەمین غەزا بوو؟ وتی: عوشەیرە، یان عوسەیرە، ئەوەم بۆ قەتادە باس کرد، وتی: عوشەیرە.

## ١١- دەروازەی: بە خاک سپاردنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

٣٧٢٠- عَنْ عائشة قَالَتْ: لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، اخْتَلَفُوا فِي دَفْنِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَيْئاً مَا نَسِيتُهُ، قَالَ: **(مَا قَبَضَ اللهُ نَبِيّاً؛ إِلاَّ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ)**. ادْفِنُوهُ فِي مَوْضِعِ فِرَاشِهِ. [ت١٠١٨]

* صحيح.

لە عائیشەوە وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد لە شاردنەوەی جیاوازییان کەوتە نێوان، ئەبوبەکر وتی: شتێکم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیستووە لەبیرم نەکردووە، فەرمووی: (**خودا گیانی هەر پێغەمبەرێکی لەو شوێنەدا کێشاوە پێیخۆشبووە، تیایدا بشاردرێتەوە**)، لە شوێنی جێگەی نوستنەکەی بیشارنەوە.

## ١٢- دەروازەی: مەدینە لە دوای مردنی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢١**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْمَدِينَةَ، أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا نَفَضْنَا عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْأَيْدِي، وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا.

* صحيح. [ت٣٦١٨/ جه١٦٣١/ مي٨٨]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە مەدینە هەرچی شتە ڕۆشنبوویەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی تیایدا مرد هەرچی شتە تاریك بوو، ئێمە دەستمان هەڵنەگرتبوو لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ لە شاردنەوەیدابووین هەستمان بە ناخۆشی دڵی خۆمان کرد.



## بەشی یەکەم

# ناوەکانی و کەمالی خەڵقی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## ١- دەروازەی: ناوەکانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢٢-** (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لِي خَمْسَةُ أَسْمَاءٍ: أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ). [خ٣٥٣٢/ م٢٣٥٤]

(ق) لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**پێنج ناوم هەیە: من موحەمەد، و ئەحمەدم، من "ماحي"م ئەو کەسەی خودا بە من بێباوەڕی مەحو دەکاتەوە، من "حاشر"م ئەو کەسەی خەڵکی لەسەر دوو پێیەکانم حەشر دەکرێن، من "عاقب"[1]"م**).

## ٢- دەروازەی: سیفەتەکانی جەستەی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢٣-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَرْبُوعاً، بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، لَهُ شَعَرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ، رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ، لَمْ أَرَ شَيْئاً قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ. [خ٣٥٥١/ م٢٣٣٧]

(ق) لە بەرائی کوڕی عازیبەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی میانەبوو، نێوان شانەکانی بەرین بوو، پرچی شۆڕ دەبوویەوە تا نەرمی دوو گوێیەکەی، من ئەوم لە حولەیەکی سوردا[2] بینی هەرگیز شتێکم نەبینیوە جوانتر لەئەو.

---

[1] "عاقب" ئەو کەسەی دوایین پێغەمبەرە و پێغەمبەر بەدوایدا نایەت-و.

[2] جۆرێکە لە پۆشاك لە کراس و ژێرپۆشاکێك پێکهاتووە-و.

▪ وفي رواية لهما: قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَحْسَنَ النَّاسِ وَجْهاً، وَأَحْسَنَهُ خَلْقاً، لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلاَ بِالْقَصِيرِ. [خ٣٥٤٩]

**لە ڕیوایەتێکی هەردووکیاندا: بەراء وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هەموو خەڵك ڕوخساری جوانتر بوو ڕەوشتی شیرینتر بوو، کەسێکی باڵا درێژ نەبوو هەروەها کەسێکی باڵا کورت نەبوو.**

## ٣- دەروازەی: سیفەتی پرچی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢٤-** (ق) عَنْ قتادةَ قالَ: سألتُ أَنَسَ بْنَ مالك عن شعر رَسُول اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: كَانَ شَعْرُ رَسُول اللهِ صلّى الله عليه وسلّم رَجِلاً، لَيْسَ بالسَّبْطِ ولا الجَعْدِ، بين أُذنيه وعاتِقِهِ. [خ٥٩٠٥ (٥٩٠٣)/ م٢٣٣٨]

**(ق) لە قەتاتەوە وتی: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك کرد دەربارەی پرچی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وتی: پرچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەردراوەبوو نەخاو بوو نە لوول، لە نێوان دوو گوێکەی و سەرشانی.**

**٣٧٢٥-** (ق) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قالَ: سَأَلْتُ أَنَساً: أَخَضَبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم؟ قالَ: لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ إلاَّ قَلِيلاً. [٥٨٩٤ (٣٥٥٠)/ م٢٣٤١]

**(ق) لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە، وتی: پرسیارم لە ئەنەس کرد ئایا پێغەمبەر(ﷺ) بۆیاخی دەکرد؟ وتی: زۆر کەم پیری پێوە دەرکەوتبوو.**

## ٤- دەروازەی: بۆنی خۆشی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢٦-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قالَ: ما مَسِسْتُ حَرِيراً وَلاَ دِيبَاجاً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَلاَ شَمِمْتُ رِيحاً قَطُّ، أَوْ عَرْفاً قَطُّ أَطْيَبَ مِنْ رِيحِ أَوْ عَرْفِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٣٥٦١ (١١٤١)/ م٢٣٣٠]

(ق) لەئەنەسەوە (خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: دەستم نەداوە لە ئاوریشم و لە دیباج نەرمتر بێت لە دەستی پێغەمبەر(ﷺ)، هەرگیز بۆنێکم نەکردووە یان بۆنی گوڵاوم نەکردووە خوشتربێت لە بۆنی یان لە گوڵاوی پێغەمبەر(ﷺ).

**٣٧٢٧-** (ق) عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ كَانَتْ تَبْسُطُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم نِطْعاً، فَيَقِيلُ عِنْدَهَا عَلَى ذلِكَ النِّطْعِ، قَالَ: فَإِذَا نَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَخَذَتْ مِنْ عَرَقِهِ وَشَعرِهِ، فَجَمَعَتْهُ فِي قارُورَةٍ، ثُمَّ جَمَعَتْهُ فِي سُكٍّ. قالَ: فَلَمَّا حَضَرَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ الْوَفَاةُ، أَوْصى إِلَيَّ أَنْ يُجْعَلَ فِي حَنُوطِهِ مِنْ ذلِكَ السُّكِّ، قالَ: فَجُعِلَ فِي حَنُوطِهِ.

[خ٦٢٨١/ م٢٣٣١، ٢٣٣٢]

لە سومامەوە، لە ئەنەسەوە: ئوم سولەیم ڕاخەرێکی پێستی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دادەخست لای ئەو قەیلولەی لەسەر ئەو ڕاخەرە پێستە دەکرد، وتی: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەخەوت لە ئارەقە و مووی پێغەمبەری دەگرت لە دەفرێکی شوشەدا کۆیکردەوە، پاشان لە بۆنێکی تێکەڵدا کۆیکردەوە، سومامە وتی: کتێ مردن لەسەر ئەنەسی کوڕی مالیك ئامادە بوو وەسێتی بۆ کردم لەو بۆنە تێکەڵە بخرێتە ناو بۆنەکانی، بۆیە بۆی کرایە ناو بۆنەکانی.

## ٥- ڕۆیشتنی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا مَشَى، مَشَى أَصْحَابُهُ أَمَامَهُ، وَتَرَكُوا ظَهْرَهُ لِلْمَلائِكَةِ. [جه٢٤٦]

* صحيح.

لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە وتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشت، هاوەڵانی لە پێشییەوە دەڕۆیشتن و، پشتیان[١] بۆ فریشتەکان بە جێدەهێڵا.

---

[١] واتە: پشتی پێغەمبەریان(ﷺ) بۆ فریشتەکان بەجێدەهێڵا-و.

# بەشی دووەم

# ڕەوشتی مەزنی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

## ١- دەروازەی: ڕەوشتی شیرین و جوانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٢٩-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قالَ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فاحِشاً وَلاَ مُتَفَحِّشاً، وَكَانَ يَقُولُ: (إِنَّ مِنْ خِيَارِكُمْ أَحْسَنَكُمْ أَخْلاَقاً).

[خ٣٥٥٩/ م٢٣٢١]

**(ق) لە عبداللە ی کوڕی عەمرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) نە فاحیش بوو، نە موتەفەحیش**[1]**، ئەو دەیفەرموو: (باشترینی ئێوە باشترینتانە لە ئەخلاقدا).**

**٣٧٣٠-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قالَ لِي: أُفٍّ، وَلاَ: لِمَ صَنَعْتَ؟ وَلاَ: أَلاَ صَنَعْتَ؟ [خ٦٠٣٨ (٢٧٦٨)/ م٢٣٠٩]

**(ق) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم (ﷺ) کرد نەپێی وتم ئۆف، نەپێی وتم ئەوەت بۆ کرد؟، نە پێی وتم ئەوەت بۆ نەکرد؟.**

**٣٧٣١-** (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقاً.

[م٢٣١٠]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هەموو کەس ڕەوشتی شیرینتر و جوانتربوو.**

---

[1] "فُحْش" زیادەی ناپەسەندە لە هەر گوفتار و کردارێکدا، پێغەمبەر(ﷺ) نە لە گوفتاری و نە لە کرداری زیادەڕەوی و ناپەسەندی بوونی نەبوو-و.

## ٢- دەروازەی: حەیا و شەرمی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٣٢-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ قالَ: كانَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، فَإِذَا رَأَى شَيْئاً يَكْرَهُهُ عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ. [خ٦١٠٢ (٣٥٦٢)/ م٢٣٢٠]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە کچێکی ناو پەردە بەشەرم و بەحەیاتر بوو، گەر شتێکی ببینیبایە لای ناپەسەندبێت لە ڕوخساریدا دەمانبینی.**

## ٣- دەروازەی: پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەکردووەتەوە

**٣٧٣٣-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ؓ أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بَيْنَ أَمْرَيْنِ؛ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا ما لَمْ يَكنْ إِثْماً، فَإِنْ كانَ إِثْماً كانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لِنَفْسِهِ؛ إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللهِ، فَيَنْتَقِمَ للهِ بِهَا. [خ٣٥٦٠/ م٢٣٢٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەو وتی: هەرکات پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نێوان دوو کاردا سەرپشك بکرابایە ئاسانەکەیانی هەڵدەبژارد گەر گوناه نەبوایە ئەگەر گوناه بوایە دورترینی خەڵکی بوو لێی، هەروەها هەرگیز پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەکردۆتەوە مەگەر حورمەتی خودا بەزێنرابێت ئەو کات بۆ خودا تۆڵەی دەکردەوە.**

**٣٧٣٤-** (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم شَيْئاً قَطُّ بِيَدِهِ، وَلاَ امْرَأَةً، وَلاَ خَادِماً؛ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللهِ. وَمَا نِيلَ مِنْهُ شَيْءٌ قَطُّ، فَيَنْتَقِمَ مِنْ صَاحِبِهِ؛ إِلاَّ أَنْ يُنْتَهَكَ شَيْءٌ مِنْ مَحَارِمِ اللهِ، فَيَنْتَقِمَ للهِ عزّ وجل. [م٢٣٢٨]

**(م) لە عائیشەوە وتی: هەرگیز پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شتێکی نەداوە، نە لە ئافرەت و نە لە خزمەتکار، مەگەر لە ڕێگەی خودادا جیهادی کردبێت، گەر دەست درێژییەك بکرابایەتە سەری هەرگیز لە کەسەکە تۆڵەی نەدەسەند، مەگەر شتێك لە سنووری خودا ببەزێنرایە، ئەو کات بۆ خودا(عز وجل) تۆڵەی دەکردەوە.**

## ٤- دەروازەی: حیلمی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٣٥**- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَذَبَهُ جَذْبَةً شَدِيدَةً، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عاتِقِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ أَثَّرَتْ بِهِ حاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَذْبَتِهِ، ثُمَّ قالَ: مُرْ لِي مِنْ مالِ اللهِ الَّذِي عِنْدَكَ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ فَضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ. [خ٣١٤٩/ م١٠٥٧]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشتم بوردێکی نەجرانی لێوار زبری لەسەر شان بوو، پیاوێکی ئەعرابی پێیگەیشت زۆر بە توندی بوردەکەی ڕاکێشا تا تەماشای لاملی پێغەمبەرم(ﷺ) کرد ئاساری لێواری بوردەکەی پێوە دیاربوو بەهۆی ڕاکێشانی توندی ئەعرابیەکەوە، پاشان بابای ئەعرابی وتی: فەرمان بکە لەو ماڵەی خودام پێ بدرێت کە لە لاتە، پێغەمبەر لای کردەوە بەلایدا و پێکەنی، پاشان فەرمانی کرد بە پێدانی.**

## ٥- دەروازەی: بەخشندەیی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٣٦**- (ق) عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: ما سُئِلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ شَيْءٍ قَطُّ فَقَالَ: لاَ. [خ٦٠٣٤/ م٢٣١١]

**(ق) لە جابرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: هەرگیز شتێك داوا نەکراوە لە پێغەمبەر(ﷺ) وتبێتی نەخێر.**

**٣٧٣٧**- (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الإِسْلاَمِ شَيْئاً إِلاَّ أَعْطَاهُ. قَالَ: فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَأَعْطَاهُ غَنماً بَيْنَ جَبَلَيْنِ، فَرَجَعَ إِلَى قَوْمِهِ، فَقَالَ: يَا قَوْمِ! أَسْلِمُوا، فَإِنَّ مُحَمَّداً يُعْطِي عَطَاءً لاَ يَخْشَى الْفَاقَةَ. [م٢٣١٢]

**(م) لە ئەنەسەوە وتی: لەسەر موسوڵمانبوون هەر شتێك داوا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکرابایە پێیدەدا، پیاوێك هات بۆ لای و پڕ بە دۆڵێك مەڕی پێدا، گەڕایەوە**

بۆ لای هۆزەکەی و وتی: ئەی هۆزەکەم، موسوڵمان بن، موحەمەد بە بەخشینێك دەبەخشێت ترسی هەژاریی نییە.

## ٦- دەروازەی: ئازایەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٣٨**- (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَحْسَنَ النَّاسِ، وَأَجْوَدَ النَّاسِ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ، قَالَ: وَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ المدِينَةِ لَيْلَةً، سَمِعُوا صَوْتاً، قَالَ: فَتَلَقَّاهُمُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، وَهُوَ مُتَقَلِّدٌ سَيْفَهُ، فَقَالَ: (**لَمْ تُرَاعُوا لَمْ تُرَاعُوا**). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**وَجَدْتُهُ بَحْراً**). يعني: الْفَرَسَ.
[خ٣٠٤٠ (٢٦٢٧)/ م٢٣٠٧]

**(ق)** لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) باشترینی خەڵك و بەخشندەترینی خەڵك و ئازاترینی خەڵك بوو، ئەو وتی: شەوێك ئەهلی مەدینە ترس ڕووی لێکردن و دەنگێکیان بیست، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەسپێکی زین نەکراوی ئەبی تەڵحە بەوان گەیشت[1]، شمشێرەکەی ڕاکێشا بوو، فەرمووی: (**مەترسن، مەترسن**). پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**وەك دەریام بینی**) واتە ئەسپەکە[2].

## ٧- دەروازەی: تەوازع و بەزەیی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٣٩**- (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، فَقَالَ: (**يَا أُمَّ فُلاَنٍ! انْظُرِي أَيَّ السِّكَكِ شِئْتِ، حَتَّى أَقْضِيَ لَكِ حَاجَتَكِ**) فَخَلاَ مَعَهَا فِي بَعْضِ الطُّرُقِ، حَتَّى فَرَغَتْ مِنْ حَاجَتِهَا. [م٢٣٢٦]

**(م)** لە ئەنەسەوە: ئافرەتێك شتێك لە ناتەواوی لە عەقڵیدا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا پێویستییەکم لای تۆ هەیە، پێغەمبەر فەرمووی: (**دایکی فڵان، بڕۆ و**

---

[1] واتە: پێغەمبەر(ﷺ) بەر لەوان ڕۆیشت بوو بە پیری دەنگەکەوە و لەو سەرەوە دەگەڕایەوە-و.

[2] ئەسپەکەی ئەبو تەلحە تەمبەڵ بوو، بەڵام بە هۆی سواری پێغەمبەرەوە وەك شەپۆلی دەریا تەکانی دەدا-و.

**بزانە چ ڕێگەیەك دەخوازی تا بێم پێویستیەکەت بۆ جێبەجێبکەم)**، لەسەر یەکێك لە ڕێگەکان لەگەڵ پێغەمبەر تەنهاکەوت تا لە پێویستیەکەی خۆی تەواوبوو[1].

**٣٧٤٠**- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَجُلٌ، فَكَلَّمَهُ، فَجَعَلَ تُرْعَدُ فَرَائِصُهُ، فَقَالَ لَهُ: (**هَوِّنْ عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ**). [جه٣٣١٢]

* صحيح.

[وانظر: **٢٤٠٢، ٢٤٠٣**].

**لە ئەبی مەسعودەوە**، وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و قسەی لەگەڵ کرد و، ترس و هەیبەت دایگرتەوە، پێغەمبەر پێی فەرموو: (**هێواش بە، من مەلیك نیم، من کوڕی ئافرەتێکم گۆشتی وشککراوەی دەخوارد)**.

## ٨- دەروازەی: شێوازی قسەکردنی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٤١**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُحَدِّثُ حَدِيثاً لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لأَحْصَاهُ. [خ٣٥٦٧/ م٢٤٩٣م/ زهد ٧١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) قسەیەکی باس دەکرد گەر کەسێك بیویستبایە بیژمێرێت هەژماری دەکرد.**

**٣٤٧٢**- (خ) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ كَانَ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلاَثاً، حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإِذَا أَتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلاَثاً. [خ٩٥ (٩٤)]

[وانظر: **٢١٣١، ٣٧٧٩**.

وانظر في مزاحه صلّى الله عليه وسلّم: **٣٤٣٥، ٣٤٣٦**].

---

(١) ئەقڵی ئافرەتەکە غەریب بوو، پێیخۆش بوو خەڵك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ببینن تا بڵێن فلان ئافرەت کار و پرسیاری هەیە لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش ئەمەی دەزانی بۆیە فەرمووی: برۆ و بزانە چ ڕێگەیەك دەخوازی-و.

لە ئەنەسەوە، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)، گەر پێغەمبەر قسەیەکی بفەرمووبایە سێ جار دووبارەی دەکردەوە تا لێیەوە حاڵی ببن، گەر بهاتایە بۆ لای کۆمەڵێك و سەلامی لەسەر بکردبان سێ جار سەلامی لەسەر دەکردن.

## ٩- دەروازەی: پێکەنینی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٤٣-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: ما رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم مُسْتَجْمِعاً قَطُّ ضَاحِكاً، حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ. [خ٦٠٩٢ (٤٨٢٨)/ م٨٩٩]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: هەرگیز پێغەمبەرم نەبینیوە لە پێکەنیندا قاقا لێبدات تا زمانە بچکۆلەی ببینم، ئەو خەندەی دەکرد.**

**٣٧٤٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَكْثَرَ تَبَسُّماً مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [ت٣٦٤١]

* صحيح.

**لە عەبدوڵای کوڕی حارسی کوڕی جەزئەوە، وتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە بە ئەندازەی پێغەمبەر(ﷺ) خەندە بکات.**

## ١٠- دەروازەی: کەسێك پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" قسەی پێ بڵێت

**٣٧٤٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ! فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ، فَاجْعَلْ ذَلِكَ لَهُ قُرْبَةً إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).** [خ٦٣٦١/ م٢٦٠١]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەو گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (خودایە قسەم بە هەر باوەڕدارێك وت لە ڕۆژی قیامەت بیکە بە نزیکی و کاری چاکە لە خۆتەوە).**

## ١١- دەروازەی: پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" لە خۆی ماف دەسێنێتەوە

**٣٧٤٦**- عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ . رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ . قَالَ: بَيْنَمَا هُوَ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، وَكَانَ فِيهِ مِزَاحٌ، بَيْنَا يُضْحِكُهُمْ، فَطَعَنَهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي خَاصِرَتِهِ بِعُودٍ، فَقَالَ: أَصْبِرْنِي فَقَالَ: (اصْطَبِرْ)، قَالَ: إِنَّ عَلَيْكَ قَمِيصاً، وَلَيْسَ عَلَيَّ قَمِيصٌ، فَرَفَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ قَمِيصِهِ، فَاحْتَضَنَهُ وَجَعَلَ يُقَبِّلُ كَشْحَهُ، قَالَ: إِنَّمَا أَرَدْتُ هَذَا يَا رَسُولَ اللهِ. [د٥٢٢٤]

* إسناده صحيح.

لە ئوسەیدی کوڕی حوزەیرەوە -پیاوێك لە ئەنصار- وتی: کاتێ کە ئوسەید قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد، شتێك لە شۆخی تێدابوو کە ئەوانی دەهێنایە پێکەنین، پێغەمبەر(ﷺ) بەدارێك دای لە ناوقەدی، ئوسەید وتی: لە خۆت مافەکەم بۆ وەربگرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(مافی خۆت وەربگرە)** ئوسەید وتی: تۆ کراست لەبەردایە و من کراسم لەبەردانەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی لەبەرکردەوە ئوسەید لە ئامێزی گرت و ناوقەدی ماچ کرد، وتی: تەنها ئەوەم ویست ئەی پێغەمبەر خودا.



# بەشی سێیەم

## هەندێك لە ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

### ١- دەروازەی: فەرمودەی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ": من چیمداوە لە دنیا

**٣٧٤٧**-(خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بَيْتَ فَاطِمَةَ فَلَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهَا، وَجَاءَ عَلِيٌّ فَذَكَرَتْ لَهُ ذلِكَ، فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (إِنِّي رَأَيْتُ عَلَى بَابِهَا سِتْراً مَوْشِيّاً)، فَقَالَ: (ما لِي وَلِلدُّنْيَا). فَأَتَاهَا عَلِيٌّ فَذَكَرَ ذلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ: لِيَأْمُرْنِي فِيهِ بِمَا شَاءَ، قَالَ: (تُرْسِلُ بِهِ إِلَى فُلاَنٍ، أَهْلِ بَيْتٍ بِهِمْ حَاجَةٌ). [خ٢٦١٣]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ماڵی فاتیمە و نەچووە ژوورەوە بۆ لای، عەلی هات و فاتیمە ئەوەی بۆ باس کرد، عەلیش ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، فەرمووی: (من لەسەر دەرگاکەی ئەو قوماشێکی ڕەنگا و ڕەنگم بینی)، هەروەها فەرمووی: (من چیمداوە لە دنیا[1])، عەلی هات بۆ لای فاتمە و ئەوەی بۆ باس کرد، فاتیمە وتی: با پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو قوماشە فەرمانم پێ بکات چۆنی دەوێت، پێغەمبەر فەرمووی: (بینێرە بۆ فلان، خانەوادەیەکن پێویستیان پێیەتی).**

**٣٧٤٨**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مَسْعُودٍ قَالَ: نَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى حَصِيرٍ، فَقَامَ وَقَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ اتَّخَذْنَا لَكَ وِطَاءً، فَقَالَ: (مَا لِي وَمَا لِلدُّنْيَا، مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا). [ت٢٣٧٧/ جه٤١٠٩]

* صحيح.

---

(١) ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیان و گوزەراندا وەك پێغەمبەر(ﷺ) وابوون، بۆیە (من)ەکە بۆ خۆی و ئالوبەیتیی موبارەکی دەگەڕێتەوە-و.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر حەسیرێك خەوتبوو ئەسەری حەسیرەکە لە لاکانیدا دەرکەوتبوون، وتمان، ئەی پێغەمبەری خودا، گەر بتوانین دۆشەکێکت بۆ ڕابخەین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(من چیمداوە لە دنیا، من و دنیا وەك سوارێکین دەچێتە ژێر سێبەری درەختێك، پاشان دەڕوات و بەجێیدەهێڵێت).**

## ٢- دەروازەی ئەوەی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" دەیخوارد

**٣٧٤٩-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا أَكَلَ آلُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم أَكْلَتَيْنِ فِي يَوْمٍ؛ إِلاَّ إِحْدَاهُمَا تَمْرٌ. [خ٦٤٥٥/ م٢٩٧١]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئالی موحەمەد لە ڕۆژێکدا دوو ژەمیان خواردبێت ژەمێکیان خورما بووە.**

**٣٧٥٠-** (ق) وَعَنْهَا ﵂ قَالَتْ: ما شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم، مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، مِنْ طَعَامِ الْبُرِّ ثَلاَثَ لَيَالٍ تِبَاعاً، حَتَّى قُبِضَ. [خ٥٤١٦/ م٢٩٧٠]

**(ق) هەر لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەوکاتەوەی پێغەمبەر هات بۆ مەدینە ئالی موحەمەد(ﷺ) سێ شەو بەدوای یەکدا لە نانی گەنم تێری نەخواردووە تا کۆچی دوایی کرد.**

**٣٧٥١-** (ق) وَعَنْهَا ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: ابْنَ أُخْتِي، إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلاَلِ، ثُمَّ الْهِلاَلِ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم نَارٌ. فَقُلْتُ: يَا خَالَةُ، ما كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالماءُ؛ إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ، كَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ، وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ أَلْبَانِهِمْ فَيَسْقِينَا. [خ٢٥٦٧/ م٢٩٧٢]

**(ق) هەر لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، ئەو وتی بە عوروە: خوشکەزای خۆم، ئێمە تەماشای مانگی یەك شەوەمان دەکرد، پاشان مانگی یەك شەوە، سێ مانگی یەك**

شەوە لە دوونگدا، لە ماڵەکانی پێغەمبەر ئاگر نەدەکرایەوە، عوروە وتی: ئەی پووری خۆم، گوزەرانتان چی بوو؟ عائیشە وتی: دوو ڕەشەکە، خورما و ئاو، بەلاّم پێغەمبەری خودا(ﷺ) جیرانی لە ئەنصار هەبوو، ئەوان شیریان هەدیە دەکرد، ئەوان حوشتر و مەڕی شیردەریان هەبوو لە شیرەکەی هەدیەی پێغەمبەری خودایان دەکرد و دەمانخواردەوە.

**٣٧٥٢-** (خ) وَعَنْهَا ﷺ قَالَتْ: ما شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ خُبْزِ بُرٍّ مَأْدُومٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ. [خ٦٦٨٧ (٥٤٢٣)]

**(خ) هەر لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: ئالی موحەمەد(ﷺ) سێ ڕۆژ لە نانی گەنم بە پێخۆرەوە تێر نەبوون تا بە خودا گەیشت.**

**٣٧٥٣-** (خ) عَنْ قَتَادَةَ قالَ: كُنَّا نَأْتِي أَنَسَ بْنَ مالِكٍ ﷺ وَخَبَّازُهُ قَائِمٌ، قالَ: كُلُوا، فَمَا أَعْلَمُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم رَأَى رَغِيفاً مُرَقَّقاً حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ، وَلاَ رَأَى شَاةً سَمِيطاً بعَيْنِهِ قَطُّ. [خ٥٤٢١ (٥٣٨٥)]

**(خ) لە قەتادەوە وتی: دەهاتین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیك(خوا لێی ڕازی بێت)، نانکەرەکەی بەپێوە بوو، وتی: بخۆن، وانازانم پێغەمبەر(ﷺ) تا بە خزمەتی خودا گەیشت نانێکی نەرمی خواردبێت، هەر بەو جۆرە هەرگیز بە چاوانی بەرخێکی لێنراوی نەبینیوە.**

**٣٧٥٤-** (خ) عَنْ أَبِي حازِمٍ قالَ: سَأَلْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَقُلْتُ: هَلْ أَكَلَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم النَّقِيَّ؟ فَقَالَ سَهْلٌ: ما رَأَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم النَّقِيَّ، مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللهُ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ. قالَ: فَقُلْتُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَنَاخِلُ؟ قَالَ: ما رَأَى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُنْخُلاً، مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللهُ حَتَّى قَبَضَهُ. قالَ: قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَأْكُلُونَ الشَّعِيرَ غَيْرَ مَنْخُولٍ؟ قالَ: كُنَّا نَطْحَنُهُ وَنَنْفُخُهُ، فَيَطِيرُ ما طَارَ، وَمَا بَقِيَ ثَرَّيْنَاهُ فَأَكَلْنَاهُ. [خ٥٤١٣ (٥٤١٠)]

**(خ) لە ئەبی حازمەوە، وتی: پرسیارم لە سەهلی کوڕی سەعد کرد و وتم: ئایە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نانی سپی خواردووە؟ سەهل وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نانی سپی نەبینیوە لەو کاتەوەی خودا ڕەوانەی کرد تا ئەو کاتەی گیانی**

لێوەرگرتەوە، وتی: وتم: ئایە لەسەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هێڵەکتان هەبوو؟ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هێڵەکێکی نەبینیوە لەو کاتەوەی خودا ڕەوانەی کرد تا ئەو کاتەی گیانی لێوەرگرتەوە، وتی: وتم: ئەی چۆن جۆی نەبێژراوەتان دەخوارد؟ وتی: دەمانهاڕی و پاشان دەماندایە بەربا و ئەوەی با دەیبرد دەیبرد و ئەوەی دەمایەوە تەڕماندەکرد و دەمانخوارد.

**٣٧٥٥**- (خ) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: ما عَلِمْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَكَلَ عَلَى سُكْرُجَةٍ قَطُّ، وَلاَ خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ قَطُّ، وَلاَ أَكَلَ عَلَى خِوَانٍ قَطُّ. قِيلَ لِقَتَادَةَ: فَعَلَى ما كَانُوا يَأْكُلُونَ؟ قَالَ: عَلَى السُّفَرِ. [خ٥٣٨٦]

**(خ) لە قەتادەوە لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: وانازانم پێغەمبەر(ﷺ) لە دەوری و قاپی بچووکدا هەرگیز خواردنی خواردبێت، هەروەها هەرگیز نانی سپییان بۆ نەکردووە و هەرگیز لەسەر کورسی و مێز نانی نەخواردووە، وترا بە قەتادە: ئەی لەسەر چی دەیانخوارد؟ وتی: لەسەر سفرەی ڕاخراوی سەر زەوی.**

## ٣- دەروازەی: جێگەی نوستنی پێغەمبەری خودا "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٥٦**- (ق) عَنْ عائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ أَدَمٍ، وَحَشْوُهُ مِنْ لِيفٍ. [خ٦٤٥٦/ م٢٠٨٢]

**(ق) لە عائیشەوە وتی: جێگەی نوستنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە چەرم بوو ناوەخنەکەی لە پەلك و ریشاڵی دارخورما بوو.**

- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: كَانَ وَسَادَةُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، الَّتِي يَتَّكِئُ عَلَيْهَا، مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ.

**لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا عائشە وتی: ئەو سەرینەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شانی لەسەر دادەدا لە چەرم بوو ناواخنەکەی لە پەلك و ریشاڵ بوو.**

## ٤- دەروازەی: خۆشترین خواردنەوە لای پێغەمبەری خودا"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٥٧-** عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الشَّرَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْحُلْوَ الْبَارِدَ. [ت١٨٩٥]

* صحيح.

**له عائیشەوە وتی: خۆشترین خواردنەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) شیرین و سارد بوو.**



# بەشی چوارەم

## لێجێماو و میراتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

### ١- دەروازەی: ئەوەی لە دوای پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بەجێماوە

**٣٧٥٨-** (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ؛ إِلاَّ شَطْرَ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ.
[خ٣٠٩٧/ م٢٩٧٣]

**(ق) لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و لە ماڵەکەمدا شتێك نەبوو جگەرداریك[1] بیخوات جگە لە هەندێك جۆ لە ڕەفەیەکمدا، لێمخوارد تا درێژەی کێشا کاتێك پێوام کۆتایی هات[2].**

**٣٧٥٩-** (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ ـ خَتَنِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَخِي جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الحَارِثِ ـ، قَالَ: ما تَرَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عِندَ مَوْتِهِ دِرْهَماً، وَلاَ دِيناراً، وَلاَ عَبْداً، وَلاَ أَمَةً، وَلاَ شَيْئاً؛ إِلاَّ بَغْلَتَهُ البَيْضَاءَ، وَسِلاَحَهُ، وَأَرْضاً جَعَلَهَا صَدَقَةً. [خ٢٧٣٩]

**لە عەمری کوڕی حاریسەوە، ژنبرای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، برای جوەیرەی کچی حاریس، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کاتی مردنی درهەم و دینار و بەندە و کەنیزەك و شتێکی بە جێنەهێڵا، جگە لە ئێسترێکی سپی و چەکەکەی[3]، زەویەکیش کردی بە صەدەقە.**

[1] واتە: زیندوویەك–و.

[2] ئاماژەی ئەوەی تێدایە خواردن و دانەوێڵە لە ماڵدا هەڵبگیرێ و داپۆشرێ و پێوانە نەکرێت تا فەڕ و بەرەکەتی بەردەوام بێت–و.

[3] واتە: شمشێرەکەی–و.

## ٢- دەروازەی: پەرداخی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

٣٧٦٠-(خ) عَنْ عاصِمٍ الأَحْوَلِ قَالَ: رَأَيْتُ قَدَحَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ، وَكَانَ قَدِ انْصَدَعَ فَسَلْسَلَهُ بِفِضَّةٍ، قالَ: وَهْوَ قَدَحٌ جَيِّدٌ عَرِيضٌ مِنْ نُضَارٍ.
قالَ: قالَ أَنَسٌ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي هَذَا الْقَدَحِ أَكْثَرَ مِنْ كَذَا وَكَذَا.
قَالَ: وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: إِنَّهُ كانَ فِيهِ حَلْقَةٌ مِنْ حَدِيدٍ، فَأَرَادَ أَنَسٌ أَنْ يَجْعَلَ مَكَانَهَا حَلْقَةً مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، فَقَالَ لَهُ أَبُو طَلْحَةَ: لاَ تُغَيِّرَنَّ شَيْئاً صَنَعَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَتَرَكَهُ.
[خ٥٦٣٨ (٣١٠٩)]

**(خ) لە عاصم ئەحوەلەوە وتی: پەرداخەکەی پێغەمبەرم(ﷺ) لای ئەنەسی کوڕی مالیك بینی درزی برد بوو بە زنجیرێك لە زیو چاکیکردبووەوە وتی: پەرداخێکی باشی بەرینبوو لە دار.**

**وتی: ئەنەس وتی: بەم پەرداخە زیاتر لە ئەوەندە و ئەوەندە جار خواردنەوەم بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوە.**

**وتی: ئیبن سیرین وتی: ئەو پەرداخە ئەڵقەیەك لە ئاسنی تێدا بوو، ئەنەس ویستی ئەڵقەیەك لە زێڕ یان لە زیو لە جێگەی دابنێ، ئەبو تەڵحە پێی وت: شتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) درووستی کردووە مەیگۆڕە، بۆیە ئەنەس وازی لێهێنا.**

## ٣- دەروازەی: پۆشاك و نەعل

٣٧٦١- (ق) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عائِشَةُ كِسَاءً وَإِزَاراً غَلِيظاً، فَقَالَتْ: قُبِضَ رُوحُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي هذَيْنِ.          [خ٥٨١٨ (٣١٠٨)/ م٢٠٨٠]

**(ق) لە ئەبی بوردەوە وتی: عائشە پۆشاکێك و ژێر پۆشاکێکی زبری بۆ ئێمە دەرهێنا و وتی: ڕۆحی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم دوانەدا دەرچوو.**

٣٧٦٢- (خ) عَنْ عِيسى بْنِ طَهْمَانَ قَالَ: أَخْرَجَ إِلَيْنَا أَنَسٌ نَعْلَيْنِ جَرْدَاوَيْنِ لَهُمَا قِبَالاَنِ. فَحَدَّثَنِي ثَابِتٌ البُنَانِيُّ بَعْدُ عَنْ أَنَسٍ: أَنَّهُمَا نَعْلاَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم.     [خ٣١٠٧]

(خ) لە عیسای کوڕی تەهمانەوە وتی: ئەنەس جووتێ نەعلی چەرمی بێمووی بۆ ئێمە دەرهێنا کە جێپەنجەیان هەبوو، دواتر سابیت بەنانی لە ئەنەسەوە بۆی باسکردم: ئەو دووانە نەعلی پێغەمبەربوون(ﷺ).

## ٤- دەروازەی: فەرموودەی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" میراتمان لێناگیرێت

٣٧٦٣- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**لاَ يَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِينَاراً، ما تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمُؤْنَةِ عامِلِي، فَهُوَ صَدَقَةٌ**).

[خ٦٧٢٩ (٢٧٧٦)/ م١٧٦٠]

(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(وەرەسەکانم دینار دابەش ناکەن، ئەوەی بەجێمهێڵاوە–لەدوای خەرجی ژنەکانم و تێچووی کارکەرم– بریتییە لە صەدەقە).**

٣٧٦٤- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، أَرَدْنَ أَنْ يَبْعَثْنَ عُثْمَانَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ يَسْأَلْنَهُ مِيرَاثَهُنَّ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَلَيْسَ قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ؟!**).

[خ٦٧٣٠ (٤٠٣٤)/ م١٧٥٨]

(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)،: ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ)–کاتێ پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد– ویستیان عوسمان بنێرن بۆ لای ئەبوبەکر داوای میراتی خۆیانی لێبکەن، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، نەیفەرموو: **(میراتمان لێناگیرێت ئەوەی بەجێما صەدەقەیە؟!).**

## ٥- دەروازەی: خزمایەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

٣٧٦٥- (خ) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قالَ: مَشَيْتُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَعْطَيْتَ بَنِي المطَّلِبِ وَتَرَكْتَنَا، وَنَحْنُ وَهُمْ مِنْكَ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّمَا بَنُو المُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ**). [خ٣١٤٠]

(خ) لە جوبەیری کوڕی موتعیەمەوە، وتی: من و عوسمانی کوڕی عەفان ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ بە کوڕەکانی موتەلیبت بەخشی و وازت لە ئێمە هێنا، ئەوان لە تۆوە لەیەك مەنزیلەتدان؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**بەنی موتەلیب و بەنی هاشم یەك شتن**).



## بەشی پێنجەم

## بەرەکەتی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٦٦-** (خ) عَنْ إِسْرَائِيلَ بْنِ يُونُسَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ قالَ: أَرْسَلَنِي أَهْلِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ. وَقَبَضَ إِسْرَائِيلُ ثَلاَثَ أَصَابِعَ. مِنْ قُصَّةٍ، فِيهَا شَعْرٌ مِنْ شَعْرِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَكَانَ إِذَا أَصَابَ الإِنْسَانَ عَيْنٌ أَوْ شَيْءٌ بَعَثَ إِلَيْهَا مِخْضَبَهُ، فَاطَّلَعْتُ فِي الجُلْجُلِ، فَرَأَيْتُ شَعْرَاتٍ حُمْراً. [خ٥٨٩٦]

**(خ) لە ئیسرائیلی کوڕی یونسەوە، لە عوسمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی مەوهەبەوە، وتی: خانەوادەکەم[1] ڕەوانەی کردم بۆ لای ئوم سەلەمە، پەرداخێکی ئاوی بچووک- ئیسرائل سێ پەنجەی خۆی گرت[2]- لە زیو کە مووی پێغەمبەری(ﷺ) تێدابوو، گەر ئینسانێك چاو یان شتێکی توشبوایە ئاوی ئەوەی بۆ دەنارد تەماشای زەنگۆڵەکەم[3] کرد، چەند تاڵە موویەکی سورم بینی[4].**

- وفي رواية: قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا شَعْراً مِنْ شَعْرِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مَخْضُوباً. [خ٥٨٩٧]

---

(١) واتە: ژنەکەی-و.

(٢) واتە: بچووك وەك سێ سەرە پەنجە-و.

(٣) واتە: ئەو زیوەی مووەکانی پێغەمبەری(ﷺ) تێدا هەڵگیرا بوو-و.

(٤) ئوم سەلەمە مووی پێغەمبەری خودای لە لا بوو، بە زیو ڕووپۆشی مووەکانی کرد بوو، بە قەدەر سێ نووکە پەنجە دەبوو، گەر کەسێك چاو لێیبدابایە یان هەر نەخۆشییەکی هەبوایە پەرداخێك ئاوی دەبرد و ئوم سەلەمە مووەکانی دەخستە ناو و پاشان کەسە نەخۆشەکە بەو ئاوە خۆی دەشۆری و بە بەرەکەتی مووی پێغەمبەر خودا شفای بۆ ڕەوانە دەکرد-و.

لە ڕیوایەتێکدا وتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای ئوم سەلەمە، موویەك لە مووی بۆیاخکراوی[1] پێغەمبەری(ﷺ) بۆ ئێمە دەرهێنا.

**٣٧٦٧**– (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ، فَيُبَرِّكُ عَلَيْهِمْ، وَيُحَنِّكُهُمْ. [م٢١٤٧]

**(م) لە عائیشەوە منداڵان دەهێنران بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەرەکەتی بەسەردا دەهێنان و مەلاشووی دەهەنوون.**

**٣٧٦٨**– (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا صَلَّى الْغَدَاةَ جَاءَ خَدَمُ الْمَدِينَةِ بِآنِيَتِهِمْ فِيهَا الْمَاءُ، فَمَا يُؤْتَى بِإِنَاءٍ إِلاَّ غَمَسَ يَدَهُ فِيهَا، فَرُبَّمَا جَاؤُوهُ فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ فَيَغْمِسُ يَدَهُ فِيهَا. [م٢٣٢٤]

**(م) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە نوێژی بەیانی دەکرد خزمەتکارانی مەدینە بە دەفرەکانیانەوە دەهاتن ئاویان تێدابوو، هەر دەفرێکی بۆ دەهات دەستی تێدا نوقم دەکرد، لەوانەیە لە بەیانییەکی ساردا بیانهێنابایە، ئەو هەر دەستی تێدا نوقم دەکرد.**

**٣٧٦٩**– (ق) عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ، وَرَأَيْتُ بِلاَلاً أَخَذَ وَضُوءَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَرَأَيْتُ النَّاسَ يَبْتَدِرُونَ ذَاكَ الْوَضُوءَ، فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئاً تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ شَيْئاً أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ. [خ٣٧٦ (١٨٧)/ م٥٠٣]

**(ق) لە ئەبی جوحەیفەوە وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە خێمەیەکی سووری چەرمدا بینی، بیلالم بینی ئاوی دەستنوێژەکەی پێغەمبەری خودای(ﷺ)، هێنا خەڵکم دەبینی دەستپێشخەرییان دەکرد بۆ ئاوی دەستنوێژەکە، هەر کەس شتێکی لێوە بەدەست بهێنابایە دەیهێنا بە دەست و دەموچاویدا، هەرکەسێك شتێکی لێوە بەدەست نەکەوتبوایە لە تەڕبوونی دەستی هاوەڵەکی خۆی وەریدەگرت.**

---

[1] بۆیە لە ریوایەتەکەی تردا دەڵێت مووی سوور، دیارە بۆیاخکراو بووە–و.

**٣٧٧٠-** (خ) عَنْ سُفَيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ: حَدَّثَنَا شَبِيبُ بْنُ غَرْقَدَةَ قالَ: سَمِعْتُ الحَيَّ يُحَدِّثُونَ، عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم أَعْطَاهُ دِيناراً يَشْتَرِي لَهُ بِهِ شَاةً، فَاشْتَرَى لَهُ بِهِ شَاتَيْنِ، فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ، وَجَاءَهُ بِدِينَارٍ وَشَاةٍ، فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ، وَكَانَ لَوِ اشْتَرَى التُّرَابَ لَرَبِحَ فِيهِ. [خ٣٦٤٢]

**(خ) لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە: شەبیبی کوڕی غەرقەدە بۆی باسکردین و وتی: گوێم لە گەڕەکێك بوو باسیان دەکرد لە عورووەوە: پێغەمبەر(ﷺ) دینارێکی پێدا تا مەڕێکی بۆ بکرێت، ئەو بەوە دوو مەڕی بۆ کڕی، دانەیەکیانی فرۆشتەوە بە دینارێك و دینارێك و مەڕەکەی هێنایەوە، پێغەمبەر دوعای بەرەکەتی بۆ کرد لە فرۆشتنی، گەر خوڵی بفرۆشتبایە قازانجی تێدا دەکرد.**

**٣٧٧١-** (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ أُمَّ مَالِكٍ كَانَتْ تُهْدِي لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي عُكَّةٍ لَهَا سَمْناً، فَيَأْتِيهَا بَنُوهَا فَيَسْأَلُونَ الأُدْمَ، وَلَيْسَ عِنْدَهُمْ شَيْءٌ، فَتَعْمِدُ إِلَى الَّذِي كَانَتْ تُهْدِي فِيهِ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَتَجِدُ فِيهِ سَمْناً، فَمَا زَالَ يُقِيمُ لَهَا أُدْمَ بَيْتِهَا حَتَّى عَصَرَتْهُ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**عَصَرْتِيهَا**)؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: (**لَوْ تَرَكْتِيهَا مَا زَالَ قَائِماً**). [م٢٢٨٠]

**(م) لە جابرەوە ئوم مالیك لە هیزەیەکی خۆیدا ڕۆنی هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، کوڕەکانی دەهاتن داوای پێخۆریان دەکرد، ئەو شتێکی لەلا نەبوو، دەچوو بۆ ئەو هیزەیەی تیایدا ڕۆنی هەدیەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ڕۆنی تێدا دەبینیەوە، بەردەوام پێخۆریماڵەکەی بوو تا دایگووشی[1]، ئەو هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)[2]، پێغەمبەر فەرمووی:(داتگووشی؟) وتی: بەڵێ، پێغەمبەر فەرمووی: (گەر وازت لێ بهێنابایە بەردەوام تیایدا بوو).**

(١) واتە: بەردەوام ڕۆنی لەو هیزە دەردەهێنا و دەیکرد بە پێخۆری منداڵەکانی تا هیزەکەی داگووشی، ئەوەش بوو بە هۆی نەمانی ڕۆنەکە-و.

(٢) واتە: هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ڕووداوەکەی بۆ باس کرد-و.

**٣٧٧٢**- (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَسْتَطْعِمُهُ، فَأَطْعَمَهُ شَطْرَ وَسْقِ شَعِيرٍ، فَمَا زَالَ الرَّجُلُ يَأْكُلُ مِنْهُ وَامْرَأَتُهُ وَضَيْفُهُمَا، حَتَّى كَالَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (**لَوْ لَمْ تَكِلْهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ، وَلَقَامَ لَكُمْ**). [م٢٢٨١]

[وانظر: **٢٧٣٧**].

**(م) هەر لە جابرەوە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای خۆراکی لێ کرد، ئەویش نیو وەسەق[1] جۆی پێدا وەك خۆراك، بەردەوام ئەو پیاوە و ژنەکەی و میوانەکانی لێیان دەخوارد، تا پێوانەی کرد، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەر پێی فەرموو: (گەر پێوانەت نەکردبایە لێتان دەخوارد و بەردەوام دەبوو بۆتان).**



(١) نیو وەسەق بە نزیکی ٦٥ کیلۆگرامە-و.

# بەشی شەشەم

## تایبەتمەندییەکان

### ١- دەروازەی: فەزڵی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بەسەر تەواوی دروستکراواندا

**٣٧٧٣-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ، وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ). [م٢٢٧٨]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من سەرداری ڕۆڵەکانی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەت، یەکەم کەسم گۆڕ شەق دەبات بۆم، یەکەم شفاعەتکار و یەکەم شفاعەتگیراوم).**

**٣٧٧٤-** (خ) وَعَنْهُ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (بُعِثْتُ مِنْ خَيْرِ قُرُونِ بَنِي آدَمَ، قَرْناً فَقَرْناً، حَتَّى كُنْتُ مِنَ الْقَرْنِ الَّذِي كُنْتُ فِيهِ). [خ٣٥٥٧]

**(خ) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ)** فەرمووی: **(من لە باشترین نەوەکانی ئادەمیزاد ڕەوانەکراوم، نەوە[1] لە دوای نەوە، تا ئەو نەوەی منی تێدام).**

**٣٧٧٥-** (ق) وَعَنْهُ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتاً، فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ؛ إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هذِهِ اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ).
[خ٣٥٣٥/ م٢٢٨٦]

---

[1] نەوەیەك: بریتییە لە ئەهلی سەردەم و ڕۆژگارێك-و.

**(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نموونەی من و نموونەی پێغەمبەرانی پێش من، وەك پیاوێك وایە ماڵێکی دروستکردبێت، چاك و جوانی کردووە، جگە لە جێگەی یەك خشت لە گۆشەیەکدا، خەڵکی بەدەوریدا دەسوڕان و پێیەوە سەرسامبوون و دەیانووت: بۆچی ئەو خشتە دانەنراوە؟ پێغەمبەر فەرمووی: من ئەو خشتەم، من خاتەمی پێغەمبەرانم).**

## ٢- دەروازەی: سەلماندنی خاتەمی پێغەمبەرایەتی

**٣٧٧٦**- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ، فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، مِثْلَ زِرِّ الحَجَلَةِ.

[خ١٩٠/ م٢٣٤٥]

**(ق) لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە، وتی: من و پوورم لە دایکمەوە چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پوورم وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەم خوشکەزایەم ئازارێکی هەیە، پێغەمبەر دەستی بەسەرمدا هێنا و دوعای بەرەکەتی بۆ کردم، پاشان دەستنوێژی گرت و لە دەستنوێژەکەیم خواردەوە، پاشان لە پشتیەوە ڕاوەستام تەماشای خاتەمی پێغەمبەرایەتییەکەم کرد، لە نێوان دوو شانی وەك قەفەسی کەو وابوو.**

## ٣- دەروازەی: موسوڵمانبوونی شەیتانەکەی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٧٧**- (م) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ـ:أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا لَيْلاً. قَالَتْ: فَغِرْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ، فَقَالَ: (**مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ أَغِرْتِ؟**) فَقُلْتُ: وَمَا لِي لاَ يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ**)؟ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَوَ مَعِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) قُلْتُ: وَمَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) قُلْتُ: وَمَعَكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ**). [م٢٨١٥]

(م) لە عائیشەوە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) شەوێك لەلای ئەو چووە دەرەوە، عائیشە وتی: غیرەم لێ کرد[1]، گەڕایەوە و ئەوەی بینی من ئەنجامدا، فەرمووی: (**عائیشە چیتە، ئایە غیرەت کرد؟**) وتم ئەی چۆن کەسێکی وەك من لە کەسێکی وەك تۆ غیرە ناکات؟ پێغەمبەر خودا(ﷺ) فەرمووی: (**ئایە شەیتانەکەت بۆت هاتووە؟**) عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایە شەیتانێکم لەگەڵە؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**بەڵێ**)، وتم لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**بەڵێ**)، وتم لەگەڵ تۆیش، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (**بەڵێ، بەلام پەروەردگارم کۆمەکی کردم بەسەریدا تا موسوڵمان بوو**).

## ٤- دەروازەی: پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" ئەمان بوو بۆ هاوەڵانی

**٣٧٧٨**- (م) عَنْ أَبِي موسى الأشعري قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ثُمَّ قُلْنَا: لَوْ جَلَسْنَا حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَهُ الْعِشَاءَ، قَالَ: فَجَلَسْنَا، فَخَرَجَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: (**مَا زِلْتُمْ هاهُنَا**)؟ قلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ ثُمَّ قُلْنَا: نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَكَ الْعِشَاءَ. قَالَ: (**أَحْسَنْتُمْ أَوْ أَصَبْتُمْ**) قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، وَكَانَ كَثِيراً مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: (**النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ. وَأَنَا أَمَنَةٌ لأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ. وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ**). [م٢٥٣١]

(م) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی مەغریبمان کرد، پاشان وتمان: گەر بتوانین دابنیشین تا نوێژی عیشای لەگەڵ بکەین، وتی: بۆیە دانیشتین، پێغەمبەر هاتەدەرەوە بۆ لامان فەرمووی: (**ئێوە هێشتا هەر لێرەن؟**) وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا نوێژی مەغریبمان لەگەڵ تۆ ئەنجامدا، وتمان دادەنیشین تا نوێژی عیشاشت لەگەڵ ئەنجام بدەین، فەرمووی: (**چاکتان کرد یان -پێکاتان-**) ئەبو موسا وتی: پێغەمبەر سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، ئەو زۆر

[1] واتە: غیرەم لێکرد وامزانی دەچێت بۆ لای ژنەکانی تری-و.

سەری بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان، فەرمووی: **(ئەستێرەکان ئەمانن بۆ ئاسمان، گەر ئەستێرەکان نەمان ئاسمان ئەوەی بەڵێنی پێدراوە دەیهێنێت، من ئەمانم بۆ هاوەڵانم، گەر ڕۆیشتم ئەوەی بەڵێن بە هاوەڵانم دراوە بۆیان دێت، هاوەڵانم ئەمانن بۆ ئومەتم، گەر هاوەڵانم ڕۆیشتن ئەوەی بەڵێن دراوە بۆ ئومەتەکەم دێتە دی).**

## ٥- دەروازەی: تایبەتمەندی جۆراوجۆر

**٣٧٧٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِي الْغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُوراً وَمَسْجِداً، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ)**. لفظ مسلم. [خ٢٩٧٧/ م٥٢٣]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بە شەش شت فەزڵم دراوە بەسەر پێغەمبەراندا، (جوامع الكَلِم[1])م پێدراوە، بەترس سەرخراوم، غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ کراوە، زەویم بۆ پاك و خاوێن کراوە و کراوە بە مزگەوت بۆم، بۆ هەموو خەڵکی رەوانەکراوم، و پێغەمبەران بە من کۆتاییان پێهاتووە) لە فزەکە بۆ موسلیم دەگەڕێتەوە.**



(١) "جوامع الكلم" بریتییە لە کۆکردنەوەی زۆرترین مانای دین و شەریعەت لە کەمترین وشەدا-و.

# بەشی حەوتەم

## موعجیزەکان

### ١- دەروازەی: هەڵقوڵینی ئاو و زۆربوونی لەنێوان پەنجەکانی پێغەمبەری خوداوە "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

**٣٧٨٠-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَحَانَتْ صَلَاةُ الْعَصْرِ، فَالْتَمَسَ النَّاسَ الْوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِوَضُوءٍ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي ذَلِكَ الإِنَاءِ يَدَهُ، وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّؤُوا مِنْهُ. قَالَ: فَرَأَيْتُ الماءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، حَتَّى تَوَضَّؤُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ. [خ١٦٩/ م٢٢٧٩]

**(ق) لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەو وتی: پێغەمبەری خودام بینی(ﷺ) کاتێ نوێژی عەسر هاتە بەرەوە، خەڵکی هەوڵی دەستنوێژگرتنیان دەدا، ئاویان نەدەبینیەوە، ئاوی دەستنوێژ هێنرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی خستە ناو ئەو دەفرە و فەرمانی کرد خەڵکی دەستنوێژی لێبگرن، ئەنەس وتی: ئاوم دەبینی لەژێر پەنجەکانییەوە هەڵدەقولا، تا دواین کەس دەستنوێژی لێگرت.**

**٣٧٨١-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قالَ: كُنَّا نَعُدُّ الآيَاتِ بَرَكَةً، وَأَنْتُمْ تَعُدُّونَهَا تَخْوِيفاً، كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي سَفَرٍ، فَقَلَّ الماءُ، فَقَالَ: (**اطْلُبُوا فَضْلَةً مِنْ مَاءٍ**). فَجَاؤُوا بِإِنَاءٍ فِيهِ ماءٌ قَلِيلٌ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، ثُمَّ قَالَ: (**حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ المُبَارَكِ، وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللهِ**). فَلَقَدْ رَأَيْتُ الماءَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلَقَدْ كُنَّا نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ وَهُوَ يُؤْكَلُ. [خ٣٥٧٩]

**(خ) لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە وتی: ئێمە ئایەتەکانمان بە بەرەکەت دەبینی، ئێوە بەترس و تۆقینی دەزانن، ئێمە لە سەفەرێك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، ئاو کەمبوویەوە، فەرمووی: (زیادەیەك لە ئاو داوابکەن)، دەفرێکیان هێنا کەمێك ئاوی**

تێدا بوو، دەستی خستە ناو دەفرەکە، پاشان فەرمووی: **(وەرن بۆ خۆ پاکردنەوەی موبارەك، بەرەکەت لە خوداوەیە)**. ئاوم بینی لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) هەڵدەقوڵا، ئێمە تەسبیحی خواردنمان گوێ لێ دەبوو کاتێ دەخورا.

## ٢- دەروازەی: زۆربوونی خواردن

**٣٧٨٢**- (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ)**؟ فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُمَّ جاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ، مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ، بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(بَيْعاً أَمْ عَطِيَّةً، أَوْ قالَ: أَمْ هِبَةً)**. قالَ: لاَ، بَلْ بَيْعٌ، فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ، وَأَمَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى. وَايْمُ اللهِ، مَا فِي الثَّلاَثِينَ وَالْمِائَةِ إِلاَّ قَدْ حَزَّ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لَهُ حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كانَ شَاهِداً أَعْطَاهَا إِيَّاهُ، وَإِنْ كانَ غائِباً خَبَأَ لَهُ، فَجَعَلَ مِنْهَا قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلُوا أَجْمَعُونَ وَشَبِعْنَا، فَفَضَلَتِ الْقَصْعَتَانِ، فَحَمَلْنَاهُ عَلَى الْبَعِيرِ، أَوْ كما قالَ. [خ٢٦١٨ (٢٢١٦)/ م٢٠٥٦]

**(ق)** لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: سەد و سی کەس لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، پێغەمبەر فەرمووی: **(ئایە لای کەسێك لە ئێوە خواردن هەیە؟)**، پیاوێك صاعێك[1] لە خواردن یان نزیك بە صاعێکی لا هەبوو، خواردنەکە شێلدرا، پاشان پیاوێکی هاوەڵدانەری درێژی قژ هەڵچوو کە ڕانەمەڕێکی دابووە بەر هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(پێمان دەفرۆشی یان بە بەخشین)**، پیاوەکە وتی: نەخێر، بەڵکو فرۆشتن، پێغەمبەر مەڕێکی لێکڕی، خواردن ئامادەکرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد جگەر و ناوسکەکەی ببرژێنرێت، سوێند بە خودا پێغەمبەر(ﷺ) لە ناوسکی مەڕەکە بەشی ئەو سەد و سی پیاوەی دا، گەر کەسەکە ئامادەبووایە دەیدایە دەستی، گەر ئامادەنەبوایە بۆی هەڵدەگرت، پاشان دوو

---

[1] صاع: لای جمهووری فوقەها جگە لە حەنەفییەکان نزیك بە دوو کیلۆیە-و.

"قصعة"[1]ی لێ ئامادە کرد هەموان لێیان خوارد و تێربوون، لەو دوو قەسعەیە مایەوە، لەسەر حوشترێك هەڵمانگرت، یان بەو جۆرەی کە وتی.

**٣٧٨٣-** (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ . شَكَّ الأَعْمَشُ . قَالَ: لَمَّا كَانَ غَزْوَةُ تَبُوكَ، أَصَابَ النَّاسَ مَجَاعَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ أَذِنْتَ لَنَا فَنَحَرْنَا نَوَاضِحَنَا فَأَكَلْنَا وَادَّهَنَّا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**افْعَلُوا**). قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ فَعَلْتَ قَلَّ الظَّهْرُ، وَلَكِنِ ادْعُهُمْ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، ثُمَّ ادْعُ اللهَ لَهُمْ عَلَيْهَا بِالْبَرَكَةِ، لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَجْعَلَ فِي ذلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**نَعَمْ**).

قَالَ: فَدَعَا بِنِطَعٍ فَبَسَطَهُ، ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، قَالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِكَفِّ ذُرَةٍ، قَالَ: وَيَجِيءُ الآخَرُ بِكَفِّ تَمْرٍ، قَالَ: وَيَجِيءُ الآخَرُ بَكِسْرَةٍ، حَتَّى اجْتَمَعَ عَلَى النِّطَعِ مِنْ ذلِكَ شَيْءٌ يَسِيرٌ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَيْهِ بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ: (**خُذُوا فِي أَوْعِيَتِكُمْ**) قَالَ: فَأَخَذُوا فِي أَوْعِيَتِهِمْ، حَتَّى مَا تَرَكُوا فِي الْعَسْكَرِ وِعَاءً إِلاَّ مَلَؤُوهُ. قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، وَفَضَلَتْ فَضْلَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، لاَ يَلْقَى اللهَ بِهِمَا عَبْدٌ، غَيْرَ شَاكٍّ، فَيُحْجَبَ عَنِ الْجَنَّةِ**). [م٢٧]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، یان ئەبی سەعیدەوە -ئەعمەش شکی بۆ دروستبووە- وتی: کە غەزوەی تەبووك هاتە بەرەوە خەڵکی تووشی برسێتی هاتن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا گەر مۆڵەتمان بدەی حوشترەکان سەرببڕین و لێیان بخۆین و خۆمانی لێبهەنووین[2]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەنجامی بدەن)، وتی: عومەر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، گەر ئەو کارە ئەنجام بدەیت پشتی ولاخمان کەم دەبێتەوە، بەڵکو داوای خواردن و توێشووی زیادەیان لێ بکە، پاشان لە خودا داوای بەرەکەت بکە بەسەریدا بۆ ئەوان، بەڵکو خودا بەرەکەتی تێبخات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ).**

---

[1] "قصعة": دەفرێکی گەورە و بەرینە خواردنی تێدا دەخورێ و تریتی تێدا دەکرێت، زۆرجار لە دار دروست دەکرێت-و.

[2] هەنوین: واتە: بە چەوری و ڕۆنی حوشترە سەربڕاوەکان دەست و سەر و لاقیان چەور بکەن-و.

وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) داوای ڕاخـەرێکی چـەرمی کـرد، پاشـان داوای خواردنـە زیادەکەی ئەوانی کرد، وتی: پیاوێك لاگوێلێ گەنمەشامی دەهێنا، پیاوێکی تر لاگوێلێ خورمای دەهێنا، پیاوێکی تر پارچەیەکی دەهێنـا، تـا شـتێکی کـەم لەسـەر ڕاخـەرە چەرمەکە کۆبوویەوە، وتی: پێغەمبەر خـودا(ﷺ) بەسـەریدا دوعـای بەرەکـەتی کـرد، پاشان فەرمووی: (**لێـی بکەنـە دەفرەکانتـان**)، وتـی: لێیـان کـردە دەفرەکانیـان تـا سوپاکە هەموو دەفرەکانیان پڕکرد، وتی: پاشان لێیان خوارد تا تێربوون و هەندێکی لێمایەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**أشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله، هەر بەندەیەك بەم دوو شایەتییەوە بە خودا بگات شك و گومانی نەبێت، لە بەهەشت بێبەش نابێت**).

## ٣- دەروازەی: هەواڵدان لە داهاتوو

**٣٧٨٤**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: شَهِدْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ لِرَجُلٍ مِمَّنْ يَدَّعِي الإِسْلاَمَ: (**هَذَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ**). فَلَمَّا حَضَرَ الْقِتَالُ قَاتَلَ الرَّجُلُ قِتَالاً شَدِيداً، فَأَصَابَتْهُ جِرَاحَةٌ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، الَّذِي قُلْتَ إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَإِنَّهُ قَدْ قَاتَلَ الْيَوْمَ قِتَالاً شَدِيداً وَقَدْ مَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِلَى النَّارِ**). قَالَ: فَكَادَ بَعْضُ النَّاسِ أَنْ يَرْتَابَ، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذلِكَ إِذْ قِيلَ: إِنَّهُ لَمْ يَمُتْ، وَلكِنَّ بِهِ جِرَاحاً شَدِيداً، فَلَمَّا كَانَ مِنَ اللَّيْلِ لَمْ يَصْبِرْ عَلَى الْجِرَاحِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بِذلِكَ فَقَالَ: (**اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ**). ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَنَادَى بِالنَّاسِ: (**إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَإِنَّ اللهَ لَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ**). [خ٣٠٦٢/ م١١١]

**(ق)** لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خـودا(ﷺ) ئامادەبووین بە پیاوێکی فەرموو-لەوانەی بانگەشـەی ئیسـلامی دەکـرد-: (**ئەمـە لـە ئەهلی ئاگرە**)، کاتێ جەنگان هاتە بەرەوە پیاوەکە بە جەنگانێکی زۆر تونـد جـەنگا، برینێکی تووش هات، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەی کـە فـەرمووت: (**ئەمـە لـە ئەهلی ئاگرە**) ئەمڕۆ بەجەنگانێکی زۆر توند جەنگا و مرد، پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی:

**(بۆ ناو ئاگر)**، وتی: هەندێك خەڵك خەریکبوو دڵ کرمێن بن، کاتێ ئەوان لەو دۆخەدا بوون یەکێك وتی: ئەو نەمردووە، بەڵکو برینێکی سەختی پێوەیە، کە شەو هاتە بەرەوە ئارامی نەگرت لەسەر برینداربوونەکە و خۆی کوشت، بەوە هەواڵەکە درا بە پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: **(الله أکبر، شایەتی دەدەم کە من عەبدی خودا و پێغەمبەری خودام)**، پاشان فەرمانی کرد بە بیلال و بانگیدا بەناو خەڵکدا: **(تەنها نەفسێکی موسوڵمان دەچێتە بەهەشتەوە، خودا پشتیوانی ئەم دینە دەکات بە پیاوێکی فاجیر)**.

**٣٧٨٥-** (ق) وَعَنْهُ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(هَلَكَ كِسْرَى، ثُمَّ لاَ يَكُونُ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَقَيْصَرٌ لَيَهْلِكَنَّ ثُمَّ لاَ يَكُونُ قَيْصَرٌ بَعْدَهُ، وَلَتُقْسَمَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللهِ)**.
[خ٣٠٢٧/ م٢٩١٨]

**(ق) هەر لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (کیسرا تیاچوو، پاش ئەو کیسرای تر نایەت، قەیسەر تیا دەچێت، لە دوای ئەو قەیسەری تر نایەت، ئێوە گەنجینەکانی ئەو دووانە لە ڕێگەی خودادا دابەش دەکەن)**.

**٣٧٨٦-** (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ مُعْتَمِراً، قَالَ: فَنَزَلَ عَلَى أُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ أَبِي صَفْوَانَ، وَكَانَ أُمَيَّةُ إِذَا انْطَلَقَ إِلَى الشَّامِ فَمَرَّ بِالْمَدِينَةِ نَزَلَ عَلَى سَعْدٍ، فَقَالَ أُمَيَّةُ لِسَعْدٍ: انْتَظِرْ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ وَغَفَلَ النَّاسُ انْطَلَقْتَ فَطُفْتَ. فَبَيْنَا سَعْدٌ يَطُوفُ إِذَا أَبُو جَهْلٍ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا الَّذِي يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ؟ فَقَالَ سَعْدٌ: أَنَا سَعْدٌ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: تَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ آمِناً، وَقَدْ آوَيْتُمْ مُحَمَّداً وَأَصْحَابَهُ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَتَلاحَيَا بَيْنَهُمَا، فَقَالَ أُمَيَّةُ لِسَعْدٍ: لاَ تَرْفَعْ صَوْتَكَ عَلَى أَبِي الحَكَمِ، فَإِنَّهُ سَيِّدُ أَهْلِ الْوَادِي. ثُمَّ قَالَ سَعْدٌ: وَاللهِ لَئِنْ مَنَعْتَنِي أَنْ أَطُوفَ بِالْبَيْتِ لأَقْطَعَنَّ مَتْجَرَكَ بِالشَّامِ.

قَالَ: فَجَعَلَ أُمَيَّةُ يَقُولُ لِسَعْدٍ: لاَ تَرْفَعَ صَوْتَكَ، وَجَعَلَ يُمْسِكُهُ، فَغَضِبَ سَعْدٌ فَقَالَ: دَعْنَا عَنْكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم يَزْعَمُ أَنَّهُ قَاتِلُكَ، قَالَ: إِيَّايَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَاللهِ ما يَكْذِبُ مُحَمَّدٌ إِذَا حَدَّثَ. فَرَجَعَ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: أَمَا تَعْلَمِينَ ما قَالَ لِي أَخِي الْيَثْرِبِيُّ؟ قَالَتْ: وَمَا قَالَ؟ قَالَ: زَعَمَ أَنَّهُ سَمِعَ مُحَمَّداً يَزْعُمُ أَنَّهُ قَاتِلِي، قَالَتْ: فَوَاللهِ ما يَكْذِبُ مُحَمَّدٌ. قَالَ:

فَلَمَّا خَرَجُوا إِلَى بَدْرٍ، وَجاءَ الصَّرِيخُ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: أَمَا ذَكَرْتَ ما قَالَ لَكَ أَخُوكَ الْيَثْرِبِيُّ؟ قَالَ: فَأَرَادَ أَنْ لاَ يَخْرُجَ، فَقَالَ لَهُ أَبُو جَهْلٍ: إِنَّكَ مِنْ أَشْرَافِ الْوَادِي فَسِرْ يَوْماً أَوْ يَوْمَيْنِ، فَسَارَ مَعَهُمْ، فَقَتَلَهُ اللهُ. [خ٣٦٣٢]

**(خ)** لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: سەعدی کوڕی مەعاز ڕۆیشت بۆ عەمرە، وتی: بوو بە میوانی ئومەیەی کوڕی خەلەف ئەبی صەفوان، ئومەیە کاتێ دەڕۆیشت بۆ شام و بەپاڵ مەدینەدا تێپەڕیبایە لای سەعد دادەبەزی، ئومەیە بە سەعدی وت: چاوەڕوان بە تا نیوەڕۆ، خەڵکی بێئاگا دەبن و تۆش بڕۆ تەوافێك بکە، کاتێ سەعد تەوافی دەکرد ئەبو جەهلی بینی، وتی: ئەم کەسە کێیە تەوافی کەعبە دەکات؟ سەعد وتی: من سەعدم، ئەبو جەهل وتی: بە ئەمن و ئاسایش تەوافی کەعبە دەکەیت و داڵدەی موحەمەد و هاوڕێکانیتان داوە؟ وتی: بەڵێ، ناکۆکی لە نێوانیان دروستبوو، ئومەیە وتی بە سەعد: دەنگ بەرزمەکەوە بەسەر ئەبی حەکەمدا[1] ئەو سەرداری ئەهلی ئەم شیوەیە، پاشان سەعد وتی: سوێند بە خودا، گەر ڕێگریم لێ بکەی تەوافی بەیت بکەم بازرگانییەکەت بۆ شام کۆتا پێدەهێنم.

وتی: ئومەیە دەیوت بە سەعد: دەنگت بەرزمەکەرەوە، ئەو هەوڵیدەدا سەعد بگرێت، سەعد تووڕە بوو و وتی: تۆش لێمان گەڕێ، من لە موحەمەدم(ﷺ) بیست دەیوت بکوژی تۆیە، ئومەیە وتی: مەبەستی من بوو؟ وتی: بەڵێ، وتی: سوێند بە خودا، موحەمەد درۆ دەکات کاتێ کە قسە دەکات، ئومەیە گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی و وتی: دەزانی برا یەسریبییەکەم چی وت؟ ژنەکەی وتی: چی وت؟ وتی: دەڵێ لە موحەمەدی بیستوە ئەو من دەکوژێت، ژنەکەی وتی: سوێند بە خودا، موحەمەد درۆ ناکات، وتی: کاتێ دەرچوون بۆ بەدر بانگکەر(الصريخ)[2] بۆ جەنگ بانگی کرد،

---

(1) ئەبی حەکەم: بریتییە لە ئەبو جەهل-و.

(2) بانگکەر یان هانابەر(الصريخ) ئەو کەسە بوو هەواڵی بە قورەیش دا محەمەد و هاوەڵانی دەیانەوێ بەر لە کاروانییە بازرگانییەکەی قورەیش بگرن کە ئەبو سوفیانی سەرۆکایەتی دەکرد-و.

ژنەکەی بە ئومەیەی وت: بیرت دێت برا یەسرببیەکەت چی پێ وتی؟ وتی: ئومەیە ویستی نەچێتە دەرەوە، بەڵام ئەبو جەهل پێی وت: تۆ لەسەردارانی ئەم شیوەی، بۆیە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ڕێگە ببڕە، ئەویش لەگەڵیان ڕۆیشت و خودا کوشتی.

## ٤- دەروازەی: حەنینی بنکی دارخورما

**٣٧٨٧-** (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: يَا رَسُولَ اللهِ! أَلاَ أَجْعَلُ لَكَ شَيْئاً تَقْعُدُ عَلَيْهِ، فَإِنَّ لِي غُلاَماً نَجَّاراً. قَالَ: (**إِنْ شِئْتِ**). قَالَ: فَعَمِلَتْ لَهُ الْمِنْبَرَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ الجُمُعَةِ، قَعَدَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الْمِنْبَرِ الَّذِي صُنِعَ، فَصَاحَتِ النَّخْلَةُ الَّتِي كَانَ يَخْطُبُ عِنْدَهَا، حَتَّى كَادَتْ أَنْ تَنْشَقَّ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى أَخَذَهَا فَضَمَّهَا إِلَيْهِ، فَجَعَلَتْ تَئِنُّ أَنِينَ الصَّبِيِّ الَّذِي يُسَكَّتُ، حَتَّى اسْتَقَرَّتْ، قَالَ: (**بَكَتْ عَلَى مَا كَانَتْ تَسْمَعُ مِنَ الذِّكْرِ**). [خ٢٠٩٥ (٤٤٩)]

**(خ)** لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: ژنێك لە ئەنصار وتی بە پێغەمبەری خودا: ئەی پێغەمبەری خودا، شتێکت بۆ دروست نەکەم لەسەری دابنیشیت، غوڵامێکی دارتاشم هەیە؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەگەر دەتەوێ**)، وتی: مینبەرێکی بۆ دروستکرد، کە ڕۆژی جومعە دەهاتە بەرەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەرە دروستکراوەکە دادەنیشت، ئەو درەختە دارخورمایەی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای وتاری دەدا هاواری لێ بەرزبوویەوە تا خەریك بوو شەق ببات، پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی و دارخورماکەی گرت و بە خۆیدا گووشی، دارخورماکە وەك ئەو منداڵەی دەکوڕوزێتەوە و بێدەنگ دەکرێت دەکوڕوزایەوە تا بێدەنگ بوو، پێغەمبەر فەرمووی: (**گریا لەسەر ئەوەی دەیبیست لە زیکر**)[١].

---

[١] کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) مینبەرەکەی لای دارخورماکە گواستەوە دارخورماکە دەستی بە گریان کرد، ئەوەش بۆ ئەو زیکرەی لە پێغەمبەری دەبیست-و.

## ٥- شەقکردنی مانگ

**٣٧٨٨-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ: أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً، فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ. [خ٣٦٣٧/ م٢٨٠٢]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەهلی مەککە داوایان کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایەتێکیان نیشان بدات، پێغەمبەر شەقکردنی مانگی پێ نیشاندان.**

**٣٧٨٩-** (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِلْقَتَيْنِ، فَسَتَرَ الْجَبَلُ فِلْقَةً، وَكَانَتْ فِلْقَةٌ فَوْقَ الْجَبَلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اللَّهُمَّ! اشْهَدْ). [م٢٨٠١]

**(م) لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مانگ بوو بە دوو لەتەوە، چیاکە لەتێکی داپۆشی و لەتەکەی تری لەسەر چیاکە بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودایە تۆ بەشایەت بە).**

- وفي رواية: فقال: (اشْهَدُوا، اشْهَدُوا).

**لە ڕیوایەتێکدا پێغەمبەر فەرمووی: (ئێوە بەشایەت بن، ئێوە بەشایەت بن).**

## ٦- دەروازەی: پاشگەزبوویەك لە ئیسلام زەوی هەڵیدەداتە دەرەوە

**٣٧٩٠-** (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ نَصْرَانِيّاً فَأَسْلَمَ، وَقَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، فَكَانَ يَكْتُبُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَعَادَ نَصْرَانِيّاً، فَكانَ يَقُولُ: ما يَدْرِي مُحَمَّدٌ إلا ما كَتَبْتُ لَهُ، فَأَمَاتَهُ اللهُ فَدَفَنُوهُ، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَقَالُوا: هَذَا فِعْلُ محمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ، نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا فَأَلْقَوْهُ، فَحَفَرُوا لَهُ فَأَعْمَقُوا، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَقَالُوا: هَذَا فِعْلُ محمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ، نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ فَأَلْقَوْهُ، فَحَفَرُوا لَهُ وَأَعْمَقُوا لَهُ فِي الأَرْضِ ما اسْتَطَاعُوا، فَأَصْبَحَ قَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَعَلِمُوا: أَنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ، فَأَلْقَوْهُ.
[خ٣٦١٧/ م٢٧٨١]

(ق) لـە ئەنەسـەوە(خوا لێـی ڕازی بێـت)، پیـاوێکی نەصـرانی موسـوڵمان بـوو، سورەتی (البقرة و آل عمران)ی خوێند، ئەو بۆ پێغەمبەری(ﷺ) دەنووسی، گەڕایـەوە بـۆ نەصـرانی، ئـەو دەیـوت: موحەمـەد تـەنها ئـەوە دەزانێـت بـۆم نوسـیووە، خـودا کەسـەکەی مرانـد و شـاردیانەوە، بـەیانی ڕۆژ بوویـەوە زەوی هەڵیـدابووە دەرەوە، وتیان: ئەمە کاری موحەمەد و هاوەڵانییەتی، کاتێ لـەوان ڕایکـردووە هـاتوون گـۆڕی هاوەڵەکەی ئێمەیان هەڵداوەتەوە و فڕێیانداوە، بۆیە چاڵێکی قوڵتریان بۆ هەڵکەنـد و شاردیانەوە، بەیانی ڕۆژیان لێبوویەوە زەوی فڕێیدابووە دەرەوە، وتیان: ئەمـە کـاری موحەمەد و هاوەڵانییەتی، گۆڕی هاوەڵەکـەی ئێمـەیان هەڵداوەتـەوە و فڕێیانداوەتـە دەرەوە کاتێ لەوان هەڵهاتووە، بۆیە چەندیان توانی چـاڵێکی قوڵتریـان لـە زەوی بـۆ هەڵکەنـد، بـەیانی ڕۆژبوویـەوە و زەوی فڕێیـدابووە دەرەوە، بۆیـە زانیـان ئـەوە لـە خەڵکەوە نییە هەڵدراوەتە دەرەوە.



## بەشی یەکەم

# فەزڵی هاوەڵان و فەزڵی سەدەکەیان

**٣٧٩١**- (ق) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ**). قالَ عِمْرَانُ: لاَ أَدْرِي، أَذَكَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بَعْدَ قَرْنِهِ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْماً يَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلاَ يَفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ**).
[خ٢٦٥١/ م٢٥٣٥]

**(ق)** لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**باشترین سەدەتان ئەم سەدەی منە، پاشان ئەوەی بە دوایاندا دێت، پاشان ئەوەی بەدوایاندا دێت**)، عیمران وتی: نازانم ئایا پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای سەدەکەی خۆی دوو سەدەی باس کرد یان سێ سەدە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**لەدوای ئێوە خەڵکانێك دێن ناپاکی دەکەن و جێی متمانە نین، شایەتی دەدەن و داوای شایەتییان لێ نەکراوە، نەزر دەکەن و وەفای پێناکەن، قەڵەوییان تێدا سەرهەڵدەدات**).

**٣٧٩٢**- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**يَأْتِي زَمَانٌ يَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ، فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ، فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ صَاحِبَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ**). [خ٢٨٩٧/ م٢٥٣٢]

**(ق)** لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**ڕۆژگارێك دێتە بەرەوە کۆمەڵێك لە خەڵك غەزا دەکەن، دەوترێت: ئایا لە نێوان ئێوەدا کەسێك هەیە هاوەڵی پێغەمبەری(ﷺ) کرد بێت؟ دەوترێت: بەڵێ، بۆیە**

**فەتحی بۆ دەکرێت[1]، پاشان ڕۆژگارێك دێت دەوترێت: ئایا لە ناو ئێوەدا کەسێك هەیە هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەری(ﷺ) کرد بێت؟ دەوترێت: بەڵێ، بۆیە فەتحی بۆ دەکرێت، پاشان ڕۆژگارێك دێت دەوترێت: ئایە لەناو ئێوەدا کەسێك هەیە هاوەڵی هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەری کردبێت(ﷺ)؟ دەوترێت: بەڵێ، بۆیە فەتحی بۆ دەکرێت).**

**٣٧٩٣-** (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً، ما بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ).

[خ٣٦٧٣/ م٢٥٤١]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (جنێو مەدەن بە هاوەڵانم، گەر یەکێك لە ئێوە وەکو چیای ئوحد زێڕ ببەخشێت ناگاتە مشتێك و نیوەی مشتێك لە بەخشینی ئەوان).**



---

[1] واتە: بە دوعاکانی سوپاکە سەردەکەوێت و وڵاتیان بۆ فەتح دەبێت-و.

## بەشی دووەم

## فەزڵی ئەنصار

### ١- دەروازەی: خۆشەویستی ئەنصار و پلە و پایەیان

**٣٧٩٤**- (ق) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، أَوْ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**الأَنْصَارُ لاَ يُحِبُّهُمْ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يُبْغِضُهُمْ إِلاَّ مُنَافِقٌ، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللهُ**). [خ٣٧٨٣/ م٧٥]

**(ق)** لە بەرائەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو یان وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**تەنها باوەڕدار ئەنصاری خۆشدەوێت و تەنها دووڕوو ڕقی لە ئەنصارە، هەر کەسێك ئەوانی خۆشبوێت خودا خۆشی دەوێت هەرکەسێك ڕقی لەوانبێت خودا ڕقی لێیەتی**).

**٣٧٩٥**- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ**). [خ١٧/ م٧٤]

**(ق)** لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**نیشانەی ئیمان خۆشەویستی ئەنصارە و نیشانەی دووڕوویی ڕق لە ئەنصارە**).

**٣٧٩٦**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِياً وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ وَادِياً، أَوْ شِعْباً، لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ، أَوْ شِعْبَ الأَنْصَارِ**). [خ٧٢٤٤ (٣٧٧٩)]

**(خ)** لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**گەر کۆچ نەبوایە پیاوێك بووم لە ئەنصار، گەر خەڵکی دۆڵێك بگرنەبەر و ئەنصار دۆڵێك، یان شیوێك بگرێتەبەر، دۆڵەکەی ئەنصار، یان شیوەکەی ئەنصار دەگرمەبەر**).

## ٢- دەروازەی: وەسیێت بە چاکەکردن لەگەڵ ئەنصار

**٣٧٩٧-** (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (**الأَنْصَارُ كَرِشِي وَعَيْبَتِي، وَالنَّاسُ سَيَكْثُرُونَ، وَيَقِلُّونَ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَتَجَاوَزُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ**).

[خ٣٨٠١ (٣٧٩٩)/ م٢٥١٠]

**(ق)** لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**ئەنصار کۆمەڵ و تایبەتانی منن، خەڵکی زۆر دەبن و ئەوان کەم دەبن، لە چاکەکارانیان قبوڵ بکەن و چاوپۆشی لە خراپکارانیان بکەن**).

## ٣- دەروازەی: فەزڵی خانوو و ماڵەکانی ئەنصار

**٣٧٩٨-**(ق) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (**إِنَّ خَيْرَ دُورِ الأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي الحَارِثِ، ثُمَّ بَنِي سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ**). فَلَحِقْنَا سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ نَبِيَّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَيَّرَ الأَنْصَارَ، فَجَعَلَنَا أَخِيراً؟ فَأَدْرَكَ سَعْدٌ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، خُيِّرَ دُورُ الأَنْصَارِ فَجُعِلْنَا آخِراً، فَقَالَ: (**أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الخِيَارِ**).

[خ٣٧٩١ (١٤٨١)/ م: الفضائل ١٣٩٢ (١١)]

**(ق)** لەئەبی حومەیدی ساعیدییەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (**باشترین خانوو و ماڵی ئەنصار خانوو و ماڵی بەنی نەجارە، پاشان عەبدئەشهەل، پاشان خانوو و ماڵی بەنی حارس، پاشان بەنی ساعیدە، لە هەموو خانوو و ماڵەکانی ئەنصاردا خێر هەیە**)، بە سەعدی کوڕی عوبادە گەیشتین، أبو ئوسەید وتی: نابینی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنصاری خێراویی کرد و ئێمەی لە دوایندا دانا؟ سەعد بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، خێر درایە پاڵ خانوو و ماڵەکانی ئەنصار و ئێمە خراینە کۆتاییەوە، پێغەمبەر فەرمووی(ﷺ): (**ئایە بەس نییە بۆ ئێوە لە چاکان بن**).

## ٤- دەروازەی: هاوەڵێکردنی ئەنصار بە چاکە

**٣٧٩٩**-(ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: صَحِبْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي وَهْوَ أَكْبَرُ مِنْ أَنَسٍ. قالَ جَرِيرٌ: إِنِّي رَأَيْتُ الأَنْصَارَ يَصْنَعُونَ شَيْئاً، لا أَجِدُ أَحَداً مِنْهُمْ إِلاَّ أَكْرَمْتُهُ.
[خ٢٨٨٨/ م٢٥١٣]

**(ق) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: هاوەڵی جەریری کوڕی عەبدوڵام کرد، ئەو خزمەتی دەکردم، ئەو لە ئەنەس گەورەتر بوو، جەریر وتی: من ئەنصارم بینی شتێکیان ئەنجام دەدا[1]، هەرکام لەوان ببینمەوە ڕێزی لێدەگرم.**



---

[1] واتە: خزمەتی پێغەمبەریان دەکرد، بۆیە بەو خزمەت کردنەی پێغەمبەر ئەنصارم خۆشدەوێت و خزمەتیان دەکەم-و.

## بەشی سێیەم

# باسی فەزڵی هەندێك لە کۆچکەران

## ١- دەروازەی: فەزڵی ئەبوبەکری صدیق(خوا لێی ڕازی بێت)

٣٨٠٠- (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ قالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا فِي الْغَارِ: لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ تَحْتَ قَدَمَيْهِ لأَبْصَرَنَا، فَقَالَ: (**ما ظَنُّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ بِاثْنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا**). [خ٣٦٥٣/ م٢٣٨١]

**(ق) لە ئەنەسەوە لە ئەبی بەکرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: من لە غارەکەدا[1] بووم، وتم بە پێغەمبەر(ﷺ) گەریەکێك لەوان تەماشای ژێر دوو پێی خۆی بکات ئێمە دەبینێت، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەی ئەبوبەکر، گومانت چییە بە دوو کەس خودا سێهەمیان بێت).**

٣٨٠١- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: (**إِنَّ عَبْداً خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا ما شَاءَ، وَبَيْنَ ما عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ ما عِنْدَهُ**). فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا. فَعَجِبْنَا لَهُ، وَقَالَ النَّاسُ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا الشَّيْخِ، يُخْبِرُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَنْ عَبْدٍ خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَبَيْنَ ما عِنْدَهُ، وَهْوَ يَقُولُ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا! فَكَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم هُوَ الْمُخَيَّرَ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ هُوَ أَعْلَمَنَا بِهِ. [خ٣٩٠٤ (٤٦٦)/ م٢٣٨٢]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر مینبەر دانیشت و فەرمووی: (بەندەیەك خودا سەرپشکی کردووە لە نێوان پێدانی جوانییەکانی دنیا**

---

[1] واتە: غاری سەور کە لە کاتی کۆچ کردن ئەبوبەکر و پێغەمبەر بۆ خۆ حەشاردان تێیچوون-و.

**چەند بخوازێت ئەوەی لای خۆیەتی، ئەوەی هەڵبژارد لە لای خودایە).** ئەبوبەکر گریا و وتی: دایکان و باوکانمان فیدات بێت، ئێمە سەرمان سوڕما، خەڵکی وتی: تەماشای ئەو پیرە بکەن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵدەدات دەربارەی بەندەیەك هەوالّ بدات خودا سەرپشکی کردووە لەنێوان پێدانی جوانییەکانی دنیا و ئەوەی لای خۆیەتی، کەچی ئەو دەڵێت دایکان و باوکان فیدات بێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەرپشکراوەکە بوو، ئەبوبەکر بەوە زاناترینمان بوو.

٣٨٠٢– (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قالَ: أَتَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، قَالَتْ: أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ وَلَمْ أَجِدْكَ؟ كَأَنَّهَا تَقُولُ: المَوْتَ، قَالَ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنْ لَمْ تَجِدِينِي، فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ). [خ٣٦٥٩/ م٢٣٨٦]

**(ق)** لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە، وتی: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر، ئافرەتەکە وتی: ئەی ئەگەر بگەڕێمەوە و تۆم نەبینیوە؟ وەك ئەوەی ئافرەتەکە بلێت: مردن[1]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(گەر منت نەبینییەوە وەرە بۆ لای ئەبوبەکر).**

٣٨٠٣– (ق) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلاَسِلِ، فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: (عائِشَةُ)، فَقُلْتُ: مِنَ الرِّجالِ؟ فَقَالَ: (أَبُوهَا). قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: (ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ). فَعَدَّ رِجالاً. [خ٣٦٦٢/ م٢٣٨٤]

**(ق)** لە عەمری کوڕی عاصەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) وەك ئەمیری سوپای (ذات السلاسل) ڕەوانەی کرد، هاتم بۆ لای و وتم: چ کەسێك زۆر لات خۆشەویستە؟ فەرموی: **(عائیشە)**، وتم: لە پیاوان؟ فەرمووی: **(باوکی)**، وتم: پاشان کێ؟ فەرمووی: **(عومەری کوڕی خەتاب)**، پیاوانێکی ژمارد.

---

[1] واتە: وەك ئەوەی ئافرەتەکە بلێت: ئەی ئەگەر من گەڕامەوە و هاتمەوە بۆ لات و تۆ مردبوویت، ئەوکاتە چی؟–و.

٣٨٠٤- (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، عَاصِباً رَأْسَهُ بِخِرْقَةٍ، فَقَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَمَنَّ عَلَيَّ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ مِنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي قُحَافَةَ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً مِنَ النَّاسِ خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، وَلَكِنْ خُلَّةُ الإِسْلاَمِ أَفْضَلُ، سُدُّوا عَنِّي كُلَّ خَوْخَةٍ فِي هَذَا المَسْجِدِ، غَيْرَ خَوْخَةِ أَبِي بَكْرٍ). [خ٤٦٧]

(خ) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە دەرەوە لەو نەخۆشییەی تیایدا مرد، سەری خۆی بە پەڕۆیەك پێچابوو، لەسەر مینبەر دانیشت، حەمد و سەنای خودای کرد، پاشان فەرمووی: **(لە خەڵكی هیچ كەس بەقەدەر ئەبوبەكری كوڕی ئەبی قوحافە خۆی و ماڵ وسامانی بۆ من تەرخان نەكردووە، گەر خەلیلێكم لە خەڵكدا بگرتبایە ئەبوبەكرم دەكرد بە خەلیل[1]، بەڵام خۆشەویستی ئیسلام باشترینە، هەموو كەلەبەرەكانی[2] ئەم مزگەوتەم لێبگرن جگە لە كەلبەرەكەی ئەبی بەكر).**

٣٨٠٥- (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي مَرَضِهِ: (ادْعِي لِي أَبَا بَكْرٍ وَأَخَاكِ، حَتَّى أَكْتُبَ كِتَاباً، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ وَيَقُولَ قَائِلٌ: أَنَا أَوْلَى، وَيَأْبَى اللهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبَا بَكْرٍ). [م٢٣٨٧]

(م) لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نەخۆشییەكەیدا پێی وتم: **(ئەبوبەكر و براكەتم بۆ بانگ بكە تا نوسراوێك بنووسم، من ترسم هەیە ئاواتخوازێك ئاوات بخوازێت، یەكێك بڵێت: من پێی لە پێشترم[3]، خودا و باوەڕداران تەنها ئەبوبەكریان دەوێت).**

---

(١) خەلیل: بریتییە لە دۆستی گیانی بە گیانی كە گەورەترین خۆشەویستی پێ دەدرێت، ئەوەش دەبێ تەنها بۆ خودا بێت، ئەو باڵاترین دۆستە-و.

(٢) كەلەبەر: ئەو دەرگا و ڕێڕەوانەی دەهاتنەوە سەر مزگەوتەكەی پێغەمبەر-و.

(٣) مەبەست خەلافەتە-و.

٣٨٠٦- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِماً**)؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً**)؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِيناً**)؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضاً**)؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ**).

[م: الزكاة ١٠٢٨ (٨٧)/ فضائل الصحابة ١٠٢٨ (١٢)]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمڕۆ کێ لە ئێوە بەڕۆژووە)؟ ئەبوبەکر وتی: من، فەرمووی: (ئەمڕۆ کێ لە ئێوە شوێنی جەنازەیەك کەوتووە)؟ ئەبوبەکر وتی: من، فەرمووی: (ئەمڕۆ کێ لە ئێوە نانی هەژارێکی داوە)؟ ئەبوبەکر وتی: من، فەرمووی: (ئەمڕۆ کێ لە ئێوە سەردانی نەخۆشێکی کردووە)؟ ئەبوبەکر وتی: من، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمانە لە هەر پیاوێکدا کۆببنەوە دەچێتە بەهەشتەوە).**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان(خوایان لێ ڕازی بێت)

٣٨٠٧- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (**بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُنِي عَلَى قَلِيبٍ عَلَيْهَا دَلْوٌ، فَنَزَعْتُ مِنْهَا ما شَاءَ اللهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ، فَنَزَعَ بِهَا ذَنُوباً أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، وَاللهُ يَغْفِرُ لَهُ ضَعْفَهُ. ثُمَّ اسْتَحَالَتْ غَرْباً، فَأَخَذَهَا ابْنُ الْخَطَّابِ، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيّاً مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ**).

[خ٣٦٦٤/ م٢٣٩٢]

**(ق)** لەئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(کاتێ من خەوتبووم، بینیم لەسەر بیری قەلیب دۆڵچەیەکی[1] لەسەرە، خودا چەندی بوێت من لێم هەڵکێشا، پاشان کوڕەکەی ئەبی قوحافە گرتی دۆڵچەیەك**

[1] دۆڵچە: ئەو دەفرەی ئاوی لە بیر پێ هەڵدەکێشرێت، لە دار یان لە چەرم و لاستیك دروست دەکرێت-و.

**یان دوو دۆڵچەی لێ هەڵکوزی، لە هەڵکوزینەکەیدا لاوازی هەبوو، خودا لە لاوازییەکەی خۆشدەبێت، پاشان بوو بە دۆڵچەیەکی زۆر گەورە، کوڕەکەی خەتاب گرتی و سەرداریکم لە خەڵك نەبینیوە وەك عومەر هەڵکوزێت، تا خەڵکی ئاژەڵەکانیان پاراو کرد و گێڕانیانەوە بۆ مۆڵگاکانی خۆیان).**

٣٨٠٨- (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ: أَنَّهُ تَوَضَّأَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ خَرَجَ، فَقُلْتُ: لأَلْزَمَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، ولأَكُونَنَّ مَعَهُ يَوْمِي هَذَا، قالَ: فَجَاءَ المسْجِدَ، فَسَأَلَ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالُوا: خَرَجَ وَوَجَّه هَاهُنَا، فَخَرَجْتُ عَلَى إِثْرِهِ، أَسْأَلُ عَنْهُ، حَتَّى دَخَلَ بِئْرَ أَرِيسٍ، فَجَلَسْتُ عِنْدَ البَابِ . وَبَابُهَا مِنْ جَرِيدٍ . حَتَّى قَضى رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَاجَتَهُ فَتَوَضَّأَ، فَقُمْتُ إِلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ جالِسٌ عَلَى بِئْرِ أَرِيسٍ وَتَوَسَّطَ قُفَّهَا، وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلاَّهُمَا فِي الْبِئْرِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ فَجَلَسْتُ عِنْدَ البَابِ، فَقُلْتُ: لأَكُونَنَّ بَوَّابَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْيَوْمَ.

فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ فَدَفَعَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: (**ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ**). فَأَقْبَلْتُ حَتَّى قُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ: ادْخُلْ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُبَشِّرُكَ بالجَنَّةِ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَجَلَسَ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَعَهُ فِي الْقُفِّ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ كما صَنَعَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ.

ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، وَقَدْ تَرَكْتُ أَخِي يَتَوَضَّأُ وَيَلْحَقُنِي، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللهُ بِفُلاَنٍ خَيْراً . يُرِيدُ أَخاهُ . يَأْتِ بِهِ، فَإِذَا إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: (**ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ**). فَجِئْتُ فَقُلْتُ: ادْخُلْ، وَبَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالجَنَّةِ، فَدَخَلَ فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْقُفِّ عَنْ يَسَارِهِ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ.

ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللهُ بِفُلاَنٍ خَيْراً يَأْتِ بِه، فَجَاءَ إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَقُلْتُ عَلَى رِسْلِكَ، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله

عليه وسلّم فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ، عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ). فَجِئْتُهُ، فَقُلْتُ لَهُ: ادْخُلْ، وَبَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالجَنَّةِ، عَلَى بَلْوَى تُصِيبُكَ، فَدَخَلَ فَوَجَدَ الْقُفَّ قَدْ مُلِئَ، فَجَلَسَ وُجَاهَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ.

قَالَ سَعِيدُ بْنُ المسَيَّبِ: فَأَوَّلْتُهَا قُبُورَهُمْ. [خ٣٦٧٤/ م٢٤٠٣]

**(ق)** لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە: ئەو لە ماڵەوە دەستنوێژی گرت و پاشان هاتە دەرەوە، وتم[1]: پەیوەست دەبم بە پێغەمبەری خوداوە و(ﷺ)، ئەمڕۆ لەگەڵی دەبم، وتی: هات بۆ مزگەوت و پرسیاری کرد دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ)، وتیان ڕۆیشتووە بۆ دەرەوە و ڕووی لەوێ کردووە، منیش بەدوایدا ڕۆیشتم، پرسیارم دەکرد دەربارەی، تا چووە ناو بیری ئەریس[2]، لە دەرگاکە دانیشتم-دەرگاکەی لە پەلکە دارخورما بوو- تا پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێویستی خۆی تەواو کرد و دەستنوێژی گرت، هەستام چووم بۆ لای، ئەو لەسەر بیری ئەریس دانیشتبوو، لە ناوەڕاستی لێوارەکەی دوو لاقی خۆی دەرخستبوو و بەبیرەکەدا شۆڕی کردبوونەوە، سەلامم لێکرد، پاشان ڕۆیشتم و لەدارگاکە دانیشتم، وتم: ئەمڕۆ دەبم بە دەرگاوانی پێغەمبەری خودا(ﷺ).

ئەبوبەکر هات و پاڵی نا بەدەرگاکەوە، وتم: کێیە؟ وتی: ئەبوبەکر، وتم: هێواش بە[3]، پاشان ڕۆیشتم و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوە ئەبوبەکرە داوای مۆڵەت دەکات، فەرمووی: **(مۆڵەتی بدە و مژدەی بەهەشتی پێ بدە)**، منیش هاتم و تا بە ئەبوبەکرم وت: وەرە ژوورەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) مژدەی بەهەشتت پێ دەدات، ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە و لای ڕاستی پێغەمبەری خوداوە و(ﷺ)-لە لێواری بیرەکە- دانیشت و هەردوو لاقی بە بیرەکەدا شۆڕکردووە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی ئەنجام دابوو، و هەردوو لاقی دەرخست.

---

(١) واتە: ئەبو موسا وتی-و.

(٢) بیری ئەریس: بیر و باخ و سەھەندێ بووە لە مەدینە، ئەو بیرەی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری تێکەوت لە سەردەمی ئیمامی عوسمان و نەدۆزرایەوە.

(٣) واتە: چاوەڕوان بە-و.

پاشان گەڕامەوە و دانیشتم، وازم لە براکەم هێنابوو، دەسنوێژ بگرێت و پێم بگات، وتم: گەر خوا خێری بۆ فلاّن بوێت -مەبەستم براکەم بوو- دەیهێنێت بۆ ئێرە، بینم یەکێك دەرگاکەی جولاّند، وتم کێیە؟ وتی: عومەری کوڕی خەتاب، وتم هێواش بە، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، سەلامم لیّ کرد و وتم: ئەوە عومەری کوڕی خەتابە، داوای مۆڵەت دەکات، فەرمووی: (**مۆڵەتی بدە و مژدەی بەهەشتی پیّ بدە**)، هاتم و وتم: وەرە ژوورەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مژدەی بەهەشتت پیّ دەدات، هاتەژوورەوە و لای چەپی پێغەمبەر و قەراغ بیرەکە دانیشت و هەردوو لاقی بە بیرەکەدا شۆڕکردەوە.

پاشان گەڕامە و دانیشتم و وتم: گەر خودا بۆ فلاّن خێرێکی بوێت دەیهێنێت بۆ ئێرە، کەسێك هات و دەرگاکەی جولاّند، وتم: ئەوە کێیە؟ وتی: عوسمانی کوڕی عەفان، وتم: هێواش بە، هاتم بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەواڵم پێدا، فەرمووی: (**مۆڵەتی بدە و مژدەی بەهەشتی پیّ بدە لەسەر بەڵایەك تووشی دەبێت**)، منیش هاتم بۆ لای و پێم وت: وەرە ژورەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێداوی لەسەر بەڵایەك تووشت دەبێت، هاتە ژوورەوە بینی لێواری بیرەکە پڕبووە، بۆیە لە بەرەکەی تر بەرانبەر پێغەمبەر دانیشت.

سەعیدی کوڕی موسەییەب وتی: من ئەوەم بە گۆڕەکانیان تەئویل کرد.

**٣٨٠٩**- (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ قالَ: صَعِدَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم أُحُداً، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَضَرَبَهُ بِرِجْلِهِ وقالَ: (**اثْبُتْ أُحُدُ، فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدَانِ**). [خ٣٦٨٦ (٣٦٧٥)]

(خ) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوت بە چیای ئوحدا، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانی لەگەڵ بوو، چیاکە ئەوانی هێنایە هەژان، پێغەمبەر بە پیّ کێشای بە چیاکەدا و فەرمووی: (**ئوحد دامەزراو بە، تەنها پێغەمبەرێك یان صدیقێك یان دوو شەهیدت لەسەرە**[1]).

[1] واتە: تەنها پێغەمبەرێك و صدیقێك و دوو شەهیدت لەسەرە-و.

٣٨١٠- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قالَ: كُنَّا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ نَعْدِلُ بِأَبِي بَكْرٍ أَحَداً، ثُمَّ عُمَرَ، ثمَّ عُثْمَانَ، ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم لاَ نُفَاضِلُ بَيْنَهُمْ. [خ٣٦٩٧ (٣٦٥٥)]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە(خوایان لیّ ڕازی بێت)، وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبوبەکرمان بە کەس هاوتا نەدەرکرد، پاشان عومەر، پاشان عوسمان، پاشان هاوەڵانی پێغەمبەرمان(ﷺ) وازلێدەهێنا و فەزڵمان نەدەخستە نێوانیان.**

## ٣- فەزڵی عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی ڕازی بێت)

٣٨١١- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ). قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (الدِّينَ). [خ٢٣/ م٢٣٩٠]

**(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کاتێ من لە خەوتبووم خەڵکیان بۆ خستمە ڕوو و کراسیان لەبەربوو، هەیانبوو دەگەیشتە مەمکی هەیانبوو لە خوار ئەوەوە، عومەری کوڕی خەتابیان بۆ خستمە ڕوو کراسێکی لەبەردابوو ڕایدەکێشا)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، بە چی تەئویلت کرد؟ فەرمووی: (دین).**

٣٨١٢- (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ، فَشَرِبْتُ حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ فِي أَظْفَارِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ). قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (الْعِلْمَ). [خ٨٢/ م٢٣٩١]

**(ق) لەئیبن عومەرەوە(خوایان لیّ ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو فەرمووی: (کاتێ من لە خەوتبووم پەرداخێکیان بۆ هێنام شیری تێدا بوو، لێم خواردەوە تا پاراوبوونەکەم بینی لە نینۆکم دەردەچوو، پاشان زیادەکەم دا بە**

**عومەری کوڕی خەتاب)، وتیان: بە چی تەئویلت کرد، ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: (زانست).**

**٣٨١٣-** (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وُضِعَ عُمَرُ عَلَى سَرِيرِهِ، فَتَكَنَّفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُصَلُّونَ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَجُلٌ آخِذٌ مَنْكِبِي، فَإِذَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ وَقَالَ: ما خَلَّفْتَ أَحَداً أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ. وَايْمُ اللهِ إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَحَسِبْتُ: أَنِّي كُنْتُ كَثِيراً أَسْمَعُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(ذَهَبْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ)**.

[خ٣٦٨٥ (٣٦٧٧)/ م٢٣٨٩]

**(ق) لە ئیبن عەباسەوە، وتی: عومەر خرایە سەر جێگەکەی، خەڵکی دەورەیان لێدا، دوعایان دەکرد و نوێژیان دەکرد بەرلەوەی بەرز بکرێتەوە، من لە ناویاندا بووم، پیاوێك ڕایچڵەکاندم و دەستی بە دوو شانمەوە گرت، بینم عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو، ڕەحمەتی ڕەوانە کرد بۆ عومەر و وتی: لە دوای خۆت کەسێکت بە جێ نەهێڵاوە پێمخۆشبێت بە نموونەی کاری ئەو بەخزمەتی خودا بگەم جگە لە خۆت، سوێند بە خودا، گومان وایە کە خودا بە دوو هەواڵەکەت بگەیەنێت، وادەزانم زۆرجار لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستبێت کە دەیفەرموو: (من و ئەبوبەکر و عومەر ڕۆیشتین، من و ئەبوبەکر و عومەر چووینە ژوورەوە، من و ئەبوبەکر و عومەر هاتینە دەرەوە).**

**٣٨١٤-** (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَعِنْدَهُ نِسَاءٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُكَلِّمْنَهُ وَيَسْتَكْثِرْنَهُ، عالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ، فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ قُمْنَ يَبْتَدِرْنَ الْحِجَابَ، فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ورَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَضْحَكُ، فَقَالَ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللهِ! قالَ: **(عَجِبْتُ مِنْ هؤُلاءِ اللاَّتِي كُنَّ عِنْدِي، فَلَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ ابْتَدَرْنَ الْحِجَابَ)**. قالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ كُنْتَ أَحَقَّ أَن يَهَبْنَ، ثُمَّ قالَ: أَيْ عَدُوَّاتِ أَنْفُسِهِنَّ، أَتَهَبْنَنِي وَلاَ تَهَبْنَ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم؟ قُلْنَ: نَعَم، أَنْتَ أَفَظُّ وَأَغْلَظُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، ما لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكاً فَجّاً؛ إِلاَّ سَلَكَ فَجّاً غَيْرَ فَجِّكَ)**.

[خ٣٢٩٤/ م٢٣٩٦]

(ق) لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، وتی: عومەر داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ژنەکانی لە قورەیش لە لای بوون قسەیان لەگەڵ دەکرد و داوای خەرجی زیادەیان لێ دەکرد و دەنگیان بەرز بووبوویەوە، کاتێ عومەر داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد هەستان و حیجابیان کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) مۆڵەتی عومەری دا و پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێدەکەنی، عومەر وتی: خودا بتهێنێتە پێکەنین ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەر فەرمووی: **(سەرم سوڕدەمێنێت لەو ژنانە کە لەلام بوون، کاتێ کە دەنگی تۆیان بیست حیجابیان کرد)**، عومەر وتی: تۆ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، لەپێشتری لەوەی هەیبەتت لێ بکەن، پاشان وتی: ئەی ئەوانەی دوژمنی نەفسی خۆتانن، هەیبەت لە من دەکەن و هەیبەت لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناکەن؟ وتیان: بەڵێ، تۆ کابرایەکی زبر و وشکتری لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر ڕێگەیەك بگریتە بەر و لە هەر شوێنێك بە شەیتان بگەی، ئەو ڕێگەیەکی تر دەگرێتە بەر جگە لە ڕێگەکەی تۆ)**.

٣٨١٥- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: قَالَ: (إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيما مَضى قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، وَإِنَّهُ إِنْ كَانَ فِي أُمَّتِي هذِهِ مِنْهُمْ فَإِنَّهُ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ).　　[خ٣٤٦٩]

(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: **(لەئومەتانی پێشوو پێشکۆیان(محدَّثون[1]) بوونیان هەبووە، گەر لەم ئومەتەی من لەوانە بوونی هەبێت بریتییە لە عومەری کوڕی خەتاب)**.

## ٤- دەروازەی: فەزڵی عوسمانی کوڕی عەفان(خوا لێی ڕازی بێت)

٣٨١٦- (خ) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ وَحَجَّ الْبَيْتَ، فَرَأَى قَوْماً جُلُوساً، فَقَالَ: مَنْ هؤُلاَءِ الْقَوْمُ؟ فَقَالُوا: هؤُلاَءِ قُرَيْشٌ، قَالَ: فَمَنِ الشَّيْخُ

---

[1] "محدثون" ئەوانەی دڵیان بە نووری پێغەمبەرایەتی پاراو دەبێت و لای خوداوە ئیلهام دەکرێن و گوفتار و کردار و بڕیاریان بەپێی شەرعی خودا دەبێت-و.

فِيهِمْ؟ قَالُوا: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: يَا ابْنَ عُمَرَ، إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ شَيْءٍ فَحَدِّثْنِي: هَلْ تَعْلَمُ أَنَّ عُثْمَانَ فَرَّ يَوْمَ أُحُدٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ: تَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ عَنْ بَدْرٍ وَلَمْ يَشْهَدْ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: تَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ عَنْ بَيْعَةِ الرُّضْوَانِ فَلَمْ يَشْهَدْها؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ.

قَالَ ابْنُ عُمَرَ: تَعَالَ أُبَيِّنْ لَكَ، أَمَّا فِرَارُهُ يَوْمَ أُحُدٍ فَأَشْهَدُ أَنَّ اللهَ عَفَا عَنْهُ وَغَفَرَ لَهُ. وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَدْرٍ فَإِنَّهُ كَانَتْ تَحْتَهُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَكَانَتْ مَرِيضَةً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّ لَكَ أَجْرَ رَجُلٍ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً وَسَهْمَهُ**). وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَيْعَةِ الرُّضْوَانِ، فَلَوْ كَانَ أَحَدٌ أَعَزَّ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ عُثْمَانَ لَبَعَثَهُ مَكَانَهُ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عُثْمَانَ، وَكَانَتْ بَيْعَةُ الرُّضْوَانِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ عُثْمَانُ إِلَى مَكَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِيَدِهِ الْيُمْنَى: (**هٰذِهِ يَدُ عُثْمَانَ**)، فَضَرَبَ بِهَا عَلَى يَدِهِ، فَقَالَ: (**هٰذِهِ لِعُثْمَانَ**)، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: اذْهَبْ بِهَا الآنَ مَعَكَ. [خ٣٦٩٨ (٣١٣٠)]

**(خ) لە عوسمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی مەوهەبەوە، وتی: پیاوێك لە ئەهلی مصر هات و حەجیماڵی خودای کرد، کۆمەڵێك خەڵکی بینی دانیشتبوون، وتی: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەوانە قورەیشن، وتی: لەناو ئەوانەدا کامەیان ڕیش سپییە؟ وتیان: عەبدوڵای کوڕی عومەر، وتی: ئەی کوڕەکەی عومەر، من پرسیاری شتێکت لێ دەکەم بۆم باس بکە: ئایا ئەوە دەزانیت عوسمان ڕۆژی ئوحد هەڵهاتووە؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئایا دەزانیت لە بەدر بزر و نائامادە بوو؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئایا دەزانیت لە بەیعەی ڕیزوان بزر و نامادە بوو؟ وتی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: الله أکبر.**

**ئیبن عومەر وتی: وەرە بۆت ڕۆشن بکەمەوە: هەڵهاتنی لە ڕۆژی ئوحد شایەتی دەدەم کە خودا لێی بووراوە و لێی خۆشبووە[1]، ئامادەنەبوونی لە ڕۆژی بەدر: ئەو کچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژنی بوو و نەخۆش بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: (تۆ پاداشت و بەشی پیاوێك لەوانەت هەیە لەبەدر ئامادە بووە)[2]، ئەوەش**

---

**[1] لە جەنگی ئوحد هەڵهاتن و شکانەکە گشتی بوو، تەنها عوسمان نەبوو ڕوو بە چیاکە هەڵدەهات، لەدوای جەنگی ئوحد خودا ڕازیبوونی خۆی لە هاوەڵان ڕادەگەیەنێت—و.**

**[2] واتە: لە جەنگی بەدر بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە مایەوە و لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نەچووە دەرەوە—و.**

کە لەبەیعەی ڕیزوان ئامادە نەبووە گەر یەکێك لە عوسمان پشتیوانی زۆرتر و زیاتر بوایە لە ناو مەکەییەکان پێغەمبەر ئەوی لە جێگەی عوسمان ڕەوانە دەکرد، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) عوسمانی ڕەوانەکرد، بەیعەی ڕیزوان لە دوای ئەوە بوو عوسمان چوو بۆ مەککە[1]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەدەستی ڕاستی فەرمووی: **(ئەمەش دەستی عوسمان)** دەستی ڕاستی کێشا بە دەستەدەکەی تریدا، فەرمووی: **(ئەمەیان بۆ عوسمان)**، ابن عومەر پێی وت: ئێستا بڕۆ و ئەمە لەگەڵ خۆت ببەرە[2].

**٣٨١٧-** (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مُضْطَجِعاً فِي بَيْتِي، كَاشِفاً عَنْ فَخِذَيْهِ، أَوْ سَاقَيْهِ. فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ، فَأَذِنَ لَهُ، وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَتَحَدَّثَ. ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ فَأَذِنَ لَهُ، وَهُوَ كَذٰلِكَ، فَتَحَدَّثَ. ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَسَوَّى ثِيَابَهُ ـ قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلاَ أَقُولُ ذٰلِكَ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ ـ فَدَخَلَ، فَتَحَدَّثَ. فَلَمَّا خَرَجَ قَالَتْ عَائِشَةُ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ. ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ، فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ! فَقَالَ: **(أَلاَ أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلاَئِكَةُ)**. [م٢٤٠١]

**(م)** لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەماڵەکەی من پاڵیدابوویەوە، دوو ڕانی خۆی-یان دوو لاقی خۆی- دەرخستبوو، ئەبوبەکر داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی دا، ئەو لەهەمان حاڵدا بوو و قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد[3]، پاشان عومەر داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتی دا و ئەو لە هەمان حاڵدا بوو و قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد،

---

(1) پێش بەیعەی ڕیزوان پێغەمبەر(ﷺ) عوسمانی ڕەوانە کرد بۆ مەککە تا دانوستان لەگەڵ قورەیش بکات، ئەو لەناو قورەیشدا کەسوکار و پشتیوانی زۆر بوو و نەیاندەتوانی دەستدرێژی بکەنە سەری، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی هەڵبژارد بۆ ئەو کارە-و.

(2) واتە: ئەم ڕۆشن کردنەوانە دەربارەی عوسمان(خوا لێی ڕازی بێت) ببەرەوە بۆ مصر کە بەهۆی بەرهەڵستکاری هەندێ لە خەڵکەکە دژ بە والییەکەی عوسمان قسەی ناڕاستیان دەکرد و گومانی خراپیان لەسەر عوسمان بۆ دروست بووبوو-و.

(3) واتە: ئەبوبەکر قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد و پاشان ڕۆیشت، وەك لە ڕیوایەتێکی موسلیمدا هاتووە-و.

پاشان عوسمان داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشت و پۆشاکەکانی خۆی ڕێککرد، موحەمەد وتی: من ناڵێم ئەوە لەیەك ڕۆژدا بووە[1]، عوسمان هاتە ژوورەوە و قسەی کرد، کاتێ چووە دەرەوە، عائیشە وتی: ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە لەگەڵی گەرم نەبووی و باکێکت پێی نەبوو، پاشان عومەر هاتە ژوورەوە لەگەڵی گەرم نەبووی و باکێکت پێی نەبوو، پاشان عوسمان هاتە ژوورەوە دانیشتیت و پۆشاکەکانت ڕێککرد؟! پێغەمبەر فەرمووی: (**ئایا لەپیاوێك شەرم نەکەم فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن؟!**).

## ٥- دەروازەی: فەزڵی عەلی(خوا لێی ڕازی بێت)

**٣٨١٨**- (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: (**لأُعْطِيَنَّ هذِهِ الرَّايَةَ غداً رَجُلاً يَفْتَحُ اللهُ عَلَى يَدَيْهِ، يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ**). قَالَ: فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا؟ فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كُلُّهُمْ يَرْجُو أَنْ يُعْطَاهَا، فَقَالَ: (**أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ**)؟ فَقِيلَ: هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ، قالَ: (**فَأَرْسِلُوا إِلَيْهِ**). فَأُتِيَ بِهِ، فَبَصَقَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ، فَبَرَأَ حَتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ، فَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا؟ فَقَالَ: (**انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللهِ فِيهِ. فَوَاللهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِداً، خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ**). [خ٤٢١٠ (٢٩٤٢)/ م٢٤٠٦]

**(ق) لەسەهلی کوڕی سەعدەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی خەیبەر فەرمووی: (سبەینێ بەیداخەکە دەدەمە دەست پیاوێك خودا لەسەر دوو دەستی ئەو فەتح دەکات[2]، ئەو پیاوە خودا و پێغەمبەری خودای خۆشدەوێت و**

---

[1] موحەمەد کە یەکێکە لە ڕاوییەکان دەڵێت: من ناڵێم ئەو سێ هاتنە لە یەك ڕۆژدا بووە، بەڵکو لە چەند ڕۆژێکدا ئەوە ڕوویداوە-و.

[2] واتە: قەڵاکە فەتح دەکات-و.

**خودا و پێغەمبەری خوداش ئەویان خۆشدەوێت)**، وتی: خەڵکی شەو مانەوە باسی ئەوەیان دەکرد و لەوەدا ڕۆچووبوون: بەیداخەکە دەدرێتە دەست کامیان؟ کاتێ خەڵکەکە ڕۆژی لێبوویەوە بەیانییەکەی هاتن بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، هەموویان رجایان وابوو بەیداخەکەیان پێ بدرێت، پێغەمبەر فەرمووی: (**عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە کوێیە**)؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەو دوو چاوی ئازار دەکات، فەرمووی: (**بنێرن بە دوایدا**)، عەلی هێنرا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) تفی کردە دوو چاوی و دوعای بۆ کرد، چاوەکانی چاك بوونەوە وەك ئەوەی هیچ ئازاریان پێوە نەبێت، بەیداخەکەی دایە دەستی، عەلی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بجەنگم لەگەڵیان تا وەك ئێمە بن؟[1]، فەرمووی: (**جێبەجێی بکە بە هێواشی خۆت، تا دادەبەزییە مەیدانەکەیان، پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام، هەواڵیان پێ بدە بەوەی تیایدا حەقی خودا لەسەریان پێویستە، سوێند بە خودا، گەر تەنها یەك پیاو لەسەر دەستی تۆ خودا هیدایەتی بدات باشترە بۆ تۆ لە گەلە حوشتری سوور و مەزن**).

٣٨١٩- (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم خَرَجَ إِلَى تَبُوكَ، وَاسْتَخْلَفَ عَلِيًّا، فَقَالَ: أَتُخَلِّفُنِي فِي الصِّبْيَانِ وَالنِّسَاءِ؟ قَالَ: (أَلاَ تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسى، إِلاَّ أَنَّهُ لَيْسَ نَبِيٌّ بَعْدِي). [خ٤٤١٦ (٣٧٠٦)/ م٢٤٠٤]

**(ق)** لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوو بۆ تەبووك، عەلی لە دوای خۆی کردە جێنیشتن، عەلی وتی: ئایە لەگەڵ منداڵ و ژنانان بەجێمدەهێڵیت؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**ئایە ڕازی نابیت مەنزیلەتت لە منەوە وەك مەنزیلەتی هارون بێت لە موسا جگە لەوەی کە پێغەمبەر نییە لەدوای من؟**).

٣٨٢٠- (م) عَنْ زِرٍّ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِلَيَّ: (أَنْ لاَ يُحِبَّنِي إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يُبْغِضَنِي إِلاَّ مُنَافِقٌ). [م٧٨]

---

[1] واتە: تا موسڵمان دەبن-و.

(م) لە زیرەوە، وتی: عەلی وتی: سوێند بەو کەسەی تۆوی تەقاندووە و مرۆڤی درووست کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: **(تەنها باوەڕدار منی خۆشدەوێت و تەنها دووڕوو ڕقی لێمە)**.

**٣٨٢١**- (م) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَوْماً فِينَا خَطِيباً، بِمَاءٍ يُدْعَى خُمًّا، بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَوَعَظَ وَذَكَّرَ. ثُمَّ قَالَ: **(أَمَّا بَعْدُ؛ أَلاَ أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ. وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ: أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللهِ، وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ)** فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللهِ، وَرَغَّبَ فِيهِ. ثُمَّ قَالَ: **(وَأَهْلُ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي. أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي. أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي)**. فَقَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: وَمَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ يَا زَيْدُ، أَلَيْسَ نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ؟ قَالَ: نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، وَلكِنْ أَهْلُ بَيْتِهِ مَنْ حُرِمَ الصَّدَقَةَ بَعْدَهُ. قَالَ: وَمَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُمْ آلُ عَلِيٍّ، وَآلُ عَقِيلٍ، وَآلُ جَعْفَرٍ، وَآلُ عَبَّاسٍ. قَالَ: كُلُّ هؤُلاَءِ حُرِمَ الصَّدَقَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ. [م٢٤٠٨]

(م) لەزەیدی کوڕی ئەرقەمەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك لەناوماندا بە پێوە وەستا و وتاری بۆ داین، نزیك بە ئاوێك پێی دەوترا: "خوم[(١)]" لە نێوان مەککە و مەدینە، حەمد و سەنای خودای کرد و ئامۆژگاری کرد و بیرهێنانەوەی کرد، پاشان فەرمووی: **(پاشان، دەزانن ئەی خەڵکینە من مرۆڤێکم خەریکە نێردراوی پەروەردگارم بێت و وەڵامی بدەمەوە، من لەناو ئێوەدا دوو شتە قورسەکە بەجێدەهێڵم: یەکەمیان: کتێبەکەی خودایە، هیدایەت و نووری تێدایە، بە کتێبەکەی خودا کار بکەن و دەستی پێوەبگرن)**، هانیدا بۆسەر کتێبەکەی خودا و حەزی تێدا دروست کرد[(٢)]، پشان فەرمووی: **(هەروەها ئەهل و بەیتم[(٣)]، خوداتان بیر دەخەمەوە دەربارەی ئەهل و بەیتم، خوداتان بیر دەخەمەوە دەربارەی ئەهل و بەیتم، خوداتان بیر دەخەمەوە دەربارەی ئەهل و بەیتم)** حوسەین وتی: ئەهل و

(١) بە "غەدیر خوم" بەناوبانگە-و.
(٢) واتە: تەرغیبی گوێگرانی کرد بۆ دەستگرتن بە قورئانەوە و کار پێ کردنی-و.
(٣) ئەمە بریتییە لە دووەمیان-و.

بەیتی ئەو کێیە ئەی زەید؟ ئایا ژنەکانی ئەهل و بەیتی ئەون؟ وتی: ژنەکانی لە ئەهل و بەیتی ئەون، بەڵام ئەهل و بەیتی ئەو ئەو کەسەیە لە دوای ئەو صەدەقەی لێ حەرامە، وتی: ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە ئالی عەلی و ئالی عوقەیل و ئالی جەعفەر و ئالی عەباسن، وتی: هەموو ئەوانە صەدەقەیان لێ حەرامە؟ وتی: بەڵێ.

## ٦- دەروازەی: سەروەریەکانی حەسەن و حوسەین(خوایان لێ رازی بێت)

**٣٨٢٢-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، والحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ عَلَى عاتِقِهِ، يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ، فَأَحِبَّهُ). [خ٣٧٤٩/ م٢٤٢٢]

**(ق)** لە بەرائەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەرم بینی(ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی لەسەر شان بوو و دەیفەرموو: (**خودایە، من خۆشمدەوێت تۆیش خۆشتبوێت**).

**٣٨٢٣-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيِّ ﷺ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم فِي طَائِفَةِ النَّهَارِ، لاَ يُكَلِّمُنِي وَلاَ أُكَلِّمُهُ، حَتَّى أَتَى سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعَ، فَجَلَسَ بِفِنَاءِ بَيْتِ فَاطِمَةَ، فَقَالَ: (أَثَمَّ لُكَعُ، أَثَمَّ لُكَعُ). فَحَبَسَتْهُ شَيْئاً، فَظَنَنْتُ أَنَّهَا تُلْبِسُهُ سِخَاباً أَوْ تُغَسِّلُهُ، فَجَاءَ يَشْتَدُّ حَتَّى عَانَقَهُ وَقَبَّلَهُ، وَقَالَ: (اللَّهُمَّ أَحِبَّهُ، وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّهُ). [خ٢١٢٢/ م٢٤٢١]

**(ق)** لەئەبی هورەیرەی دەوسییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لە تاقی بەیانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە، قسەی لەگەڵ نەکردم و قسەم لەگەڵ نەکرد تا هات بۆ بازاڕی بەنوقەینوقاع، لەتەنیشتماڵەکەی فاتیمە دانیشت، فەرمووی: (**ئایا وردیلەکان لەوێن، ئایا وردیلەکان لەوێن؟**) شتێك فاتیمەی دواخست، وا گومانم برد فاتیمە میسك و مێخەکی لە مل بکات[١] یان بیشۆریت، بەپەلە هات[٢] و کردییە باوەش و ماچی کرد و فەرمووی: (**خودایە ئەو کەسەی خۆشیدەوێت خۆشتبوێت**).

---

(١) واتە: بۆنخۆشی بکات ئەوجا بیهێنێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)-و.

(٢) واتە: حەسەن هات-و.

**٣٨٢٤-** (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ أَشْبَهَ بِالنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم مِنَ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ. [خ٣٧٥٢]

**(خ) لە ئەنەسەوە، وتی: حەسەنی کوڕی عەلی لە هەموو کەس زیاتر بە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو.**

**٣٨٢٥-** (خ) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى الْمِنْبَرِ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ إِلَى جَنْبِهِ، وَهْوَ يُقْبِلُ عَلَى النَّاسِ مَرَّةً وَعَلَيْهِ أُخْرَى، وَيَقُولُ: **(إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ المُسْلِمِينَ)**. [خ٢٧٠٤]

**(خ) لە ئەبی بەکرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)[1]، وتی: پێغەمبەری خودام(ﷺ) لەسەر مینبەر بینی حەسەنی کوڕی عەلی لە تەنیشتیبوو، ئەو جارێك ڕووی لە خەڵکەکە دەکرد و جارێکك ڕووی لە حەسەن دەکرد، دەیفەرموو: (ئەم کوڕەم سەرداره، بەڵکو خودا سوڵحی نێوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسوڵمانی پێ بکات).**

**٢٨٢٦-** (خ) عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ قَالَ: كُنْتُ شَاهِداً لِابْنِ عُمَرَ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ، فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ: مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، قَالَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا، يَسْأَلُنِي عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ، وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا)**. [خ٥٩٩٤ (٣٧٥٣)]

**(خ) لە ئیبن ئەبی نوعمەوە، وتی: لای ئیبن عومەر ئامادەبووم، پیاوێك پرسیاری خوێنی مێشی لێ کرد، ئیبن عومەر وتی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتی: خەڵکی عێراقم، ئیبن عومەر وتی: تەماشای ئەمە بکەن، پرسیاری خوێنی مێشم لێ دەکات، ئەوان کوڕەکەی پێغەمبەریان(ﷺ)کوشت، گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو: (ئەو دووانە ڕێحانەی منن لە دنیا).**

---

[1] ئەبی بەکرە(أبي بكرة) یەکێکە لە هاوەڵان و جیاوازە لە ئەبی بەکر(أبي بكر) کە خەلیفەی خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەری خودایە -و.

٣٨٢٧- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﵁ قَالَ: ارْقُبُوا مُحَمَّداً صلّى الله عليه وسلّم فِي أَهْلِ بَيْتِهِ. [خ٣٧١٣]

**(خ) لە ئیبن عومەرەوە، لە ئەبی بەکرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: چاودێری موحەممەد(ﷺ) بکەن لە خانەوادەکەی[1].**

٣٨٢٨-(م) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم غَدَاةً وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ، مِنْ شَعْرٍ أَسْوَدَ. فَجَاءَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ فَأَدْخَلَهُ. ثُمَّ جَاءَ الْحُسَيْنُ فَدَخَلَ مَعَهُ. ثُمَّ جَاءَتْ فَاطِمَةُ فَأَدْخَلَهَا. ثُمَّ جَاءَ عَلِيٌّ فَأَدْخَلَهُ. ثُمَّ قَالَ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾[الأحزاب:٣٣]. [م٢٤٢٤]

**(م) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر بەیانییەکیان چووە دەرەوە و پۆشاکێکی "مِرْط مُرَحَّل"[2]"ی لە مووی ڕەش لەبەردابوو، حەسەنی کوڕی عەلی هات و هێنایە ژوورەوە، پاشان حوسێن هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، پاشان فاتیمە هات و هێنایە ژوورەوە، پاشان عەلی هات و هێنایە ژوورەوە، پاشان فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾[الأحزاب:٣٣].**

## ٧- دەروازەی: سەروەرییەکانی جەعفەر(خوا لێی ڕازی بێت)

٣٨٢٩- (خ) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِجَعْفَرٍ: (أَشْبَهْتَ خَلْقِي وخُلُقِي). [خ٤٢٥١]

**(خ) لەبەرائی کوڕی عازیبەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بە جەعفەری فەرموو: (لە شێوە و لە ڕەوشتدا لە من دەچیت).**

---

(١) واتە: پارێزگاری لە حورمەتیان بکەن و قسەیان پێ مەڵێن و ئازاریان مەدەن-و.

(٢) "مرط مرحل": جۆرە پۆشاکێکی یەمەنی خەتخەتە-و.

**٣٨٣٠**- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَقُولُونَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَإِنِّي كُنْتُ أَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِشِبَعِ بَطْنِي، حِينَ لاَ آكُلُ الخَمِيرَ، وَلاَ أَلْبَسُ الحَبِيرَ، وَلاَ يَخْدُمُنِي فُلاَنٌ وَلاَ فُلاَنَةُ، وَكُنْتُ أُلْصِقُ بَطْنِي بِالحَصْبَاءِ مِنَ الجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لأَسْتَقْرِئُ الرَّجُلَ الآيَةَ، هِيَ مَعِي، كَيْ يَنْقَلِبَ بِي فَيُطْعِمَنِي، وَكَانَ أَخْيَرَ النَّاسِ لِلْمَسَاكِينِ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، كَانَ يَنْقَلِبُ بِنَا فَيُطْعِمُنَا ما كانَ فِي بَيْتِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ لَيُخْرِجُ إِلَيْنَا الْعُكَّةَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ، فَنَشُقُّهَا فَنَلْعَقُ ما فِيهَا. [خ٣٧٠٨]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت): خەڵکی دەیانوت: ئەبو هورەیرە فەرموودە زۆر دەڵێت، من بۆ تێر کردنی سکم بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لکابووم، کاتێ خواردنی خۆشم نەدەخوارد و پۆشاکی جوانم نەدەپۆشی و فلان پیاو و فلان ژن خزمەتیان نەدەکردم، لە برسان بەردم دەنا بەسکی خۆمەوە، داوای خوێندنەوەی ئایەتێکم لە پیاوێك دەکرد، ئایەتەکەم لەلا بوو تا ئاوڕ بداتەوە بە لامدا و خواردم پێ بدات، بەئاگاترین کەس بۆ هەژاران جەعفەری کوڕی ئەبی تالب بوو، ئەو بەلاماندا تێدەپەڕی و ئەوەی لە ماڵەکەیدا بوو دەرخواردی ئێمەی دەدا، تەنانەت ئەو هیزەی کە هیچی تێدا نەمابوو بۆ ئێمەی دەهێنایە دەرەوە، ئێمەش دەمانگوشی و ئەوەی تێیدا بوو بە پەنجە دەمانلێسایەوە.**

## ٨- دەروازەی: سەروەرییەکانی زوبەیری کوڕی عەوام(خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٣١**- (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: نَدَبَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم النَّاسَ يَوْمَ الخَنْدَقِ، فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، قالَ: النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا، وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ)**.

[خ٢٩٩٧ (٢٨٤٦)/ م٢٤١٥]

**(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: ڕۆژی خەندەق پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە خەڵکی کرد یەکێکیان خۆی تەرخان بکات بۆ چوونە ناو قورەیش، زوبەیر وتی: من، پاشان داوای لێکردن و زوبەیر وتی: من، پاشان داوای**

لێكردن و زوبەیر وتی: من، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(هەر پێغەمبەرێك حەواری**[1] **خۆی هەیە، حەواری من بریتییە لە زوبەیر)**.

**٣٨٣٢**– (خ) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالُوا لِلزُّبَيْرِ يَوْمَ الْيَرْمُوكِ: أَلاَ تَشُدُّ فَنَشُدُّ مَعَكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي إِنْ شَدَدْتُ كَذَبْتُمْ، فَقَالُوا: لاَ نَفْعَلُ. فَحَمَلَ عَلَيْهِمْ حَتَّى شَقَّ صُفُوفَهُمْ، فَجَاوَزَهُمْ وَمَا مَعَهُ أَحَدٌ، ثُمَّ رَجَعَ مُقْبِلاً، فَأَخَذُوا بِلِجَامِهِ، فَضَرَبُوهُ ضَرْبَتَيْنِ عَلَى عاتِقِهِ، بَيْنَهُمَا ضَرْبَةٌ ضُرِبَهَا يَوْمَ بَدْرٍ.
قالَ عُرْوَةُ: كُنْتُ أُدْخِلُ أَصَابِعِي فِي تِلْكَ الضَّرَبَاتِ أَلْعَبُ وَأَنَا صَغِيرٌ. قالَ عُرْوَةُ: وَكَانَ مَعَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ يَوْمَئِذٍ، وَهْوَ ابْنُ عَشْرِ سِنِينَ، فَحَمَلَهُ عَلَى فَرَسٍ، وَوَكَّلَ بِهِ رَجُلاً.
[خ٣٩٧٥ (٣٧٢١)]

**(خ) لە عوروەی كوڕی زوبەیرەوە: ڕۆژی یەرمووك هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتیان بە زوبەیر، ئایا توندنابییەوە و پەلاماری هاوەڵدانەران نادەی و ئێمەش لەگەڵت پەلامار بدەین و توندببینەوە؟ زوبەیر وتی: گەر من توندببمەوە و پەلاماربدەم ئێوە درۆدەكەن**[2]**، وتیان: ئەو كارە ناكەین، زوبەیر پەلامارییدان تا ڕیزەكانی شەق كردن لەوان تێپەڕی و كەسی لەگەڵ نەبوو، پاشان گەڕایەوە ڕوو بە ڕۆمەكان، ڕۆمەكانیش رەشۆی ئەسپەكەیان گرت و دوو لێدانیان لە شانی دا، لە نێوان ئەو دوو لێدانەدا لێدانێك هەبوو لە ڕۆژی بەدر لێی درابوو، عوروە وتی: من منداڵ بووم پەنجەكانم دەخستە نێوان ئەو شوێنە لێدراوانە و یارم پێ دەكردن، هەروەها عورۆە وتی: لەو ڕۆژەدا عەبدوڵای كوڕی زوبەیری لەگەڵ بوو، ئەو تەمەنی دە ساڵان بوو، سواری ئەسپێكی كرد بوو، پیاوێكی پێ تایبەت كرد بوو.**

**٣٨٣٣**– (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم كَانَ عَلَى جَبَلِ حِرَاءٍ، فَتَحَرَّكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اسْكُنْ حِرَاءُ، فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ**

---
[1] مانای هاوەڵ و سەرخەری هەیە–و.
[2] واتە: ئێوە كارەكە ئەنجام نادەن–و.

شَهِيدٌ). وعَلَيْهِ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ. [م٢٤١٧]

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر چیای حیراء بوو، چیاکە هاتە لەرزین، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئارام بە، ئەی حیراء، تەنها پێغەمبەرێك یان صدیقێك یان شەهیدێکت لەسەرە)، پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و تەلحە و زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی(خوایان لێ ڕازی بێت) لەسەر بوو.**

## ٩- دەروازەی: سەروەرییەکانی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا(خوا لێی رازی بێت)

٣٨٣٤- (ق) عَنْ أَبِي عُثمانَ النَّهْدِيِّ قالَ: لَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فِي بَعْضِ تِلْكَ الأَيَّامِ الَّتِي قاتَلَ فِيهِنَّ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، غَيْرُ طَلْحَةَ وَسَعْدٍ. عَنْ حَدِيثِهِمَا. [خ٣٧٢٢، ٣٧٢٣/ م٢٤١٤]

**(ق) لە ئەبی عوسمانی نەهدییەوە وتی: لە یەکێك لەو ڕۆژانە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) تیایدا جەنگا، جگە لە تەڵحە و سەعد کەس لەگەڵی نەماوەتەوە[1]، لە خۆیانەوە بۆم باس کراوە.**

٣٨٣٥- (خ) عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حازِمٍ قالَ: رَأَيْتُ يَدَ طَلْحَةَ الَّتِي وَقَى بِهَا النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَدْ شَلَّتْ. [خ٣٧٢٤]

**(خ) لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە وتی: دەستی تەڵحەم بینی کە دەستی پێغەمبەری(ﷺ) پێ پاراستبوو تووشی شەلەل هاتبوو.**

- زاد في رواية: يَوْمَ أُحُدٍ. [خ٤٠٦٣]

**لە ڕیوایەتێکدا ئەمە زیادکراوە: لە ڕۆژی ئوحد.**

---

[1] مەبەستیان لە یەکێك لەو ڕۆژانە غەزوەی ئوحد بووە-و.

## ١٠- دەروازەی: سەروەرییەکانی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس(خوا لێی ڕازی بێت)

٣٨٣٦–(ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَرِقَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَالَ: (لَيْتَ رَجُلاً صَالِحاً مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ) ! إِذْ سَمِعْنَا صَوْتَ السِّلاَحِ، قالَ: (مَنْ هَذَا) ؟ قالَ: سَعْدٌ يَا رَسُولَ اللهِ، جِئْتُ أَحْرُسُكَ، فَنَامَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم حَتَّى سَمِعْنَا غَطِيطَهُ.

[خ٧٢٣١ (٢٨٨٥)/ م٢٤١٠]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: شەوێك پێغەمبەر(ﷺ) خەوی زڕابوو فەرمووی: (خۆزگە پیاوێکی صالح لە هاوەڵانم ئەم شەو پاسەوانی دەکردم)، گوێمان لە دەنگی چەك بوو فەرمووی: (ئەوە کێ یە)؟ سەعد وتی: سەعدە، ئەی پێغەمبەر خودا، هاتووم پاسەوانیت بکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەوت، تا گوێم لە پرخەی بوو.**

٣٨٣٧– (ق) عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قالَ: ما سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم جَمَعَ أَبَوَيْهِ لأَحَدٍ؛ إِلاَّ لِسَعْدِ بْنِ مالِكٍ، فَإِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ أُحُدٍ: (يَا سَعْدُ ارْمِ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي).

[خ٤٠٥٩ (٢٩٠٥)/ م٢٤١١]

**(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: نەمبیستوە لە پێغەمبەر بۆ هیچ کەس دایك و باوکی کۆبکاتەوە لە بەقوربان کردندا جگە لە سەعدی کوڕی مالیك، من ڕۆژی ئوحد گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (ئەی سەعد، تیریان تێتەقێنە، دایك و باوکم فیدات بێت).**

٣٨٣٨– (خ) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قالَ: ما أَسْلَمَ أَحَدٌ إِلاَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي أَسْلَمْتُ فِيهِ، وَلَقَدْ مَكَثْتُ سَبْعَةَ أَيَّامٍ، وَإِنِّي لَثُلُثُ الإِسْلاَمِ. [خ٣٧٢٧ (٣٧٢٦)]

**(خ) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، وتی: ئەو ڕۆژەی تیایدا من موسوڵمان بووم هیچ کەس موسوڵمان نەبوو، حەوت ڕۆژ مامەوە و من سێیەکی ئیسلام بووم.**

## ١١- دەروازەی: سەروەرییەکانی زەیدی کوڕی حاریسە و کوڕەکەی زەید، ئوسامە (خوایان لێ ڕازی بێت)

**٣٨٣٩**- (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْن عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم بَعْثاً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَطَعَنَ بَعْضُ النَّاسِ فِي إِمَارَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنْ تَطْعُنُوا فِي إِمَارَتِهِ، فَقَدْ كُنْتُمْ تَطْعُنُونَ فِي إِمارَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلُ. وَايْمُ اللهِ إِنْ كانَ لَخَلِيقاً لِلإِمارَةِ، وَإِنْ كانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ).

[خ٣٧٣٠/ م٢٤٢٦]

**(ق) لە عەبدولڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردەیەکی ڕەوانە کرد ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد بە ئەمیر بەسەریانەوە، هەندێك خەڵك تانەیاندا لە ئەمیری ئوسامە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (گەر تانە بدەین لە ئەمیرییەکەی پێشتریش تانەتان دەدا لە ئەمیری باوکی، سوێند بە خودا، ئەو شایستە بوو بە ئەمیری، سوێند بە خودا، ئەو خۆشەویسترین خەڵك بوو لە لام، ئەمەش[1] خۆشەویسترین خەڵکە لە لام لە دوای ئەو).**

**٣٨٤٠**-(خ) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما: حَدَّثَ عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَنَّهُ كَانَ يَأْخُذُهُ وَالحَسَنَ، فَيَقُولُ: (اللَّهُمَّ أَحِبَّهُمَا، فَإِنِّي أُحِبُّهُما). [خ٣٧٣٥]

**(خ) لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(خوایان لێ ڕازی بێت): لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ئوسامە و حەسەنی دەگرت و دەیفەرموو: (خودایە، ئەم دوانەت خۆشبوێت، من خۆشمدەوون).**

---

[1] واتە: ئوسامە-و.

## ١٢- دەروازەی: سەروەرییەکانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود

**٣٨٤١-** (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ أَنَا وَأَخِي مِنَ الْيَمَنِ، فَمَكَثْنَا حِيناً، ما نُرَى إِلاَّ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، لِمَا نَرَى مِنْ دُخُولِهِ وَدُخُولِ أُمِّهِ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٣٧٦٣/ م٢٤٦٠]

**(ق) لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: من و براکەم لە یەمەنەوە هاتین، ماوەیەك ماینەوە پێمان وابوو عەبدوڵای کوڕی مەسعود پیاوێکە لە ئەهل و بەیتی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێ دەمانبینی ئەو و دایکی دەچوونە ژوورەوە بۆ لای.**

**٣٨٤٢-** (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قالَ: قالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلهَ غَيْرُهُ، ما أُنْزِلَتْ سُورَةٌ مِنْ كِتَابِ اللهِ؛ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ أَيْنَ أُنْزِلَتْ، وَلاَ أُنْزِلَتْ آيَةٌ مِنْ كِتَابِ اللهِ؛ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ فِيمَا أُنْزِلَتْ، وَلَوْ أَعْلَمُ أَحَداً أَعْلَمَ مِنِّي بِكِتَابِ اللهِ، تُبَلِّغُهُ الإِبِلُ، لَرَكِبْتُ إِلَيْهِ. [خ٥٠٠٢/ م٢٤٦٣]

**(ق) لە مەسروقەوە وتی: عەبدوڵا وتی: سوێند بەو کەسەی هیچ خودایەك نییە جگە لە ئەو، سورەتێك لە کتێبەکەی خودا دانەبەزیوە من نەزانم لە کوێ دابەزیوە، ئایەتێك لە کتێبەکەی خودا دانەبەزیوە من نەزانم بۆچی دابەزیوە، گەر کەسێك بناسم لە من زاناتر بێت بە کتێبەکەی خودا و حوشتری پێ بگات[1] سواری دەبووم و دەچووم بۆ لای.**

**٣٨٤٣-** (خ) عَنْ حذيفة ﷺ قال: إِنَّ أَشْبَهَ النَّاسِ دَلاًّ وَسَمْتاً وَهَدْياً بِرَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم لابْنُ أُمِّ عَبْدٍ، مِنْ حِينَ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ إِلَى أَنْ يَرْجِعَ إِلَيْهِ، لاَ نَدْرِي ما يَصْنَعُ فِي أَهْلِهِ إِذَا خَلاَ. [خ٦٠٩٧ (٣٧٦٢)]

**(خ) لە حوزەیفەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: کەسێك کە لە هەموو خەڵك زیاتر بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەچوو لە باشیی جووڵە لە رۆیشتن و جوانی لە کاروباری دیندا**

---

[1] واتە: بتوانم بە سواری حوشتر بیگەمێ‌و.

و هیدایەتدا، بریتی بوو لە کوڕەکەی ئوم عەبد[1]، لەو کاتەوەی لە ماڵەکەی دەهاتە دەرەوە تا دەگەڕایە ماڵەوە، نەماندەزانی چی لەگەڵ خانەوادەکەی دەکات کاتێ تەنها دەکەوت.

## ١٣- دەروازەی: سەروەرییەکانی عەبدوڵای کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت)

**٣٨٤٤-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ فِي يَدِي سَرَقَةً مِنْ حَرِيرٍ، لاَ أُهْوِي بِهَا إِلَى مَكانٍ فِي الْجَنَّةِ؛ إِلاَّ طَارَتْ بِي إِلَيْهِ، فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: (**إِنَّ أَخَاكِ رَجُلٌ صَالِحٌ، أَوْ قَالَ: إِنَّ عَبْدَ اللهِ رَجُلٌ صَالِحٌ**). [خ٧٠١٥، ٧٠١٦ (٤٤٠)/ م٢٤٧٨]

لە ئیبن عومەرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: لە خەونـدا بینـیم پارچـەیەك لـە ئاورشمم لە دەستدا بوو، بەوەوە ئارەزووی هەر شـوێنێکم دەکـرد لـە بەهەشـت مـنی دەفڕان بۆ ئەو جێگەیە، خەونەکەم بۆ حەفصە گێڕایەوە، حەفصەش خەونەکـەی بـۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕابوویەوە، پێغەمبـەر فـەرمووی: (**براکـەت پیـاوێکی صـاڵحە**، یـان فەرموبووی: **عەبدوڵا پیاوێکی صاڵحە**).

**٣٨٤٥-** (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا، فَأَقُصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَكُنْتُ غُلاَماً شَابّاً، وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي، فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ، وَإِذَا فِيهَا أُنَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ: أَعُوذ بِاللهِ مِنَ النَّارِ. قَالَ: فَلَقِيَنَا مَلَكٌ آخَرُ، فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ. فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَقَالَ: (**نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ! لَوْ كانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ**). فكانَ بَعْدُ لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلاَّ قَلِيلاً. [خ١١٢١ و١١٢٢ (٤٤٠)/ م٢٤٧٩]

[1] ئوم عەبد: ناوی دایکی عەبدوڵای کوڕی مەسعوودە ـ و.

(ق) لە ئیبن عومەرەوە(خوا لێی رازی بێت)، پیاو لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) گەر خەونێکی بینیبایە بۆ پێغەمبەری خودای(ﷺ) دەگێڕایەوە، ئاواتم خواست خەونێك ببینم و بۆ پێغەمبەری خودای(ﷺ) بگێڕمەوە، غولامێکی گەنج بووم، لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوت دەخەوتم، لە خەوندا بینیم وەك ئەوی دوو فریشتە گرتمیان و بردمیان بۆ ناو ئاگر، تووناو توون بوو، وەك توونا و توونی بیر، دوو شاخی هەبوو، خەڵکانێکی تێدابوو من ئەوانم دەناسی، دەموت: پەنا دەگرم بە خودا لە ئاگر، وتی: فریشتەیەکی ترمان پێگەیشت وتی: مەترسە، خەونەکەم بۆ حەفصە گێڕایەوە، حەفصەش بۆ پێغەمبەری خودای(ﷺ) گێڕابوویەوە، فەرمووبووی: (**باشترین پیاو عەبدوڵایە، گەر شەونوێژ بکات**)، لە دوای ئەوە عەبدوڵا لە شەودا زۆر کەم دەخەوت.

## ١٤- دەروازەی: سەروەرییەکانی عەبدوڵای کوڕی عباس (خوایان لێ ڕازی بێت)

**٣٨٤٦**- (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ الْخَلاَءَ، فَوَضَعْتُ لَهُ وَضُوءاً، قَالَ: (مَنْ وَضَعَ هذَا) ؟ فَأُخْبِرَ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ**).

[خ١٤٣ (٧٥)/ م٢٤٧٧]

(ق) لە ئیبن عەباسەوە: پێغەمبەر(ﷺ) چووە ژوورەوە بۆ سەر پێشاو، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادە کرد، فەرمووی: (**کێ ئەمەی داناوە**)؟ هەواڵی پێدرا، فەرمووی: (**"اللهم فقهه في الدين"-خودایە لە دیندا فیقهی پێ ببەخشە**).

- وفي رواية للبخاري: قَالَ: ضَمَّنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَقَالَ: (**اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ**). [خ٧٥]

لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەخۆیدا گوشیم و فەرمووی: (**اللهم علّمْه الكتابَ-خودایە کتێبی فێر بکە**[1]).

[1] واتە: تێگەیشتن و تەفسیری قورئانی فێر بکە-و.

■ وفي رواية له: قَالَ: (اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الحِكْمَةَ). [خ٣٧٥٦]

**لە ڕیوایەتێکی تری بوخاریدا وتی: فەرمووی: ("اللهم عَلِّمْه الحكمةَ"-خودایە حیکمەتی فێر بکە).**

**٣٨٤٧-** (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ عُمَرُ يُدْخِلُنِي مَعَ أَشْيَاخِ بَدْرٍ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لِمَ تُدْخِلُ هَذَا الْفَتَى مَعَنَا وَلَنَا أَبْنَاءٌ مِثْلُهُ؟ فَقَالَ: إِنَّهُ مِمَّنْ قَدْ عَلِمْتُمْ، قَالَ: فَدَعَاهُمْ ذَاتَ يَوْمٍ وَدَعَانِي مَعَهُمْ، قَالَ: وَمَا أُرِيتُهُ دَعَانِي يَوْمَئِذٍ إِلاَّ لِيُرِيَهُمْ مِنِّي، فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ۝١ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا۝٢﴾ [النصر: ١-٢] حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أُمِرْنَا أَنْ نَحْمَدَ اللهَ وَنَسْتَغْفِرَهُ إِذَا نُصِرْنَا وَفُتِحَ عَلَيْنَا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نَدْرِي، أَوْ لَمْ يَقُلْ بَعْضُهُمْ شَيْئاً، فَقَالَ لِي: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَكَذَاكَ تَقُولُ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَمَا تَقُولُ؟ قُلْتُ: هُوَ أَجَلُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَعْلَمَهُ اللهُ لَهُ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ۝١﴾[النصر: ١]. فَتْحُ مَكَّةَ، فَذَاكَ عَلاَمَةُ أَجَلِكَ: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا۝٣﴾ [النصر: ٣]. قَالَ عُمَرُ: مَا أَعْلَمُ مِنْهَا إِلاَّ مَا تَعْلَمُ. [خ٤٢٩٤ (٣٦٢٧)]

**(خ) لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: عومەر دەیبردمە ژوورەوە لەگەڵ گەورە پیاوانی بەدر، هەندێکیان وتیان: بۆچی ئەم گەنجە لەگەڵمان دێنیتە ژوورەوە، ئێمە کوڕمان هەیە هاوشێوەی ئەوە؟ عومەر وتی: ئەوە لەو کەسەیە کە ئێوە دەیزانن، وتی: ڕۆژێك ئەوانی بانگ کرد و منیشی لەگەڵیان بانگ کرد و وتی: پێموابوو ئەو ڕۆژە بۆیە بانگی کردم تا من نیشانی ئەوان بدات[1]، عومەر وتی: چی دەڵێن دەربارەی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ۝١ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا۝٢﴾ [النصر: ١-٢]، تا کۆتای سورەتەکە.. یەکێکیان وتی: فەرمانمان پێکراوە حەمدی خودا بکەین و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین گەر سەرخراین و فەتحمان بۆکرا، یەکێکی تریان وتی: نازانین، یان هەندێکیان هیچیان نەوت، عومەر وتی بە من: ئەی ئیبن عەباس، تۆش**

---

[1] واتە: زانستی من بۆ ئەوان دەربخات-و.

هەر بەو جۆرە دەڵێیت؟ وتم نەخێر، وتی: ئەی تۆ چی دەڵێیت؟ وتم: ئەوە ئەجەلی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، خودا بە ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾[النصر: ١]، فەتحی مەکە، ئاگاداری کردووە ئەوە نیشانەی ئەجەلەکەتە، ﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ۝٣﴾ [النصر: ٣]، عومەر وتی: منیش هەر ئەوە دەزانم کە تۆ لێی دەزانی.

## ١٥- دەروازەی: سەروەرییەکانی ئەبو زەڕی غیفاری

**٣٨٤٨**–(ق) عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى مَلإٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ خَشِنُ الشَّعَرِ وَالثِّيَابِ وَالْهَيْئَةِ، حَتَّى قامَ عَلَيْهِمْ، فَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: بَشِّرِ الْكانِزِينَ بِرَضْفٍ يُحْمى عَلَيْهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، ثُمَّ يُوضَعُ عَلَى حَلَمَةِ ثَدْيِ أَحَدِهِمْ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ نُغْضِ كَتِفِهِ، وَيُوضَعُ عَلَى نُغْضِ كَتِفِهِ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ حَلَمَةِ ثَدْيِهِ، يَتَزَلْزَلُ. ثُمَّ وَلَّى فَجَلَسَ إِلَى سَارِيَةٍ، وَتَبِعْتُهُ وَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، وَأَنَا لاَ أَدْرِي مَنْ هُوَ، فَقُلْتُ لَهُ: لاَ أُرَى الْقَوْمَ إِلاَّ قَدْ كَرِهُوا الَّذِي قُلْتَ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً.

قَالَ لِي خَلِيلِي، قَالَ: قُلْتُ: مَنْ خَلِيلُكَ؟ قَالَ: النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: **(يَا أَبَا ذَرٍّ أَتُبْصِرُ أُحُداً)** ؟ قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَى الشَّمْسِ ما بَقِيَ مِنَ النَّهَارِ، وَأَنَا أُرَى أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُرْسِلُنِي فِي حاجَةٍ لَهُ، قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: **(ما أُحِبُّ أَنَّ لِي مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً، أُنْفِقُهُ كُلَّهُ، إِلاَّ ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ)**. وَإِنَّ هؤُلاَءِ لاَ يَعْقِلُونَ، إِنَّمَا يَجْمَعُونَ الدُّنْيَا. لاَ وَاللهِ، لاَ أَسْأَلُهُمْ دُنْيَا، وَلاَ أَسْتَفْتِيهِمْ عَنْ دِينٍ، حَتَّى أَلْقَى اللهَ. [خ١٤٠٧ و١٤٠٨/ م٩٩٢]

**(ق)** لە ئەحنەف کوڕی قەیسەوە، وتی: لە کۆمەڵێکی قورەیشدا دانیشتم، پیاوێکی پرچ زبر و پۆشاك و هەیبەت زبر هات تا بەسەریانەوە وەستا، سەلامی لێکردن و پاشان وتی: مژدە بدە بەو کەسانەی زێڕ و زیو و گەنجینە دەکەن، بە بەردی گەرم کە لەئاگری دۆزەخ گەرم دەکرێ و پاشان لەسەر مەمکی یەکێك لەوان دادەنرێت تا لە ئێسکی شانییەوە دەردەچێت، لەسەر ئێسکی شانی دادەنرێت تا لەسەر گۆی مەمکییەوە دەردەچێت و دێتە هەژان، پاشان پشتی هەڵکرد و لای کۆڵەکەیەك دانیشت، منیش شوێنی کەوتم و لای دانیشتم، من نەمدەزانی ئەوە کێیە، وتم: پێموایە ئەو کۆمەڵە قسەکەی تۆیان پێناخۆشبوو، وتی: ئەوانە هیچ شتێك تێناگەن.

خۆشەویستەکەم پێی وتم: وتم: خۆشەویستەکەت کێیە؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ): **(ئەی ئەبو زەڕ، ئایا ئوحد دەبینی؟)** ئەبو زەڕ وتی: تەماشای خۆرم کرد ڕۆژی زۆر نەمابوو، من پێم وابوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕەوانەم دەکات بۆ پێویستییەکی خۆی، وتم: بەڵێ، فەرمووی: **(پێمخۆش نییە بەقەدەر ئوحد زێرم هەبێت و هەمووی خەرج بکەم، جگە لە سێ دینار)**، ئەوانە ناژنەون، دنیا کۆدەکەنەوە، نە سوێند بە خودا، داوای دنیایان لێ ناکەم، داوای فتوایان لێ ناکەم لە دین، تا بە خودا دەگەم.

**٣٨٤٩-** (خ) عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: مَرَرْتُ بِالرَّبَذَةِ، فَإِذَا أَنَا بِأَبِي ذَرٍّ ﷺ، فَقُلْتُ لَهُ: ما أَنْزَلَكَ مَنْزِلكَ هَذَا؟ قَالَ: كنْتُ بِالشَّامِ، فَاخْتَلَفْتُ أَنَا وَمُعَاوِيَةُ فِي: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة:٣٤]. قَالَ مُعَاوِيَةُ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ، فَقُلْتُ: نَزَلَتْ فِينَا وَفِيهِمْ، فَكانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فِي ذاكَ، وَكَتَبَ إِلَى عُثْمانَ ﷺ يَشْكُونِي، فَكَتَبَ إِلَيَّ عُثْمانُ أَنِ اقْدَمِ المدِينَةَ، فَقَدِمْتُهَا، فَكَثُرَ عَلَيَّ النَّاسُ، حَتَّى كَأَنَّهُمْ لَمْ يَرَوْنِي قَبْلَ ذلِكَ، فَذَكَرْتُ ذَاكَ لِعُثْمانَ، فَقَالَ لِي: إِنْ شِئْتَ تَنَحَّيْتَ، فَكُنتَ قَرِيباً. فَذَاكَ الَّذي أَنْزَلَنِي هَذَا المَنْزِلَ، وَلَوْ أَمَّرُوا عَلَيَّ حَبَشِيّاً لَسَمِعْتُ وَأَطَعْتُ. [خ١٤٠٦]

**(خ)** لە زەیدی کوڕی وەهبەوە وتی: بە ڕەبزەدا[(١)] گوزەرم کرد، بینیم ئەبو زەڕ(خوا لێی ڕازی بێت) لەوێیە، پێم وت: چی تۆی لەم شوێنە دابەزاندووە؟ وتی: لە شام بووم من و موعاویە تووشی ناکۆکی هاتین دەربارەی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة:٣٤]، موعاویە دەیوت: دەربارەی ئەهلی کیتاب دابەزیوە، منیش دەموت: دەربارەی ئێمە و ئەوان دابەزیوە، ئەوە لە نێوان من و ئەودا بوو، نووسراوی بۆ عوسمان(خوا لێی ڕازی بێت) نووسی و سکاڵای لە دەستی من کرد، عوسمان بۆی نووسیم: وەرەوە بۆ مەدینە، منیش هاتمەوە بۆ مەدینە، خەڵکێکی زۆر لەسەرم کۆبوونەوە، تەنانەت وەك ئەوەی پێشتر منیان نەبینی بێت، ئەوەم بۆ عوسمان باس کرد، پێی وتم: گەر پێتخۆشە کەنار بگرە و نزیك بە،

(١) ناوی گوندێك بووە -و.

ئەوەیە منی لەم شوێنە دابەزاندووە، گەر حەبەشییەك بەسەرمەوە بكەن بە ئەمیر دەبیستم و گوێڕایەڵ دەبم.

٣٨٥٠- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (مَا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ، وَلاَ أَقَلَّتِ الْغَبْرَاءُ، أَصْدَقَ مِنْ أَبِي ذَرٍّ). [ت٣٨٠١/ جه١٥٦]

له عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە وتی: لە پێغەمبەری خودام(ﷺ) بیست فەرمووی: **(ئاسمان سێبەری بۆ کەسێك نەکردووە و زەوی کەسێکی هەڵنەگرتووە راستگۆتر لە ئەبو زەڕ).**

## ١٦- دەروازەی: سەروەرییەکانی عەممار(خوا لێی رازی بێت)

٣٨٥١- (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ وَلاِبْنِهِ عَلِيٍّ: انْطَلِقَا إِلَى أَبِي سَعِيدٍ، فَاسْمَعَا مِنْ حَدِيثِهِ، فَانْطَلَقْنَا، فَإِذَا هُوَ فِي حَائِطٍ يُصْلِحُهُ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَاحْتَبَى، ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثُنَا، حتَّى أَتَى ذِكْرُ بِنَاءِ الْمسْجِدِ، فَقَالَ: كُنَّا نَحْمِلُ لَبِنَةً لَبِنَةً، وَعَمَّارٌ لَبِنَتَيْنِ لَبِنَتَيْنِ، فَرَآهُ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم، فَيَنْفُضُ التُّرَابَ عَنْهُ، وَيَقُولُ: (وَيْحَ عَمَّارٍ! تَقْتُلُهُ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ، يَدْعُوهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ، وَيَدْعُونَهُ إِلَى النَّارِ). قَالَ: يَقُولُ عَمَّارٌ: أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الْفِتَنِ. [خ٤٤٧]

(خ) له عیکریمەوە: ئیبن عەباس وتی بە من و کوڕەکەی خۆی، عەلی، بڕۆن بۆ لای ئەبی سەعید لە قسەکانی ببیستن، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ لای ئەو، خەریکی باخێك بوو چاکی دەکرد، کراسەکەی هەڵکرد و خۆی پێچایەوە و پاشان لەگەڵمان دەستیکرد بە قسەکردن تا هات بۆ باسی بینای مزگەوتەکە: ئێمە خشت خشت هەڵماندەگرت، عەممار دوو خشت دوو خشت هەڵیدەگرت، پێغەمبەر(ﷺ) بینی و خۆڵی لێ دەتەکان و دەیفەرموو: **(هاوار بۆ عەممار، دەستەی دەستدرێژکار دەیکوژێت، بانگیان دەکات بۆ بەهەشت، ئەوان بانگی دەکەن بۆ ئاگر)**، وتی: عەممار دەیوت: پەنا دەگرم بە خودا لە فیتنە[1].

---

(١) عەمار لە جەنگی صەفین لە ریزی سوپای ئیمامی عەلی شەهید بوو-و.

## ١٧- سەروەرییەکانی بیلالی کوڕی ڕیباح (خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٥٢**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ لِبِلاَلٍ عِنْدَ صَلاَةِ الْفَجْرِ: (**يَا بِلاَلُ! حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ**). قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلاً أَرْجى عِنْدِي: أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُوراً، فِي سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ؛ إِلاَّ صَلَّيْتُ بِذلِكَ الطُّهُورِ ما كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ. [خ١١٤٩/ م٢٤٥٨]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە (خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی نوێژی بەیانی بەبیلالی وت: (ئەی بیلال، باسی باشترین کارێکی خۆتم بۆ بکە لە ئیسلامدا ئەنجامت دابێت، من گوێم لە تەقەی دوو نەعلەکەت بوو لەپێشمەوە لە بەهەشت)، بیلال وتی: کارێکم ئەنجام نەداوە باشتر بێت لەوەی هەرکات خۆم پاك دەکەمەوە لە ساتێکی شەو، یان ڕۆژ بەو پاکییەوە چەند خودا بۆی نووسیبم لە نوێژ ئەنجامی دەدەم.**

**٣٨٥٣**– (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَقُولُ: أَبُو بَكْرٍ سَيِّدُنَا، وَأَعْتَقَ سَيِّدَنَا. يعني: بِلاَلاً. [خ٣٧٥٤]

**(خ) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: عومەر دەیوت: ئەبوبەکر سەرداری ئێمەیە، ئەو سەرداری ئێمەی ئازاد کردووە، واتە بیلال.**

## ١٨- دەروازەی: فەزڵی سەلمان و صوهەیب

**٣٨٥٤**– (م) عَنْ عَائِذِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَتَى على سَلْمَانَ وَصُهَيْبٍ وَبِلاَلٍ فِي نَفَرٍ، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا أَخَذَتْ سُيُوفُ اللهِ مِنْ عُنُقِ عَدُوِّ اللهِ مَأْخَذَهَا. قَالَ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَتَقُولُونَ هَذَا لِشَيْخِ قُرَيْشٍ وَسَيِّدِهِمْ؟ فَأَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَأَخْبَرَهُ. فَقَالَ: (**يَا أَبَا بَكْرٍ لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ، لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ**).

فَأَتَاهُمْ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: يَا إِخْوَتَاهْ أَغْضَبْتُكُمْ؟ قَالوا: لاَ، يَغْفِرُ اللهُ لَكَ يَا أُخَيَّ. [م٢٥٠٤]

**(م) لە عائیزی کوڕی عەمرەوە: ئەبو سوفیان هات بۆ لای سەلمان و صوهەیب و بیلال لەناو چەند کەسێکدا بوون، وتیان: سوێند بە خودا، شمشێرەکانی خودا لە**

گەردنی ئەم دوژمنەی خودا جێگەی خۆی نەگرت، وتی: ئەبوبەکر وتی: ئایە ئێوە دەربارەی شێخێکی قورەیش و سەردارێکی قورەیش ئەوە دەڵێن، هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پێدا، پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەی ئەبوبەکر، لەوانەیە ئەوانت توڕە کردبێت، گەر ئەوانت توڕە کردبێت پەروەردگارت توڕە کردووە**).

ئەبوبەکر هات بۆ لایان و وتی: ئەی برایان، من ئێوەم توڕە کرد؟ وتیان: : نەخێر، ئەی برا، خودا لێتخۆشبێت.

## ١٩- دەروازەی: سەروەرییەکانی ئەبو هورەیرە(خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٥٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: يَقُولُونَ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الحَدِيثَ، وَاللهُ المَوْعِدُ. وَيَقُولُونَ: ما لِلْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ لاَ يُحَدِّثُونَ مِثْلَ أَحَادِيثِهِ؟ وإِنَّ إِخْوتِي: مِنَ المُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ، وَإِنَّ إِخْوتِي: مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَلُ أَمْوَالِهِمْ، وَكُنْتُ امْرَأً مِسْكِيناً، أَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم عَلَى مِلْءِ بَطْنِي، فَأَحْضَرُ حِينَ يَغِيبُونَ، وَأَعِي حِينَ يَنْسَوْنَ، وَقَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم يَوْماً: (**لَنْ يَبْسُطَ أَحَدٌ مِنْكُمْ ثَوْبَهُ حَتَّى أَقْضِيَ مَقَالَتِي هذِهِ، ثُمَّ يَجْمَعَهُ إِلَى صَدْرِهِ، فَيَنسى مِنْ مَقَالَتِي شَيْئاً أَبَداً**). فَبَسَطْتُ نَمِرَةً لَيْسَ عَلَيَّ ثَوْبٌ غَيْرَهَا، حَتَّى قَضى النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم مَقَالَتَهُ، ثُمَّ جَمَعْتُهَا إِلَى صَدْرِي، فَوَالَّذِي بَعَثَهُ بِالحَقِّ ما نَسِيتُ مِنْ مَقَالَتِهِ تِلْكَ إِلَى يَوْمِي هَذَا. وَاللهِ لَوْلاَ آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ، ما حَدَّثْتُكُمْ شَيْئاً أَبَداً: ﴿**إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ**﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿**ٱلرَّحِيمُ**۝﴾ [البقرة: ١٥٩، ١٦٠].

[خ٢٣٥٠ (١١٨)/ م٢٤٩٢]

لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: دەڵێن: ئەبو هورەیرە فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە، "واللهُ الموعدُ"[١] هەروەها دەڵێن: بۆچی موهاجرین و ئەنصار وەك فەرموودەکانی ئەو ناگێڕنەوە؟ براکانم لە موهاجرین سەودای بازاڕ خەریکی کردبوون،

[١] واتە: بە خودا دەگەینەوە، گەر درۆم کردبێت دادگاییم دەکات و گەر گومانی خراپم پێ برابێت سزای وەردەگرن-و.

براکانیشم لە ئەنصار سەرقاڵی ماڵ و سامانەکانیان بوون، من پیاوێکی هەژار بووم، بۆ پڕ کردنی سکم بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) نووسابووم، کاتێ ئەوان بزر دەبوون من ئامادە دەبووم، کاتێ ئەوان لەبیریان دەچوو، من لەبەرم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك فەرمووی: (**هەرکەسێك پۆشاکەکەی ڕابخات تا ئەم قسانەم تەواو دەکەم، پاشان کۆی بکاتەوە بۆ لای سینەی، هەرگیز هیچ شتێك لە فەرموودەی من لەبیر ناکات**)، منیش کراسەکەی خۆم-کە جگە لەوە پۆشاکێکی ترم لەبەردا نەبوو- ڕاخست تا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەکەی تەواوبوو، پاشان کۆمکردەوە بۆ لای سینەم، سوێند بەو کەسەی پێغەمبەری بە حەق ڕەوانە کردووە، لە فەرموودەکانی تا ئەم ڕۆژە هیچم لەبیر نەچووە، سوێند بە خودا، گەر دوو ئایەت نەبووایە لە کتێبەکەی خودا هەرگیز هیچم بۆ باس نەدەکردن: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، تا فەرموودەی خودا: ﴿ٱلرَّحِيمُ١٦٠﴾ [البقرة: ١٥٩، ١٦٠].

٣٨٥٦- (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثاً عَنْهُ مِنِّي، إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ. [خ١١٣]

**(خ) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: هیچ کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەی لە من زۆرتر نییە، جگە لە عەبدوڵای کوڕی عەمر، ئەو دەینووسی و من نەمدەنووسی.**

٣٨٥٧- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ وَهِيَ مُشْرِكَةٌ، فَدَعَوْتُهَا يَوْماً فَأَسْمَعَتْنِي فِي رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مَا أَكْرَهُ. فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَأَنَا أَبْكِي، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ، فَتَأْبَى عَلَيَّ، فَدَعَوْتُهَا الْيَوْمَ فَأَسْمَعَتْنِي فِيكَ مَا أَكْرَهُ، فَادْعُ اللهَ أَنْ يَهْدِيَ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ**)، فَخَرَجْتُ مُسْتَبْشِراً بِدَعْوَةِ نَبِيِّ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَلَمَّا جِئْتُ فَصِرْتُ إِلَى الْبَابِ، فَإِذَا هُوَ مُجَافٌ، فَسَمِعَتْ أُمِّي خَشْفَ قَدَمَيَّ، فَقَالَتْ: مَكَانَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، وَسَمِعْتُ خَضْخَضَةَ الْمَاءِ. قَالَ: فَاغْتَسَلَتْ وَلَبِسَتْ دِرْعَهَا وَعَجِلَتْ عَنْ خِمَارِهَا، فَفَتَحَتِ الْبَابَ. ثُمَّ قَالَتْ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم،

فَأَتَيْتُهُ وَأَنَا أَبْكِي مِنَ الْفَرَحِ. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَبْشِرْ قَدِ اسْتَجَابَ اللهُ دَعْوَتَكَ وَهَدَى أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ خَيْراً.

قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يُحَبِّبَنِي أَنَا وَأُمِّي إِلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيُحَبِّبَهُمْ إِلَيْنَا. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ هَذَا** . يَعْنِي: أَبَا هُرَيْرَةَ . **وَأُمَّهُ إِلَى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ، وَحَبِّبْ إِلَيْهِمُ الْمُؤْمِنِينَ**) فَمَا خُلِقَ مُؤْمِنٌ يَسْمَعُ بِي وَلاَ يَرَانِي إِلاَّ أَحَبَّنِي. [م٢٤٩١] [وانظر: ٣٨٣٠].

**(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: دایکم هاوەڵدانەر بوو، من بانگم دەکرد بۆ ئیسلام، رۆژێك بانگم دەکرد شتێکم لێ بیست دەربارەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێم ناخۆشبوو، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و من دەگریام، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، من دایکم بانگ دەکرد بۆ ئیسلام، بەڵام بە گوێم ناکات، ئەمڕۆ بانگم کرد شتێکی دەربارەی تۆ وت پێم ناخۆش بوو، داوا لە خودا بکە دایکی ئەبی هورەیرە هیدایەت بدات.**

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودایە هیدایەتی دایکی ئەبی هورەیرە بدە)، بەمژدەی دوعاکەی پێغەمبەری خوداوە هاتمە دەرەوە، کاتێ هاتم و گەیشتمە دەرگاکە بینیم داخراوە، دایکم گوێی لە تەپەی پێم بوو وتی: لە شوێنی خۆت بوەستە، ئەی ئەبو هورەیرە، گوێم لە خورەی ئاو بوو، ئەبو هورەیرە وتی: دایکم خۆی شۆری و پۆشاکەکەی لەبەرکرد و سەرپۆشەکەی پۆشی و دەرگاکەی کردەوە و پاشان وتی: ئەی ئەبو هورەیرە: "أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أنّ محمدا رسول الله"، ئەبوهورەیرە وتی: گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاتم بۆ لای و من لە خۆشیدا دەگریام، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، مژدەت لێ بێت، خودا دوعاکەی تۆی وەڵام دایەوە و هیدایەتی دایکی ئەبی هورەیرەی دا، پێغەمبەر حەمد و سەنای خودای کرد و خێری فەرموو.**

**ئەبو هورەیرە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، داوا لە خودا بکە من و دایکم لای بەندە باوەڕدارەکانی خۆشەویست بین و ئەوانیش لای ئێمە خۆشەویست بن، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودایە، ئەم بەندە بچووکەی خۆت -واتە ئەبی هورەیرە- و دایکی لای بەندە باوەڕدارەکان خۆشەویست بکە و بەندە باوەڕدارەکانیشت لای**

ئەوان خۆشەویست بکە)، هەر باوەڕدارێك خودا دروستی کردبێت و ناوی منی بستبێت و نەیبینیبم منی خۆشویستووە.

## ٢٠- دەروازەی: سەروەرییەکانی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر (خوایان لێ ڕازی بێت)

**٣٨٥٨-** (خ) عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّهُ قالَ حِينَ وَقَعَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ ابْنِ الزُّبَيْرِ: قُلْتُ: أَبُوهُ الزُّبَيْرُ، وَأُمُّهُ أَسْمَاءُ، وَخالَتُهُ عائِشَةُ، وَجَدُّهُ أَبُو بَكْرٍ، وَجَدَّتُهُ صَفِيَّةُ. [خ٤٦٦٤]

**(خ) لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە، لە ئیبن عەباسەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، ئەو وتی: کاتێ لە نێوان ئەو و ئیبن زوبەیر ئەوە ڕوویدا، وتم: باوکی زوبەیرە و دایکی ئەسمایە و پووری عائیشەیە و باپیری ئەبوبەکرە و داپیری صەفیەیە.**

- وفي رواية: أَمَّا أَبُوهُ: فَحَوَارِيُّ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، يُرِيدُ: الزُّبَيْرَ، وَأَمَّا جَدُّهُ: فَصَاحِبُ الْغَارِ، يُرِيدُ: أَبَا بَكْرٍ، وَأَمَّا أُمُّهُ: فَذَاتُ النِّطَاقِ، يُرِيدُ: أَسْمَاءَ، وَأَمَّا خالَتُهُ: فَأُمُّ المؤْمِنِينَ، يُرِيدُ: عائِشَةَ، وَأَمَّا عَمَّتُهُ: فَزَوْجُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، يُرِيدُ: خَدِيجَةَ، وَأَمَّا عَمَّةُ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: فَجَدَّتُهُ، يُرِيدُ: صَفِيَّةَ، ثُمَّ عَفِيفٌ فِي الإِسْلاَمِ، قارِئٌ لِلْقُرْآنِ. [خ٤٦٦٥]

**لە ڕیوایەتێکدا: باوکی حەواری پێغەمبەرە، مەبەستی زوبەیرە، باپیری یاوەری غارە، مەبەستی ئەبوبەکرە، دایکی خاوەنی دوو پشتوێنەکەیە، مەبەستی ئەسمایە، پووری دایکی باوەڕدارانە، مەبەستی عائیشەیە، پووری لەباوکییەوە هاوسەری پێغەمبەرە، مەبەستی خەدیجەیە، پووری پێغەمبەر(ﷺ) داپیری ئەو بووە، مەبەستی صەفیەیە، پاشانیش خۆی کەسێکی عەفیفە لە ئیسلامدا و خوێنەری قورئانە.**

## ٢١- دەروازەی: ئەوەی دەربارەی دە کەسەکە (خوایان لێ ڕازی بێت) هاتووە

**٣٨٥٩-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ فِي الْجَنَّةِ).**

* صحيح. [ت٣٧٤٧]

لە عبدالرحمانی کوڕی عەوفەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەبوبەکر لە بەهەشتە، و عومەر لە بەهەشتە، و عوسمان لە بەهەشتە، و عەلی لە بەهەشتە، و تەلحە لە بەهەشتە، و زوبەیر لە بەهەشتە، و عبدالرحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، و سەعد لە بەهەشتە، و سەعید لە بەهەشتە، و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، لە بەهەشتە)**.

## ٢٢- دەروازەی: تایبەتمەندییەکانی هەندێك لە هاوەڵان

**٣٨٦٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي أَمْرِ اللهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَأَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلاَلِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِيناً، وَإِنَّ أَمِينَ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ). [ت٣٧٩٠/ جه١٥٤]

* صحيح.

[وانظر: ٤٤٨، ٤٥٣، ٥٢٧].

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(بەبەزەیترین کەس بە ئومەتەکەم ئەبوبەکرە، توندترینیان لە ئەمری خودادا عومەرە، ڕاستگۆترینیان لە ڕووی حەیاوە عوسمانە، خوێنەرترینیان بۆ کتێبەکەی خودا ئوبەی کوڕی کەعبە، زاناترینیان بە فەرزەکان زەیدی کوڕی سابیتە، زاناترینیان بە حەڵاڵ و حەرام موعازی کوڕی جەبەلە، دەزانن بۆ هەموو ئومەتێك ئەمینێك هەیە ئەمینی ئەم ئومەتە بریتییە لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح)**.

- زاد ابن ماجه: (وَأَقْضَاهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ).

لە ڕیوایەتەکەی ابن ماجەدا ئەمە زیاد بووە: **(زاناترینیان بە قەزاوەت عەلی کوڕی ئەبی تالیبە)**.

## ٢٣- دەروازەی: فەزڵی دواپینی ئەم ئومەتە

**٣٨٦١-** عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي جُمُعَةَ ـ رَجُلٍ مِنَ الصَّحَابَةِ ـ حَدِّثْنَا حَدِيثاً سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. قَالَ: نَعَمْ، أُحَدِّثُكَ حَدِيثاً جَيِّداً: تَغَدَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَعَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَحَدٌ خَيْرٌ مِنَّا؟ أَسْلَمْنَا وَجَاهَدْنَا مَعَكَ؟ قَالَ: **(نَعَمْ، قَوْمٌ يَكُونُونَ مِنْ بَعْدِكُمْ، يُؤْمِنُونَ بِي وَلَمْ يَرَوْنِي)**. [مي٢٧٤٤]

* إسناده صحيح.

**لە ئیبن موحەیریزەوە، وتی: وتم بە ئەبی جومعە -پیاوێك لە هاوەڵان بوو-: حەدیسێكمان بۆ باس بكە لە پێغەمبەری خودات(ﷺ) بیستبێت، وتی: بەڵێ، حەدیسێكی باشت بۆ باس دەكەم: لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژەمی بەیانیمان خوارد و ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاحمان لەگەڵ بوو، ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، كەسێك هەیە باشتر لە ئێمە؟ موسوڵمان بووین و لەگەڵت جیهادمان كرد، پێغەمبەر فەرمووی: (بەڵێ، قەومێك لە دوای ئێوە دێن، ئیمانم پێ دەهێنن و منیان نەبینیوە).**

**٣٨٦٢-** عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(مَثَلُ أُمَّتِي مَثَلُ الْمَطَرِ، لاَ يُدْرَى أَوَّلُهُ خَيْرٌ أَمْ آخِرُهُ)**. [ت٢٨٦٩]

* حسن صحيح.

**لە ئەنەسەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نموونەی ئومەتەكەم وەك باران وایە، نازانرێت ئایا سەرەتاكەی خێرە، یان كۆتاییەكەی).**

## بەشی چوارەم

## باسی فەزڵی هەندێك لە ئەنصار

### ١- دەروازەی: سەروەرییەکانی سەعدی کوڕی مەعاز(خوا لێی رازی بێت)

٣٨٦٣- (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِثَوْبٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَجَعَلُوا يَعْجَبُونَ مِنْ حُسْنِهِ وَلِينِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَمَنادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الجَنَّةِ، أَفْضَلُ مِنْ هَذَا). [خ٣٢٤٩/ م٢٤٦٨]

**(ق) لە بەرائی کوڕی عازیبەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پۆشاکێك لە ئاورشم هێنرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەوانیش سەرسامبوون بە جوانی و نەرمییەکەی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دەستماڵەکانی سەعدی کوڕی مەعاز لە بەهەشت، باشتر و چاکترە لەمە).**

٣٨٦٤- (ق) عَنْ جابِرٍ ﷺ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (اهْتَزَّ الْعَرْشُ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ معَاذٍ). [خ٣٨٠٣/ م٢٤٦٦]

**(ق) لە جابرەوە(خوا لێی رازی بێت)، گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (عەرشی خودا هاتە هەژان بۆ مردنی سەعدی کوڕی مەعاز).**

### ٢- دەروازەی: سەروەرییەکانی سەعدی کوڕی عوبادە(خوا لێی رازی بێت)

٣٨٦٥- (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوْ وَجَدْتُ مَعَ أَهْلِي رَجُلاً، لَمْ أَمَسَّهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (نَعَمْ) قَالَ: كَلاَّ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ! إِنْ كُنْتُ لأُعَاجِلُهُ بِالسَّيْفِ قَبْلَ ذَلِكَ. قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (اسْمَعُوا إِلَى مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ، إِنَّهُ لَغَيُورٌ، وَأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللهُ أَغْيَرُ مِنِّي). [م١٤٩٨]

(م) لە ئەبی هورەیرەوە، وتی: سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا گەر پیاوێکم لەگەڵ خانەوادەکەم بینی دەستی بۆ نەبەم تا چوار شایەت دەهێنم[1]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، سەعد وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردووە، من بەر لەوە[2] شمشێری بۆ پێش دەخەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(گوێبگرن بۆ ئەوەی کە سەردارەکەتان دەیڵێ، ئەو پیاوێکی بە غیرەتە، من لەو بەغیرەترم، خودا لە من بەغیرەترە).**

## ٣- دەروازەی: سەروەرییەکانی ئەنەسی کوڕی مالیك(خوا لێی ڕازی بێت)

**٣٨٦٦-** (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَنَسٌ خادِمُكَ، ادْعُ اللهَ لَهُ، قَالَ: (اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ). [خ٦٣٧٩/ م٢٤٨٠]

(ق) لە ئەنەسەوە، لە ئوم سولەیمەوە، ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەنەس خزمەتکاری تۆیە، دوعای لای خودا بۆ بکە، پێغەمبەر فەرمووی: **(خودایە ماڵ و منداڵی زۆربکە و بەرەکەت بخە ئەوەی پێتبەخشیوە).**

**٣٨٦٧-** (خ) عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَبْقَ مِمَّنْ صَلَّى الْقِبْلَتَيْنِ غَيْرِي. [خ٤٤٨٩]

(خ) لە ئەنەسەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: لەو کەسانەی نوێژی دوو قبلەکەیان کردووە، جگە لە من کەسی تر نەماوە.

## ٤- دەروازەی: سەروەرییەکانی حەسانی کوڕی سابیت(خوا لێی ڕازی بێت)

**٣٨٦٨-** (ق) عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم لِحَسَّانَ: (اهْجُهُمْ . أَوْ هَاجِهِمْ . وَجِبْرِيلُ مَعَكَ). [خ٣٢١٣/ م٢٤٨٦]

---

(١) ئەم ڕووداوە بەر لە دابەزینی ئایەتی مولاعەنەیە، ئایەتی مولاعەنە تەنها شایەتی پیاوەکە داوا دەکات بۆ جیابوونەوە لە یەکتر-و.

(٢) واتە: بەر لە هێنانی شایەت-و.

**(ق) لە بەرائەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە حەسان: (هەجویان بکە[1]، یان هێرش بکە سەریان، جیبریلت لەگەڵە).**

**٣٨٦٩**– (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(اهْجُوا قُرَيْشاً، فَإِنَّهُ أَشَدُّ عَلَيْهَا مِنْ رَشْقٍ بِالنَّبْلِ)** فَأَرْسَلَ إِلَى ابْنِ رَوَاحَةَ فَقَالَ: **(اهْجُهُمْ)** فَهَجَاهُمْ فَلَمْ يُرْضِ. فَأَرْسَلَ إِلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ. فَلَما دَخَلَ عَلَيْهِ، قَالَ حَسَّانُ: قَدْ آنَ لَكُمْ أَنْ تُرْسِلُوا إِلَى هَذَا الأَسَدِ الضَّارِبِ بِذَنَبِهِ. ثُمَّ أَدْلَعَ لِسَانَهُ فَجَعَلَ يُحَرِّكُهُ. فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَفْرِيَنَّهُمْ بِلِسَانِي فَرْيَ الأَدِيمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(لاَ تَعْجَلْ، فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ أَعْلَمُ قُرَيْشٍ بِأَنْسَابِهَا، وَإِنَّ لِي فِيهِمْ نَسَباً، حَتَّى يُلَخِّصَ لَكَ نَسَبِي)** فَأَتَاهُ حَسَّانُ. ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ لَخَّصَ لِي نَسَبَكَ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنَ الْعَجِينِ.

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ لِحَسَّانٍ: **(إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ لاَ يَزَالُ يُؤَيِّدُكَ، مَا نَافَحْتَ عَنِ اللهِ وَرَسُولِهِ)**.

وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: **(هَجَاهُمْ حَسَّانُ فَشَفَى وَاشْتَفَى)**.

قَالَ حَسَّانُ:

هَجَوْتَ مُحَمَّداً فَأَجَبْتُ عَنْهُ	وَعِنْدَ اللهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ
هَجَوْتَ محَمَّداً بَرّاً تَقِيّاً	رَسُولَ اللَّهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ
فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِرْضِي	لَعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ

[م٢٤٩٠]

**(م) لە عائیشەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هێرش بکەنە سەر قورەیش، چونکە لە تیرباران کردن زۆر لەسەری ناخۆشترە)، ناردی بە دوای ئیبن ڕەواحەدا و فەرمووی: (هێرش بکەرە سەریان)، هێرشی کردە سەریان و پێغەمبەری ڕازی نەکرد،**

---

(١) واتە بە هۆنراوە هێرش بکە سەریان، چونکە ئەوان بە هۆنراوە هێرشیان دەکردە سەر پێغەمبەر و هاوسەرەکانی و هاوەڵان و هاوسەرەکانیان، حەسان یەکێك بوو لە شاعیرەکانی پێغەمبەر(ﷺ)–و.

ناردی بە دوای کەعبی کوڕی مالیکدا، پاشان ناردی بە دوای حەسانی کوڕی سابیتدا، کاتیٚ هاتە ژوورەوە بۆ لای حەسان وتی: کاتی ئەوە هاتووە بنێرن بە دوای ئەم شێرە تێکشکێنەرە بە کلکی، پاشان زمانی خۆی لە لێوەکانییەوە دەرهێنا و دەیجوڵاند، وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانەکردووە، بە زمانم پارچە پارچەیان دەکەم، وەك پارچە پارچە کردنی چەرم، پێغەمبەر خودا(ﷺ) فەرمووی: (**پەلە مەکە، ئەبوبەکر زاناترین کەسی قورەیشە بە ڕەچەڵەکیان، من ڕەچەڵەکم تیاندا هەیە تا ڕەچەڵەکی منت بۆ پوختە بکات**[1])، حەسان هات بۆ لای ئەبوبەکر، پاشان گەڕایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەبوبەکر ڕەچەڵەکی تۆی بۆ پوختە کردووم، سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە، تۆ لەوان جیادەکەمەوە وەکو چۆن موو لە هەویر جیادەکرێتەوە.

عائیشە وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو بە حەسان: (**ڕۆحی قودس بەردەوام پشتیوانیت دەکات، هەتا بەرگری بکەیت لە خودا و پێغەمبەرەکەی**).

هەروەها عائیشە وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (**ئەی حەسان، هەجویان بکە، باوەڕداران شفا دەدات و تۆش شفات بۆ دێت**) حەسان وتی:

هَجَوْتَ مُحَمَّداً فَأَجَبْتُ عَنْهُ وَعِنْدَ اللَّهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ
هَجَوْتَ مـحَمَّداً بَـرًّا تَقِيًّـا رَسُولَ اللَّهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ
فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِـرْضِـي لِعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ

(تۆ هێرشت کردە سەر محەمەد و منیش لە ئەوەوە وەڵام دەدەمەوە، و لەوەشدا لای خودا پاداشت هەیە، هێرشت کردووەتە سەر محەمەدی چاکەکار و تەقوادار، ئەو پێغەمبەرەی ڕەوشتی بریتییە لە وەفا، باوکم و باپیرم و حەیا و حورمەتم بۆ حەیا و حورمەتی محەمەد پارێزەرە لە هێرشی ئێوە)

---

[1] بۆ ئەوەی بەرچاو ڕۆشن بێت و بەهۆی نەناسینەوە بە هۆنراوەکانی هێرش نەکاتە سەر ڕەچەڵەکی پێغەمبەر—و.

## ٥- دەروازەی: سەروەرییەکانی عەبدوڵای کوڕی سەلام(خوا لێی ڕازی بێت)

٣٨٧٠- (ق) عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: كُنْتُ جالِساً في مَسْجِدِ المدِينَةِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ عَلَى وَجْهِهِ أَثَرُ الخُشُوعِ، فَقَالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ تَجَوَّزَ فِيهِمَا، ثُمَّ خَرَجَ، وَتَبِعْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّكَ حِينَ دَخَلْتَ المسْجِدَ قالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، قالَ: وَاللهِ! ما يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَقُولَ ما لاَ يَعْلَمُ، وَسَأُحَدِّثُكَ لِمَ ذَاكَ: رَأَيْتُ رُؤْيَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ، وَرَأَيْتُ كَأَنِّي فِي رَوْضَةٍ. ذَكَرَ مِنْ سَعَتِهَا وَخُضْرَتِهَا. وَسْطَهَا عَمُودٌ مِنْ حَدِيدٍ، أَسْفَلُهُ فِي الأَرْضِ وَأَعْلاَهُ فِي السَّمَاءِ، فِي أَعْلاَهُ عُرْوَةٌ، فَقِيلَ لِي: ارْقَهْ، قُلْتُ: لاَ أَسْتَطِيعُ، فَأَتَانِي مِنْصَفٌ، فَرَفَعَ ثِيَابِي مِنْ خَلْفِي، فَرَقِيتُ حَتَّى كُنْتُ فِي أَعْلاَهَا، فَأَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ، فَقِيلَ لِي: اسْتَمْسِكْ. فَاسْتَيْقَظْتُ وَإِنَّهَا لَفِي يَدِي، فَقَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، قالَ: **(تِلْكَ الرَّوْضَةُ: الإِسْلاَمُ، وَذلِكَ الْعَمُودُ: عَمُودُ الإِسْلاَمِ، وَتِلْكَ الْعُرْوَةُ: عُرْوَةُ الْوُثْقى، فَأَنْتَ عَلَى الإِسْلاَمِ حَتَّى تَمُوتَ)**. وَذَاكَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ. [خ٣٨١٣/ م٢٤٨٤]

**(ق) لە قەیسی کوڕی عوبادەوە وتی: لە مزگەوتی مەدینە دانیشتبووم، پیاوێك هاتە ژوورەوە لەسەر ڕوخساری شوێنی خشوع دیاربوو، وتیان: ئەو پیاوە لە ئەهلی بەهەشتە، دوو ڕکات نوێژی کرد درێژەی پێ نەدان، پاشان چووە دەرەوە، منیش شوێنی کەوتم و پێم وت: تۆ کاتێ هاتییە ناو مزگەوتەکە، وتیان: ئەم پیاوە لە ئەهلی بەهەشتە، وتی: سوێند بە خودا، نابێت هیچ کەس لە خۆیەوە قسەیەك بکات نەیزانێت، بۆت باس دەکەم بۆچی ئەوە، لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) خەونێکم بینی بۆم گێڕایەوە: بینیم وەك ئەوەی لە باخچەیەکدا بم-باسی بەرینی و سەوزی باخچەکەی کرد- لە ناوەڕاستەکەی عەمودێك هەبوو لە ئاسن، خوارەوەی لە زەوی و سەرەوەی لە ئاسمان، لە سەرەوەی قوڵفێك هەبوو، پێم وترا: سەرکەوە، وتم ناتوانم، خزمەتکارێك هات بۆ لام، پۆشاکەکەی لە دواوە بەرز کردمەوە، بۆیە بەرزبوومەوە تا گەیشتمە لوتکەکەی و دەستم گەیشتە قوڵفەکە، پێم وترا: دەستی پێوە بگرە، بە ئاگاهاتم و قوڵفەکەم لە دەستدا بوو، ئەوەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە فەرمووی:**

(ئەو باخچەیە ئیسلامە، ئەو عەموودە عەموودی ئیسلامە، ئەو قوڵفە "عُرْوَة الوثقى[1]"یە، تۆ لەسەر ئیسلامی تا دەمریت) ئەو پیاوە عەبدوڵای کوڕی سەلام بوو.

## ٦- دەروازەی: سەروەرییەکانی ئوسەید و عەباد (خوایان لێ ڕازی بێت)

**٣٨٧١**- (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، خَرَجَا مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، وَمَعَهُمَا مِثْلُ المِصْبَاحَيْنِ، يُضِيئَانِ بَيْنَ أَيْدِيهِمَا، فَلَمَّا افْتَرَقَا صَارَ مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَاحِدٌ، حَتَّى أَتَى أَهْلَهُ. [خ٤٦٥]

**(خ) لە ئەنەسەوە، دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە شەوێکی تاریکدا لای پێغەمبەر(ﷺ) چوونە دەرەوە شتێکیان لەگەڵ بوو، وەك دوو چرا[2] بەردەمیان بۆ ڕۆشن دەکردنەوە، کاتێ لەیەکتر جیابوونەوە، لەگەڵ هەریەکەیان یەکێك لە چراکان هەبوو تا هەریەکەیان گەیشتەوە خانەوەداکەی خۆی.**

- وفي رواية: كَانَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبَّادُ بنُ بِشْرٍ عِنْدَ النَّبِي صلّى الله عليه وسلّم. [خ٣٨٠٥]

**لە ڕیواتێکدا: ئوسەیدی کوڕی حوزەیر و عەبادی کوڕی بیشر لای پێغەمبەر(ﷺ) بوون.**

## ٧- دەروازەی: سەروەرییەکانی بەرائی کوڕی مالیك (خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٧٢**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ، لاَ يُؤْبَهُ لَهُ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، مِنْهُمُ البَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ).** [ت٣٨٥٤]

* صحيح.

---

[1] "عروة الوثقى-قوڵفی نەپساو و توندوتۆڵ"، ئاماژەیە بەم ئایەتە: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ [البقرة: ٢٥٦]-و.

[2] بەخشینی ئەو دوو نوورە موعجیزەیەکی پێغەمبەری خودا بووە-و.

لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**زۆرن ئەوانەی قژ هەڵچوو و تەپوتۆزاوین و تەنها دوو پۆشاکیان لەبەرە، خەڵک گوێیان پێ نادات**[1]**، گەر سوێند لەسەر خودا بخوات سوێندەکەی ناخات، لەوانە بەرائی کوڕی مالیکە**).



(۱) واتە: خەڵک نایانناسن–و.

# بەشی پێنجەم

## فەزڵی هەندێك لە ئافرەتان لە هاوەڵانی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ"

### ١- دەروازەی: فەزڵی فاتیمە(خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٧٣-** (ق) عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: إِنَّ عَلِيّاً خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، فَسَمِعتْ بِذلِكَ فاطِمَةُ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَتْ: يَزْعُمُ قَوْمُكَ أَنَّكَ لاَ تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وَهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحٌ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ. فَقَامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ يَقُولُ: **(أَمَّا بَعْدُ، أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ، فَحَدَّثَنِي وَصَدَقَنِي، وَإِنَّ فاطمَةَ بَضْعَةٌ مِنِّي، وَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَسُوءَهَا، وَاللهِ! لاَ تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَبِنْتُ عَدُوِّ اللهِ عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ)**. فَتَرَكَ عَلِيٌّ الْخِطْبَةَ. [خ٣٧٢٩ (٩٢٦)/ م٢٤٤٩]

**(ق) لە میسوەری کوڕی مەغرەمەوە، وتی: عەلی داوای کچەکەی ئەبی جەهلی کرد، فاتیمە ئەوەی بیست، هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، وتی: قەومەکەت بانگەشەی ئەوە دەکەن تۆ لە پێناوی کچەکانت تووڕە نابیت، ئەوە عەلی کچەکەی ئەبی جەهل دەخوازێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەستا، گوێم لێ بوو کاتێ شەهادەتی هێنا دەیفەرموو: (پاشان، کچم دا بە ئەبی عاصی کوڕی ڕەبیع[1] قسەی لەگەڵ کردم و بەڕاستی زانیم، فاتیمە پارچەیەکە لە من، من پێمناخۆشە شتێك ناڕەحەتی بکات، سوێند بە خودا، کچی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و کچی دوژمنێکی خودا لای پیاوێك کۆنابێتەوە). عەلی وازی لە داخوازییەکە هێنا.**

**٣٨٧٤-** (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قالَتْ: إِنَّا كُنَّا أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم عِنْدَهُ جَمِيعاً، لَمْ تُغَادِرْ مِنَّا وَاحِدَةٌ، فَأَقْبَلَتْ فاطِمَةُ عليها السلام تَمْشِي، وَلاَ وَاللهِ مَا تَخْفى مِشْيَتُهَا مِنْ مِشْيَةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلَمَّا رَآهَا رَحَّبَ وَقالَ: **(مَرْحَباً بِابْنَتِي)**. ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ أَوْ

---

[1] **هاوسەری زەینەب بوو-و.**

عَنْ شِمالِهِ، ثُمَّ سَارَّهَا، فَبَكَتْ بُكَاءً شَدِيداً. فَلَمَّا رَأَى حُزْنَهَا سَارَّهَا الثَّانِيَةَ، فَإِذَا هِيَ تَضْحَكُ، فَقُلْتُ لَهَا أَنَا مِنْ بَيْنِ نِسَائِهِ: خَصَّكِ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالسِّرِّ مِنْ بَيْنِنَا، ثُمَّ أَنْتِ تَبْكِينَ! فَلَمَّا قامَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سَأَلْتُهَا: عَمَّ سَارَّكِ؟ قالَتْ: ما كُنْتُ لأُفْشِيَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم سِرَّهُ.

فَلَمَّا تُوُفِّيَ، قُلْتُ لَهَا: عَزَمْتُ عَلَيْكِ بِمَا لِي عَلَيْكِ مِنَ الحَقِّ لَمَّا أَخْبَرْتِنِي، قالَتْ: أَمَّا الآنَ فَنَعَمْ، فَأَخْبَرَتْنِي، قالَتْ: أَمَّا حِينَ سَارَّنِي فِي الأَمْرِ الأَوَّلِ، فَإِنَّهُ أَخْبَرَنِي: أَنَّ جِبْرِيلَ كانَ يُعَارِضُهُ بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ مَرَّةً، **(وَإِنَّهُ قَدْ عارَضَنِي بِهِ الْعامَ مَرَّتَيْنِ، وَلاَ أَرَى الأَجَلَ إِلاَّ قَدِ اقْتَرَبَ، فَاتَّقِي اللهَ وَاصْبِرِي، فَإِنِّي نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ)**. قالَتْ: فَبَكَيْتُ بُكائِي الَّذِي رَأَيْتِ، فَلَمَّا رَأَى جَزَعِي سَارَّنِي الثَّانِيَةَ، قَالَ: **(يَا فَاطِمَةُ، أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هذِهِ الأُمَّةِ)**.

[خ٦٢٨٥ و٦٢٨٦ (٣٦٢٣، ٣٦٢٤)/ م٢٤٥٠]

**(ق)** لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: ئێمە ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەموو لە لای بووین هیچ یەکێکمان لەلای هەڵنەستابوو فاتیمە(خوا لێی رازی بێت) بە رۆیشتن بەرەو ئێمە دەهات، سوێند بە خودا، رۆیشتنەکەی لەگەڵ رۆیشتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ جیاوازی نەبوو، کاتێ پێغەمبەر ئەوی بینی مەرحەبای کرد و فەرمووی: **(مەرحەبا، ئەی کچی خۆم)**، پاشان لای راستییەوە، یان لای چەپییەوە داینا، پاشان چپەیەکی بۆ کرد، فاتیمە بە گریانێکی توند گریا، کاتێ دڵتەنگییەکەی بینی بۆ جاری دووەم چپەیەکی بۆ کرد، ئەویش دەستی بە پێکەنین کرد، من لەناو ژنەکانیانی پێم وت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەنهێنییەك لە نێوان ئێمە تۆی تایبەت کرد، پاشان تۆ گریایت، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هەستا پرسیارم لێ کرد، چپەی چی بۆکردی؟ وتی: نهێنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڵاوە پێناکەم.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد پێم وت: داوات لێدەکەم بەو حەقەی کە هەمە لەسەرت[1]، هەواڵم پێ بدە، وتی: ئێستا بەڵێ، ئەو هەواڵی پێدام و وتی: لە جاری یەکەم کە چپەی بۆکردم ئەو هەواڵی پێدام: **(جبریل هەموو ساڵێك یەك جار**

---

[1] حەقی ئەوەی هاوسەری باوکییەتی و دایکی باوەڕدارانە—و.

**قورئانی بۆ دەخستمەڕوو، ئەمساڵ دوو جار قورئانی بۆ خستومەتەڕوو وادەزانم ئەجەلم نزیك بووەتەوە، لە خودا بترسە و ئارام بگرە، من باشترین پێشینم بۆ تۆ)** فاتیمە وتی: منیش بەو جۆرە گریام کە بینیت، کاتێ دڵتەنگی منی بینی، بۆ جاری دووەم چپەی بۆکردم و فەرمووی: **(ئەی فاتیمە ڕازی دەبیت خاتوونی ئافرەتە ئیماندارەکان بیت، یان خاتوونی ئافرەتانی ئەم ئومەتە بیت؟)**.

**٣٨٧٥**– عَنْ عَائِشَةَ ـ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ـ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَشْبَهَ سَمْتاً وَدَلاًّ وَهَدْياً بِرَسُولِ اللهِ فِي قِيَامِهَا وَقُعُودِهَا مِنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [د٥٢١٧/ ت٣٨٧٢]

* صحيح.

**لە عائیشەوە دایکی باوەڕداران، وتی: هیچ کەسم نەبینیوە لە ڕەنگ و ڕوو و شێوە و هەڵسوکەوت و هەستان و دانیشتنی زۆرتر لە پێغەمبەری خودا بچێت لە فاتیمەی کچی پێغەمبەری خودا.**

## ٢- دەروازەی: فەزڵی خەدیجە

**٣٨٧٦**– (ق) عَنْ عليٍّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ). [خ٣٤٣٢/ م٢٤٣٠]

**(ق) لە عەلییەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) دەیفەرموو: (باشترین ئافرەتی زەوی مەریەمی کچی عیمرانە، و باشترین ئافرەتی زەوی خەدیجەیە[1])**.

**٣٨٧٧**– (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى جِبْرِيلُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ، مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ إِدَامٌ أَوْ طَعَامٌ أَوْ شَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنْ رَبِّهَا وَمِنِّي، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ. [خ٣٨٢٠/ م٢٤٣٢]

---

[1] واتە: هەریەکەیان باشترین ئافرەتی ڕۆژگاری خۆیان بوون–و.

**(ق) لـە ئـەبی هورەیرەوە(خـوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: جیبریـل هـات بـۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوە خەدیجەیە وا هات، دەفرێکی پێیـە پێخـۆر یـان خـۆراکی یـان خواردنـەوەی تێدایـە، گـەر ئـەو هـات بـۆ لات لـە پەروەردگارییەوە و لە منەوە سەلامی پـێ بگەیەنـە و مـژدەی پـێ بـدە بـە ماڵێـك لـە بەهەشت لە مرواری ناو بۆش، دەنگ و ژاوەژاوی تێدا نییە و شەکەتی و مانـدووبوونی رووی لێ ناکات.**

**٣٨٧٨**- (ق) عَنْ عائِشَةَ ﵂ قالَتْ: ما غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم ما غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، هَلَكَتْ قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي، لِمَا كُنْتُ أَسْمَعُهُ يَذْكُرُهَا، وَأَمَرَهُ اللهُ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ مِنْ قَصَبٍ، وَإِنْ كانَ لَيَذْبَحُ الشَّاةَ فَيُهْدِي فِي خَلاَئِلِهَا مِنْهَا ما يَسَعُهُنَّ.
[خ٣٨١٦/ م٢٤٣٥]

**(ق) لە عائیشـەوە(خوا لێـی رازی بێـت)، وتـی: هـیچ ئـافرەتێ بەقـەدەر خەدیجـە غیرەی بۆ دروست نەکردووم لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو کۆچی دوایی کرد بەر لەوەی پێغەمبەر هاوسەرگیری لەگەڵ من بکـات، لەبەرئـەوەی گـوێم لـێ بـوو پێغەمبـەر(ﷺ) ناوی دەهێنا، خودا فەرمانی پێ کرد بوو مژدە بە خەدیجە بدات بە ماڵێك لـە مـرواری ناو بۆش، ئەو کاتێ حەیوانێکی سـەردەبڕی چـەندەی بتوانیبـا هەدیـەی هاوەڵـەکانی خەدیجەی دەکرد.**

## ٣- دەروازەی: فەزڵی عائیشە (خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٧٩**- (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم قالَ لَهَا: (**يَا عائِشَةُ! هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ**). فَقَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، تَرَى ما لاَ أَرَى. تُرِيدُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم.
[خ٣٢١٧/ م٢٤٤٧]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (ئەی عائیشە، ئەوە جیبریلە سەلامت لێ دەکات)، عائیشـە وتـی: سـەلام و ڕەحمـەت و بەرەکـەتی خوداش لەسەر ئەو بێت، تۆ شتێك دەبینی من نایبینم، مەبەستی پێغەمبەربوو(ﷺ).**

٣٨٨٠- (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ). [خ٣٧٧٠/ م٢٤٤٦]

**(ق)** لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(فەزڵی عائیشە لەسەر ئافرەتان وەك فەزڵی ترید وایە بەسەر تەواوی خواردنەکانی تردا).**

٣٨٨١- (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: **(إِنِّي لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى).** قالَتْ: فَقُلْتُ: مِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذلِكَ؟ فَقَالَ: **(أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لاَ وَرَبِّ مُحَمَّدٍ، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى، قُلْتِ: لاَ وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ).** قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، ما أَهْجُرُ إِلاَّ اسْمَكَ. [خ٥٢٢٨/ م٢٤٣٩]

**(ق)** لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: **(من دەزانم گەر تۆ لەمن ڕازی بیت و دەشزانم گەر تۆ لەمن توڕە بیت)**، عائیشە وتی: وتم لە کوێوە ئەوە دەزانیت؟ فەرمووی: **(گەر تۆ لە من ڕازی بیت، دەڵێی: نەخێر، بە پەروەردگاری موحەمەد، گەر تۆ لە من توڕە بیت دەڵێی: نەخێر، بە پەروەردگاری ئیبراهیم)**، عائیشە وتی: وتم بەو جۆرەیە، سوێند بەخودا، ئەی پێغەمبەری خودا، کۆچ لە ناوەکەت دەکەم.

٣٨٨٢- (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عائِشَةَ، يَبْتَغُونَ بِهَا - أَوْ يَبْتَغُونَ بِذلِكَ - مَرْضَاةَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. [خ٢٥٧٤/ م٢٤٤١]

**(ق)** لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، لە ڕۆژەکەی عائیشەدا خەڵکی بەهەدیەکانیانەوە دەهاتن، بەوە یان بەو کارە ڕەزامەندی پێغەمبەری خودایان(ﷺ) دەویویست.

٣٨٨٣- (خ) عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ: أَنَّ عائِشَةَ اشْتَكَتْ، فَجَاءَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، تَقْدَمِينَ عَلَى فَرَطِ صِدْقٍ، عَلَى رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَعَلَى أَبِي بَكْرٍ. [خ٣٧٧١]

(خ) لە قاسمی کوڕی موحەمەدەوە، عائیشە نەخۆشکەوت، ئیبن عەباس هات بۆ لای، وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، تۆ دەچیت بۆ لای پێشکەوتوانێکی صدق، دەچیت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکر.

- وفي رواية قالَ: استَأْذَنَ ابْنُ عَبَّاسٍ ـ قَبْلَ مَوْتِهَا ـ عَلَى عائِشَةَ، وَهِيَ مَغْلُوبَةٌ، قالَتْ: أَخْشى أَنْ يُثْنِيَ عَلَيَّ، فَقِيلَ: ابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَمِنْ وُجُوهِ المسْلِمِينَ، قالَتْ: ائْذَنُوا لَهُ، فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدِينَكِ؟ قالَتْ: بِخَيْرٍ إِنِ اتَّقَيْتُ، قالَ: فَأَنْتِ بِخَيْرٍ إِنْ شَاءَ اللهُ، زَوْجَةُ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلَمْ يَنْكِحْ بِكْراً غَيْرَكِ، وَنَزَلَ عُذْرُكِ مِنَ السَّمَاءِ.
وَدَخَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ خِلاَفَهُ، فَقَالَتْ: دَخَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَأَثْنى عَلَيَّ، وَوَدِدْتُ أَنِي كُنْتُ نِسْياً مَنْسِيّاً. [خ٤٧٥٣]

لە ڕیوایەتێکدا وتی: ئیبن عەباس بەر لە مردنی عائیشە بۆ چوونە ژوورەوە بۆ لای داوای مۆڵەتی کرد، ئەو لە توندی سەرەمەرگدا بوو، وتی: دەترسم مەدح و سەنام بکات، وترا: کوڕی مامی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و لە گەورە پیاوانی موسوڵمانانە، عائیشە وتی: مۆڵەتی بدەن، ئیبن عەباس وتی: حاڵت چۆنە؟ وتی: باشم، گەر لە ئەهلی تەقوا بم، ئیبن عەباس وتی: تۆ لە خێردایت، انشاءالله، هاوسەری پێغەمبەری خودای(ﷺ)، هیچ کچێکی تری مارە نەکردووە جگە لە تۆ، بەرائەتەکەت لە ئاسمانەوە دابەزی.

بەدوای ئەودا ئیبن زوبەیر[1] هاتە ژوورەوە، عائیشە وتی: ئیبن عەباس هاتە ژوورەوە و سەنای کردم، ئاواتم خواست من بۆ هەتاهەتا لەبیربچوومایە.

**٣٨٨٤**- (خ) عَنْ عائِشَةَ ﷺ: أَنَّهَا أَوْصَتْ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما: لاَ تَدْفِنِّي مَعَهُمْ، وَادْفِنِّي مَعَ صَوَاحِبِي بِالْبَقِيعِ، لاَ أُزَكَّى بِهِ أَبَداً. [خ١٣٩١]

(خ) لە عائیشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، ئەو وەسێتی بۆ عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کرد لەگەڵ ئەوان[1] مەمنێژن، لە قەراغەکانی بەقیع بمنێژن، هەرگیز بەوە پاک نابمەوە.

---

[1] واتە: کوڕی ئەسمای خوشکی عائیشە(خوا لە هەموویان ڕازی بێت)-و.

**٣٨٨٥**– عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: مَا أَشْكَلَ عَلَيْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدِيثٌ قَطُّ، فَسَأَلْنَا عَائِشَةَ إِلاَّ وَجَدْنَا عِنْدَهَا مِنْهُ عِلْماً. [ت٣٨٨٣]

* صحيح.

**لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە، وتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەرگیز فەرموودەیەکمان لا ئاڵۆز نەبووە پرسیارمان لە عائیشە کردبێت و زانستێکمان لە لای ئەو بینیوەتەوە[2].**

## ٤- فەزڵی: زەینەبی کچی جەحش(خوا لێی رازی بێت)

**٣٨٨٦**– (ق) عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ بَعْضَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قُلْنَ لِلنَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم: أَيُّنَا أَسْرَعُ بِكَ لُحُوقاً؟ قَالَ: (**أَطْوَلُكُنَّ يَداً**). فَأَخَذُوا قَصَبَةً يَذْرَعُونَهَا، فَكَانَتْ سَوْدَةُ أَطْوَلَهُنَّ يَداً، فَعَلِمْنَا بَعْدُ: أَنَّمَا كَانَتْ طُولَ يَدِهَا الصَّدَقَةُ، وَكَانَتْ أَسْرَعَنَا لُحُوقاً بِهِ، وَكَانَتْ تُحِبُّ الصَّدَقَةَ. [خ١٤٢٠/ م٢٤٥٢]

**(ق) لە عائیشەوە(خوا لێی رازی بێت)، یەکێك لە ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: کام لە ئێمە زووتر بە تۆ دەگات؟ پێغەمبەر فەرمووی: (ئەو کەسەتان دەستی لە هەمووتان درێژترە)، ئەوانیش قامیشێکیان گرت بە دەستەوە و دەستی خۆیان دەپێوا، سەودە دەستی لە هەموویان درێژتر بوو، تواتر زانیمان مەبەستی "دەستی درێژ" صەدەقەکردنە، زەینەب لە هەموومان زووتر بە ئەو گەیشت، ئەو صەدەقەی پێخۆشبوو.**

- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: فَكَانَتْ أَطْوَلَنَا يداً زَيْنَبُ، لأَنَّهَا كَانَتْ تَعْمَلُ بِيَدِهَا وَتَصَدَّقُ.

---

[1] واتە: لەگەڵ پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر مەمنێژن، بە ناشتن لای ئەوان پاك نابمەوە، واتە: هەر مرۆڤە و کار و کردەوەی خۆی–و.

[2] واتە: هەرکات فەرموودەیەکمان لا ئاڵۆز بووبێت پرسیارمان لە عائیشە کردووە و زانستێکمان لە لای ئەو دەربارەی فەرموودەکە دەستکەوتووە–و.

لە ڕیواتێکی موسلیمدا: عائیشە وتی: ئەوەی کە لە هەموومان دەستی درێژتر بوو زەینەب بوو، چونکە بە دەستی خۆی کاری دەکرد و دەیکرد بە صەدەقە.

## ٥- دەروازەی: فەزڵی ئەسمای کچی ئەبوبەکر(خوایان لێ ڕازی بێت)

**٣٨٨٧-** (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، وَمَا لَهُ فِي الأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلاَ مَمْلُوكٍ، وَلاَ شَيْءٍ غَيْرَ نَاضِحٍ وَغَيْرَ فَرَسِهِ، فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ وَأَسْتَقِي الماءَ، وَأَخْرِزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ، وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ، وَكَانَ يَخْبِزُ جارَاتٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ، وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ، وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرضِ الزُّبَيْرِ. الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم. عَلَى رَأْسِي، وَهْيَ مِنِّي عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ.

فَجِئْتُ يَوْماً وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي، فَلَقِيتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَدَعَانِي ثُمَّ قالَ: (إِخْ إِخْ). لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، فاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسِيرَ مَعَ الرِّجالِ، وَذَكَرْتُ الزُّبَيْرَ وَغَيْرَتَهُ وَكانَ أَغْيَرَ النَّاسِ، فَعَرَفَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم أَنِّي قَدِ اسْتَحْيَيْتُ فَمَضى.

فَجِئْتُ الزُّبَيْرَ فَقُلْتُ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَعَلَى رَأْسِي النَّوَى، وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَأَنَاخَ لأَرْكَبَ، فَاسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ.

فَقَالَ: وَاللهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى كانَ أَشَدَّ عَلَيَّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ، قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذلِكَ بِخَادِمٍ يَكْفِينِي سَيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَنِي.      [خ٥٢٢٤ (٣١٥١)/ م٢١٨٢]

**(ق) لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: زوبەیر هاوسەرگیری لەگەڵ کردم، لە زەوی ماڵ و سامان و بەندە و کەنیزەکی نەبوو، تەنها حوشترێکی ئاوکێش و ئەسپەکەی هەبوو، ئالفم بۆ ئەسپەکەی دادەنا و بە دۆڵچەی گەورە ئاوم هەڵدەگۆزی و هەویرم دەشێلا و لە نانکردندا باش نەبووم، ئافرەتە جیرانەکانم لە ئەنصار نانیان دەکرد، ئەوان کۆمەڵێك ئافرەتی ڕێك و ڕاست بوون، ناوکە خورمام لە زەویەکەی زوبەیرەوە لەسەر سەرم دەگواستەوە، ئەو زەوییەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی بەخشی بوو، ئەوەش لە منەوە دووری دوو لەسەر سێی فەرسەخێك[1] بوو.**

---

[1] نزیك بە سێ کیلۆمەتر و چارەکێکە-و.

ڕۆژێك هاتم و ناوکە خورمام لەسەر سەر بوو، بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) گەیشتم و چەند کەسێك لە ئەنصاری لەگەڵ بوون، بانگی لێکردم و پاشان فەرمووی: (ئیخ، ئیخ[1]) تاکو لە پاشکۆی خۆیەوە سوارم بکات، منیش شەرمم کرد لەگەڵ پیاواندا بڕۆم، بیری زوبەیر و غیرەتی زوبەیرم کەوتەوە، ئەو بەغیرەترین کەسی ناو خەڵك بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) زانی من شەرمم کرد ڕۆیشت بەڕێگەی خۆیەوە.

هاتمەوە بۆ لای زوبەیر و وتم پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێمگەیشت و لەسەر سەرم ناوکە خورما هەبوو، چەند کەسێك لە هاوەڵانی خۆی لەگەڵ بوو، حوشترەکەی یخدا و شەرمم کرد لێی و غیرەتی تۆم بیرکەوتەوە.

زوبەیر وتی: سوێند بە خودا، هەڵگرتنت بۆ ناوکە خورما لە سەرم تونتر و ناڕەحەتترە لە سواربوونت لەگەڵی، ئەسما وتی: تا ئەبوبەکر لە دوای ئەوە خزمەتکارێکی بۆ ناردم، ئەرکی ئەسپەکەی لەکۆڵکردمەوە، وەك ئەوەی ڕزگاری کردبم.

**٣٨٨٨-** (خ) عَنْ أَسْمَاءَ ﷺ قَالَتْ: صَنَعْتُ سُفْرَةَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ، حِينَ أَرَادَ أَنْ يُهَاجِرَ إِلَى المدِينَةِ، قَالَتْ: فَلَمْ نَجِدْ لِسُفْرَتِهِ، وَلاَ لِسِقَائِهِ ما نَرْبِطُهُمَا بِهِ، فَقُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ: وَاللهِ ما أَجِدُ شَيْئاً أَرْبِطُ بِهِ إِلاَّ نِطَاقِي، قَالَ: فَشُقِّيهِ بِاثْنَيْنِ فَارْبِطِيهِ: بِوَاحِدٍ السِّقَاءَ وَبِالآخَرِ السُّفْرَةَ، فَفَعَلْتُ، فَلِذلِكَ سُمِّيَتْ: ذَاتَ النِّطَاقَيْنِ. [خ٢٩٧٩]

**(خ)** لە ئەسماوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: کۆڵ و بارەکەی پێغەمبەری خودام(ﷺ) لە ماڵی ئەبوبەکر ڕێکخست، کاتێ ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، ئەسما وتی: بۆ توێشەبەرەکەی و بۆ جەوەندەی ئاوەکەی شتێکمان لا نەبوو دەمەکانیانی پێ ببەستم، وتم بە ئەبوبەکر: سوێند بە خودا شتێك شك نابەم پێیانی ببەستم جگە لە پشتوێنەکەم، ئەبوبەکر وتی: بیکە بە دوو لەتەوە و پێیانی ببەستە، یەکێکیان بۆ جەوەندەکە و ئەویتریان بۆ توێشەبەرەکە، منیش ئەو کارەم ئەنجامدا، بۆیە ناونرام بە "ذات النطاقین-خاوەنی دوو پشتێنەکە".

---

[1] واتە: دەنگێکە خاوەن حوشتر دەیکات لە حوشترەکە تا بوەستێ و بێت بە چۆکدا بۆ سواربوون و بار لێنان-و.

**٣٨٨٩-** (م) عَنْ أَبِي نَوْفَلٍ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ عَلَى عَقَبَةِ الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَجَعَلَتْ قُرَيْشٌ تَمُرُّ عَلَيْهِ وَالنَّاسُ، حَتَّى مَرَّ عَلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، فَوَقَفَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، أَمَا وَاللهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا. أَمَا وَاللهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا. أَمَا وَاللهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا. أَمَا وَاللهِ إِنْ كُنْتَ، مَا عَلِمْتُ، صَوَّاماً، قَوَّاماً، وَصُولاً لِلرَّحِمِ. أَمَا وَاللهِ لأُمَّةٌ أَنْتَ أَشَرُّهَا لأُمَّةٌ خَيْرٌ.

ثُمَّ نَفَذَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، فَبَلَغَ الْحَجَّاجَ مَوْقِفُ عَبْدِ اللهِ وَقَوْلُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَأُنْزِلَ عَنْ جِذْعِهِ، فَأُلْقِيَ فِي قُبُورِ الْيَهُودِ. ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُمِّهِ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، فَأَبَتْ أَنْ تَأْتِيَهُ، فَأَعَادَ عَلَيْهَا الرَّسُولَ: لَتَأْتِيَنِّي أَوْ لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكِ مَنْ يَسْحَبُكِ بِقُرُونِكِ. قَالَ: فَأَبَتْ وَقَالَتْ: وَاللهِ لاَ آتِيكَ حَتَّى تَبْعَثَ إِلَيَّ مَنْ يَسْحَبُنِي بِقُرُونِي.

قَالَ: فَقَالَ: أَرُونِي سِبْتَيَّ، فَأَخَذَ نَعْلَيْهِ. ثُمَّ انْطَلَقَ يَتَوَذَّفُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: كَيْفَ رَأَيْتِنِي صَنَعْتُ بِعَدُوِّ اللهِ؟ قَالَتْ: رَأَيْتُكَ أَفْسَدْتَ عَلَيْهِ دُنْيَاهُ، وَأَفْسَدَ عَلَيْكَ آخِرَتَكَ. بَلَغَنِي أَنَّكَ تَقُولُ لَهُ: يَا ابْنَ ذَاتِ النِّطَاقَيْنِ! أَنَا وَاللهِ ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ. أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكُنْتُ أَرْفَعُ بِهِ طَعَامَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَطَعَامَ أَبِي بَكْرٍ مِنَ الدَّوَابِّ. وَأَمَّا الآخَرُ فَنِطَاقُ الْمَرْأَةِ الَّتِي لاَ تَسْتَغْنِي عَنْهُ. أَمَا إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم حَدَّثَنَا: **(أَنَّ فِي ثَقِيفَ كَذَّاباً وَمبِيراً)** فَأَمَّا الْكَذَّابُ فَرَأَيْنَاهُ. وَأَمَّا الْمُبِيرُ فَلاَ إِخَالُكَ إِلاَّ إِيَّاهُ. قَالَ: فَقَامَ عَنْهَا، وَلَمْ يُرَاجِعْهَا. [م٢٥٤٥]

**(م) لە ئەبی نەوفلەوە، عەبدوڵای کوڕی زوبەیرم بینی لە دەروازەیەکی ڕوو بە مەدینە هەڵواسرا بوو، وتی: قورەیش و خەڵکی بە پاڵیدا تێدەپەڕین، تا عەبدوڵای کوڕی عومەر بە پاڵیدا تێپەڕی لە لایدا وەستا و وتی: السلام علیك، ئەی ئەبا خوبەیب، السلام علیك، ئەی ئەبا خوبەیب، السلام علیك، ئەی ئەبا خوبەیب، سوێند بە خودا، من نەهیم لێ کردیت لەم کارە، سوێند بە خودا من نەهیم لێ کردیت لەم کارە، سوێند بە خودا من نەهیم لێ کردیت لەم کارە، بەڵام سوێند بە خودا، ئەوەی من زانیومە تۆ پیاوێکی ڕۆژووگر و شەونوێژکەر بوویت، سیلەی ڕەحمت بە جێدەهێنا، سوێند بە خودا، ئومەتێك تۆ شەڕترین کەسیبیت ئومەتێکی خێرە[1].**

---

[1] **واتە: گەر خراپەکاران بە باشترین کەسی ئومەت بڵێن خراپترینە، نیشانەی ئەوەیە ئەو ئومەتە ئومەتی خێرە-و.**

پاشان عەبدوڵای کوڕی عومەر ڕۆیشت، هەڵوێست و قسەکانی عەبدوڵا بە حەجاج گەیشتەوە، حەجاج کەسانێکی ڕەوانەکرد عەبدوڵا[1] لەسەر خاچەکەی داگیرا و لە گۆڕستانی یەهوود نێژرا[2]، پاشان ناردی بەدوای دایکی عەبدوڵادا، ئەسمای کچی ئەبوبەکر، بەڵام ئەسما نەیویست بڕوات بۆ لای، جارێکی تر نێردراوەکەی ناردەوە بەدوایدا و وتی: دێت بۆ لام یان کەسانێك بەدوایدا دەنێرم بە پەلکەکانی ڕایکێشن، وتی: ئەسما نەیویست بچێت بۆلای و وتی: سوێند بە خودا، نایەم بۆ لات تا کەسێك دەنێری بۆ لام بەپەلکەکانم ڕامبکێشتێت.

وتی: حەجاج وتی: ئەو نەعلانەم بۆ بهێنن، جووتە نەعلەکەی خۆی لەپێ کرد، پاشان بەپەلە ڕۆیشت تا چووە ژوورەوە بۆ لای ئەسما، پێی وت: چۆنم دەبینی ئەوەی ئەنجامم دا دژ بە دوژمنەکەی خودا؟ ئەسما وتی: من تۆ دەبینم دونیات لەو تێکدا و دوارۆژی خۆت وێران کرد، پێم گەیشتووە تۆ بە عەبدوڵا دەڵێی ئەو کوڕی ئافرەتە خاوەن دوو پشتوێنەکەیە، بەڵێ، سوێند بە خودا، من ئەو ئافرەتە خاوەن دوو پشتوێنەم یەکێکیان خواردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و خواردنی ئەبوبەکرم لەسەر وڵاخەکە پێ بەست، ئەویتریان پشتوێنی ئافرەتە کە لێی بێنیاز نییە، ئێمە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆی باس کردین : (**لەسەقیفدا درۆزنێك و تیاچوویەك پەیدا دەبێت**) درۆزنەکە بینیمان[3]، تیاچووەکە پێم وابێت بریتی بێت لە تۆ، حەجاج لای ئەسما هەستا و وەڵامی نەدایەوە.

---

(1) واتە: عەبدوڵای کوڕی زوبەیر -و.

(2) ناشتنی هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ)، یەکەم منداڵی کۆچکەران کە لە مەدینە لەدایك بوو، کەسێك لیکی پێغەمبەر(ﷺ) کرابێتە دەمییەوە، کەسێك باوکی زوبەیر بێت و دایکی ئەسما و باپیری ئەبوبەکر و پووری عائیشە بێت، کەسێك ڕۆژووگر و شەونوێژکەر بێت، بە بڕیاری حەجاج لە گۆڕستانی یەهوود بنێژرێت، ستەمێکی گەورەیە -و.

(3) واتە: موختار سەقەفی -و.

## ٦- فەزڵی ئوم ئەیمەن(خوا لێی رازی بێت)

٣٨٩٠- (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ . بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم . لِعُمَرَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَزُورُهَا. فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ، فَقَالاَ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ؟ مَا عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم. فَقَالَتْ: مَا أَبْكِي أَنْ لاَ أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ. فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ، فَجَعَلاَ يَبْكِيَانِ مَعَهَا. [م٢٤٥٤]

**(م) لە ئەنەسەوە وتی: لە دوای مردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبوبەکر(خوا لێی رازی بێت)، بە عومەری وت: بڕۆ با سەردانێکی ئوم ئەیمەن بکەین، وەك چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەردانی دەکرد، کاتێ ڕۆیشتین بۆ لای ئوم ئەیمەن دەستی بە گریان کرد، ئەبوبەکر و عومەر پێیان وت: چی دەتگریەنێت؟ ئەوەی لای خودایە بۆ پێغەمبەری خودا باشتر و چاکترە، ئوم ئەیمەن وتی: ئەوە نامگریەنێت بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) باشتر و چاکترە، بەڵکو ئەوە دەمگریەنێت کە وەحی لە ئاسمانەوە پچڕاوە، ئوم ئەیمەن دڵی ئەبوبەکر و عومەری تەنگکرد و ئەوانیش لەگەڵی دەستیان بە گریان کرد.**

## ٧- دەروازەی: فەزڵی ئوم سولەیم دایکی ئەنەس(خوایان لێ ڕازی بێت)

٣٨٩١- (ق) عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم لَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ بَيْتاً بِالْمَدِينَةِ غَيْرَ بَيْتِ أُمِّ سُلَيْمٍ إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: (**إِنِّي أَرْحَمُهَا، قُتِلَ أَخُوهَا مَعِي**).
[خ٢٨٤٤/ م٢٤٥٥]

**(ق) لە ئەنەسەوە (خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە نە دەچووە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵی ئوم سولەیم و هاوسەرەکانی خۆی، لەو بارەوە پرسیاری لێکرا، پێغەمبەر فەرمووی: (من بەزەیی پیێ دەکەم، براکەی لەگەڵ من کوژرا[1]).**

---

[1] براکەی ئوم سولەیم ناوی حەرامی کوڕی میلحان بوو، ڕۆژی بیری مەعوونە کوژرا(خوا لێی رازی بێت)—و.

**٣٨٩٢**- (م) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْفَةً. فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحانَ، أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ). [م٢٤٥٦]

**(م) لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (چوومە بەهەشتەوە گوێم لە دەنگ و تەپەی پێی یەکێك بوو، وتم ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە ئوم سولەیمی کچی میلحانە، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك).**



## بەشی شەشەم

# فەزڵی دەستە و کۆمەڵەکان

## ١- دەروازەی: فەزڵی ئەشعەرییەکان

**٣٨٩٣**- (ق) عَنْ أَبِي مُوسى قالَ: قالَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ، أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ، جَمَعُوا ما كانَ عِنْدَهُمْ في ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ). [خ٢٤٨٦/ م٢٥٠٠]

**(ق) لە ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کاتێ ئەشعەرییان لە غەزا خواردنیان نامێنێت، یان خواردنی خانەوادەکانیان لە مەدینە کەم دەبێت، ئەوەی لەلایانە لەسەر پۆشاکێك کۆیدەکەنەوە، پاشان بە یەك دەفری یەکسان لە نێوان خۆیان دابەشی دەکەن، ئەوان لە منن منیش لەوانم).**

## ٢- فەزڵی ئەهلی یەمەن

**٣٨٩٤**- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قالَ: (أَتَاكُمْ أَهْلُ الْيَمَنِ، هُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً وَأَلْيَنُ قُلُوباً، الإِيمَانُ يَمَانٍ وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلاَءُ فِي أَصْحَابِ الإِبِلِ، وَالسَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ). [خ٤٣٨٨/ م٥٢]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەهلی یەمەن هاتن بۆ لاتان ئەوان نەرمترین ناخ و ناسکترین دڵیان هەیە، ئیمان یەمانیە و حیکمەت یەمانی، فەخر و شانازی و خۆبادان لە هاوەڵانی حوشتردایە، سەکینە و ویقار لە بەخێوکەری مەڕدایە).**

## ٣- دەروازەی: سەروەرییەکانی وەیسی قەرەنی

**٣٨٩٥-** (م) عَنْ أُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، إِذَا أَتَى عَلَيْهِ أَمْدَادُ أَهْلِ الْيَمَنِ، سَأَلَهُمْ: أَفِيكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ حَتَّى أَتَى عَلَى أُوَيْسٍ، فَقَالَ: أَنْتَ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَانَ بِكَ بَرَصٌ فَبَرَأْتَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: لَكَ وَالِدَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يقول: (**يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ مِنْ مُرَادٍ، ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ. كَانَ بِهِ بَرَصٌ، فَبَرَأَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ. له وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ، فَافْعَلْ**). فَاسْتَغْفِرْ لِي، فَاسْتَغْفَرَ لَهُ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: الْكُوفَةَ. قَالَ: أَلاَ أَكْتُبُ لَكَ إِلَى عَامِلِهَا؟ قَالَ: أَكُونُ فِي غَبْرَاءِ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ. [م٢٥٤٢]

**(م)** له ئوسەیری کوڕی جابرەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب کاتێ سوپای پشتیوانی له ئەهلی یەمەن بۆ بهاتبایە پرسیاری لێ دەکردن ئایا ئوەیسی کوڕی عامیرتان له ناودایە؟ تا عومەر هات بۆ لای ئوەیس، پێی وت: تۆ ئوەیسی کوڕی عامیری؟ وتی: بەڵێ، وتی: له موورادی، پاشان له قەرەنی؟ وتی: بەڵێ، وتی: پەڵەیەکت پێوەیە و پاشان چاکبوویتەوە جگە له شوێنێك بەقەدەر درهەمێك؟ وتی: بەڵی، وتی: دایکت هەیە؟ وتی: بەڵێ، عومەر وتی: گوێم له پێغەمبەری خودابوو(ﷺ) دەیفەرموو: (**ئوەیسی کوڕی عامیر لەگەڵ کۆمەڵێك پشتیوانی ئەهلی یەمەن له مووراد پاشان له قەرەن دێن بۆ لاتان، ئەو پەڵەیەکی پێوەیە له پەڵەکە چاکبووەتەوە جگە له شوێنێك بەقەدەر درهەمێك، دایکێکی هەیە ئەو چاکەکارە لەگەڵی، گەر سوێند لەسەر خودا بخوات خودا سوێندەکەی ناخات، گەر دەتەوێ داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات ئەوە ئەنجام بدە**) بۆیە داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، ئوەیس داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد، عومەر پێی وت بۆ کوێ دەڕۆی؟ وتی: بۆ کوفە، عومەر وتی: ئایا نوسراوێکت بۆ بنووسم بۆ کاربەدەستەکەی ئەوێ؟ ئوەیس وتی: پێمخۆشترە له لاوازانی خەڵك بم.

## ٤- دەروازەی: فەزڵی بەنی تەمیم

٣٨٩٦- (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قالَ: ما زِلْتُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مُنْذُ ثَلاثٍ، سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ فِيهِمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ**). قالَ: وَجاءَتْ صَدَقاتُهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**هذِهِ صَدَقاتُ قَوْمِنَا**). وَكانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عائِشَةَ فَقَالَ: (**أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ**). [خ٢٥٤٣/ م٢٥٢٥]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە وتی: لەو کاتەوەی سێ شتم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی بەنی تەمیم بیست بەردەوام ئەوانم خۆشدەوێت، بیستم دەیفەرموو: (ئەوان تونترین و دامەزراوترینی ئومەتەکەمن بەرامبەر بە دەجال)، ئەبو هورەیرە وتی: صەدەقەکانیان هات و پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە صەدەقەکانی قەومەکەمانە[1])، کچۆڵەیەك لەوان[2] لای عائیشە بوو، پێغەمبەر فەرمووی: (ئازادی بکە، چونکە ئەوە لە نەوەی ئیسماعیلە).**

## ٥- دەروازەی: فەزڵی ئەهلی حیجاز

٣٨٩٧- (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**غِلَظُ الْقُلُوبِ، وَالْجَفَاءُ، فِي الْمَشْرِقِ. وَالإِيمَانُ فِي أَهْلِ الْحِجَازِ**). [م٥٣]

**(م) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (دڵ ڕەقان لە خۆرهەڵاتەوەیە، ئیمان لەناو ئەهلی حیجازە).**

---

[1] لە ئیلیاسی کوڕی موزەڕدا بە پێغەمبەری خودا دەگەنەوە-و.

[2] کچۆڵەکە لە بەنی تەمیم بوو-و.

## ٦- دەروازەی: فەزڵی شام

**٣٨٩٨-** عَنِ ابْنِ حَوَالَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**عَلَيْكَ بِالشَّامِ، فَإِنَّهَا خِيرَةُ اللهِ مِنْ أَرْضِهِ، يَجْتَبِي إِلَيْهَا خِيرَتَهُ مِنْ عِبَادِهِ، فَأَمَّا إِنْ أَبَيْتُمْ فَعَلَيْكُمْ بِيَمَنِكُمْ، وَاسْقُوا مِنْ غُدُرِكُمْ، فَإِنَّ اللهَ تَوَكَّلَ لِي بِالشَّامِ وَأَهْلِهِ**). [د٢٤٨٣]

[وانظر: **٢٠٨٣، ٢١٥٦، ٣٩١٧، ٣٩١٨**]

لە ئیبن حەوالەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لەسەرتە ڕوو لە شام بکەی، ئەو شوێنە باشترینی زەوی خودایە، چاکترینی بەندەکانی خودا ڕووی لێ دەکەن، بەڵام گەر نەتانویست لەسەرتانە ڕوو لە یەمەن بکەن، هەر کەس لە حەوزی خۆی ئاو بخواتەوە و ئاو بدات، خودا شام و ئەهلی شامی بۆ دەستەبەر کردووم**).

## ٧- دەروازەی: فەزڵی غیفار و ئەسلەم و جوهەینە و ئەوانی تر

**٣٨٩٩-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**قُرَيْشٌ، وَالأَنْصَارُ، وَجُهَيْنَةُ، وَمُزَيْنَةُ، وَأَسْلَمُ، وَأَشْجَعُ، وَغِفَارُ، مَوَالِيَّ، لَيْسَ لَهُمْ مَوْلَى دُونَ اللهِ وَرَسُولِهِ**).

[خ٣٥٠٤/ م٢٥٢٠]

**(ق)** لەئەبی هورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قورەیش و ئەنصار و جوهەینە و موزەینە و ئەسلەم و ئەشجەع و غیفار مەوالی منن، مەولایەکی تریان نییە لە خوار خودا و پێغەمبەرەکەیەوە)**.

## ٨- دەروازەی: وەسیەتی پێغەمبەر"صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بە ئەهلی مصر

**٣٩٠٠-** (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ، وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ، فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا، فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا، فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا**) أَوْ قَالَ: (**ذِمَّةً وَصِهْرًا، فَإِذَا رَأَيْتَ رَجُلَيْنِ يَخْتَصِمَانِ فِيهَا فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ، فَاخْرُجْ مِنْهَا**). قَالَ: فَرَأَيْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ شُرَحْبِيلَ بْنِ حَسَنَةَ وَأَخَاهُ رَبِيعَةَ، يَخْتَصِمَانِ فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ، فَخَرَجْتُ مِنْهَا. [م٢٥٤٣]

(م) لە ئەبی زەڕەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا فەرمووی: (**ئێوە مصر فەتح دەکەن، ئەوێ زەوییەکە قیراتی**[1] **تێدا ناودەهێنرێت، گەر فەتحتان کرد چاکبن لەگەڵ ئەهلەکەی، چونکە ئەوان زیممە و ڕەحمیان**[2] **بۆ هەیە**)، یان فەرمووی: (**زیممە و صیهریان بۆ هەیە، گەر دوو پیاوت بینی نەیارییان تێدادەکرد دەربارەی شوێنی خشتێك لێی بچۆ دەرەوە**)، وتی: عبدالرحمانی کوڕی شورەحبیلی کوڕی حەسەنە و براکەیم-رەبیحە- بینی نەیارییان دەکرد لەسەر شوێنی خشتێك، منیش لێی چوومە دەرەوە.



(1) قیرات(قیراط) پێوەرێك بوو بۆ کێشانە و پێوانە-و.

(2) زیممە(پەیمان)یان بۆ هەیە، چونکە ئەهلی کیتاب بوون، یان بە پەیمان خۆیان رادەست کردووە، رەحمیان بۆ هەیە، چونکە هاجەری دایکی ئیسماعیل(سەلامی خودایان لەسەر لەوان بوو، خزمایەتیش(صهر) بەهۆی ماریای قیبتییەوە بووە کە مقەوقیس-مەلیکی مصر- هەدییەی پێغەمبەری کرد، دەکرێت زیممەکە بەهۆی ماریای قیبتییەوە بێت و رەحمەکەش بەهۆی هاجەرەوە-و.

## ١- دەروازەی: هەواڵدانی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" بەوەی ڕوو دەدات تا ڕۆژی قیامەت

٣٩٠١- (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: لَقَدْ خَطَبَنَا النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم خُطْبَةً، ما تَرَكَ فِيهَا شَيْئاً إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ ذَكَرَهُ، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ، إِنْ كُنْتُ لأَرَى الشَّيْءَ قَدْ نَسِيتُهُ، فَأَعْرِفُهُ كَمَا يَعْرِفُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ، إِذَا غابَ عَنْهُ فَرَآهُ فَعَرَفَهُ. [خ٦٦٠٤/ م٢٨٩١]

**(ق) لە حوزەیفەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکی بۆداین تا بەرپابوونی قیامەت شتێکی تێدا بەجێنەهێڵا باسی نەکات، ئەوەی زانی زانی و ئەوەی نەیزانی نەیزانی، دەکرێت شتێکم لەبیرچووبێت و ببیینم، بە بینینەکە چۆن پیاو پیاو دەناسێت کاتێ لێی بزر دەبێت و دواتر دەیبینێتەوە و دەیناسێتەوە[1]، منیش ئاوا دەیناسمەوە.**

٣٩٠٢- (م) عَنْ أَبِي زَيْدٍ، عَمْرِو بْنِ أَخْطَبَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم الْفَجْرَ، وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ، فَنَزَلَ فَصَلَّى. ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى. ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ، فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا. [م٢٨٩٢]

**(م) لە ئەبی زەیدەوە عەمری کوڕی ئەختەب، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەیانی پێکردین، چووە سەرمینبەر و وتاری بۆداین تا نیوەڕۆ هاتە بەرەوە دابەزی و نوێژی کرد و پشان چووەوە سەر مینبەر، وتاری بۆداین تا عەسر ئامادەبوو، پاشان دابەزی و نوێژی کرد، پاشان چووەوە سەر مینبەر وتاری بۆداین تا خۆر ئاوابوو،**

[1] واتە: دەکرێت ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی شتێکی لەبیرچوو بێت، بەڵام کاتێ شتەکە دەبینێتەوە و ڕووداوەکە ڕوودەدات دەیناسێتەوە و قسەکەی پێغەمبەری(ﷺ) بیر دەکەوێتەوە دەربارەی فیتنە و ناسینەوەی فیتنە و.

هـەواڵی پێـدا‌ین بـەوەی هـەبووە و بـەوەی دەبێـت، زاناترینمـان ئـەو کەسـەمان بـوو زۆرتری لەبەرکردبێت.

## ٢- دەروازەی: ئەو فیتنەیەی شەپۆل دەدات وەك شەپۆلی دەریا

**٣٩٠٣**- (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فِي الْفِتْنَةِ؟ قُلْتُ: أَنَا، كَمَا قَالَهُ. قَالَ: إِنَّكَ عَلَيْهِ ـ أَوْ عَلَيْهَا ـ لَجَرِيءٌ، قُلْتُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ، تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالأَمْرُ والنَّهْيُ. قَالَ: لَيْسَ هَذَا أُرِيدُ، وَلكِنِ الْفِتْنَةُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْها بَأْسٌ يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ، إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَاباً مُغْلَقاً، قَالَ: أَيُكْسَرُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: يُكْسَرُ، قَالَ: إِذاً لاَ يُغْلَقَ أَبَداً.

قُلْنَا: أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ؟ قَالَ: نَعَمْ، كَمَا أَنَّ دُونَ الْغَدِ اللَّيْلَةَ، إِنِّي حَدَّثْتُهُ بِحَدِيثٍ لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ. فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ، فَأَمَرْنَا مَسْرُوقاً فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: الْبَابُ عُمَرُ.

[خ٥٢٥/ م: الإيمان ١٤٤ (٢٣١)، الفتن ١٤٤ (٢٦)]

**(ق) لە حوزەیفەوە، وتی: لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێت)، دانیشـتبووین عومـەر وتی: کێ لە ئێوە قەولێکی پێغەمبەری خودا(ﷺ)ی لەبەرە داربارەی فیتنە؟ وتم: من، بەوجۆرەی فەرمووی، وتی: تۆ لەسەر وتنی-یان لەسەر فیتنەکە- کەسـێکی بـوێری، وتم: فیتنــەی پیـاو لـە خانـەوادە و مـاڵ وسـامان و منـداڵ و جیرانـی، نوێـژ و ڕۆژ و صەدەقە و فـەرمان و نـەهی دەیشـۆرنەوە، عومـەر وتـی: ئـەوەم ناوێـت، بـەڵکو ئـەو فیتنەی کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات، حوزەیفە وتی: هـیچ خـەمت نـەبێت، ئەی ئەمیری باوەڕداران، لە نێوان تۆ و فتنەدا دەرگایەکی داخراو هەیە، عومەر وتـی: ئایا دەشکێنرێت یان دەکرێتەوە؟ حوزەیفە وتی: دەشکێنرێت، عومەر وتی: کـەوابوو بۆ هەتا هەتایە داناخرێتەوە.**

**وتمان: ئایا عومەر دەیزانی ئەو دەرگاکەیە؟ وتی: بەڵێ، وەك چۆن بـەدوای ڕۆژدا شەو دێت، من فەرموودەیەکم بۆ باس کرد تێکـەڵ و پێکـەڵ نـەبوو، هەیبـەتمان کـرد**

پرسیار لە حوزەیفە بکەین، بۆیە فەرمانمان کرد بە مەسروق پرسیاری لێ بکات وتی: دەروازەکە عومەرە.

- وزاد في رواية لمسلم: قَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (تُعْرَضُ الْفِتَنُ عَلَى الْقُلُوبِ كَالحَصِيرِ عُوداً عُوداً، فَأَيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، وَأَيُّ قَلْبٍ أَنْكَرَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ بَيْضَاءُ، حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ، عَلَى أَبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا، فَلاَ تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ. وَالآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادّاً، كَالْكُوزِ مُجَخِّياً لاَ يَعْرِفُ مَعْرُوفاً، وَلاَ يُنْكِرُ مُنْكَراً، إِلاَّ مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ). [م١٤٤]

لەریوایەتێکی موسلیمدا ئەمە زیاد بووە: حوزەیفە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خودابوو(ﷺ) دەیفەرموو: **(فیتنە بۆ دڵان دەخرێتە ڕوو وەك حەسیر چیلکە بە دوای چیلکەدا، هەر دڵێك خواردیەوە نوکتەیەکی ڕەشی تێدا دادەنرێت، هەر دڵێك ئینکاری کرد نوکتەیەکی سپی تێدا دادەنرێت، تا دەبنە دوو دڵ: دڵێکی سپی وەك بەردی سپی لووس، هەتا ئاسمان و زەوی هەبن فیتنە زیانی پێناگەیەنێت، ئەویتریان ڕەشێکی بۆری چڵکن وەك گۆزەی دەمەونخون، نە چاکە بە چاکە دەزانێت، نە خراپە بە خراپە دەزانێت، جگە لەوەی بەئارەزووی خۆی دەخوا).**

## ٣- دەروازەی: تیاچوونی ئەم ئومەتە هەندێکی بە هەندێکی

**٣٩٠٤**- (م) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ اللهَ زَوَى لِيَ الأَرْضَ، فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ: الأَحْمَرَ وَالأَبْيَضَ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي أَنْ لاَ يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لاَ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوّاً مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ. وَإِنَّ رَبِّي قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لاَ يُرَدُّ. وَإِنِّي أَعْطَيْتُكَ لأُمَّتِكَ أَنْ لاَ أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لاَ أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوّاً مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ، وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا . أَوْ قَالَ: مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا . حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضاً، وَيَسْبِي بَعْضُهُمْ بَعْضاً). [م٢٨٨٩]

(م) لە سەوبانەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(زەویم بۆ کۆکرایەوە، خۆرهەڵات و خۆرئاوایم بینی، ئومەتەکەی من موڵکەکەی دەگاتە ئەو شوێنەی زەویم**

**بۆ کۆکرایەوە، دوو گەنجینەم پێدرا سوور و سپی، من داوام لە پەروەردگارم کرد ئومەتەکەم بە گرانی و سیاسالی گشتی تیانەبات و دوژمنێك جگە لە خۆیان بەسەریاندا زاڵ نەکات، کەسێك بەسەریاندا زاڵ نەکات خوێنرێژی بکات لە کۆمەڵ و دەستەیان، پەروەردگارم فەرمووی: ئەی موحەمەد، من قەزایەکم بڕیارداوە بەرچەرچدانەوەی نییە، من ئەوەم بە ئومەتەکەت داوە بە گرانییەکی گشتگیر ئەوان تیانەبەم و دوژمنێك جگە لە خۆیان بەسەریاندا زاڵ نەکەم خوێنی کۆمەڵ و دەستەیان بڕێژێت، گەر هەموو ئەوەی لە سووچەکانی زەویەوە هەن لەسەریان کۆببنەوە-یان فەرمووی: لەنێوان وڵاتانی زەوی- تا هەنێکیان هەندێکیان تیادەبەن و هەندێکیان هەندێکیان دیل و بەخسیر دەکەن[1]).**

## ٤- دەروازەی: تیاچوونی ئەم ئومەتە لەسەر دەستی غوڵامانێکی نەفام

**٣٩٠٥-** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**يُهْلِكُ النَّاسَ هَذَا الحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ**)، قالوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (**لَوْ أَنَّ النَّاسَ اعْتَزَلُوهُمْ**). [خ٣٦٠٤/ م٢٩١٧]

**(ق) لە ئەبی هورەیرەوە(خوا لێی رازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم تیرەیە لە قورەیش خەڵکی تیادەبەن) گوتمان فەرمانمان بە چی پێدەکەیت؟ فەرمووی: (گەر خەڵکی بتوانن لێیان کەنارگیر بن).**

- وفي رواية للبخاري: عن عَمْرِو بْنِ يَحْيَى بْنِ سَعِيد بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَدِّي قال: كُنْتُ جَالِساً مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم بِالمدِينَةِ، وَمَعَنَا مَرْوَانُ، قالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: سَمِعْتُ الصَّادِقَ المصْدُوقَ يَقُولُ: (**هَلَكَةُ أُمَّتِي عَلَى يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ**). فَقَالَ مَرْوَانُ: لَعْنَةُ اللهِ عَلَيْهِمْ غِلْمَةً. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ: بَنِي فُلاَنٍ وَبَنِي فُلاَنٍ لَفَعَلْتُ.

فَكُنْتُ أَخْرُجُ مَعَ جَدِّي إِلَى بَنِي مَرْوَانَ حِينَ مَلَكُوا بالشَّامِ، فَإِذَا رَآهُمْ غِلْمَاناً أَحْدَاثاً قَالَ لَنَا: عَسى هؤُلاَءِ أَنْ يَكُونُوا مِنْهُمْ؟ قُلْنَا: أَنْتَ أَعْلَمُ. [خ٧٠٥٨]

---

[1] واتە: ئومەتی ئیسلام دوژمن بەسەریدا زاڵ نابێت، خۆیان زیان بە خۆیان دەگەیەنن-و.

له ڕیوایەتێکی بوخاریدا: له عەمری کوڕی یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عـەمری کوڕی سەعیدەوە، وتی: باپیرم هەواڵی پێدام و وتی: لەگەڵ ئەبو هورەیرە لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) له مەدینه دانیشتبووم، "مەروان"مان لەگەڵ بوو، ئەبو هورەیرە وتی: گوێم له صادیقی مەصدوق[1] بـوو دەیفـەرموو: (**تیاچـوونی ئومەتەکـەم لەسـەر دوو دەستی غولامانێکـه لـه قـورەیش**)، مـەروان وتـی: نـەفرەتی خودایـان لێبێـت چـۆن غولامانێکن! ئەبو هورەیرە وتی: گەر بخوازم دەتوانم بڵێم بەنی فلان و بەنی فلان.

من لەگەڵ باپیرم دەردەچووین بۆلای بەنی مەروان کـاتێ شـامیان گرتـه دەسـت، که ئەوانی وەك غولامانی گەنج دەبینی پێی دەوتین: لەوانەیە ئەوانە لەو کەسانە بـن، ئێمەش دەمانوت: تۆ زاناتری.

## ٥- دەروازەی: فیتنەکان لەو شوێنەی که شاخی شەیتانی لێوەهەڵدێت

**٣٩٠٦**- (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ صلّى الله عليه وسلّم: (**اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا**). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَفِي نَجْدِنَا؟ قَالَ: (**اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا**). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَفِي نَجْدِنَا؟ فَأَظُنُّهُ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: (**هُنَاكَ الزَّلاَزِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ**). [خ٧٠٩٤ (١٠٣٧)]

**(خ)** له ئیبن عومەرەوە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەوەی فەرموو: ("اللهم بـارك لنا في شـامنا، اللـهم بـارك لنـا في يمننـا-خودایـه بەرەکـەت بخـه شـاممان، و خودایـه بەرەکەت بخه یەمەنمانەوە")، وتیان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا، ئـەی لـه نەجـدمان؟ فەرمووی: ("اللهم بارك لنا في شامنا، اللهم بارك لنا في يمننـا-خودایـه بەرەکـەت بخـه شاممان، و خودایه بەرەکەت بخه یەمەنمانـەوە")، وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا، ئەی له نەجدمان؟ وا گومان دەبەم لـه سـێهەمدا فـەرمووی: (بومەلـەرزە و فیتنـەکان لەوێوەن، لەوێوە شاخی شەیتان دێته دەرەوە).

[1] واته: صادیق ڕاستگۆیە، مەصدووق له لای خودا و فریشـتەکان و باوەڕدارانـەوە تەصـدیق کراوە، ئەو کەسەش بریتییه له پێغەمبەر(ﷺ)-و.

## ٦- دەروازەی: فیتنە لە خۆرهەڵاتەوە

**٣٩٠٧-** (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يُشِيرُ إِلَى المَشْرِق، فَقَالَ: (**هَا إِنَّ الْفِتْنَةَ هَاهُنَا، إِنَّ الفِتْنَةَ هَاهُنَا، مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ**). [خ٣٢٧٩ (٣١٠٤)/ م٢٩٠٥]

**(ق)** لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودام بینی(ﷺ) ئاماژەی بۆ ڕۆژهەڵات دەکرد و فەرمووی: (**فیتنە هۆ ئا لەوێوەیە، فیتنە هۆ ئا لەوێوەیە، لەو شوێنەوە شاخی شەیتان دێتە دەرەوە**).

## ٧- دەروازەی: نزیکبوونەوەی فیتنەکان و کرانەوەی سەدەکەی یەئجوج و مەئجوج

**٣٩٠٨-** (ق) عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم دَخَلَ عَلَيْهَا فَزِعاً يَقُولُ: (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ**). وَحَلَّقَ بِإِصْبَعِهِ الإِبْهَامِ وَالَّتِي تَلِيهَا، قالَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قالَ: (**نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الخَبَثُ**). [خ٣٣٤٦/ م٢٨٨٠]

**(ق)** لە زەینەبی کچی جەحشەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) ترس دایگرتبوو، چووە ژورەوە بۆ لای و فەرمووی: (**"لا إلة إلا الله"، وەیل بۆ عەرەب لە شەڕێك لێی نزیکبووتەوە، ئەمڕۆ سەدەکەی یەئجوج و مەئجوج بە ئەندازەی ئەوەندەی لێکرایەوە**)، پەنجەی شایەتومان و ئەو پەنجەی بەدوایدا دێت بەرزکردەوە، زەینەبی کچی جەحش وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا ئێمە تیادەچین صاڵحانمان لە ناودایە؟ فەرمووی: (**بەڵێ، کاتێ فیسق و فجوور**[1] **زۆر دەبێت**).

---

[1] فیسق و فجوور: واتە لادان و بەدڕەفتاری–و.

## ٨- دەروازەی: داباریینی فیتنەکان وەك لێزمەی باران

**٣٩٠٩-** (م) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ، أَلاَ ثُمَّ تَكُونُ فِتْنَةٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا. أَلاَ، فَإِذَا نَزَلَتْ أَوْ وَقَعَتْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ. وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ. وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ**) قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِبِلٌ وَلاَ غَنَمٌ وَلاَ أَرْضٌ؟ قَالَ: (**يَعْمِدُ إِلَى سَيْفِهِ فَيَدُقُّ عَلَى حَدِّهِ بِحَجَرٍ، ثُمَّ لِيَنْجُ إِنِ اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ. اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ! هَلْ بَلَّغْتُ؟**) قَالَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ أُكْرِهْتُ حَتَّى يُنْطَلَقَ بِي إِلَى أَحَدِ الصَّفَّيْنِ، أَوْ إِحْدَى الْفِئَتَيْنِ، فَضَرَبَنِي رَجُلٌ بِسَيْفِهِ، أَوْ يَجِيءُ سَهْمٌ فَيَقْتُلُنِي؟ قَالَ: (**يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ. وَيَكُونُ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ**). [م٢٨٨٧]

(م) لە ئەبی بەکرەوە(خوا لێی ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (**لە داهاتوودا کۆمەڵێك فیتنە هەن، پاشان فیتنەیەك دێت دانیشتوو تیایدا باشترە لەوەی لە ناویدا دەڕوات، ئەو کەسەی لە ناویدا دەڕوات باشترە لەوەی تەکان دەدات تیایدا، ئاگادار بن، هەرکات ئەو فیتنەیە دابەزی یان ڕوویدا هەرکەس حوشترێکی هەیە با بچێت بە لای حوشترەکەیەوە، هەرکەس مەڕێکی هەیە بابچێت بە لای مەڕەکەیەوە، هەرکەس زەویەکی هەیە بابچێت بەلای زەویەکەیەوە**)، وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ئەگەر حوشتر و مەڕ و زەوی نەبوو، پێغەمبەر فەرمووی: (**ڕوو بکاتە شمشێرەکەی و بە تیژییەکەیدا بیکێشێت بە بەردێکدا، پاشان خۆی ڕزگار بکات، گەر توانیٌ ڕزگاری ببێت، خودایە ئایا گەیاندم، خوایە ئای گەیاندم، خودایە ئایا گەیانم؟**) وتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی ئەگەر ناچارکرام ڕەوانە بکرێم بۆ یەکێك لە دوو ڕیزەکە[1]، یان یەکێك لە دوو کۆمەڵەکە، پیاوێك بە شمشێرەکەی دای لە گەردنم یان تیرێك دێت و دەمکوژێت؟ پێغەمبەر فەرمووی: (**ئەو شان دەداتە ژێر گوناهی خۆی و گوناهی تۆ، ئەو دەبێتە هاوەڵی ئاگر**).

---

[1] واتە: دوو سوپاکە کە دەیانەوێ بەرانبەر یەکتر بجەنگن-و.

## ٩- دەروازەی: هەڵهاتن لە فیتنە

٣٩١٠- (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الجِبَالِ وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ). [خ١٩]

(خ) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، ئەو وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(خەریکە باشترین ماڵی موسوڵمان مەڕ بێت، بیبات بۆ لوتکەی چیاکان و شوێنی بارینی باران، بە دینەکەیەوە هەڵبێت لە فیتنە).**

## ١٠- دەروازەی: گەر دوو موسوڵمان بە شمشێرەکانیان ڕوو بە ڕووی یەکتر ببنەوە

٣٩١١- (ق) عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ذَهَبْتُ لأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ، قَالَ: ارْجِعْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا؛ فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: (إِنَّهُ كَانَ حَرِيصاً عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ). [خ٣١/ م٢٨٨٨]

(ق) لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە، وتی: ڕۆیشتم بۆ ئەوەی ئەو پیاوە سەربخەم[١]، ئەبوبەکرە پێمگەیشت و وتی: بۆ کوێ دەڕۆی؟ وتی: دەڕۆم ئەو پیاوە سەردەخەم، وتی: بگەڕێوە من گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(گەر دوو موسوڵمان بەشمشێرەکانیان ڕوو بە ڕووی یەکتر ببنەوە بکوژ و کوژراو لە ئاگردان)** وتم ئەی پێغەمبەری خودا ئەمەیان بکوژە، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ فەرمووی: **(ئەویش پێداگربوو لەسەر کوشتنی هاوەڵەکەی)**[٢].

---

[١] ئەو پیاوە: واتە عەلی کوڕی ئەبی تالب(خوا لێی ڕازی بێت)-و.

[٢] بە کۆدەنگی ئەهلی سوننەت و جەماعەت عەلی کوڕی ئەبی تالب خەلیفەی چوارەمی موسڵمانانە و گوێڕایەڵی لێ کردن و سەرخستنی تاعەتە، تەکفیری هاوەڵانی پێغەمبەر ناکەین و دەمناخەینە ناو ناکۆکییەکانیان-و.

## ١١- دەروازەی: ڕاگەیاندنی دووڕوویی و بێباوەڕی

**٣٩١٢-** (خ) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمانِ قَالَ: إِنَّ الْمُنَافِقِينَ الْيَوْمَ شَرٌّ مِنْهُمْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، كَانُوا يَوْمَئِذٍ يُسِرُّونَ وَالْيَوْمَ يَجْهَرُونَ. [خ٧١١٣]

**(خ) لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە، وتی: دووڕووان لە ئەمڕۆدا خراپترن لەوانەی لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، لەو ڕۆژانەدا دەیانشاردەوە ئەمڕۆ ئاشکرای دەکەن.**

- وفي رواية: قَالَ: إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم، فَأَمَّا الْيَوْمَ: فَإِنَّمَا هُوَ الْكُفْرُ بَعْدَ الإِيمَانِ. [خ٧١١٤]

**لە ڕیوایەتێکدا: وتی: دووڕوویی لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو، بەڵام ئەمڕۆ بریتییە لە بێباوەڕی لەدوای ئیمان.**

## ١٢- دەروازەی: باسی خەواریج و سیفەتەکانیان

**٣٩١٣-** (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: بَيْنَما رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْسِمُ غَنِيمَةً بِالْجِعْرَانَةِ، إِذْ قالَ لَهُ رَجُلٌ: اعْدِلْ، فَقَالَ لَهُ: (لَقَدْ شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ). [خ٣١٣٨/ م١٠٦٣]

**(ق) لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە(خوایان لێ ڕازی بێت)، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە جیعرانە[١] غەنیمەتی دابەش دەکرد، پیاوێك[٢] پێی وت: عەدالەت ئەنجام بدە، پێغەمبەر فەرمووی: (بەدبەخت بووم گەر عەدالەت ئەنجام نەدەم).**

- ولفظ مسلم: قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم بِالْجِعْرَانَةِ، مُنْصَرَفَهُ مِنْ حُنَيْنٍ، وَفِي ثَوْبِ بِلاَلٍ فِضَّةٌ، وَرَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقْبِضُ مِنْهَا، يُعْطِي النَّاسَ، فَقَالَ: يَا

---

[١] جیعرانە: شوێنێکە لە باکووری خۆرهەڵاتی مەککە، بیست تا بیست و پێنج کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە-و.

[٢] ئەو پیاوە نازناوی "ذو الخُويصِرَة" و ناوی (حُرْقُوص بن زهير) بووە لە بەنی تەمیم-و.

مُحَمَّدُ اعْدِلْ! قَالَ: (وَيْلَكَ! وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ؟ لَقَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ). فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: دَعْنِي، يَا رَسُولَ اللهِ فَأَقْتُلَ هَذَا الْمُنَافِقَ، فَقَالَ: (مَعَاذَ اللهِ أَنْ يَتَحَدَّثَ النَّاسُ أَنِّي أَقْتُلُ أَصْحَابِي، إِنَّ هَذَا وَأَصْحَابَهُ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنْهُ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ).

لەفزەکەی موسلیم وتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە جیعرانە، کاتێ لە حونەین پشتیان هەڵکرد و گەڕانەوە، لە کۆشی بیلالدا زیو هەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) مشتی پێدا دەکرد و دەیدا بەخەڵك، پیاوەکە وتی: ئەی موحەمەد، عەدالەت ئەنجام بدە، پێغەمبەر فەرمووی: **(وەیل بە حاڵت، جا کێ عەدالەت ئەنجام دەدات گەر من ئەنجامی نەدەم، تۆ تووشی زیان و زەرەر بوویت گەر من عەدالەت ئەنجام نەدەم)**، عومەری کوڕی خەتاب(خوا لێی رازی بێت)، وتی: لێمگەڕێ ئەی پێغەمبەری خودا، با ئەم دووڕووە بکوژم، پێغەمبەر فەرمووی: **(پەنا دەگرم بە خودا لەوەی خەڵك باسی ئەوە بکەن من هاوەڵانم دەکوژم، ئەمە و هاوەڵەکانی قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان نەچووەتە خوارەوە، لە قورئان دەچنە دەرەوە وەك و چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت)**[1].

٣٩١٤- (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَما نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم وَهْوَ يَقْسِمُ قَسْماً، أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ، وَهْوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ اعْدِلْ، فَقَالَ: (وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ، قَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ). فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي فِيهِ، فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ؟ فَقَالَ: (دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَاباً يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كما يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ إِلَى نَصْلِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى رِصَافِهِ فَمَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى نَضِيِّهِ ـ وَهْوَ قِدْحُهُ ـ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى قُذَذِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، قَدْ سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ أَسْوَدُ، إِحْدَى عَضُدَيْهِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ، أَوْ مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ، وَيَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ).

---

[1] ئەم کابرایە رەگ و ریشکی خەواریجە کە دواتر لە خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا(خوا لێی رازی بێت) سەرهەڵدەدەن-و.

قالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قاتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ، فَأَمَرَ بِذلِكَ الرَّجُلِ فَالْتُمِسَ فَأُتِيَ بِهِ، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْهِ عَلَى نَعْتِ النَّبِيِّ صلّى الله عليه وسلّم الَّذِي نَعَتَهُ. [خ٣٦١٠، م١٠٦٤]

(ق) لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە، وتی: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووین، ئەو غەنیمەتێکی دابەش دەکرد، زوخوەیصیرە –ئەو پیاوێکی بەنی تەمیم بوو– وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، عەدالەت ئەنجام بدە، پێغەمبەر فەرمووی: (**وەیل بە حاڵت، کێ دادپەروەری ئەنجام دەدات گەر من ئەنجامی نەدەم، زەرەرمەند و زیانۆمەند بووم گەر عەدالەت ئەنجام نەدەم**)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، تیایدا مۆڵەتم بدە لە گەردنی بدەم، پێغەمبەر فەرمووی: (**لێیگەڕێ، ئەمانە هاوەڵانێکی هەن یەکێك لە ئێوە نوێژەکەی خۆی کەم تەماشا دەکات بەرامبەر بە نوێژەکەیان، ڕۆژووەکەی خۆی کەم تەماشا دەکات بەرامبەر بە ڕۆژووەکەیان، قورئان دەخوێننەوە و لە قوڕگیان نەچووەتە خوارەوە، لە دین دەچنە دەرەوە وەکو چۆن تیر لە نیشانەکەی دەچێتە دەرەوە، تەماشای ئاسنەکەی سەر تیرەکە دەکرێت هیچی پێوە نابینرێ، پاشان تەماشای کۆتایی ئاسنەکە دەکرێت هیچی پێوەنابرێ، پاشان تەماشای داری تیرەکە دەکرێت هیچی پێوەنابینرێ، پاشان تەماشای پەڕی تیرەکە دەکرێت هیچی پێوەنابینرێ، بەنێوان ناوسك و خوێنی نێچیرەکەدا تێپەڕیوە، نیشانەکەیان پیاوێکی ڕەشتاڵەیە، یەکێك لە شانەکانی وەك مەمکی ئافرەت وایە، یان وەك پارچە گۆشتێك دەلەرزێت، لەکاتی ناکۆکی و جیاوازی خەڵکی لە دین دەچنە دەرەوە**).

ئەبوسەعید وتی: شایەتی دەدەم من ئەم فەرموودەم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیست، هەروەها شایەتی دەدەم کە عەلی کوڕی ئەبی تالب دژ بەوانە جەنگا و من لەگەڵی بووم، فەرمانی کرد بەو پیاوە و هێنرا، عەلی فەرمانی کرد لە کوژراوەکاندا بەدوای ئەو پیاوەدا بگەڕێن و پیاوەکەیان بۆ هێنا، کاتێ تەماشام کرد لەسەر ئەو وەسفەبوو کە پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کردبوو.

**٣٩١٥**- (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (إِنَّ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي . أَوْ سَيَكُونُ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي . قَوْمٌ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ حَلاَقِيمَهُمْ، يَخْرُجُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَخْرُجُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لاَ يَعُودُونَ فِيهِ، هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ). [م١٠٦٧]

(م) لە ئەبی زەڕەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(دوای من لە ئومەتەکەم دەستەیەك قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان ناچێتە خوارەوە، لە دین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، پاشان ناگەڕێنەوە بۆ ناوی، ئەوانە خراپترین خەڵك و دروستکراوانن)**.

**٣٩١٦**- (ق) عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم، فَلأَنْ أَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَكْذِبَ عَلَيْهِ، وَإِذَا حَدَّثْتُكُمْ فِيما بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ، فَإِنَّ الْحَرْبَ خَدْعَةٌ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (يَأْتِي فِي آخِرِ الزَّمانِ قَوْمٌ، حُدَثَاءُ الأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ كما يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لاَ يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ، فَأَيْنَما لَقِيتُموهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَإِنَّ فِي قَتْلِهِمْ أَجْراً لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [خ٣٦١١/ م١٠٦٦]

(ق) لە سوەیدی کوڕی غەفەلەوە، وتی: عەلی(خوا لێی رازی بێت)، وتی: گەر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆم باس کردن، گەر لە ئاسمانەوە بەربدرێمەوە پێم خۆشترە درۆ بەدەمیەوە بکەم، گەر لەنێوان خۆم و ئێوەدا باسم بۆ کردن ئەوە جەنگ و فێڵە، گوێم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: **(لە ئاخیر زەماندا کۆمەڵێك دێن گەنج و کەم تەمەن، نەفام و کەڵفام، باشترین و چاکترین قسەی خەڵکی دەکەن، لە دین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت، ئیمانەکەیان لە قوڕگیان ناچێتە خوارەوە، لە هەرشوێنێك بەوانە گەیشتن بیانکوژن، چونکە لە کوشتنیاندا لە ڕۆژی قیامەت پاداشت هەیە بۆ ئەو کەسەی دەیانکوژێت)**.

## ١٣- دەروازەی: قەڵا و قوڵەی موسوڵمانان لەڕۆژی جەنگە مەزنەكە

**٣٩١٧-** عَنْ مَكْحُولٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(مَوْضِعُ فُسْطَاطِ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمَلاَحِمِ أَرْضٌ يُقَالُ لَهَا: الْغُوطَةُ).** [د٤٦٤٠]

* صحيح مرسل.

لە مەكحولەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(شوێن و قەڵا و قوڵەی موسوڵمانان لە جەنگە مەزنەكە زەوییەكە پێی دەوترێت "الغُوطة"[1]).**

**٣٩١٨-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: **(إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ، بِالْغُوطَةِ إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا: دِمَشْقُ، مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ).** [د٤٢٩٨]

* صحيح.

[وانظر: ٢٠٨٣، ٣٨٩٨]

لەئەبی دەرداوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(قەڵا و قوڵەی موسوڵمانان ڕۆژی جەنگە مەزنەكە لە "الغُوطة"یە لەتەنیشت شارێك پێی دەوترێت دیمەشق لە باشترین شارەكانی شامە).**

## ١٤- دەروازەی: فیتنەكان سزای دنیان

**٣٩١٩-** عن أبي موسى قال: قال رسول الله صلّى الله عليه وسلّم: **(أمتي أمةٌ مرحومةٌ ليس عليها عذابٌ في الآخرةِ، عذابُها في الدنيا: الفِتَنُ والزلزالُ والقتلُ).** [د٤٢٧٨]

صحيح. وقال شعيب: ضعيف.

لە ئەبی موساوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: **(ئەم ئومەتەم ئومەتێكی ڕەحمپێكراوە، لە دواڕۆژ سزای لەسەر نییە، سزاكەی لە دنیادایە: فیتنە و بومەلەرزە و كوشتن).**

---

[1] "الغوطة" نزیك بە دیمەشقە-و.

## ١٥- دەروازەی: هۆیەکانی بەلاَ و فیتنە و نەخۆشی

**٣٩٢٠**- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم قَالَ: (فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ: خَسْفٌ، وَمَسْخٌ، وَقَذْفٌ)، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَتَى ذَاكَ؟ قَالَ: (إِذَا ظَهَرَتِ الْقَيْنَاتُ، وَالْمَعَازِفُ، وَشُرِبَتِ الْخُمُورُ). [ت٢٢١٢]

* صحيح. وقال شعيب: ضعيف.

**لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لەم ئومەتەدا "خسف و مسخ و قذف"[1] بوونیان هەیە)، پیاوێك لە موسوڵمانان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، کەی ئەوە دەبێت؟ فەرمووی: (کاتێ کۆرانیبێژانی ئافرەت و مۆسیقا و ژەنین و خوارنەوەی عارەق دەرکەوت).**

**٣٩٢١**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: أَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: (يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ، خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ وَأَعُوذُ بِاللهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ:

لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلاَّ فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ وَالْأَوْجَاعُ، الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلاَفِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا. وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ؛ إِلاَّ أُخِذُوا بِالسِّنِينَ، وَشِدَّةِ الْمَؤُونَةِ، وَجَوْرِ السُّلْطَانِ عَلَيْهِمْ. وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ؛ إِلاَّ مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلاَ الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا. وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللهِ وَعَهْدَ رَسُولِهِ؛ إِلاَّ سَلَّطَ اللهُ عَلَيْهِمْ عَدُوّاً مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ. وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللهُ، إِلاَّ جَعَلَ اللهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ). [جه٤٠١٩]

* حسن.

**لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕووی لێکردین و فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی کۆچکەران، پێنج شت گەر پێی موبتەلا بوون، پەنا دەگرم بە خودا گەر بەوانە بگەن:**

---

[1] "خسف" بریتییە لە ڕۆچوون بە ناخی زەویدا، "مسخ" بریتییە لە گۆڕانی شێوە و ڕوواڵەت بۆ بەراز و مەیموون، وەك چۆن بۆ خێڵی شەممە(أصحاب السبت) ڕویدا، "قذف" بریتییە لە بەردەباران وەك بەردەبارانی هۆزی "لوط"-و.

هەرکات فاحیشە لە کۆمەڵێکدا دەرکەوت و فاحیشەکەیان ئاشکرا کرد تاعون و نەخۆشی و ئازارێك تیایاندا بڵاوە دەکات لە پێشینیەکانیان -کە تێپەڕیوون- بوونیان نەبووە، هەرکات کێشانە و پێوانەیان کەم کرد بە گرانی و سیاساڵی و زۆری تێچوون و ستەمی دەسەڵاتداران بەسەریاندا دەگیرێن، هەرکات زەکاتی ماڵ وسامانیان نەدا بارانیان لە ئاسمانەوە لێ دەگیرێتەوە، گەر ئاژەڵان نەبن بارانیان بۆ نابارێت، هەرکات پەیمانی خودا و پەیمانی پێغەمبەر دەشکێنن خودا دوژمنێك لە غەیری خۆیان بەسەریاندا زاڵ دەکات و هەندێك لەو شتانەی لە دەستیاندایە لێیان وەردەگرێت، هەرکات ئیمامەکانیان بە کتێبەکەی خودا حوکمیان نەکرد و هەڵبژاردن بکەن لەوەی خودا دایبەزاندووە[1]، خودا زەبر و زەنگی خۆیان دەخاتە نێوانیانەوە.

حەمد و سەنا بۆ خودا

بە کۆمەکی و پشتیوانی خودا لە ٢٠٢٢/٥/١، ڕێکەوتی ئێوارەی جەژنی رەمەزانی

ساڵی ١٤٤٣ی کۆچی

لە وەرگێڕان و پێداچوونەوەی "معالم السنة" تەواو بووم

عبدالکریم فتاح

سلێمانی



---

(١) وەك ئەوەی باوەڕیان بە هەندێکی هەبێت و وازبهێنن لە هەندێکی تری-و.

# پێرست

# ناوەرۆکی هەموو کتێبەکە (هەرچوار بەرگەکە)

## ⑨ مێژوو و ژیاننامە و سەروەرییەکان



## ⑩ فیتنەکان